ی دووەم

مەنوچێهر موحسنی

# دەروازەکانی کۆمەڵناسی

وەرگێڕانی

ڕێبوار سیوەیلی    موسلح ئیروانی

مراد حەکیم    دارا سوبحان    ئەبوبەکر عەلی

دلشاد حەمە    تەحسین تەها

دکتۆر مەنوچێهر موحسنی

# دەروازەکانی کۆمەڵناسی

وەرگێڕانی

ڕێبوار سیوەیلی، موسڵح ئیروانی،
مراد حەکیم، دارا سوبحان، ئەبو بەکر عەلی،
دڵشاد حەمە، تەحسین تەها

چاپی دووەم - هەولێر
2006

**ناوی کتێب: دەروازەکانی کۆمەڵناسی**

- نووسەر: دکتۆر مەنوچێهر موحسنی
- وەرگێڕ: ڕێبوار سیوەیلی، موسلح ئیروانی، مراد حەکیم، دارا سوبحان، ئەبو بەکر عەلی، دڵشاد حەمە، تەحسین تەها
- نەخشەسازی ناوەوە: دەزگای موکریانی
- بەرگ: هۆگر سدیق
- سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات
- چاپی یەکەم: ٢٠٠٢
- چاپی دووەم ٢٠٠٦
- ژمارەی سپاردن: ٣٤٤
- تیراژ: ١٠٠٠
- نرخ: ٤٥٠٠
- چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

زنجیرەی کتێب -٥١- (١٥٤)



ناونیشان

دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی

هەولێر - پشت ڕۆژنامەی خەبات

پۆستی ئەلکترۆنی: asokareem@maktoob.com

ژمارەی تەلەفۆن: ٢٢٦٠٣١١

www.mukiryani.com

# پێرست



## بەشی یەکەم



## بەشی دووەم

## بەشی سێیەم



## بەشی چوارەم



## بەشی پێنجەم

**بەشی شەشەم**



**بەشی حەوتەم**

## بەشی هەشتەم



## بەشی نۆیەم

## بەشی دەیەم



## بەشی یازدەیەم

## بەشی دوازدەم



## بەشی سێزدەیەم

# پێگە و سنووری کۆمەڵناسی

## کۆمەڵناسی چی نییە؟

یەکەمین دەستکەوتی سەردەمی نوێ، سەبارەت بە ڕەوتی زانست و هزری کۆمەڵایەتی، وەک هانز جۆرج گادامیر گوتوویە، بریتیبوو لە دروستبوون و پاشان جیابوونەوەی لقەکانی زانست لە فەلسەفە. بەرهەمی ئەم جیابوونەوەیەش ئەوەبوو، کە فەلسەفە بوو بە دیسیپلینێکی تایبەت. دەتوانین هەمان شت بە جۆرێکی دیکە دووپات بکەینەوە و بڵێین: گرنگترین خاڵی وەرچەرخان لە سەردەمی مۆدێرندا بریتیبوو لە جیابوونەوەی زانستەکان لە ئەدەبیات و بەرهەمی ئەم جیابوونەوەیەش ئەوە بوو، کە ئەدەب لە «ئەدەبی خەیاڵ»دا بچووککرایەوە. بۆ دیراسەکردنی ئەم ئەدەبە بچووککراوەیەش، دەبوو بەشەکانی وەک «فیلۆلۆژیا» و «ئەدەبی گشتی» هەروەها «ئەدەبی بەراوردکاری» و بەشی «زانستی ئەدەب» بکرێنەوە. بەشی یەکەمیان خۆی بە «ئەدەبی نەتەوەیی»یەوە سەرقاڵ دەکرد، دووەمیشان سەرقاڵی «ئەدەبی جیهانی» بوو. بەمەش زانستی «فیلۆلۆژی» و «زانستی ئەدەبیات» بوونە خاوەن دیسیپلینی زانستیی تایبەت بە خۆیان. لەهەمان سەردەمدا کە ئەم بەشانە، یاخود ئەم دیسیپلینانە پێکهاتن، بەشێکی زۆری لقە زانستییە مۆدێرنە جیاوازەکان سەرهەڵدەدەن: ئەنترۆپۆلۆژیا (مرۆڤناسی)، زانستی مێژوو، کۆمەڵناسی، دەروونشیکاری و پاشانیش زمانناسی (لینگویستیک).

بنەمای هەر بەشێک، یان هەر دیسیپلینێکی زانستیی جیابۆوە لە بەشەکانی دیکە، بریتییە لە بانگەشەکردنی بۆ سەربەخۆیی و ئیدیعاکردن سەبارەت بەوەی کە دەتوانێت «بابەتی و سەرجەمگیر» بێت. هیچ لقێکی زانستی نییە کە بۆ ڕەوایەتیدان بە خۆی و لە پێناوی جێبوونەوەی لەناو تۆڕی ئەکادیمیادا، بانگەشەی بۆ جۆرێ لە بەرهەمهێنانی «ڕاستی» نەکردبێت و خۆی بە زانستێکی «بابەتییانە» پێناسە نەکردبێت، کە دەتوانێت ڕاستیمان لەسەر گشتمەندی و سەرجەمیەتی کێشەکان پێ بڵێت و لە پاشانیشدا «ڕووناکایی»یان دەخاتە سەر. بەشێوەیەکی ڕەسمی، مێژوونووسان و کۆمەڵناسان دان بەوەدا دێنن کە هەرلایەکیان ئیش لە پانتاییەکی «جیاواز»دا دەکەن، بەڵام بەشێوەیەکی نارەسمی ئەم دوو لقە زانستییە لە داگیرکردنی پانتایی یەکتر زیاتر هیچ ناکەن. ئەم قسەیە بۆ پەیوەندیی نێوان کۆمەڵناسان و مرۆڤناسانیش هەر ڕاستە: مرۆڤناسی لە مرۆڤ دەکوڵێتەوە و کۆمەڵناسیش لە کۆمەڵ و دیاردەکانی. بەڵام ئایا دەتوانین مرۆڤ لە کۆمەڵ

دابڕین و کۆمەڵگایەکی بێ مرۆڤ وێنا بکەین؟

لەگەڵ ئەوەشدا کە هەر زانستەی جیاوازە لە ئەوانیتر و بەسەر بەش و دیسیپلینی جۆربەجۆردا دابەشبوون، ئەوە نابێت چاو لەو ڕاستییە مێژووییەش بپۆشین کە پێمان دەڵێت: هەر لقێکی زانستی، دامەزرێنەری خۆی، مەنهەجیەتی خۆی، دەقی سەرچاوەیی خۆی، تیۆری و شێوازی خۆ دەربڕینی خۆیان هەیە و ئیمکان و ئەگەری ئەوەش لەبەردەمدایە، کە هەریەکە لەم دیسیپلینانە تیۆری و مەنهەج و بیرۆکەی سەرنجڕاکێش لەیەکتری قەرز بکەن. بەمانایەکی دیکە: ئەگەر لە ساتێک لە ساتەکاندا فەلسەفە دەسەڵاتی ئەوەی لەدەستدا بووبێت کە ببێتە «دایک» و بنەمای هەموو زانستەکان، ئەوە لە دنیای هاوچەرخیشدا هەردەم یەکێک لە زانستە تایبەتمەندەکان فرسەتی ئەوەی هەبووە کە ببێتە «زانستی مۆدێل»، بۆ نموونە زانستی زمان (لینگویستیک) لە بەشێکی زۆری سەدەی بیستەمدا ئەم ڕۆڵەی بینی.

لەڕاستیدا ئەوەی ئەمڕۆکە لە دنیای ئەکادیمیادا زەحمەتە بەرگری لێبکرێت، بریتییە لەو سنوورەی کە زانستەکان و دیسیپلینەکان لێکدی جیا دەکاتەوە. بەشێکی زۆر لە بوارە زانستییەکان دەیانەوێت سنووری جیاکاری خۆیان بپارێزن، بەڵام ناتوانن و ئەمەیان بۆ ناچێتە سەر. مەسەلەکە ئەوە نییە کە سەرۆکی بەشە زانستییەکان حەز دەکەن سنووری بەشەکانیان بپارێزن، هەروەها ئەوەش نییە کە زانستەکان بەرەو دامەزراندنی «یەکێتییەکی زانستی» دەڕۆن و دەیانەوێ بوارە پسپۆڕییەکان لێکدی نزیک بخەنەوە و پەرە بە تێکەڵکردنی بوارە زانستییەکان بدەن، لەبەر ئەوەی «ناچارییەک» ئەوە دەسەپێنێ. مەسەلەی بنەڕەتیی لەوەدایە، کە چیدی ناتوانرێت و دەسەڵاتێک نەماوە بتوانێت پارێزگاری لە سنووری جیاکەرەوەی نێوان لقە زانستییەکاندا بکا. لە دنیای مۆدێرندا زانستەکان بەناچاری تێکەڵ بەیەکتر دەبن، بەناچاری دەکەونە ژێر کاریگەریی ئەنجامەکانی یەکترەوە و بەناچاریش یەکتری تەواو دەکەن.

بۆ نموونە با وای دابنێین لە بەشێکی وەک کۆمەڵناسیدا پرۆژەیەکمان هەیە پێوستە لەسەر بنەمای دوو لقی زانستییەوە جێ بەجێ بکرێت، با وای دابنێین پێویستیمان بەوە هەیە لە پرۆژەکەدا سوود لە تێڕوانینی مرۆڤناسانە (ئەنترۆپۆلۆژی) و میتۆدی ئەو زانستە و نەریتەکانی وەربگرین. بێگومان بۆ ئەم کارە پێویستیمان بەوە هەیە کە لە پێشەوە پرس بە مرۆڤناسەکان بکەین سەبارەت بەو کارەی کە ئێمە وەک کۆمەڵناس پێوەی سەرقاڵین. ڕێک ئالەم کاتەدا ئاسان نییە بەڕوونی و بێ هیچ بەهەڵە تێگەیشتنێک قەناعەت بەوە بکەین، ئایا بەڕاستی «زەمینەی کاری مرۆڤناسێک» چییە؟ ئایا ئەو توانایی و

قابیلیەتێکی تایبەتیی هەیە؟ ئایا شتێک هەیە مرۆڤناسەکان بتوانن ئەنجامی بدەن و کەسانی سەر بە لقە زانستییەکانی تر نەتوانن؟ ئایا مرۆڤناسێک لەبواری ئەفسانەکاندا لە مێژوونووسێکی ئایینی شارەزاترە، فەیلەسووفێک لە تیۆلۆژێک دەقیقترە و هتد؟

ئیدی ئێمە دەتوانین بەمجۆرە لە پرسیارکردن بەردەوامبین، هێندە هەیە هەر کەسێک لەبواری پسپۆریی خۆیدا پێی وایە توانا و شارەزاییەکی بێ نموونەی هەیە: مێژوونووسەکان بە دڵنیاییەوە پێمان دەڵێن: ئەوان و تەنیا ئەوان شارەزای ئیشکردنن لەبارەی دۆزینەوەی «سەرچاوە» و لێکدانەوەی «بەڵگەنامەکان»ـەوە، مرۆڤناسەکان خۆیان بە پسپۆڕ دەزانن لەبواری دیراسەی مەیدانیدا و جارانیش زماننناس ئەو کەسە بوو کە زۆرترین زمانی دەزانی و بەوجۆرە..

ئەمرۆ دیمەنەکان بە شێوەیەکی دیکەن: هەموو بەشێک، هەموو دیسیپلینێک و هەموو زانستێک کێشەی هەیە لەگەڵ ناسنامەی خۆیدا. هیچ لقێکی زانستی و هیچ دیسیپلینێکی ئەکادیمی نەماوە بەشێک لەسنووری خۆی لەدەست نەدابێت و تێکەڵ بە بوار و بەشی دیکە نەبووبێت و نەچووبێتە ژێر کاریگەرییانەوە. بەمانایەکی دیکە: لە دنیای ئەمرۆدا هیچ لقێکی زانستیمان نییە بە تەنیا و بە پشتبەستن بە یاساکانی خۆی، بانگەشەی وەڵامدانەوەی پرسیارەکان بکات، ئەنجامەکانی وەک ئەنجامگیریی «بابەتیانە» و «سەرجەمگیر» لەقەڵەم بدات و لەهەمان کاتیشدا وەک «لقێکی زانستی» بمێنێتەوە. لقێکی زانستی ناتوانێت «بابەتی» و «سەرجەمگیر» بێت و لە هەمان کاتیشدا «زانستی»یش بێت. چونکە زانست چییە جگە لە بچووککردنەوەی واقیع لەناو ئەگەر و رستە و دەربڕینەکانی زماندا؟ زانست ئەوە نییە کە بتوانێت دەربارەی «سەرجەمی شتەکان» بدوێت. هیچ زانستێک ناتوانێت سەرجەمگیر و گشتگرەوە بێت و ئەوەش هەڵە و کەمایەسی زانستێک نییە کە واقیع دابەزێنێتە سەر ئاستێکی بچووکی قسەکردن لەبارەی واقیعەوە، ئەوە عەیبی زانست نییە کە نەتوانێت لەمەڕ هەموو شتەکانەوە بدوێت، ئەوە کەموکوڕی زانستکار نییە کە نەتوانێت بە چراکەی دەستی هەموو کەلێنە تاریکەکانمان بۆ روونابکاتەوە. ئیشکردن لە زانستیشدا پێویستی بە رێژەیەک لە واقیعبینی هەیە، «واقیعبینی زانستیش» ئەوەیە کە سنوورەکانی خۆی بناسێت.

کەواتە دەبێت بپرسین: چۆن لقێکی زانستی پێکدێت و شەرعییەتی خۆی لەسەر کام بنەمایانەوە وەردەگرێ؟ ناسنامەی لقێکی زانستی چییە و هتد؟

زۆر هەڵەناکەین گەر بڵێین: ناسنامەی هەر بەشێکی زانستی لەوێوە سەرهەڵدەدات کە ئەو بەشە زانستییە رێگە نەدات بە پراکتیزەکارەکانی، کە «هەمووشتێک» بەناوی ئەو لقە

زانستییەوە بڵێن و ئەنجام بدەن. ناسنامەی لقێکی زانستی لە ناسینی سنوور و ئیمکانییەتەکانی خۆیدایە، لەبەرامبەر سنوور و ئیمکانیەتی لقەکانی دیکەی زانستدا، چونکە هەر لقێکی زانستی کە سنوورەکانی خۆی نەزانی، دەکەوێتە ئاخاوتن لە بارەی هەموو شتێکەوە و زانستێکی تۆتالیتاری و سەرجەمگیری لێبەرهەم دەهێنێ و ئەمەش ناودەنێ «حەقیقەتی زانستی»، بەبێ ئەوەی گوێ بداتە ئەوەی کە لقەکانی دیکەی زانستیش حەقیقەتی خۆیان هەیە. بۆیە لقێکی زانستی بەوە پێناسە دەکرێت کە «چی نییە»، نەک ئەوەی کە «چییە».

کۆمەڵناسی، مێژوو نییە، چونکە وەک کۆمەڵناسیی بەریتانی، ئەنتۆنی گیدێنز دەڵێت: بابەتی زانستیی کۆمەڵناسی بریتییە لە «کۆمەڵگای مۆدێرن» و بابەتی زانستی مێژوویش بریتییە لە «ڕابردوو». هەروەها کۆمەڵناسی، مرۆڤناسیش نییە، چونکە مرۆڤناسی خۆی بە «کۆمەڵگا تەقلیدییەکان»ـەوە سەرقاڵ دەکات و خاڵی هاوبەشی ئەمانەش ئەوەیە کە هیچیان «ئەدەب» نین. بەڵام بۆ ئەوەی کۆمەڵناسی ببێتە «زانستی ناسینی کۆمەڵگا و دیاردەکانی»، پێویستی بەوەیە بچێتە ناو تۆڕێکی هاوکارییەوە لەگەڵ هەموو ئەو لقە زانستییانەی تردا کە بەجۆرێک لەجۆرەکان لە مرۆڤ و کۆمەڵگا دەکۆڵنەوە.

* * *

**خەسڵەتەکانی ئەم بەرهەمە:**

ئەم کتێبەی دەیخوێنیتەوە بەهەمان ڕۆحییەتەوە نووسراوە، تا لە سەرێکەوە بابەتی سەرەکی ئەم زانستەمان بەشێوەیەکی بەرفراوان تێبگەیەنێت و لەسەرێکی دیکەیشەوە پێمان بڵێت، کۆمەڵناسی وەک دیسیپلینێکی زانستی لە چیدا و لە کوێدا لە لق و بەشە زانستییەکانی دیکە جیا دەبێتەوە. ئەم کتێبە چەندە دەیەوێت پێمان بڵێت کۆمەڵناسی چییە، هێندەش پێمان دەڵێت چی نییە!

ئێمە کە دەستمان بە ئیشکردن لە وەرگێڕانی ئەم کتێبەدا کرد، وێڕای خۆشەویستی هەرکامێکمان بۆ کۆمەڵناسی وەک لقێکی زانستی و وەک دیسیپلینێکی ئەکادیمی، هێشتا دوودڵ بووین لەوەی: ئایا پانتاییەکانی ئیشکردنی سۆسیۆلۆژی لە کوێدا لە پانتایی لقەکانی دیکە جیا دەبێتەوە. هۆی ئەمەش نەک هەر بۆ نەبوونی سەرچاوە و نەبوونی بەشی کۆمەڵناسی لە زانکۆکانی کوردستاندا دەگەڕێتەوە، بەڵکو دەشگەڕێتەوە بۆ گرنگی نەدان بەو ڕۆڵەی کە دەشێت کۆمەڵناسی و کۆمەڵناسان لە ناو دامەزراوەکانی

کۆمەڵگادا بیگێڕن. بەمانایەکی دیکە، تا ئێستاش چارەنووسی کۆمەڵناسی وەک زانستێک لە وڵاتی ئێمەدا روون نییە و شوێنگەی ئەم لقە زانستییە لە بەڕێوەبردن و رێکخستنی کۆمەڵگادا ئاماژەی بۆ نەکراوە. رەنگە ئەمەش هۆی ئەو نائومێدییە بێت کە هەر قوتابییەکی بەشی کۆمەڵناسی و هەر لێکۆڵەرەوەیەکی کۆمەڵایەتی دووچاری ببێت و بەدوای وەڵامەکەیدا بگەڕێت.

ئێمە نامانەوێت بەوەرگێڕانی ئەم بەرهەمە، بانگەشەی ئەوە بکەین کە وەڵامی ئەو پرسیارەمان داوەتەوە، بەڵام لەوە دڵنیاین کە خوێنەر لە دوای خوێندنەوەی بابەتەکانی ئەم کتێبە، بەشێوەیەکی وردتر دەڕوانێتەوە کۆمەڵگا و دەوروبەری خۆی و رەنگە تا ئەندازەیەکی زۆریش سنوورەکانی ئەم لقە زانستییەی بۆ روون ببێتەوە. هەرچی سەبارەت بە قوتابییانی بەشی کۆمەڵناسیشە، ئەم کتێبە دەتوانێت رۆڵی «یاوەرێکی زیندووی حازربەدەست» بگێڕێت، کە دەشێت پشتی پێببەسترێت و متمانەی پێبکرێت. ئالێرەشەوە چەند خەسڵەتێکی گرنگ، ئەم کتێبە لە زۆربەی ئەو کتێبانە جیا دەکاتەوە کە بە زمانەکانی دیکە نووسراون و دەکرێ بۆ سەر زمانەکەمانیان وەربگێڕین:

**خەسڵەتی یەکەم** ئەوەیە، ئەم کتێبە وەک «دەروازەیەک» و وەک «پێشەکی و سەرەتایەک» خۆی دەخاتەڕوو بۆ چوونە ناو دنیای کۆمەڵناسییەوە. واتە ئەم کتێبە نایەوێت هەڵگری هیچ یەقینێکی زانستی نەگۆڕ بێت، بەڵکو تەنیا دەروازەیەکی هێمن و بەکاوەخۆیە بۆ چوونە ناو ئەم بەشە و پێناسەکردنی ئەو چوارچێوەیەی کە دەکرێت بە «سنووری سەرەکیی پانتایی ئیشکردنی کۆمەڵناسەکان»ی لەقەڵەم بدەین، کە ئەمە شتێکە لەلای ئێمە و تەنانەت لەبەشەکانی کۆمەڵناسیشدا وەڵامێکی ئەوتۆمان بۆی دەستگیر نابێت. وەک دەزانین خەسڵەتێکی نەگۆڕی زانست بریتییە لە دەستنیشانکردنی وردی بابەتەکان و چڕکردنەوەی زەینی توێژەر لە پێناو بەدەستهێنانی چەند ئەنجامێکدا، کە دەشێت هەندێ روونکردنەوەی تازەمان لەسەر ئەو بابەتانە بخەنە بەر دەست. ئەمکارە خۆی لە خۆیدا بانگهێشتن و تاڕادەیەکیش ناچارکردنی ئێمەیە بۆ ئەوەی دیاردەکان و بابەتەکان بەشێوەی دیکە ببینین و لێیان بکۆڵینەوە و هوشیارانە لەناویاندا بژین. دەستنیشانکردنی سنووری هەر بابەتێک، واتە جیاکردنەوەی لە بابەتەکانی دیکە و رێگەگرتن لە تێکەڵکردنیان بەیەکتر، ئەمکارە وردبینییەکی زەینی و چاودێریکردنێکی وردی دەوێت تاکو ئێمە عادەت بە دیاردەکانەوە نەگرین و ڕانەیەین بە دووبارەبوونەوەیان، کە لە ئەنجامدا ئەم راهاتنە دەبێتە هۆی خەولێکەوتنی هوشیاریمان. کەواتە

دەستنیشانکردنی وردی بابەتەکان و جیاکردنەوەی سنوورەکانیان وامان لێدەکات کە زەینی خۆمان لەسەر چاودێریکردنی بابەت و دیاردەکان رابهێنین و بەمجۆرەش زەینمان و هۆشمان بەردەوام لە چالاکیدا بێت، نەک خەوی لێبکەوێت. نووسەری ئەم کتێبە ویستوویەتی بۆ هەر بابەتێک چەند پێناسەیەکی روون و لەهەر پێناسەیەکدا چەند خەسڵەتێکی ئەو دیاردانەمان بۆ ئاشکرا بکا، کە کتێبەکەی لەبارەیانەوە دە[illegible]ێت و پاشانیش لەرێگەی نموونە هێنانەوەی گونجاوەوە، پەیوەندییەک لە نێوان خس[illegible]ەرووە تیۆرییەکانی و دیاردەکانی واقیعی کۆمەڵایەتیدا، دروستبکا. هەموو ئەمەش بە «دەستپێیک»، یان «سەرەتا» و «دەروازەیەک» بۆ بابەتەکانی کۆمەڵناسی ناو دەبات و لێرەشەوە رووخسارێکی رێژەگەراییانەی زانستیی دەداتە کتێبەکەی.

**خەسڵەتی دووەمی** ئەم کتێبە لەوەدایە، لە بنەماوە لەسەر شێوازێکی ئەکادیمی و پەروەردەیی هاوچەرخ و بە زمانێکی شەففاف؛ بۆ قوتابییان نووسراوە. جگە لەوەی نووسەری کتێبەکە بۆ خۆی لەرووی بەرهەمهێنانی تیۆرییەوە کۆمەڵناسێکی پرکارە، مامۆستای دەرسی کۆمەڵناسیشە و ئەمەش بواری ئەوەی بۆ رەخساندووە، تا لە نزیکەوە ئاگاداری ئەو کێشە جۆربەجۆرانە بێت کە قوتابییانی ئەم بەشە دووچاری دەبن. بۆیە وەک خوێنەر بۆی دەردەکەوێ، لەو کاتەدا ئەم کتێبە گەرەکیەتی رەهەندە تیۆرییەکەی خۆی بپارێزێت و بەرگریی لە ئاستی دەربڕینی زانستییانەی خۆی دەکا، ئەوە لەهەمان کاتیشدا شێوازێکی پەروەردەیی و فێرکارییانەی تێدا رەچاو کراوە و ئەمەش وایکردووە لایەنە ئاڵۆزەکانی تیۆر، بەزمانێکی سادە، نەک ساکار، گوزارشیان لێبکرێت.

لەروانگەیەکی فەلسەفییانەوە بۆ کاری پەروەردەیی، پەروەردە هەرتەنیا لە پەیامی ئەو بابەتانەدا کورتنابێتەوە کە دەخرێنەروو، بەڵکو لایەنێکی گرنگی کاری پەروەردەیی بریتییە لە دروستکردنی پردی دیالۆگ و پێکهێنانی فەزایەکی هاوبەش بۆ قسەکردن لەسەر کێشەکان و رەواندنەوەی هەموو جۆرە ستەم و ترسێک لەبارەیانەوە تاکو پرۆسەی «لێتێگەیشتن» و «هەرسکردن»یان ئاسان بێت. کاری پەروەردەیی هەر لەو خاڵانەدا کورتبنەوە کە «پەروەردەیین»، بەڵکو گرنگیشە ئەم خاڵە پەروەردەییانە لە کەش و هەوایەکی ئەوتۆدا و بە زمانێکی گونجاو و شەففافی ئەوتۆ بخرێنە روو، کە زیان بەئامانجە پەروەردەییەکان نەگەیەنن و نەبنە «فەرمانی پەروەردەیی». پەروەردە کاتێک دەبێتە فەرمان و سەپاندن، ئەوە خەسڵەتێکی بنەمایی خۆی وندەکات، چونکە ئەو ئامادەییە عەقڵی و دەروونییەی کە بەرامبەر هەیەتی بۆ وەرگرتنی وانە و ئەزموونە

پەروەردەییەکان، هەڵدەگێڕێتەوە بۆ وزەیەک کە بەهۆیەوە لە پەروەردە رابکات و بەرگری لەبەرامبەردا بکات. ئەمەیە ئەو کێشە هەرە گرنگەی کە لە سیستەمی پەروەردەیی وڵاتی ئێمەدا هەیە و ئەم سیستەمەی لە سیستەمێکی فێرکاری و پێگەیاندنەوە کردۆتە سیستەمێکی دیسپلینکەری عەسکەرییانە و بەرزەفتەکردن. لەپەروەردەدا تەنیا یەک جۆر کۆنترۆڵکردن شەرعیەتی هەیە، ئەویش ئەوەیە داخۆ ئەو رێگا پەروەردەییەی گرتوومانەتە بەر کارایە یان پاسیڤ.

**سێیەمین خەسڵەتی** ئەم بەرهەمە، لە فرەڕەهەندی و سەرجەمگیربوونی دیدی نووسەرەکەیدایە، کە تەنیا خۆی نەبەستۆتەوە بە کۆمەڵگا خۆرهەڵاتی و ئیسلامییەکانەوە؛ بەڵکو بەردەوامیش لە هەوڵی بەڵگەهێنانەوە و نموونە هێنانەوەدایە لە کۆمەڵگاکانی خۆرئاوا و جیهانییەوە. ئەمرۆ کەمتر کتێبێک لەبارەی کۆمەڵناسییەوە دەبینین، کە بە دیدێکی فراوان و شارەزاییەکی وردبینانەی بێلایەنەوە، بتوانێت لە میانەی لاپەڕەکانی خۆیدا سەفەر بەناو کۆمەڵگا جۆربەجۆرەکاندا بکات و لە خەسڵەت و نیشانە و تایبەتمەندییەکانیان بدوێت و دواجاریش بکەوێتە بەراووردکاریی نێوان دیاردە کۆمەڵایەتییەکانیان. زۆر لە ڕاستی دوور ناکەوینەوە گەر بڵێین: لەناو نووسەرانی ئەورووپی لە بواری بابەتەکانی کۆمەڵناسیدا، کەمتر کەسانێک پەیدا دەبن کە شارەزاییەکی سەرجەمگیریان لەبارەی کۆمەڵگا خۆرهەڵاتی و غەیرە ئەوروپاییەکانەوە هەبێت. ئەوان پتر لەلایەنی تیۆریدا قووڵ دەبنەوە و لە بواری نموونە هێنانەوەدا کورت دەهێنن، لەکاتێکدا نووسەرانی غەیرە ئەوروپایی لەڕووی تیۆرییەوە دەستکورت و پابەندی دووبارەکردنەوەی ئەو تێز و دەستکەوتە تیۆرییانەن، کە هاوکارە ئەوروپایی و ئەمەریکییەکانیان بەرهەمیان هێناون. یەکێک لە بایەخەکانی ئەم کتێبە و تایبەتمەندیی شێوازی نووسەرەکەی ئەوەیە، کە دەیەوێت جۆرێ لە هاوسەنگی لە نێوان ئەو دوولایەنەدا بسازێنێ و لە ئەنجامدا لە «دەروازەیەک»ی تایبەتەوە بێتە دەرێ کە نە بەتەواوی لەڕووی تیۆرییەوە پشتی بەستووە بەو رۆشنبیرییە سۆسیۆلۆژییەی لە کولتووری خۆرئاوادا بەرهەم هاتووە و نە لە نموونە هێنانەوەشدا کۆمەڵگا غەیرە خۆرهەڵاتییەکانی لەبیر کردووە.

**چوارەمین خەسڵەتی** گرنگی ئەم کتێبە، لە زیندوویی و نزیکی و هاوشێوەیی نموونەکانیدایە، لەگەڵ ئەو دیاردانەی لە کۆمەڵگای ئێمەشدا ئامادەن. بۆیە خوێندنەوەی ئەم کتێبە لە گەلێک رووەوە وەک خوێندنەوەیەکی ناڕاستەو خۆی کۆمەڵگای ئێمە وایە و ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ لێکچوون و دووبارەبوونەوەی گەلێک «هاوبونیاد» لە

کۆمەڵگاکاندا بەگشتی و لە کۆمەڵگا تەقلیدییەکاندا بەتایبەتی. ڕاستە ناکرێت ئەم کتێبە و هیچ کتێبێکی دیکە، وەک «ڕابەرێک» و وەک بەرنامەیەک بۆ تێگەیشتن لە کۆمەڵگای کوردی و دیاردەکانی ناوی، بەکار بهێنرێت؛ بەڵام گومانیش لەوەدا نییە، زۆربەی ئەو نموونە پراکتیکیانەی نووسەر پەنایان بۆدەبات؛ بەشێوەیەکی دیکە و لە ئاستێکی تری دەرکەوتنیاندا، لە کۆمەڵگای ئێمەشدا ئامادەن و پێیان دەگوترێ «دیاردە کۆمەڵایەتییەکان». دیارە ئەم دۆخە هەلێکی باش بۆ خوێنەر دەڕەخسێنێت تاکو لە کاتی خوێندنەوەی بابەتەکاندا، جگە لە سوود وەرگرتن لەزانیارییەکان، جۆرێ لە بەراووردکاریش لەنێوان «دیاردە کۆمەڵایەتییە چوون یەکەکان»ی «کۆمەڵگا جیاوازەکان»دا ئەنجام بدات و ئەم کارەش یارمەتیدەرێکی باشە بۆ دەرچوون لە «ڕەهاییگەری کولتووری» و خۆبەستنەوەیەکی کوێرانە بە هەموو ئەو شتانەی کە پێمانوایە: تایبەتن بە کۆمەڵگا و کولتووری ئێمەوە. تێگەیشتن لە «جیاوازیی کۆمەڵگاکان» و لەهەمان کاتیشدا «چوونیەک بوونی هەندێک لە دیاردەکانیان»، خاڵێکی گرنگە لەبەردەم هەر پڕۆژەیەکی کۆمەڵناسی و کولتووریدا کە ئامانجی ئەوەبێت پردی هاوبەش و تێگەیشتنێکی زانستییانەی بێ لایەن بەرهەم بهێنێت. چونکە واچاکە کۆمەڵناسییەکی زانستیی و کارا، هەنگاوی سەرەتایی خۆی لە زەمینەخۆشکردن بۆ گفتوگۆی نێوان کولتوورەکان و دۆزینەوەی دیاردەی چوونیەکی کۆمەڵگاکانەوە بنێت. بە کورتی: کۆمەڵناسی دەکارێ پردێکی زانستی بێت لە نێوان کۆمەڵگاکاندا.

**کۆمەڵناسیی کوردەواری، چۆن؟**

ئەگەر قەرارە کۆمەڵگای ئێمە خۆی لە بونیادە دێرینەکانی ڕزگار بکات و پێ بخاتە قۆناغێکی مۆدێرنەوە، ئەوە ئێمە پێویستیمان بە زانستی کۆمەڵناسی و بەو مەعریفە تیۆری و پراکتیکییە هەیە، کە کۆمەڵناسان لەسەر کۆمەڵگا بەرهەمی دەهێنن، چونکە وەک لە شوێنێکی دیکەدا و لە زمان گیدێنزەوە ئاماژەم پێدا: بابەتی کۆمەڵناسی وەک لقێکی زانستی، بریتییە لە «کۆمەڵگای مۆدێرن». بۆیە هەوڵدان بۆ مۆدێرنیزەکردنی کۆمەڵگای کوردی، پێویستە هاوکات و هاوشان بێت بە دامەزراندنی کۆمەڵناسییەکی تایبەت بە کوردەواری، واتە کۆمەڵناسییەک، بتوانێت کۆمەڵگای کوردی لەسەر ئاستێکی تیۆری و زانستی بەرهەم بهێنێتەوە، یاسا و میکانیزمەکانی دەستنیشان بکا، لە

چارەسازیی کێشە و ئاڵۆزییەکانیدا ڕۆشنگەری بکا و ڕێگەخۆشکەر بێت بۆ خۆتازەکردنەوەی ئەم کۆمەڵگایە.

دامەزراندنی زانستی کۆمەڵناسیی کوردی، بە کردنەوەی «بەشی کۆمەڵناسی» لە زانکۆ و بە وەرگێڕانی کتێبێکی لەبابەت وەک ئەم کتێبەی ئێمە کردومانەتە کوردی، مەیسەر نابێت. ئەوەی کۆمەڵناسیی کوردی دروست دەکا، بریتییە لە ئیشکردن و ژیانێک بە هوشیارییەکی ڕەخنەگرانەوە لە ناو کایە کۆمەڵایەتییەکان و هەوڵدان بۆ تێگەیشتن لە میکانیزمی دروستبوونی دیاردەکان و پاشانیش تەفسیرکردنەوەیان بەپێی مەنهەجیەتێکی زانستی و دوور لە «دۆگماخوازی». کۆمەڵناسیی کوردی لەو شوێنەوە دروست دەبێت کە بتوانرێت دیدی تاکەکەسی کوردی بەرەو کۆمەڵگاکەی خۆی ئاراستەبکرێتەوە، واقیعی کۆمەڵایەتی لەلای ببێتە پرۆژەیەک، کە شایانی توێژینەوەیە و پاشانیش بە دیدێکی ڕەخنەیی پەروەردە بکرێت تابتوانێت لەنێوان خواست و ئیرادەی خۆی و، ئەوەی یاسا و نەریتە کۆمەڵایەتییەکان بەسەریدا دەیسەپێنن، مەودایەک بۆ پرسیارەکانی خۆی دروستبکا. بە مانایەکی دیکە، کۆمەڵناسیی کوردی هەر تەنیا بە کتێب تەرجەمەکردن بەرهەم نایەت، بەڵکو پێویستی بە ئیشکردنمان و هاوکاریکردنی ئەندامانی کۆمەڵگاش هەیە لەتەک یەکتردا، کە بێگومان ئەم دۆخەش پێویستی بە جۆرێک لە متمانەکردنە بە یەکتری.

* * *

لە بیری کۆمەڵناسیی هاوچەرخدا، «متمانە» دیاردەیەکە گرنگییەکی تایبەتیی پێدەدرێت. یەکێک لەو بەڵگانەی کە دەتوانین باس لە یاسا نەنووسراوەکانی کۆمەڵگا بکەین، یاخود باس لە «پەیمانێکی نهێنی» نەنووسراوی ناو کۆمەڵگایەک بکەین، کە دواجار ئەندامەکانی ئەو کۆمەڵگایە لەدەوری یەکتری کۆدەکاتەوە، دیاردەی متمانەیە. هەروەها متمانە یەکێکە لە بنەما گرنگەکانی هەر ئاڵوگۆڕێکی ئابووری و بواری بەرهەمهێنان: هەر یەکێکمان کاتێ ئامێرێکی تەکنەلۆژی بەکار دەهێنین، لەوێوە هەنگاو دەنێین، کە متمانەمان بەو ئامێرە هەیە. ئەوەش متمانەیە کە هاووڵاتیان سواری هۆیەکانی گواستنەوە دەبن، کۆرپەکانیان دەنێرن بۆ باخچەی ساوایان و منداڵەکانیان بۆ قوتابخانە و گەنجەکانیشان بۆ زانکۆ؛ تاکو لەوێ لەو بەشە بخوێنن و پەروەردە بکرێن کە ئەو دامەزراوانە وادەیان پێداوین. متمانە لە چوونی ئێمە بۆ لای پزیشک و بەردە وەستای دارتاش و دادوەرەکانیشدا خۆی ئاشکرا دەکا، چونکە بڕوامان وایە: پزیشک چاکمان

دەکاتەوە، دارتاش ئەو کەلوپەلەمان بە باشی بۆ دروستدەکات کە دەمانەوێ، و دادوەرەکانیش بە پێی یاسا مەدەنیەکان داوەریمان بەسەرەوە دەکەن و بەرگریمان لێدەکەن. بەمجۆرەش «متمانە» داینەمۆی زیندوویی کۆمەڵگاو گەرانتە بۆ نە شلەژان و ئاڵۆزنەبوونی ژیانی ئاسایی رۆژانە.

لێرەشەوە، متمانە لە دیاردەی «هاوکاری» جیا نابێتەوە، چونکە لە هەناوی هەموو جۆرە متمانەکردنێکدا شێوەیەکی دانان بەیەکتر و هەروەها ئاستێکی هاوکاریکردن لەگەڵ یەکدی، خۆی شاردۆتەوە. هەمووجارێ کە من متمانە بەتۆ دەکەم، واتە وەک خۆت و بە سەربەخۆیی خۆتەوە دەتبینم و قەبوولت دەکەم، کەئەمەش ئاستی هاوکاریکردنی منە بۆ ئەوەی تۆ، وەک کەسێتییەکی کۆمەڵایەتی دەرکەویت. هەموو جارێ کە تۆ متمانە بە من دەکەیت، واتە بوارم بۆ دەرەخسێنیت تاکو لە کۆمەڵگادا بوونی خۆم بسەلمێنم و بەوجۆرەی کە بەپێویستی دەزانم ئەرکەکانم جێبەجێ بکەم. لە متمانە و هاوکاریکردندا ڕێژەیەکی زۆری پرنسیپە ئەخلاقییەکانیش ئامادەن، چونکە لەلایەکەوە متمانە و هاوکاریکردن، دەچنە خزمەتی وەدیهاتنی دۆخێکی ئاسایی بۆ ژیانی پێکەوەیی مرۆڤەکان و لە لایەکی دیکەشەوە؛ ئامانجی ئەخلاق بریتییە لە وەدیهێنانی ئەو دۆخەی کە تیایدا هەر تاکەکەسێک لە خەمی ژیانی هاوبەشدایە.

***

هاوکاری و متمانەش لەلایەکەوە، بەردی بناخەی ئیشکردنی ئێمە بوون لە وەرگێرانی ئەم بەرهەمەدا و لەلایەکی دیکەوە خاڵی پەیوەندیی ئێمەش بوون لەگەڵ بەشی کۆمەڵناسی لە زانکۆی سەلاحەدین و بەڕێوەبەرێتی دەزگای بڵاوکردنەوەی موکریانی، کە دوو لایەنی هاندەربوون بۆ بەئەنجامگەیاندنی ئەم پرۆژەیە.

یەکەمین دیدارەکانی ئێمە بۆ گەڵاڵەکردن و دابەشکردنی بەشەکانی ئەم بەرهەمە، لە گۆڕەپانی کۆلێژی ئاداب و پاشان لە نووسینگەی سەنتەری گۆڤاری «ژیار»ەوە دەستیان پێکرد. سەبارەت بە من، ئیشکردن لەگەڵ کۆمەڵێ لاوی رۆشنبیر و خەمخۆر، ئەو یەکەمین ئامێزەبوو کە دەشێت مرۆڤێکی لە هەندەران گەڕاوە ئاشنا بکاتەوە بە وڵات و کۆمەڵگاکەی خۆی. لێرەوە سوپاسێکی زۆرم هەیە بۆ یەک بەیەکی ئەو کەسانەی پێکەوە ئەم پرۆژەیەمان داڕشت و کارمان تێداکرد و کەچی بەداخەوە لە دوای کۆتایی هاتنی کارەکانمان دیاردەی کۆچکردن بۆ هەندەران سێ لەو کەسانەی لێسەندین (ئەبوبەکر و دڵشادو دارا).. ئەو ئازیزانە جگە لە کۆمەڵێ یادگاری خۆش، شوێندەستی ماندووبوونیان

بەم بەرهەمەوە زۆر دیارەو ئێمەش دڵمان بەوە خۆشە کە توانیمان ئەو ئەمانەتییە بگەیەنین.

ئێمە ئەم کتێبەمان لە چاپی شازدەیەمی دەقە فارسییەکەوە تەرجەمە کردووە، کە لە کۆتایی هەر بەشێکدا کورتەی بەشەکە و زنجیرە پرسیارێک هەیە. ئێمە بە پێویستمان نەزانی پرسیارەکان وەربگێڕین، چونکە پێمانوایە خوێندنەوەی سەرجەمی کتێبەکە، یان ئەو بەشانەی بابەتگەلی جۆربەجۆر دەخەنەڕوو، ئەرکی سەرەکی خوێنەرە، نەک ناچارکردنی بەوەی لە ژێر ڕۆشنایی پرسیارێکی دیاریکراودا، لاپەڕەکان هەڵبداتەوە. هەروەها نووسەر لەگەڵێک شوێندا نموونەیەکی زۆر تایبەت، یاخود سەرچاوەیەکی ناسۆسیۆلۆژی وەک شیعر و حیکمەتی تایبەت بە کۆمەڵگای ئێرانیی فارسزمانی هێناوەتەوە، کە دیسانەوە بە پێویستمان نەزانیوە هەمیشە ئەو نموونە تایبەتییانە هەڵبژێرین، چونکە پێویستی دەکرد خوێنەر لە سیاقی گشتی ئەو بابەتانە شارەزابێت. هەروەها پێویستە ئاماژە بە شێوازی نووسەر بدەین لە دەستنیشانکردنی ژێدەرەکانیدا: ژێدەری ئەم کتێبە لە کۆتاییدا وەک لیستەیەک و بەپێی تەرتیبی ژمارەیی چاپکراون و نووسەر لە مەتندا تەنیا ئاماژەی بە ژمارەی ژێدەرەکە و لاپەڕەکەی داوە، بۆ نموونە: [٢١٦/ ٢٢٤] واتە: سەرچاوەی ژمارە ٢١٦ لاپەڕەی ٢٢٤) لە لیستی سەرچاوەکاندا.

لە کۆتاییدا دەبێت ئەوە دووپات بکرێتەوە، کە ئەم کارە کارێکی هاوبەشە و لە ئاستی خۆیدا کارێکە نموونەی لە وڵاتی ئێمەدا زۆر دەگمەنە. بۆیە ئێمە دوو چاوەڕوانیمان لە خوێنەر هەیە: یەکەم ئەمکارە ببێتە نموونە بۆ شوێنپێ هەڵگرتن و هاندانێک بۆ ئەنجامدانی کاری هاوبەش و بە کۆمەڵ. دووەمین چاوەڕوانیمان: ئەوەیە کە لە کاری هاوبەشدا هیچ ڕەهاییگەرییەک جێگەی نابێتەوە و کۆی زەحمەتی کەسەکان دەبێتە ئەنجامێک، کە دەخرێتەڕوو بۆ گفتوگۆ لەسەرکردن و دەوڵەمەندکردنی بەرهەمەکە، بەتایبەتی لە ڕووی زاراوەسازی و داڕشتنی زمانی و بەرجەستەکردنی خەسڵەتەکانی زمانی زانستییەوە. گرنگە خوێنەران و شارەزایان بەوجۆرە تەماشای زمان و زاراوەکانی ئەم وەرگێڕانە بکەن، کە وەک پێشنیار خراونەتەڕوو، کە دەکرێت دەستکاری بکرێن و بە زاراوەی گونجاوتر جێگەیان پڕ بکرێتەوە. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو خاڵەی کە ئێمە هێشتاش بۆخۆمان لەم لایەنە رازی نین و دەکرێ بە هاوکاریی خوێنەران، ئەم کەموکورییە لە چاپی دواتردا چارەسەر بکرێت. چاوەڕوانی تێبینی و سەرنجی قوتابییان، مامۆستایان و کۆمەڵناسەکانین تاکو هاوکاریمان بکەن و ئەم کتێبە ببێتە بەرهەمی هەوڵدانی هەموومان.

ئەرکی دابەشکردنی فەسڵەکان بۆ تەرجەمەکردن و هەروەها پیاچوونەوەی کتێبەکە و فەرهەنگسازی و سەرپەرشتی چاپ، بەمجۆرەی خوارەوە بووە:

رێبوار سیوەیلی: پیاچوونەوەی گشتی و پێشەکی و وەرگێڕانی بەشی: (کۆمەڵناسی، زانستی کۆمەڵگە)

موسڵح ئیروانی: پیاچوونەوەی گشتی و وەرگێڕانی: بەشی (سەرهەڵدان و گەشەکردنی کۆمەڵناسی) و (پێکهاتە و ئەرکی کۆمەڵگای مرۆیی)

مراد حەکیم: پیاچوونەوەی گشتی، فەرهەنگۆک، سەرپەرشتی چاپ لەگەڵ وەرگێڕانی هەر سێ بەشی: (گرووپی کۆمەڵایەتی)، (دامەزراوە و رێکخراوە کۆمەڵایەتییەکان) و (کۆمەڵگا لە قۆناغی پێش کشتوکاڵیدا).

دڵشاد حەمە: وەرگێڕانی بەشی (بەکۆمەڵایەتیبوون)، (شارنشینی و کۆمەڵگای پیشەسازی)

ئەبوبەکر عەلی: وەرگێڕانی بەشی (نۆرمەکان، بەهاکان و لادانە کۆمەڵایەتییەکان) و (کشتوکاڵ و گوندنشینی)

دارا سوبحان: وەرگێڕانی بەشی (خێزان و خزمایەتی) و (نایەکسانی و چینە کۆمەڵایەتییەکان).

تەحسین تەها: وەرگێڕانی بەشی (کولتوور و کۆمەڵگا)

سوپاسی بەڕێز کەریم سۆفی دەکەین، کە ئەرکی کێشاوەو بە کوردییەکەیدا چۆتەوە.

رێبوار سیوەیلی
٢٠٠١/١١

## کۆمەڵناسی چییە؟

ڕۆڵی کۆمەڵناسی بریتییە لە ڕۆشنگەری لە پانتایی ئەزموونی مرۆییدا. کۆمەڵناسی بانگهێشتمان دەکا بۆ توێژینەوەو چاوخشاندنەوە بەلایەنە جیاوازەکانی ژینگەی کۆمەڵایەتی، ئەو لایەنانەی کە ئێمە بە زۆری پشتگوێیان دەخەین، گرنگییان پێنادەین یاخود وەک حاڵەتی سەپاو وەریاندەگرین. خوێندنی کۆمەڵناسی یارمەتیمان دەدات تاکو تێبگەین کۆمەڵگا چۆن ڕێکخراوە، دەسەڵات لە کوێدایە، کامە بیروڕاو نەریت ڕەفتارەکانمان ئاراستە دەکەن و هەروەها کۆمەڵگاکەشمان بە چ شێوەیەک فۆرمی ئێستای خۆی وەرگرتووە؟ بەمانایەکی دیکە: کۆمەڵناسی مرۆڤەکان بەهۆشیارییەکی تایبەت لەسەر ئەوەی کە هەیە، چەکدار دەکا. ئەم هۆشیارییە یارمەتیمان دەدات تاکو ئەو هێزە کۆمەڵایەتییانەی کە ڕووبەڕوویان بووینەتەوە، باشتر بناسین، بەتایبەتیش ئەو هێزانەی کە سنوورمان بۆ دادەنێن یان بەرەڵڵامان دەکەن. ڕەنگە زۆر لە ڕاستی دوور نەکەوینەوە ئەگەر بڵێین: کۆمەڵناسی، زانستێکی ئازادکەرە [٣/ ٥]. کۆمەڵناسی پێش هەرشتێ (هەرچەندە کەم تا زۆر ئەمە ئاشکرا نەبووە) تێڕوانین و تێگەیشتنی ڕەخنەیی لە کۆمەڵگا پەرەپێدەدات و بەگەشەسەندنی ئەم تێڕوانینەش کۆمەڵناسی دەکارێ بەشداریکردنێکی چالاکی لە گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکاندا هەبێت. ئەم ڕۆڵە لە کۆمەڵناسیدا زۆر بەڵگە نەویستە، چونکە شتێکی ئاساییە هەر کۆمەڵناسێک گرنگی بەمەسەلەکانی وەک هەژاری، تاوان، تەلاق، گەندەڵی و هتد.... بدات [١/ ١].

کۆمەڵناسی (Sociology) وەک بەشێکی پسپۆڕی لە بواری زانستە مرۆڤایەتییەکاندا، پانتاییەکی بەرفراوان دەگرێتەوە. کاروبارو کێشەکانی وەک هەژاری، جیاکردنەوەی ڕەگەزی و گرووپی، ژیانی خێزانی، ڕێکخراو، حزب و گرووپە سیاسییەکان، ژیانی ئایینی، جۆرەکانی لادانی کۆمەڵایەتی، پێکهاتەی ئابووری، گۆڕانە کۆمەڵایەتییەکان، شۆڕش، ڕێکخراوو بونیادی فێرکردن، زانست و

توێژینەوە، گەشەی تەکنیکی، یەکێتییە پیشەیی و سەندیکاکان، زۆربوونی خێرای دانیشتووان، نامۆبوونی کۆمەڵایەتی، شارنشینی، لادێنشینی و زۆربواری دیکە، کە یا ئەوەتا راستەوخۆ دەکەونە پانتایی توێژینەوەی کۆمەڵناسییەوە، یاخود پەیوەندییان پێوەی هەیە [٣/٦]. کۆمەڵناسی بەجەختکردنەوەی لەسەر بینین و هەڵسەنگاندن، ئەو ئەگەرە دەهێنێتە ئاراوە کە زانیاری رێکوپێکمان لە با ەی ئەو باسە سەختانەی پەیوەندییان هەیە بەسیاسەتەکان و هەڵبژاردنە کۆمەڵایەتی ٔانەوە، دەست بکەوێت. [٥/٢-٣]. چۆن بتوانین ئەو بەشە زانستییە پێناسە بکەین کە بانگەشەی ئەم جۆرە لێکۆڵینەوانە دەکات؟

نەریتی کتێب نووسین ئەوە دەسەپێنێ کە سەرەتا پێناسەی کۆمەڵناسی بکەین، هەرچەندە نەشتوانین: ئەوەی کۆمەڵناسی لێیدەکۆڵێتەوە شتێ نییە تازە دۆزرابێتەوە. کۆمەڵناسی پێکهاتەیەکی نوێ نییە لەو شتانەی کە پێشتر بوونیان هەبووە بەشێوەی بەرهەمە تاقیگایی یاخود پیشەسازییەکان. کۆمەڵناس عەودالّی ناسینی شێوە هەبیەکانی ژیانی کۆمەڵایەتییە. کۆمەڵناسێکی وەکو «سامۆیل مۆرس» (S. morse) شتێک داناهێنێ. زەمینەی بابەتییانەی کۆمەڵناسی لە سەرەتای دەستپێکردنی ژیانی کۆمەڵایەتیی مرۆڤەکانەوە لە سەر زەوی تائێستا هەمیشە هەبووە. لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەم زەمینە بابەتییانە لەکات و شوێندا لە هەندێ لایەنەوە هەمەڕەنگن، بەڵام رەگەزە بنەڕەتییەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی، کەم تا زۆر رەهەندگەلێکی گشتییان هەیە.

ئەو دۆزینەوانەی پشت ئەستوورن بەناسینی زانستی، جیاوازییان لەگەڵ هۆشیاری و ناسینی عامەو زانینێک هەیە کە لەم رێگەیەوە بەدەست دێت (Common sense). بۆ نموونە ناسینی عامە حوکم دەدات ئەگەر کەسێ لە یارییەکی دەستەجەمعیدا فێڵ بکات، ئەوە لەکاروکاسبیشدا هەر فێڵ دەکات، ئەمەش لەکاتێکدا کە توێژینەوە زانستییەکان لەمبارەیەوە پیشانی دەدەن، کە کارڕاستی کەسێ لە هەڵومەرجێکی تایبەتدا هیچ پەیوەندییەکی بەرەفتاری ئەو کەسەوە نییە لە هەڵومەرجێکی دیکەدا [٥/٧]. بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین بەشێ لە تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی کۆمەڵناسی (وەکو لقێکی زانستی) بەم شێوەیەی خوارەوە کورت بکەینەوە [٩/٨].

أ- یەکەمین ئامانجی (کۆمەڵناسی) زانینە نەک هەنگاونان.

ب- بابەتییەت، رێکوپێکی و روانگەی زانستی.

ج- بەرفراوانکردنی پانتایی و بایەخدانی بابەتییانە بەرەهەندە جیاوازو هەمەڕەنگەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و بەپسپۆڕیکردن.

د- پشت بەستن بەدەستکەوتەکانی هەموو زانستە کۆمەڵایەتییەکان.

لە سەرەتای مێژووەوە تائێستا، هەڵسوکەوتی کۆمەڵایەتی مرۆڤ زەمینەیەکی سەرنجڕاکێش بووە بۆ خوێندنەوەو لێکۆڵینەوە، شێوەی ڕەفتاری کەسەکانیش لەگەڵ یەکتردا- واتە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان. لە لایەن مێژوونووس، ڕۆحانی و فەیلەسووفەکانەوە جێگەی گرنگیپێدان، تۆژینەوە، بینین و تۆمارکردن بووە. باسکردنی ئەوەی کە «کراوە» وێڕای ئەوەی لە لایەن مێژوونووسەکانەوە ئەنجامدرابێت یان ڕۆژنامەنووسەکان، دەچێتە خانەی مێژووی ژیانی کۆمەڵایەتی مرۆڤەکانەوە. لێرەوە ئەرکی کۆمەڵناس ئەوەیە کە بەسوود وەرگرتن لە میتۆدی زانستی، هەوڵی شیکارکردن و لێکدانەوەی ڕووداوو دیاردە کۆمەڵایەتییەکان بدات. بەم پێیەش، کۆمەڵناسی وەکو لقێکی دیاریکراو بەدوای ناسینی مرۆڤی کۆمەڵایەتییەوەیە و لە دیاردەکانی وەکو کۆمەڵە مرۆییەکان، دابونەریت و دامەزراوەکان و نموونەکانی جێگیری و گۆڕانی کۆمەڵایەتی دەکۆڵێتەوە.

بێگومان ڕەفتاری تاکەکان لە چوارچێوەی ئامادەیی ئەواندا وەک (تاک) دەردەکەون. ئەم ڕەفتارانە کاریگەری لە هۆکارە فیزیکی (وەکو توانای جەستەیی) و هۆکارە دەروونییەکان (وەکو هۆش و ئامادەباشی) وەردەگرن، بەڵام لە پاڵ ئەمەو لە پەیوەندی لەگەڵیدا، هۆکارە کۆمەڵایەتییەکان هەن. لەم ڕووەوە بۆ ئەوەی بتوانین ناسینێکی ورد و هەمەلایەنمان لەسەر ڕەفتاری مرۆڤ هەبێت، پێویستە حیساب بۆ هۆکارە تاکەکەسی و کۆمەڵایەتییەکان بکەین. بەسەرنجدان لەوەی کە هۆکارە تاکەکەسییەکانیش لە ژێر کاریگەری هۆکارە کۆمەڵایەتییەکاندان، دەستەیەک لە کۆمەڵناسان لە بنەڕەتدا گومان لە بوونی هۆکارە تاکەکەسییەکان دەکەن. لەوێوە کە تاکەکان پێکەوە دەژین، هاوبەشن لە داب ودەستوورەکاندا، سەبارەت بەدۆست و دوژمنەکان پەرچەکردار دەنوێنن و هتد...، ڕەفتارەکانیشیان لە چوارچێوەگەلێکی تایبەتیدا شێوە دەگرن [ ١١/١-٦ ].

هەر کاتێ مەبەست لە کۆمەڵناسی نوێ دەزگای ناسینی زانستییانەی خەسڵەتی «کۆمەڵایەتی»بێت، ئەوە هەر پێناسەیەکی بمانەوێت بخەینەڕوو، ڕووبەڕووی تەنگ و چەڵەمە دەبێتەوە: کۆمەڵایەتی چییە؟ ناسینی زانستییانە لە چ لایەنێکەوە لە ناسینێک جیا دەبێتەوە کە ئەم تایبەتمەندییەی نییە[ ٢٥/٥ ].

ویرای ئەو جیاوازییە بەرچاوەی کە لە رووی شێوەی پێناسەکردنی کۆمەڵناسییەوە لە نێوان کۆمەڵناسەکاندا هەیە، تارادەیەک بوارەکانی باس و تۆژینەوە یەکن. بۆ نموونە وا نایەتە پێش چاو کەسێ دژی ئەوە بێت گەر بڵێین، یەکێک لە رەهەندە بنچینەییەکانی تۆژینەوە لە کۆمەڵناسیدا بریتییە لە ناسینی زانستییانەی رەفتاری مرۆڤەکان لە چوارچێوەی گرووپەکان و گەشەسەندنیان، چونکە ئەگەر بڵێین کۆمەڵناسی بریتییە لە خوێندنەوەی زانستییانەی کۆمەڵگا، یان پەیوەندییە مرۆییەکان یاخود رەفتارە کۆمەڵایەتییەکان، لە راستیدا هەندێ بەڵگەمان لەسەر ناوەڕۆکەکەی خستوونەتەڕوو و رەنگە بتوانین بڵێین: ئەم کتێبە جگە لە پێناسەکردنی کۆمەڵناسی و ناوەڕۆکەکەی هیچ شتێکی دیکە ناگرێتە خۆی. بەزۆری ناوەڕۆکی کۆمەڵناسییان بە «دیاردە کۆمەڵایەتییەکان» ناوبردووە کە هەڵبەت ئەم دەربڕینە ئیقاعێکی تەمومژاویی هەیە.

زۆربەی کۆمەڵناسە ئەمریکییەکان حەز دەکەن کۆمەڵناسی بەزانستی تۆژینەوەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، پێناسە بکەن، چونکە ئەزموونی رۆژانەی ئێمە لە پەیوەندییە مرۆییەکان، واتە پەیوەندییەکانی خێزان، هاورێکان، دوژمنان، بێگانەکان و بەوجۆرە.... بەدیهێنەری بابەتی سەرەکی ئەم زانستەن [ ١٠/١٣ ]. بەچاوخشاندنەوە بەناو ئەو تێڕوانینە جیاوازانەدا، کە لەبارەی بابەتی تۆژینەوەی کۆمەڵناسییەوە لە بەردەستدان بەو ئەنجامە دەگەین کە گرووپێک کۆمەڵناسی بە هاوواتای «پێکهاتەی کۆمەڵایەتی» (Social structure) دەزانن (وەک مارکس، پارسۆنز و هتد)، گرووپێک لە رواڵەتی کۆمەڵی (Collective Representa-tions)دا کورتی دەکەنەوە (وەک دورکهایم و...)، لە کۆتاییشدا دەستەیەکی دیکە بە «کردەی کۆمەڵایەتی» (Social Action) دەزانن (وەک: ماکس ڤێبەر..و) [٢٠٤/ ٥٠١-٥٠٤].

لەگەڵ زانینی ئەوەی کە تائێستا هیچ پێناسەیەک بۆ کۆمەڵناسی نەیتوانیوە خۆی لە رەخنە بپارێزێت، بەڵام لەو رووەوە کە بتوانین بەلای کەمەوە وێنەیەکی تا ئەندازەیەک دیاریکراو لەسەر پانتایی بابەتییانەی ئەم زانستە بخەینە پێش چاوی عەودالانی سەرەتایی ئەم لقە، دەتوانین بڵێین: کۆمەڵناسی وەکو یەکێک لە زانستە کۆمەڵایەتییەکان بەشێکە خۆی بەلێکۆڵینەوەی دیاردە کۆمەڵایەتییەکانەوە، واتە ئەو لایەنانەی ژیانی مرۆڤ کە لە ئەنجامی ئەندامێتی مرۆڤ لە کۆمەڵگادا سەرهەڵدەدەن، خەریک دەکات. کۆمەڵناسی بەیارمەتی میتۆدە زانستییە

تایبەتییەکان، دەزگاکان، پەیوەندی و رەفتارە کۆمەڵایەتییەکانی مرۆڤ لە رووی پێکهاتە، ئەرک، دینامیکییەت و گۆڕان دەخاتە بەر تۆژینەوە، شیکردنەوە و لێکدانەوە، بەراورد و پۆلێن کردنەوە. هەروەها بەروانینێکی تایبەتی هۆکارە کۆمەڵایەتییەکان هەوڵی گەیشتن بەو «یاسا کۆمەڵایەتی»یانە دەدات کە بەسەر «ژیانی کۆمەڵایەتی»دا زاڵن.

### ئامانجەکان و بەشە پسپۆڕییەکان

زەمینە سەرەتاییەکانی بیری کۆمەڵناسی لەسەر ئەو بنەمایە دروستبوو کە کۆمەڵناسی وەک لقێکی زانستی بەشێوەیەکی مەعریفیانە کاردەکات و تەنیا خاوەنی «بەکارهێنانە پراکتیکییەکان»ە، نەک «ئامانجە پراکتیکییەکان». کۆمەڵناسی لەوە دەکۆڵێتەوە کە«هەیە» نەک لەوەی کە «دەبێت هەبێت». لە ئەنجامی تۆژینەوە کۆمەڵایەتییەکانەوە ئەنجامگەلێکی بەسوود بۆ جێبەجێ کردنی بەرنامەکانی چاکسازیی کۆمەڵایەتییەکان و خۆشگوزەرانیی گشتی دێتە دەست. بەڵام کۆمەڵناسی بەشێوەیەکی راستەوخۆ عەوداڵی بەدەستهێنانی نموونە تایبەتی و پراکتیکییەکانی ئەم جۆرە کاروبارانە نییە. لەبەرئەوە کۆمەڵناسی زانستێکە نەک چارەسەرێکی راستەوخۆ. لەگەڵ ئەوەشدا کە کۆمەڵناسان دەتوانن وەکو راوێژکار لە بەرنامەکانی پەرەپێدانی ناوچەیی و چاکسازی و بەرنامەرێژیی کۆمەڵایەتیدا بەشداری بکەن، کاری سەرەکی ئەوان خستنەڕووی واقیعەکان و شیکردنەوەو لێکدانەوەی دیاردە کۆمەڵایەتییەکانە بۆ یارمەتیدانی راپەڕێنەرانی ئەو بەرنامانە [٨/١٣].

پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمەوە تائێستا ئەم ئاراستەیە نەیاری خۆیشی هەبووە کە خۆیان لە ریزی جۆربەجۆردا بینیوەتەوە. بەبڕوای ئەم گرووپانە قەبوولکردنی «کۆمەڵناسی لە پێناو کۆمەڵناسیدا» بە مانای دوورخستنەوەیەتی لە کێشەکانی ئێستای کۆمەڵگاو ئاراستە وەرگرتنێکی نادەروەستانەیە لە بەرامبەر مرۆڤەکاندا [٨/١٢].

لە دەوروبەری ساڵی ١٩٦٠ بەدواوە وردە وردە لە جیهاندا کایەی پیشەیی نوێ بۆ کۆمەڵناسی پەیدابوون. کۆمەڵناسی کە تاکو پێش ئەو مێژووە، تایبەت بوو بە گرووپە فێرکارییەکانی زانکۆ و گۆڕەپانی دیکەی لە بەرامبەر خۆیدا بینییەوە، هێدی هێدی کۆمەڵناسان لە نووسینگەکانی تۆژینەوە و راپرسی، یەکە پیشەسازییە

گەورەکان، کۆمپانیاکانی ئەندازیاریی ڕاوێژی شارسازی، و ڕێکخراوە جۆربەجۆرە کارگێڕییەکاندا کار دەدۆزنەوەو لە زۆرینەی بوارەکاندا کاری ئەوان پەیوەندیی بەلق و بوارە جیاوازەکانی وەکو دەروونشیکاری، ئابووری، تەنانەت مافیشەوە دەبێت. [٩/ ١١٠].

بەدرێژایی چەند دەیەی ڕابردوو کۆمەڵناسیی پراکتیکی (عملي) جێگەی سەرنج بووە و تۆژینەوەش لە لقە جیاوازەکانی کۆمەڵناسیی پراکتیکیدا بابەتی چەندین پەرتووکی جیاوازبووە، و کتێبی «کۆمەڵناسیی پراکتیکی» (Applied Sociolo-gy) کە لەلایەن «فریمان» (H. E. Freeman)و هاوکارەکانییەوە بڵاوکراوەتەوە یەکێکە لەوانە. ئەوان ئەم بابەتەیان لەم ڕوانگانەی خوارەوە شیکردۆتەوە: سەرهەڵدانی لقەکانی کۆمەڵناسیی پراکتیکی، ڕۆڵی تیۆر لە کۆمەڵناسیی پراکتیکیدا، پرۆسەی کارکردنی کۆمەڵناسان، هەڵسەنگاندنی بەرنامەکان، بەرنامەدارشتنی خزمەتگوزارییە کۆمەڵایەتییەکان، لێکۆڵینەوە لە پرۆگرامی حکوومەت، ڕاوێژکردنی یاسادانان، بەڕێوەبردنی خزمەتگوزاریی تەندروستی و چارەسەرییەکان، تۆژینەوەی کۆمەڵایەتی لە پیشەسازی، دۆزینەوەی بازاڕ، تۆژینەوە سەربازییەکان، بەرنامە فێرکارییەکان، کێشەی بەساڵاچووەکان، خانووبەرەو پلاندانانە ژینگەیی و ناوچەییەکان، فێربوونی کۆمەڵناسیی پراکتیکی و خوێندنی لە قۆناغە جۆربەجۆرەکانی زانکۆدا [٥٤/ ١-٤].

**هەندێک لە جۆرەکانی چالاکییە پیشەییەکان لە بواری کۆمەڵناسیدا (لە ئاستی جیاواز) [٢٦١/٨].**

| بەکالۆریۆس | ماستەر | دکتۆرا |
|---|---|---|
| خزمەتگوزارییە خۆشگوزارییەکان | بەرنامەدارشتنی کۆمەڵایەتی | بەڕێوەبەرایەتی پرۆژەکانی تۆژینەوە |
| وانە گوتنەوە لە قوتابخانەکاندا | وانەگوتنەوە لە قوتابخانە باڵاکاندا | ڕاوێژکاری لە کاروباری کۆمەڵایەتیدا |
| پەیوەندییە گشتییەکان و پروپاگەندە | تۆژینەوە | مامۆستای زانکۆ |
| خزمەتگوزارییە کۆمەڵایەتییەکان | بەڕێوەبەرایەتی خۆشگوزەرانیی کۆمەڵایەتی | |
| یاریدەدەری تۆژینەوەیی | | |

بەسەرقاڵبوونیان بەم پیشانەوە کۆمەڵناسان چاوەڕوانی ئەوەن کە بتوانن: (١) لە چاککردنی ئەرکی دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکاندا بەئاراستەی وەدیهێنانی ئامانجە دەستنیشانکراوەکان، بەشداری بکەن؛ (٢) لە کەمکردنەوەی نایەکسانییە کۆمەڵایەتییەکاندا کاریگەربن؛ (٣) لە جێبەجێکردن و گەڵاڵەکردنی خزمەتگوزارییە کۆمەڵایەتییەکاندا (فێرکاری، تەندروستی، چارەسەری، دەروونی، قەزایی...)، بۆ

هەمووان بەشدارین؛ و دواجار: (٤) رۆڵی کاریگەری خۆیان لە بەردەوامیبەخشین بەژیانی مرۆڤ و مسۆگەرکردنی مانەوەی ئینسان (لە رێگەی: چاودێریکردنی رێژەی دانیشتووان، پارێزگاریکردن لە سەرچاوەکانی وزە، پارێزگاری ژینگەو سەرچاوە سروشتییەکان، بەرەو پێشەوەبردنی ئاشتی، لێکحاڵیبوونی نێوان مرۆڤەکان...وهتد) بگێڕن.

بەرفراوانبوونی هەرچی زیاتری پانتایی کۆمەڵایەتی دەبێتە هۆی بە پسپۆڕیبوونی ئەم بوارە و لە هەندێ حاڵەتیشدا بە دوورکەوتنەوە و گۆشەگیری کۆمەڵناسان لە یەکتری، گەیشتووە. ئەوەی لە رابردوودا لە ژێر ناوی دامەزراوەکان، پەیوەندییەکان و بونیادی کۆمەڵایەتیدا گفتوگۆی لەسەر دەکرا، ئەورۆکە بۆتە بوارێکی سەربەخۆو لە ژێر ناوی وەک کۆمەڵناسیی خێزان، کۆمەڵناسیی سیاسی، کۆمەڵناسیی لادێ، کۆمەڵناسیی چینە کۆمەڵایەتییەکان، کۆمەڵناسیی پەروەردەو فێرکردن و.. پۆلین دەکرێت [١٧/٤-١٤].

### دیاردەی کۆمەڵایەتی

ئاماژە درا بەوەی کە بابەتی کۆمەڵناسی بریتییە لە لێکۆڵینەوەی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان. زاراوەی «کۆمەڵایەتی» (Social) کە لەسەدەکانی ١٤ و ١٥ی زایینیدا لە دەستەواژەی «ژیانی کۆمەڵایەتی» و بە مانای ژیان لە کۆمەڵگادا بەکاردەهات، لە سەدەکانی ١٨ و١٩ی زایینیدا مانایەکی فەردی وەرگرت [٢/٥٠].

لەسەرەتای سەدەی بیستەمەوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە وشەی «کۆمەڵایەتی» ناواخنێکی بەرفراوانتری بەخۆیەوە گرت، بەڵام لە هەمان کاتدا راشکاوتریش کراو لە رێگەی لکاندنی بەزاراوەگەلێکی ترەوە، وەکو: بەها، رۆڵ، چین، توێژو شوێنگە، رەهەندی پسپۆریشی وەرگرت. لە بەکارهێنانی ئێستاییدا، وەکو پێشتر چەمکی «تاکەکەسی» لە بەرامبەر چەمکی «کۆمەڵایەتی»دا (کە بەڵگەبوو بۆ جۆرە وێناکردنێکی تەجریدی ئەم چەمکانە) دانانرێت، و تاکیش وەک ئەندامێکی کۆمەڵگا لێی دەکۆڵرێتەوە.

بەلای کۆمەڵناسەکانەوە دیاردە کۆمەڵایەتییەکان لە کۆمەڵە رەفتارێکی تاکەکەسی و نەگۆڕ لە شوێن و کاتدا، کورت ناکرێتەوە. دیاردە کۆمەڵایەتییەکان بە لای ئەوانەوە لە خەسڵەتە کۆمەڵی، خێزانی، چینایەتی و نەتەوەییەکانەوە سەرچاوە

دەگرن، وەک ئەنجامی پەیوەندیی نێوان تاکەکان و نفوزکردنی کۆمەڵەکان لەسەر تاکەکان لێکدەدرێنەوە [٤٧/٢٢]. «ئەمیل دورکهایم» (١٨٥٨-١٩١٧ E. Durkheim) کۆمەڵناسی فەرەنسی بڕوای وابوو کە دەبێت دیاردە کۆمەڵایەتییەکان وەک «شتەکان» بکرێنە بابەتی لێکۆڵینەوە [٢٦/١٤].

بەلای دورکهایمیەوە دیاردە کۆمەڵایەتییەکان خاوەنی هەندێ تایبەتمەندین، کە دەکرێ ئاماژە بۆ سێیانیان بکرێت: دەرەکی بوون، حەتمی بوون، و سەرتاپاگیربوونیان. دیاردە کۆمەڵایەتییەکان لایەنێکی دەرەکییان هەیە چونکە تاکەکان لە پرۆسەی بەکۆمەڵایەتیبووندا، نموونەو نۆرمە کۆمەڵایەتییەکان لە کۆمەڵگاوە وەردەگرن و بەو جۆرەش رەگەزگەلێکی دەرەکی، کە لەبوونی فیزیکی و دەروونی ئەواندا نییە، دەکەنە بەشێک لە خۆیان[٢/ ٥٠] پەیوەندیی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان بەکەسایەتی مرۆڤەوە ئەوەندە پتەوە کە ناتوانین بەئاسانی لە دەرەوەی بوونی، یان کەسایەتی تاک، بۆ رەگوریشەیان بگەڕێین[١٥/١٧].

حەتمی بوونی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان لە رێگەی هێزو پاڵپشتە کۆمەڵایەتییەکەیەوە - کە رەگەکەی ئەوەتا لە دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکاندا - دەناسرێتەوە. تاکەکان بەوهۆیەوە کە ئەندامانی کۆمەڵگان، ئەرکی سەرشانیانە کە فەرمانە کۆمەڵایەتییەکان، بڕیارەکان، یاساکان، دابونەریت و شتی لەو بابەتە، رەچاو بکەن، چونکە بەپێچەوانەوە، رووبەڕووی پەرچەکرداری کۆمەڵگا دەبنەوە. لەگەڵ ئەوەی کە دیاردە کۆمەڵایەتییەکان هێزی خۆسەپاندنیان هەیە و تاکەکان لەبەر چەند هۆیەک ناچارن رەچاوی بکەن، وێڕای ئەوەش حەتمییەتی کۆمەڵایەتی لە هەموو دیاردەکاندا بەیەک رێژە بوونی نییە [٣/ ٩٥].

دیاردە کۆمەڵایەتییەکان بەو هۆیەوە کە «کۆمەڵایەتین» ئەوە «سەرتاپاگیرن»، و «کۆمەڵایەتی» بوونیان بەهۆی سەرتاپاگیرییەکەیانەوە نییە. مەبەست لەسەرتاپاگیری، هەبوون و بڵاوبوونەوەی دیاردە کۆمەڵایەتییەکانە (هەڵبەت بەپلەی جیاواز) لە رووبەری کۆمەڵگادا. لەمبارەیەوە «دورکهایم» دەنووسێ: «دیاردەی کۆمەڵایەتی بارێکی دەستە جەمعییە کە بەسەر گشت تاکەکاندا دەسەپێنرێت و بەشێوەیەکی دووبارەبووەوە لە هەمووواندا دەبینرێ. لەبەرئەوەی لە گشت دایە، لە بەشیشدا بوونی هەیە، نەک لەبەرئەوەی کە لە بەشدا هەیە لەگشتیشدا دەدۆزرێتەوە» [١٤/٣٢]. پێویستە لەمبارەیەوە ئەوەش زیادبکەین و بڵێین تایبەتمەندییە ناوبراوەکان (دەرەکی بوون، جەبری بوون، و سەرتاپاگیربوون)

هەریەکەیان خەسلەتێکی بەتەواوی سەربەخۆ نین و لەگەڵ یەکتردا لە پەیوەندیدان. لە رەفتارێکی کۆمەڵایەتیدا دەتوانین بەرێژەی جیاواز ئەم تایبەتمەندییانە ببینینەوە [٢٥٢/١٦].

**کۆمەڵناسی و زانستە کۆمەڵایەتییەکان**

هەرکاتێ مرۆڤێکی عەودالّی ورد بیەوێ بزانێت چ بابەتگەلێک لە کایەی زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا تایبەتن بە کۆمەڵناسی، یاخود سنووری نێوان کۆمەڵناسی و زانستە کۆمەڵایەتییەکانی دیکە کامانەن، سەرکەوتنێکی ئەوتۆی دەستگیرنابێت. ئەوە دەزانین کە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، «کۆمەڵایەتین» نەک بەتەنیا کۆمەڵناسانە، ئابووریانە، یاخود سیاسییانەبن بەم پێیەش هێڵی سنووری نێوان زانستە کۆمەڵایەتییەکان دۆخێکی نەگۆڕو وردیان نییە و هیچکامێکیشیان بەباشی پێناسەنەکراون. وێرای ئەمەش، هاوکاری لە نێوان زانایانی کۆمەڵایەتیدا لەم چەند دەیەی دواییدا بەردەوام لە برەودا بووە [١٢/١١].

پێرستگەلێکی جیاوازی ئەو لقە زانستییانەمان لەبەر دەستدان کە دەکرێت لە ریزی زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا دایانبنێین. لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەی کات زانستی سیاسەت، ئابووری، کۆمەڵناسی، دەروونناسیی کۆمەڵایەتی، دیمۆگرافی و ئەنترۆپۆلۆژیای کۆمەڵایەتی وەک زانستی کۆمەڵایەتی ناویان نراوە، ئەمەش لە کاتێکدا کە زەمینەی هاوبەشی هەموو ئەو بوارانە ژیانی کۆمەڵایەتیی مرۆڤە. لە کۆتاییدا، کۆمەڵناسی هاوواتای زانستە کۆمەڵایەتییەکان نییە، بەڵکو یەکێکە لە زانستە کۆمەڵایەتییەکان و تەنانەت گەنجترین ئەندامی ئەو خێزانەیە. ئەم زانستانە لە رەهەندگەلێکی جیاوازەوە لە مرۆڤ دەکۆڵنەوە.

زانستە جۆراوجۆرە کۆمەڵایەتییەکان لە پەیوەندییان بە زانستی کۆمەڵناسییەوە خاوەنی چەند خاڵێکی هاوبەش و جیاوازن. ئەوەی لە نێوان کۆمەڵناسی و دەروونناسیدا هاوبەشە، ئەوەیە کە هەریەکێ لەم دوولقە زانستییە لە رەفتارە مرۆییەکان رادەمێنن، وەلێ جیاوازی بنەڕەتییان لەوەدایە کە دەروونناسی زیاتر گرنگی بە «تاک» (وەک یەکەی سەرەکی لێکۆڵینەوە) دەدات.

بەنێویەکداچوونی بابەتییانەی« ئەنترۆپۆلۆژیای کۆمەڵایەتی» (Social Anthro-pology) لەگەڵ کۆمەڵناسیدا زیاترە. بەبڕوای «مارسیل مووس» (١٨٧٣-١٩٥٠، Marcel Mauss)ی مرۆڤناس و کۆمەڵناسی فەرەنسی، دەتوانین بەهۆی

هەمان میتۆدەوە لە بونیادی ئاڵوگۆڕکردن لە کۆمەڵگای سەرەتاییدا بکۆڵینەوە، کە دەکرێ بۆ لێکۆڵینەوە لە ژیانی ئابووری مرۆڤ لە کۆمەڵگا پێشکەوتووەکاندا بەکاری بهێنین. لەگەڵ ئەمەشدا مرۆڤناسە کۆمەڵایەتییەکان حەزیان لە تۆژینەوەی کۆمەڵگایە بەپێوەرە بچووکەکان (Macro)، و زۆربەی جاریش خۆیان لە لێکۆڵینەوەی فراوان (Macro)، بەو جۆرەی کە کۆمەڵناسەکان پێی هەڵدەستن، نادەن. مرۆڤناسانی کۆمەڵایەتی پێیان باشترە زانیارییەکانی خۆیان لە ئەنجامی ژیان لەناو کۆمەڵگا، وتوویژ لەگەڵ خەڵک و پەیوەندی بە ژیانی رۆژانەیانەوە بەدەست بهێنن، میتۆدی ئەوانیش بریتییە لە تۆژینەوە لە رێگای بەشداریکردنیان لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا. هەڵبەت ئەم میتۆدە وەک پێشان تایبەت نییە بەکۆمەڵگایەکی سەرەتایی و ئیمرۆکە مرۆڤناسانی کۆمەڵایەتی دەتوانن ئەم تۆژینەوەیە لە قوتابخانە، کارگە یاخود لەیەکێک لە مەراسیمە ئایینییەکانیشدا ئەنجام بدەن، [٤/١٨].

هاوبەشیی روانگەی کۆمەڵناسی و ئابووری لەوەدایە، کە هەردوو ئەم لقە زانستییە سەرنج نادەنە تاکەکەسەکان وەک یەکەی جیاجیا، بەڵکو پەیوەندیی دوولایەنەی تاکەکان و ئەو دامەزراوانەش کە تیایاندا چالاکن لەبەر چاودەگرن. خاڵی تێڕوانینی تایبەتی زانستی ئابووری ئەوەیە بزانێت مرۆڤەکان چۆن لە پێناوی بەدەستهێنانی زۆرترین رێژەی نرخ لە سنووردارترین سەرچاوەکان، کاردەکەن. رەفتارە ئابوورییەکان دوو خەسڵەتیان هەیە کە پێیان دەگوترێ: خەسڵەتی «ماتریالیزم» (Materialism) و خەسڵەتی «عەقڵخوازی» (Rationalism).

هەموو لقەکانی زانستە کۆمەڵایەتییەکان لە هەوڵی ناسینێکی زیاتری مرۆڤ و کۆمەڵگادان، هەرچەندەش روانگەکان جیاواز بن زەمینەی زانستە جۆراوجۆرە کۆمەڵایەتییەکان پێکەوە بەستراون و تۆژەرانی هەر لقێک سوود لە دۆزراوەکانی لقەکانی دیکە وەردەگرن. ئەگەرچی کۆمەڵناسی وەک بەشێکی پسپۆری سەر بەزانستە کۆمەڵایەتییەکان گەشەی کردووە و خاوەنی ژمارەیەک تیۆرو شێوازی لێکۆڵینەوەیە، بەڵام ناکرێت بەتەواوی ئەم لقە زانستییە لە زانستە کۆمەڵایەتییەکانی دی جیابکرێتەوە، ئەوە جگە لەوەی بەشێوەیەکی گشتی زەمینەکانی ئەم لقە زاستییە ناکرێت لەبیرکردنەوەی گشتی (عامە) لە بارەی کۆمەڵگاوە بەشێوەیەکی گشتی هەڵاوێردرێن[١٥/١٩].

### تۆژینەوە لە کۆمەڵناسیدا

کۆمەڵناسی پشتی نەبەستووە بەتێگەیشتنە گشتییەکان و بیرکردنەوە لەمەڕ ئەزموونی کارو پەیوەندیی بەئەوانی ترەوە، بەڵکو پشتی بەستووە بەبینراوی بابەتی و ئەزمموونکراو کە بەرهەمی کاروبارو واقیعە ڕێکخراوەکانەو قابیلی تۆژینەوەی زانستییە. هیچ کەسێک تەنیا لەبەر پەیوەندیی بەئەوانی ترەوە، هەرچەندە قووڵ و فراوان و شایانیش بێت - نابێتە کۆمەڵناس، هەروەک چۆن هیچ ژنێکیش لەبەرئەوەی چەند منداڵێک دەهێنێتە دنیاوە نابێتە پسپۆڕ لە نەخۆشییەکانی ئافرەتان و منداڵبووندا. کۆمەڵناسەکان بڕوایان بەجۆرێک لە «هۆیەتی» (Causallty) هەیە، هەرچەندە کە هەمموویان ئەم چەمکە بەیەک شێوە پێناسە ناکەن. هەندێک بەپشت بەستن بەیەکێک لە تایبەتمەندییەکانی زانست، بڕوایان بەبوونی فەرهەنگێکی زانستی یاخود بەکۆمەڵێک زاراوەی قەبووڵکراو و بەکارهێنراو لەلایەن ئەندامانی کۆمەڵەیەکی زانستییەوە هەیە. ئەم دەستەیە کۆمەڵناسی بەوە دەزانن کە کۆمەڵێک زاراوەی جیهانی پەسەندکراو دەگرێتەوە. دەستەیەکی دیکە زۆر بایەخ بەتیۆرو زاراوەکان نادەن بەڵکو زیاتر پشت بەپێویستیی (ضرورة) ئەزموون دەبەستن. بەبڕوای ئەم دەستەیە، کۆمەڵناس لە جیاتی ئەوەی خۆی سەرقاڵ بکات بەهەموو هۆکارە کۆمەڵایەتییەکانەوە و خەریک بێت بەگفتوگۆی سەرنجڕاکێش لە بارەی چەمک و تیۆرەکانەوە، دەبێت بەوردبینی تەواوەوە بکەوێتە «بینین» (مشاهدة) و «هەڵسەنگاندن» (واتە لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتی بەپشتیوانی ئامرازە جۆربەجۆرەکانی وەک ڕاپرسی و سوود وەرگرتن لە میتۆدە ئامارییەکان ئەنجام بدات. لە ماوەی دوو دەیەی ڕابردوودا زۆربەی کۆمەڵناسەکان، بەئاراستەی پەیوەندی دروستکردن لە نێوان ڕەهەندە تیۆری و ئەزموونکارییەکاندا کاریان کردووە لەم ڕووەوە لێکۆڵینەوە بابەتی و ئەزموونکارییەکان، کە لەسەرو بەندی گەشەکردنداین، لە شیکردنەوەو لێکدانەوەی ڕوانگە تیۆرییەکان و ناسینی وردی دیاردە کۆمەڵایەتییەکاندا بایەخیان پێ دەدرێت [٩/٢٢].

### قۆناغ و میتۆدەکانی لێکۆڵینەوە

ئەنجامدانی تۆژینەوە لە بواری کۆمەڵناسی و زەمینە بابەتییە هاوشێوەکانی، بەزۆری لە ماوەی دوو بڕی زەمانیدا بەئەنجام دەگات کە ئامادەکردنی پلانی

تۆژینەوەکە [ ١٦/٢١ ]و جێبەجێکردنی دەگرێتەوە. دوای ئەوەی پلانی سەرەتایی تۆژینەوەکەو بەرنامەی جێبەجێکردنی عەمەلی ئەو پلانە دەستنیشان کرا (بەو جۆرەی لە هێلکارییەکەدا پیشاندراوە) ئەوە قۆناغی جێبەجێکردنەکەی دەست پێدەکا، و تۆژەریش لە ڕێگەی کۆکردنەوەی زانیاری و شیتەلکاری و راڤەکردنیانەوە هەوڵ دەدات وەلامێک بۆ ئەو پرسیارانە بخاتەڕوو کە پەیوەندییان بەتۆژینەوەکەیەوە هەیە. دەکرێ پێکهاتەیەک لەم دوو هەنگاونانە، کە لە کۆتاییدا هەمان قۆناغەکانی میتۆدی زانستییە، بەم جۆرەی خوارەوە کورتبکەینەوە:

١- خستنەڕوو و بەیانکردنی بابەت یان پرسیاری مەبەست: بابەتی تۆژینەوەکە چییە؟

٢- لێکۆڵینەوەو هەڵسەنگاندنی زانیارییە هەییەکان: پێویستە بەهەموو سەرچاوەو زانیارییە هەییەکان لە بارەی بابەتی تۆژینەوەکەدا، بچینەوە: چی لە بارەی بابەتەکەوە دەزانین؟

٣- نووسینەوەی ئامانجەکان، پرسیارەکان و گریمانەکانی لێکۆڵینەوەکە: چ پرسیارو گریمانەیەک بۆ ئێمە گرنگە؟ ئامانج بەدەستهێنانی یان گەیشتن بەچ شتێکە؟

پێویستە لەم قۆناغەدا تۆژەر گۆڕاوەکانی بابەتی لێکۆڵینەوە (سەربەخۆ، گرێدراو، یان بەدەربڕینێکی دی: هۆو ئەنجام) لە یەکدی جیابکاتەوە، و شوێنگەیان بەنیسبەت ئامانجی لێکۆڵینەوەکەی دەستنیشان بکات. دەتوانین ئەو پەیوەندییە کە لەنێوان دوو گۆڕاوی سەرەکی لێکۆڵینەوە لە خوێندنەوە کۆمەڵناسییەکاندا ئامادەیە (لە چوارچێوەیەکی سادەدا) بەم جۆرە رەسم بکەین[ ٢٠/٣٧ ].

| گۆڕاوی سەربەخۆ (X) | گۆڕاوی گرێدراو (Y) |
|---|---|
| پلەی هاوبەندیی تاک بەکۆمەڵگاوە | ئەگەری پەیدابوونی خۆکوشتن |
| ساڵەکانی کارکردنی کارمەند | بڕی پارەی خانەنشینی |
| بەشداربوونی دایک و باوکان لە چالاکییەکاندا | چالاکییە سیاسییەکانی رۆڵەکان |
| ئاستی خوێندەواریی دایک و باوکان | ژمارەی ئەو کتێبانەی لە ماڵەوە هەن |

٤- دەستنیشانکردنی میتۆدی تۆژینەوە: چ زانیارییەک بۆ وەلامدانەوەی پرسیارەکان و ئامانج و گریمانەکان لە بەرچاو گیراوە و بەکامە میتۆد (رابردووخوازانە، ئایندەخوازانە، ئەزموونکاری، هاوشێوەسازی، مۆنۆگرافی،

ماوەیی، هەڵسەنگاندنی گرووپی، بەراوردکردنی مێژوویی و هتد... ) پێویستە لێکۆڵینەوەکە بەئەنجام بگات؟

٥- دەستنیشانکردنی کۆمەڵگای لێتۆژراو: کام گرووپێک پێویستە بەکامە رێژە لێی بکۆڵدرێتەوە (سەرژمێریکردن، نموونە وەرگرتن) ؟

٦- دەستنیشانکردنی میتۆدی کۆکردنەوەی زانیاری: دەمانەوێت سوود لە چ هونەرێکی کۆکردنەوەی زانیارییەکان وەربگرین (چاوپێکەوتن، پرسیارنامە) ؟

٧- کۆکردنەوەی زانیارییەکان و جێبەجێکردنی تۆژینەوەکە: پێویستە زانیارییە پێویستەکان بەهۆی وەگەڕخستنی هۆکارو ئامرازی پێویست (وەک پرسیارنامە)وە کۆبکەینەوە.

٨- بەتاڵکردن (تفریغ)، خشتە بەندی و حساباتی ئاماری: پێویستە لەم قۆناغەدا زانیارییە سەرەتاییەکان لە هۆیەکانی کۆکردنەوەی زانیارییەوە بگوازرێتەوە سەر خشتەکان و ئاماریی پێویستیش ئەنجام بدرێت.

٩- جیاکردنەوەو شیکارکاری و شرۆڤەی ئەنجامەکان: لەم قۆناغەدا لێکۆڵەرەوە ئەنجامگیری لەو بەدەستهاتووانەوە دەکات کە لەئامار پێیان گەیشتووەو وەڵامی پێویستی گریمانەو پرسیارە وەڕووخراوەکان دەداتەوە.

**کۆکردنەوەی زانیاریی تۆژینەوەیی**

لەگەڵێک رووەوە کۆکردنەوەی زانیاری گرنگییەکی زۆری هەیە و هونەری کۆکردنەوەی زانیاری ئەو توانایە دەداتە تۆژەر کە لە بارەی بابەتەکانی لێکۆڵینەوەی خۆیەوە (تاکەکان، شتەکان، دیاردەکان) و هەروەها کاروبارو هەلومەرجی پەیوەست بەم لایەنانەوە بکەوێتە کۆکردنەوەی زانیاری و پاشانیش لە تۆژینەوەکەیدا سوودیان لێ وەردەگرێت. لە کۆکردنەوەی زانیارییەکاندا پێویستە بەشێوەیەکی هەڵسەنگێنراو و سیستماتیک کاربکەین و لە کاتێکیشدا دەست بدەینە ئەم کارە، کە وێڕای دەستنیشانکردنی وردبینانەی ئامانجەکان و کۆمەڵگای سەرژمێرکراو، پێناسەکان، چەمکەکان و هەروەها گۆڕاوە لەبەرچاوگیراوەکان و جۆری پێوانەکردنیان بەوردی دەستنیشان کردبێت. گرنگترین هونەرەکانی کۆکردنەوەی زانیاری لە بواری کۆمەڵناسیدا بریتین لە:

**١- بینین:** بینین (Observation) تەکنیکێکە پەیوەندی بە هەڵبژاردن، چاودێری کردن، کۆنترۆڵی وردو باسکردنی جەوهەر، رەفتارو تایبەتمەندیی

ڕووداوەکان، شتەکان، یاخود دیاردە کۆمەڵایەتییەکانەوە هەیە. لێرەدا چاو گرنگترین هۆکاری تۆژینەوەیە، لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانین بەمەبەستی تەواوکردنی کردەی بینین سوود لە هەندێ هۆکارو تەکنیکی دیکەش وەربگرین (وەک وێنەی فۆتۆگرافی، فیلم، هێڵکاری و...) بینین ڕەفتاری مرۆیی کە باوترین تەکنیکەکانی کۆکردنەوەی زانیارییە بەزۆری بە دوو شێوە ئەنجام دەدرێت:

أ- بینینی هاوشان بەبەشداربوون، کە تیایدا بینەر لە هەمان کاتدا کە تەماشای کاروبارێک یان بۆنەیەک دەکات بەشداریشە تیایدا.

ب- بینینی بێ بەشداربوون، کە تیایدا بینەر بەشێوەیەکی ئاشکراو دیار یاخود شاراوەو نادیار تەنیا هەڵدەستێت بەچاودێریکردنی بارودۆخ و هیچ جۆرە بەشداربوونێک ڕوونادات.

دەکرێ بینین بۆ ئامانجی جیاواز بەکاربهێنرێت، هەندێ جاریش زانیارییەکی وردترمان لەو زانیارییە دەداتێ کە لەڕێی چاوپێکەوتن و پرسیارنامەوە لەسەر ڕەفتاری تاکەکان دەستمان دەکەوێت. ڕێی تێدەچێت پرسیارنامە بە هۆی نەبوونی پرسیار یاخود غەفڵەتی تاکەکان لە وتنی هەندێک بابەت، یاخود هەر نایانەوێت هەندێ بابەت بورووژێنن کەموکووڕیی تێبکەوێت. هەروەها بینین دەتوانێت زانیارییە کۆکراوەکان بخاتە ژێر کۆنتڕۆڵی خۆیەوە (بەتایبەتی لە بارە ناسک و هەستیارەکاندا). لە هەندێ بواریشدا بینین بنچینەییترین سەرچاوەی زانیارییە، بۆ نموونە کاتێ بمانەوێت تۆژینەوە لەسەر یاریی منداڵان بەشێوەیەکی سیستماتیک بکەین.

**٢- چاوپێکەوتن:** چاوپێکەوتن (Interview) تەکنیکی پەیوەندیی کەسی، ئامادەبوون، یاخود پەیوەندیی تەلەفۆنییە لەنێوان تۆژەر یاخود پرسیارکەردا لەگەڵ ئەندامانی ئەو کۆمەڵگایەی کە تۆژینەوەی لەسەر دەکرێ بەمەبەستی وەدەستهێنانی زانیاری پێویست لەبەرنامەی کاری تۆژینەوەکەدا. لە چاوپێکەوتندا، ئەو پرسیارانەی کە زۆربەیان پێشتر دەستنیشان کراون لە لایەن گفتوگۆکەرەوە دەخرێنەڕوو و وڵامەکانیش بەو جۆرەی کە پێشتر بڕیاریان لەسەر دراوە تۆماردەکرێن. بەمانایەکی تر لە چاوپێکەوتندا کاری گۆڕینەوەی زانیاری لە نێوان گفتوگۆکەرو گفتوگۆ لەگەڵ کراودا بەئەنجام دەگات. پێویستە لە چاوپێکەوتندا بنەماگەلێک ڕەچاو بکرێن تاکو متمانەی زانستی بە چاوپێکەوتنەکە بکرێ کە گرنگترینیان بریتین لەمانە:

## قۆناغەکانی ئامادەکردنی پرۆژە تۆژینەوە [ ٢١/١٦]

بوونی یەکێتی تێڕوانین لە هەموو چاوپێکەوتنەکاندا، پێویستی ئاشنابوونی ئەو کەسەی کە چاوپێکەوتن دەکات لەگەڵ ئەو گرووپەی کە لێی دەتوژێتەوە (لە ڕووی دابونەریت، زمان، ڕەوشی کۆمەڵایەتی و..)، ئەنجامدانی چاوپێکەوتنەکە لە کات و شوێنێکی گونجاودا، خستنەڕووی پرسیاری ڕاشکاوو ڕۆشن، لە کۆتاییشدا ڕەچاوکردنی بێلایەنی و خۆبەدوورگرتن لە بڕیاری پێشینە لەلایەن چاوپێکەوتنکەرەوە. ئەگەر هاتوو چاوپێکەوتنەکە لەلایەن کەسانێکی ترەوە جگە لە توژەرەوە خۆی ئەنجامدرا، پێویستە ئەو دەستەیە خولی فێرکاری پێویستیان لە سەر بابەتی لێکۆڵینەوەکە ببینێت[٢٣/٢٨].

**٣- پرسیارنامە:** پرسیارنامە (Questionnaire) لە کۆمەڵە پرسیارێک پێک دێت کە لەسەر بنچینەی ئامانجەکانی لێکۆڵینەوە و بەپێی ڕەچاوکردنی پێوەرو بنەمای دیاریکراو دادەڕێژرێت، و ئامانج لە پرسیارنامە وەرگرتنی زانیارییە لە بارەی بابەتی توژینەوەوە لە کەسێک، ڕووداوێک یاخود دیاردەیەکی لە بەرچاوگیراو. بۆ نموونە، ئەگەر توژەرێک بیەوێت سەبارەت بەکاتی بێکاری قوتابییان توژینەوەیەک بکات، بەرەچاوکردنی ئامانجەکان و گۆڕاوە چاوەڕوان کراوەکانی خۆی و هەروەها گرووپی توژینەوەکە، پرسیارنامەیەک ئامادە دەکات و بەپێی هەلومەرج و دیسپلینی تایبەتی دەیخاتە بەردەمی قوتابییەکان بۆ ئەوەی تەواوی بکەن. دوای تەواوکردنی پرسیارنامەکە زانیارییەکانی ناوی لە چەند خشتەیەکی تایبەتیدا دەردەهێنێ و پاشانیش شیکردنەوەیەکی ئامارییانەیان بۆ دەکات.

بەزۆری ئەو پرسیارانەی لە پرسیارنامەکەدا هاتوون زانیاریی گشتی لەبارەی ناسنامەی وەڵامدەرەوە (وەک تەمەن، ڕەگەز، پلەی خوێندن، کارو...) و زەمینەی بابەتی لێکۆڵینەوەکە (گۆڕاوە تاقی کراوەکان کە بەپێی بابەتی توژینەوەکە جیاوازن) دەگرێتەوە.

دەکرێ ئەم پرسیارانە بەدوو شێوەی داخراو و کراوە بخرێنەڕوو. لە پرسیارەکراوەکاندا وەڵامدەرەوە ئازادە لە بەرامبەر هەندێ پرسیاری دیاریکراودا هەرچەندی بیەوێ وەڵام بداتەوە (نموونە: بەڕای ئێوە پێویستە حکومەت بۆ بەسەربردنی کاتی دەست بەتاڵی لاوەکان چ هەنگاوێک بنێت؟) لە بەرانبەر ئەمەشدا لە پرسیارە داخراوەکاندا، وەڵامدەرەوە لەنێو وەڵامگەلێکی جۆراوجۆردا کە پێشتر بۆ هەر پرسیارێک دەستنیشانکراون، یەکێک یان چەند وەڵامێکی شوێن

مەبەستی خۆی هەڵدەبژێرێت و نیشانە دەکات (نموونە: دەشێ لە بەرانبەر پرسیارەکەی پێشوودا بنووسێ هێنانەکایەی سینەما، شانۆ، هۆڵی وەرزشی، پەرتووکخانە و شتی لەم جۆرە). هەڵبەت لە هەندێ باری پێویستدا دەتوانین تێکەڵێک لە پرسیارە داخراوو کراوەکان و لە تەک یەکدا ریز بکەین.

بۆ دارشتنی پرسیارنامەیەکی متمانەپێکراو پێویستە بنەماو خاڵگەلێکی زۆر رەچاو بکرێن کە گرنگترینیان بریتین لە: لەبەر چاوگرتنی ئامانجی تۆژینەوەکە، راشکاویی پرسیارەکان، کەمکردنەوەی ژمارەی پرسیارەکان، هەروەها بایەخدان بەپاڵنەرە هاندەرەکان، تایبەتمەندییەکان و هەلومەرجی وەڵامدەرەوەکان.

دەتوانرێ پرسیارنامە بەشێوەی جۆراوجۆر تەواو بکرێت کە بریتین لە: تەواوکردنی پرسیارنامە لەرێی چاوپێکەوتنی زیندوو، ناردن لەرێی پۆست، تەواوکردنی پرسیارنامە بەهۆی وەڵامدەرەوە و کۆکردنەوەیان، و لەرێی گفتوگۆی تەلەفۆنییەوە. هەڵبژاردنی یەکێک لەم شێوازانە پێویستە بە لەبەرچاوگرتنی گوژمەی تۆژینەوەکە، هەلومەرجی گرووپی لێتوێژراوە، کات و ئیمکانیەتەکان، ئەنجامەکانی تۆژینەوەو هۆکارەکانی دیکە ئەنجام بدرێ. کاتێک پرسیارنامە زانیاریی متمانەپێکراومان پێ دەبەخشێت کە هەم باش رێکخرابێت و هەمیش باش پرکرابێتەوە، ئەمەش کارێکە پێویستی بەشارەزایی تەواو و ئەزموونی زۆرەوە هەیە[ ٢٤ / ٢٠ ].

## کۆمەڵناسی و ئەزموون

لە زانستەکانی وەک فیزیاو کیمیادا و بەشێوەیەکی گشتیش لە زۆربەی زانستە سروشتییەکاندا، تاقیکردنەوەی گریمانەکان لە رێگەی ئەزموونەوە جێبەجێ دەبێت، بەڵام لە کۆمەڵناسیدا ئەم کارە هەمیشە مومکین نییە. خاڵی گرنگ ئەوەیە کە ئەزموونکەر بتوانێت هەموو گۆڕاوەکان، جگە لەو گۆڕاوەی کە لەژێر لێکۆڵینەوەدایە، بخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە. بۆ نموونە رووەکناسێک بەلای کەمەوە دەتوانێت لە شوێنی تاقیکردنەوەکەیدا ئاو، گەرمی، تیشک، جۆری خاک و هۆکارە کارتێکەرەکانی دیکە لەسەر رووەکێکی دیاریکراو بخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە و لە کۆتایی تاقیکردنەوەکەیدا گۆڕانە بەدەستهاتووەکانی رووەکەکە پەیوەست بکات بە گۆڕاوی تاقیکردنەوەکەوە.

| باشییەکان | | عەیبەکان |
|---|---|---|
| | **چاوپێکەوتن** | |
| ئاسانی پرسیارو وەڵام | | - کاریگەریی ئامادەبوونی چاوپێکەوتنکەر لەسەر وەڵامەکان |
| | | - خەرجیی و کاتی زۆری دەوێ |
| - توانای روونکردنەوەیی پرسیارەکان | | - سەختیی دەرهێنانی زانیارییەکان |
| | **پرسیارنامە** | - تێنەگەیشتن لە هەندێ پرسیار |
| - خەرجی کەمتر | | وردنەبوون و راشکاونەبوونی وەڵامەکان |
| - ئازادی وەڵامدەرەوە لەنووسیندا | | |
| - ئاسانی دەرهێنانی زانیارییەکان | | |
| - ئەگەری زۆربوونی ژمارەی نموونەکان | | |
| | **بینین** | |
| - بەدەستهێنانی زانیاری وردوجۆراوجۆر | | - مەترسی گشتاندنی ئەو ئەنجامانەی بەرهەمی بینینی مەسەلە تایبەتییەکانن. |
| - ئەگەری بینینی واقعیە هەییەکان | | - وەسفیبوونی زانیارییەکان و سەختیی هەڵسەنگاندن |
| - نزیکبوونەوەی زیاتری لێکۆڵەرەوە لە کۆمەڵگا | | - سەختیی بەرقرارکردنی پەیوەندی لەنێوان هۆوهۆکار |

بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە رووەکناس پێویستی بەرووەکێکی «تاقیکردنەوە» و رووەکێکی دیکە وەک «شایەت» هەیە. لە کۆمەڵناسیدا زۆر بارودۆخ هەیە کە ناتوانین لە دۆخێکی تایبەتدا هەموو گۆڕاوەکان بەتەواوی لێکدی جودا بکەینەوە. وێڕای ئەوەش ژمارەی ئەو گۆڕاوانە بەگشتی زۆرن. لەلایەکی تریشەوە مومکین نییە مرۆڤەکان وەک رووەکەکان بەسەر دوو دەستەی تاقیکردنەوە و شایەتدا، دابەش بکەین و دەست بکەین بەهەرجۆرە تاقیکردنەوەیەک، هەرچەندە لەوانەیە بەشێک لە تاقیکردنەوەکان لەسەر مرۆڤەکان بکرێ ئەنجام بدرێت. بۆ زاڵبوون بەسەر ئەم گرفتانەدا کۆمەڵناسان سوود لە میتۆدەکانی ئامار و ماتماتیکی وەردەگرن[٦/١٨].

لێکۆڵینەوە ئەزموونگەرییەکان لە کۆمەڵناسیدا کە پشت بەمیتۆدەکانی ئامار و زانستەکانی ماتماتیک دەبەستن، لە بناغەوە پشت ئەستوورن بە دارشتنی گریمانە، جیاکردنەوەی گۆڕاوەکان لە یەکدی و سوود وەرگرتن لە گرووپەکانی ئەزموونی و

شـــايەت. كـــاتێك كـــە شـــيكردنەوەو لێكدانەوەكـــان و بينينە رێكخـــراو و ئاراستەكراوەكانی توێژەرە بەرەو ناسينێكی زانستانە، باس لە هەبوونی پەيوەنديی ياخود كۆمـەڵە پەيوەندييەك دەكەن لە نێـوان دوو يان ژمارەيەك گۆڕاودا، ئەوە لە پێناوی دەسـتنيـشـانكردنی زانسـتـانەی ئەم دادوەرييـانە پێـويسـتـە سـوود لە تاقيكردنەوە ئاماريیە گونجاوەكان وەربگيرێت[ ٨/ ١٤- ١٥ ].

**ئەبستيمۆلۆژيای كۆمەڵناسی**

وەكو هەر زانسـتێكی ديكە، كۆمـەڵناسيـش عەودالّی ئاراسـتەكردنی تـيـۆری و بنەماو داڕشـتنە و تيـۆر (Theory) تيـايدا بەگـەڕخەرێكی بنەڕەتييـە، چونكە تيـۆر پرەنسـيـپێكی شوێنپـەسەندی زانستی و لۆژيكـيـيـە كە هەڵدەستێ بە دروسـتكردنی پەيوەندی لە نێـوان واقـيـعـە ديارەكـاندا (ناسـراوەكـاندا). هەروەها بۆی هەيە تيـۆر هەڵگری چەندين ياسـای زانسـتی بێت، گـشـتـايەتيـيەكی زۆری هەبێت، ئاگـای لە هەندێ واقـيـعەی زانسـتی بێت و لەو نێـوانەدا خەياڵ و گريمانەش هەبێت. لە هەمـان كـاتيـشـدا نـاتوانرێت بەهەمـوو ئامرازە سـوود لێـوەرگيـراوەكـانی كـۆمـەڵناسی بگـوترێ تيـۆر. كـۆمـەڵناسی هەمـان كـات لە هەوڵـی پێناسـەكـردنی ژمـارەيەك چەمك (Concept)دايە كە لە راسـتيـدا چەمكگەلێكی ئەبسـتراكت (رووت)ن لە بابەت و دۆخی تايبەت و بەگشـتيـش لە بواری فراواندا بەكار دەبرێن. بۆ نموونە چەمكەكـانی وەك رۆڵ، كولتوور و چينی كۆمەلايەتی، لەو بابەتەن.

بەچاوپۆشين لەوەی لە توێژينەوەيەكی كـۆمـەڵناسـيـدا سـوود لە چ تەكنيـكێك وەردەگـرين، مـيـتـۆدی زانسـتی وابەسـتـەی روانگـەو رەفـتـارە جـۆراوجـۆرەكـانە. لە يەكەمين پێويستييەكانی هەنگاو هەڵهێنان لە رێگای زانستدا، بابەتيبوون، ورديی و تاقـيـكردنەوەيە. لە هەندێ باردا ئەركی كـۆمـەڵناسـێك لە هی فـيـزياناسـێك گرانترە، ئەمەش لەبەر ئەوەی لەلايەكەوە كۆنتـرۆڵی هۆكارە سۆزاوييەكان و حوكمە پێشـينييەكان و دزە نەكردنی ئەمانە لە ئەنجامگيرييە زانستييەكانی كۆمەڵناسيدا هەروا مـومـكين نيـيـە. لەلايەكی ديكەيشـەوە بەوجـۆرەی ئامـاژەمـان پێكرد گـۆڕاوە كـۆمەلايەتيـيـەكان هەمەچەشن، فرەو ئاڵۆزن و جيـاكردنەوەيان بەتەواوی لە يەكتر - ئەگـەر لە هەندێ باردا مـەحـاڵ نەبێت- بەلايكـەمـەوە دووچاری زەحـمـەت دەبێـتـەوە. بەرەچاوكـردنی ئـەوەی پرۆسـەی كـاری كۆمەڵناس لە نـاسـينی زانسـتـيـيـانەدا بەزۆری بريتييە لە تۆماركردنی گريمانە.

کۆمەڵناسان چۆن کاردەکەن [١٣/٨]

| لەڕووی تێڕوانینەوە | لەڕووی میتۆدەوە |
| --- | --- |
| بابەتیگەرایی (ئۆبژەکتیڤیزم | بینینی بابەتی |
| کاری ڕێکوپێک (سیستماتیک) | متمانەی وەدەستهاتووەکان بەسوود وەرگرتن |
| کارکردن بەهزری کراوەوە | لە ڕاستی سەرژمێریکردن |
| وەلانانی حوکمە پێشینەکان | دەست کردن بە ئەزموون |
| | سوودوەرگرتن لە تیۆرەکان |
| | مودیلەکانی ڕاڤەکردن |

کۆکردنەوەو خانەبەندیکردن و تۆمارکردنی زانیارییەکان، تاقیکردنەوەو پاشانیش ئەنجامگیریی زانستییانە. نابێت حوکمدانی بەهایی لەکاری ئەودا جێی ببێتەوە. هزرە مەبەستدارەکان و پشت بەستوو بەجیهانبینییە بەهاخوازەکان لە بنەڕەتدا ئەرکی فەیلەسووفی کۆمەڵایەتین، هەرچەندە کە لەوانەیە لە هەندێ باردا کۆمەڵناسەکانیش بەهۆی جیاوازەوە (وەک مەیلی تایبەت بۆ ئایدیۆلۆژییەک) ڕووبەڕووی خزان ببنەوەو ببنە فەیلەسووفی کۆمەڵایەتی [٨/١٨].

**کورتەی بەش**

١- کۆمەڵناسی مرۆڤەکان بەشێوەیەکی تایبەت بەهۆشیاریی کۆمەڵایەتیی پشت بەستوو بەزانست، تەییار دەکا.

٢- لە تێگەیشتنی ئێستادا، کۆمەڵناسی خاوەنی زەمینەیەکی زۆر فراوانەو ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ پەیوەندیدارە بە زۆر کاروبارو مەسەلەی جۆربەجۆری کۆمەڵایەتییەوە.

٣- لەگەڵ ئەوەشدا کە کۆمەڵناسی زانستێکی نوێیە، بەڵام بابەتی کۆمەڵناسی لە زۆر کۆنەوە سەرنجی فەیلەسووفەکان، پیاوانی ئایینی و مێژوونووسەکانی بەلای خۆیدا ڕاکێشاوە.

٤- کۆمەڵناسی وەک لقێکی زانستی هەڵدەستێ بەشیکردنەوەو لێکدانەوەی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان و لێکۆڵینەوە لەسەر دەرکەوتەکانی وەک: کۆمەڵە مرۆییەکان،

دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان، بەها کۆمەڵایەتییەکان، رۆڵە کۆمەڵایەتییەکان، پەیوەندییە رووبەڕووە کۆمەڵایەتییەکان، نموونەکانی جێگیریی و گۆڕانی کۆمەڵایەتی، دەکات.

٥- مەعریفەی زانستانە بەهۆی ئەو تایبەتمەندییانەی کە پشتیان بەمیتۆدی زانستی بەستووە لە مەعریفەی عامی جیاوازە.

٦- لەڕووی میتۆدەوە گرنگترین تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵناسی بریتین لە حەزکردن لەزانست نەک هەنگاونان، رێکخستن و تیۆروانینی زانستی، پسپۆڕبوون و پشت بەستن بەهەموو دۆزراوەکانی زانستە کۆمەڵایەتییەکان.

٧- پێویستە لە تۆژینەوەی رەفتارە مرۆییەکاندا هۆکارە تاکەکەسی و کۆمەڵایەتییەکان لە پەیوەندییان بەیەکەوە لێیان بکۆڵدرێتەوە.

٨- کۆمەڵناسی بەسەرنجدانی تایبەتیی لە هۆکارە کۆمەڵایەتییەکان، لە هەوڵی پەیوەندی دروستکردندایە لە نێوان دیاردە کۆمەڵایەتییەکاندا و بەدەربڕینێکی وردتر لە هەوڵی وەدەستهێنانی یاسا کۆمەڵایەتییەکاندایە.

٩- ئامانجی کۆمەڵناسی وەک زانستێک ناسینی زانستانەیە و ئەوەی کە ببینێ «چی هەیە» و «چۆن هەیە» نەک ئەوەی «پێویستە چۆن چۆنی بێت».

١٠- ئەنجامگیریی لێکۆڵینەوە کۆمەڵناسییەکان لە زۆربەی بوارەکاندا پراکتیکییانەش بەکاردەبرێت.

١١- کۆمەڵناسی خاوەنی زەمینەیەکی پسپۆڕیی زۆر هەمەڕەنگەو هەر تۆژەرێکی لە لقێکی تایبەتدا تۆژینەوە ئەنجام دەدا.

١٢- دیاردە کۆمەڵایەتییەکان لایەنە جۆراوجۆرەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی دەخەنەڕوو.

١٣- دیاردە کۆمەڵایەتییەکان ئاکامی خەسڵەتە دەستەجەمعی، خێزانی، چینایەتی یان نەتەوەیین.

١٤- دورکهایم بڕوای وابوو لەکاتی تۆژینەوە لە دیاردە کۆمەڵایەتییەکان پێویستە بچینە رەوشێکی دەروونیی تایبەتەوە و وەک شت لێیان بکۆڵینەوە.

١٥- دیاردە کۆمەڵایەتییەکان هەڵگری خەسڵەتی دەرەکی بوون، حەتمی بوون و بەگشتی بوونن.

١٦- دەتوانرێت جۆرەکانی چالاکی پیشەیی لە بواری کۆمەڵناسیدا بکرێن بە سێ بەشەوە: بەکالۆریوس، ماستەر، دکتۆرا.

١٧- کۆمەڵناسی یەکێکە لە زانستە کۆمەڵایەتییەکان و گشت زانستە

کۆمەڵایەتییەکان لە تێگەیشتنێکی تایبەتیدا بریتین لە: ئابووری، زانستی سیاسەت، دەروونناسیی کۆمەڵایەتی، دیمۆگرافیا و ئەنترۆپۆلۆژیای کۆمەڵایەتی.

١٨- کۆمەڵناسی هەموو زانستە کۆمەڵایەتییەکان ناگرێتەوە، بەڵکو یەکێکە لە نوێترینیان.

١٩- لەگەڵ ئەوەشدا کە سنوورگەلێکی بنەبڕ لە نێوان زانستە هەمەجۆرە کۆمەڵایەتییەکاندا بوونیان نییە، وەلێ لە هەمان کاتدا جۆرێ لە دابەشبوونی کار لە نێوان زانایانی ئەو لقە زانستییانەدا بەرچاو دەکەوێت و لە هەر حاڵەتێکیشدا دەتوانرێت ئاماژە بەخاڵی جیاوازی و لێکچوون بکرێت.

٢٠- لەکایەی لێکۆڵینەوە دەروونناسییەکاندا پتر تاکەکەس لە بەرچاو دەگرێ.

٢١- ئەنترۆپۆلۆژیای کۆمەڵایەتی زیاتر خۆی بەلێکۆڵینەوە لە بابەت و کۆمەڵگا بچووکەکانی خەریک دەکات و لە بنچینەدا سوود لە میتۆدەکانی بینین و چاوپێکەوتن وەردەگرێ.

٢٢- دەتوانرێت رەفتارە ئابوورییەکان زیاتر لە رێگەی دوو تایبەتمەندییەوە لە رەفتارەکانی دیکە جودابکرێنەوە: مادیگەرایی و عەقڵانیەت.

٢٣- لە تۆژینەوە کۆمەڵایەتییەکاندا دوو ئاراستەی باوی تیۆری و ئەزموونگەری هەن.

٢٤- کۆمەڵناسی لە لێکۆڵینەوەدا سوود لە میتۆدی پشتبەستوو بەبینین و ئەزموون وەردەگرێت.

٢٥- تۆژینەوە کۆمەڵایەتییەکان لەسەر بنچینەی قۆناغەکانی میتۆدی زانستی بەپێی پرۆسەیەکی تایبەت جێبەجێ دەکرێن.

٢٦- پلانی تۆژینەوە لە خستنەڕوو و بەیانکردنی بابەتەکەوە دەستپێدەکات و بەشیکردنەوەو لێکدانەوەو شرۆڤەی ئەنجامەکان کۆتایی دێت.

٢٧- لە تۆژینەوە کۆمەڵایەتییەکاندا لێکۆڵەران کار بەگۆڕاو گەلی تایبەتی (سەربەخۆو گرێدراو) دەکەن و پێویستە بەوردی بیانناسین.

٢٨- باوترین هۆکارەکانی کۆکردنەوەی زانیاری لە کۆمەڵناسیدا بریتین لە: بینین، چاوپێکەوتن و پرسیارنامە.

٢٩- بینین لە رێگەی چاودێریکردنی وردو پشتبەستوو بەئامانج و لەسەر بناغەی میتۆدێکی تۆکمە دێتە ئەنجام.

٣٠- دەلوێ بینین بە دووشێوە بێتەدی: هاوشان بەبەشداریکردنی تەماشاکەر یان

بەبێ بەشداریکردن.

٣١- چاوپێکەوتن لەسەر بناغەی گۆڕینەوەی زانیارییەکان وەستاوە لە نێوان ئەو کەسەی چاوپێکەوتنەکە دەکات و ئەوەی چاوپێکەوتنی لەگەڵ دەکرێ.

٣٢- پێویستە چاوپێکەوتن لەسەر بناغەی چەند پرەنیسپێک ئەنجام بدرێ تاکو تایبەتمەندیی زانستییانەی خۆی هەبێت.

٣٣- ئامانج لە ئامادەکردن و پڕکردنەوەی پرسیارنامە بریتییە لە زانیاری وەرگرتن بەشێوەیەکی نووسراو لە بارەی بابەتی تۆژینەوەکەوە.

٣٤- پرسیارەکانی ناو پرسیارنامە دەشێ بەشێوەی کراوە، داخراو یان تێکەڵێک بن لە هەردووکیان.

٣٥- ئامادەکردن و کاملکردنی پرسیارنامە پێویستە لەسەر بناغەی چەند پرنسیپێکی سەرەکی بێتە ئەنجام.

٣٦- لەوێوە کە کۆنترۆڵکردنی هەموو گۆڕاوەکان لە کۆمەڵناسیدا زۆر زەحمەت و لە هەندێ باریشدا پراکتیکی نییە، ئەو ئەزموونەی بەو شێوە لە زانستە سروشتییەکاندا هەیە، لە کۆمەڵناسیدا مومکین نییە.

٣٧- لە پێناوی چەندایەتی بەخشین و وردبینانەکردنی میتۆدەکانی تۆژینەوەی کۆمەڵناسی، بەشێوەیەکی زیاتر لە جاران سوود لە ئامار و زانستی ماتماتیک وەردەگیرێت.

٣٨- پێویستە سەرەکییەکانی تۆژینەوە لە کۆمەڵناسیدا لەڕووی شێوەی بینینەوە بریتین لە بابەتیبوون، وردبینی و دووبارە تاقیکردنەوە.

٣٩- تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی کۆمەڵناسی لەڕووی میتۆدو بینینەوە بریتین لە: بابەتیبوون، ئیشکردنی پشت بەستوو بە بەمیتۆدێکی ڕێکوپێک، سوود وەرگرتن لە مۆدیلەکانی راڤەکردن و ئامار، هەستان بەئەنجامدانی جۆرێکی تایبەت لە ئەزموون و خۆ رزگارکردن لە حوکمدانی پشتبەستوو بەلایەنگیریی شەخسییەوە.

## سەرەتا

کۆمەڵناسیی نوێ وەک زانستێک کە لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەدا دامەزرا، کۆمەڵێک تایبەتمەندیی تیۆری، میتۆدۆلۆژی، و دامەزراوەیی خۆی هەیە کە پێگەی لقێکی زانستیی تایبەتی پێدەبەخشێت و لە یاسا، فەلسەفەی کۆمەڵایەتی، و چەند بەشێکی ئەدەبیاتی رەخنەیی - کۆمەڵایەتی جیای دەکاتەوە. هەڵبەتە وەدەستهێنانی پێگەیەکی ئاوەها بەرهەمی کۆمەڵێک کاری مێژوویییە کە بەشی هەرە زۆریان بەرهەمی هەوڵ و کۆششەکانی سەدەی نۆزدەو ساڵانی دواترە. سەرەڕای ئەوەی کە بیرمەندانی گەورەی فەلسەفە واتە کەسانی وەک هۆبز، لۆک، مۆنتسکیۆ و رۆسۆ، دەورێکی گرنگیان لە دەوڵەمەندکردنی بیروڕا سەرەتاییەکانی کۆمەڵناسی بینیوە، بەڵام بێگومان سەرچاوەی کۆمەڵناسیی نوێ زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ تایبەتمەندییەکانی شارستانییەتی نوێ، کە لەکۆتایی سەدەی هەژدەوە دەستپێدەکات [ ٧/٢٥ ].

پابەندیی مرۆڤ بەو کۆمەڵگایەی کە تیایدا دەژیت بۆتە هۆی ئەوەی کە هەردەم سەرنجی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان بدات. پێش ئەوەی کۆمەڵناسی پەیدابێت، مێژوونووسان سەرنجی مرۆڤیان بۆ لای کێشە کۆمەڵایەتییەکان رادەکێشا و موژدەی وەدەستهێنانی ژیانێکی باشتریان پێ دەدا، و لە کۆتاییشدا چەند شێوازێکی روانینیان لەمەڕ لێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتییەکان دەخستەڕوو.

سەرنجدانی مرۆڤ لە ژیانی کۆمەڵایەتی لەسەردەمە جیاجیاکاندا هەمیشە جێی باس بووە، بەڵام ئەم روانینانە بەزۆری لە روانگەیەکی فەلسەفی یان ئەخلاقییەوە بووینە. دەتوانین بڵێین لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا مرۆڤ لەڕێی بەکارهێنانی هونەرەکانی کاریگەریخستنە سەر ئەوانی تر خاوەنی جۆرە کۆمەڵناسییەکی کردەیی (هەرچەند نەنووسراو، بەڵام لە هەمان کاتدا کاریگەر) بووە. ئەم راستییە بەچاوخشاندنێکی گشتی بە بەکاربردنی جۆرەها پاداشت و سزاکان، وشە، نیشانە باوەکان بۆ دەربڕینی پلەوپایەی کۆمەڵایەتی، سرووتە کۆمەڵایەتییەکان، نموونە ئەخلاقییەکان، شێوازەکانی پەروەردەکردنی منداڵان، و گشت لایەنەکانی تری ژیانی کۆمەڵایەتی بەرچاو دەکەوێت. جگە لەمە، گشتاندنی رەفتارە مرۆییەکان لە پەندو ئەفسانەو تارەکاندا، لەگشت کۆمەڵگاکان هەمیشە لە ئارادابووەو هەیە[ ١/٣١ ].

لەبەرئەوەی لە رابردوویەکی دوورەوە تا ئێستا، جۆرە کۆمەڵناسییەکی عامیانەمان هەبووە، دەتوانین بەو ئەنجامە بگەین کە لە کولتوورەکانی پێش مێژووش شتێکی هاوشێوەی کۆمەڵناسی هەبووە، و بەو ئیعتیبارە ئەو خەڵکانەی ئێستا لە ژیان دان، بەناچاری پەیوەندییەکی کولتووریی دانەبڕاویان لەگەڵ چەمکەکانی کۆمەڵناسیی عامیدا هەیە، کە نەوەکانی ئێستا بەکولتوورەکانی ناو مێژووەوە دەبەستێتەوە. هونەری ژیان لەگەڵ یەکتری ڕێکخستنی هەڵسوکەوتە رووبەڕووەکان هەمیشە وەکو وەدەستهێنانی خۆراک، پەناگە و خۆ بەدوورگرتن لە کارەساتە سروشتییەکان پێویست بووە، و ئەو کۆمەڵگایانەی کە لەڕووی بەرپاکردنی هاوسەنگیی کۆمەڵایەتییەوە نەیانتوانیوە سەربکەون لەناوچوونەو تەنانەت هەندێ جار شوێنی خۆشیان بۆ خەڵکانی تر بەجێ هێشتووە [ ٢/٣١ ].

گەڕانەوەیەکی چڕوپڕ بۆ قۆناغەکانی گەشەکردنی مێژووی کۆمەڵناسی دەشێ یارمەتیمان بدات بۆ چاکتر تێگەیشتن لە چەمک و ڕێباز و میتۆدەکانی کۆمەڵناسی، و لەم بەشەدا بەکورتی لە قۆناغەکانی دروستبوونی کۆمەڵناسی دەدوێین.

**هزرە کۆمەڵایەتییەکان**

لە مێژووی کۆمەڵناسیدا، هزرە کۆمەڵایەتییەکان (Social Thoughts) بەشێکی زۆر بەرفراوانیان داگیرکردووە، و لەبەرهەمی بیرمەندانی کۆمەڵایەتی و فەیلەسووفاندا هەندێ چەمک بەرچاو دەکەون کە لە لێکۆڵینەوەکانی توێژەرانی هاوچەرخدا بەکارهێنراون، وەک: چینە کۆمەڵایەتییەکان، پەروەردەو فێرکردن، جەوهەری پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، پەیوەندیی ئەندامانی کۆمەڵگا بەحکومەتەوە، لە کۆتاییشدا پۆلێنبەندیی کۆمەڵگا مرۆییەکان. بۆ نموونە لە هیندستانی کۆندا بەپێی کتێبەکانی «شاسترا» [بەمانای زانینی دنیایی یان زانست] کۆمەڵگا بە ئۆرگانیزمێکی (كائن عضوي) گەورە شوبهێنراوە. بەڕای نووسەرانی ئەم کتێبە - کە بەنەناسراوی ماونەتەوە - فەرمانڕەوایی لە چەند توخمێکی وەکو ئەندامە جیاجیاکانی لەشی مرۆڤ پێکهاتووە کە بریتین لە: شا، وەزیر، خاک، قەڵا، خەزێنە، سوپاو هاوپەیمان. ئەم توخمانە پەیوەندییان بەیەکترەوە هەیەو لە دەستدانی هەر یەکێکیان ڕێ لە بەرقەراربوونی فەرمانڕەوایی دەگرێت. دانەرانی «شاسترا» شایان بەسەر، وەزیریان بەچاو، خەزێنەیان بەدەم دەشوبهاند، و

پێیان وابوو هیچ کام لەم ئەندامانە لەوانی تر گرنگتر نین. ئەم بیرووڕایە، بیرۆکەی یەکسانیی چینە کۆمەڵایەتییە جیاوازەکانی دەخستەڕوو و (بەهۆی هەبوونی ئەرکگەلێکی جیاوازەوە)، وایدادەنا بایەخێکی کۆمەڵایەتیی یەکسانیان هەیە [٣٢/١-٦].

لە ڕێی لێکۆڵینەوە لە «یاساکانی حەمورابی» بەو ئەنجامە دەگەین کە لەسەردەمی حکومەتی حەمورابیدا (١٧٩٢-١٧٥٠ پ. ز) لە «بابل» کشتوکاڵ و پیشەی جۆربەجۆر و بازرگانی گۆڕانکارییەکی بەرچاویان بەخۆوە دیبوو. ئەوکات، بەپێی ئەو کتێب و نامانەی کە لە «حەمورابی»یەوە بەجێ ماون وا دەردەکەوێ کە یاساگەلێکی نووسراو بەسەر کۆمەڵگادا حوکمیان کردووە. یاساکانی «حەمورابی» کاروباری کۆمەڵایەتیی جیاواز دەگرنە خۆ. تاوانەکان بە تەجاوزکردنە سەر دەوڵەت حسێب دەکران و تاوانبار دەبوایە لەلایەن دەوڵەتەوە سزا بدرێت. بەڵام لەبەرئەوەی ئەوکات کۆمەڵگا لە حاڵەتێکی چینایەتی دابوو، هەموو خەڵک لە بەرامبەر یاسادا یەکسان نەبوون، شاو خانەدانەکان ئیمتیازێکی تایبەتییان هەبوو. یاسای «حەمورابی» مافی کۆیلەکانی دیاردەکرد و لە هەمان کاتدا ئەرکگەلێکی سەختیشی دەخستە سەرشانیان. لەم یاسایانەدا، باوترین شێوەی کۆیلەیی، کە بەکۆیلەبوون لە ئەنجامی قەرزەوەبوو و تاپێش «حەمورابی» کۆیلە لە درێژایی تەمەنیدا هەر بە کۆیلەیی دەمایەوە، بۆ سێ ساڵ کەم کرایەوە [٣٣/٢٨-٢٩]. لە دادگاکاندا، کاربەدەستانی حکومەت لە جیاتی پیاوانی ئاییني دادوەرییان دەکرد [٣٢/١١٤-١١٧].

لە هزری سەردەمی ئێرانی کۆندا، کۆمەڵە ئامۆژگاری و فەرمانێکیان داوەتە پاڵ زەردەشت و شوێنکەوتووانی کە بریتین لە: خۆ پاراستن لە تۆمەت، نەپەشۆکان، خۆنەدانەدەست توندوتیژی و تووڕەیی و ئارەزووەکان، ئێرەیی نەبوون، تەمبەڵی نەکردن، گوێڕایەڵیکردن، ڕێزگرتن لە مافی خەڵکانی ترو خۆ دوورگرتن لە هاوسەری ئەوانی تر. ئەم ئامۆژگاری و فەرمانانە پەیوەندیی تاک بەخەڵک و ڕەفتاری کۆمەڵایەتی و خوو و ڕەوشتی کۆمەڵایەتی و هەندێ بواری تر دیاردەخات.

لە وڵاتی چینی دێریندا، «مانگ تسێ» بڕوای وابوو کە مرۆڤ لەگەڵ گشت هاوچەشنەکانی خۆیدا هاودەردیی هەیەو کۆمەڵگا وەکو خێزانێکی گەورە وایەو کەواتە پابەندیی تاک بەکۆمەڵگاوە پێویستە. بەرای ئەو تاکەکەسان گرنگترین توخمی کۆمەڵگان، مافی ئەوەیان هەیە شۆڕش بکەن، و ڕەچاوکردنی تەواوی

نەریتەکان زۆر پێویست نییە. کولتووری نووسراوی چین (بەپێچەوانەی کولتووری نووسراوی هیندستان) جەختی لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی مرۆڤ دەکردەوە و هەوڵیدەدا پەیوەندییەک لە نێوان سروشت و کۆمەڵگادا دابمەزرێنێت [١١٤/٣٢-١١٧].

لە «کتێبی پیرۆز»دا (چاخی کۆن) زۆر نموونەی ئەخلاقیمان بەرچاو دەکەوێت، کە بۆ دامەزراندنی پەیوەندیی نێوان مرۆڤ و کۆمەڵگا تەرخانکراون.

### فەلسەفەی کۆمەڵایەتی چاخی کۆن لە ئەوروپا

فەیلەسووفانی یۆنانی لە ریزی ئەو یەکەمانەبوون کە لەچوارچێوەی کۆمەڵە کتێبێکی نووسراودا بیریان لە کۆمەڵگای ئادەمیزاد کردۆتەوە. تەوەری سەرەکی باسەکەیان پەیوەندیی نێوان مرۆڤ و دەوڵەت بوو، واتە «دەوڵەتە شار»ی یۆنانی، هەر لەبەر ئەوەیە دەڵێن: وشەی «سیاسەت» (Politics) لە چاوگی «Polis» بە واتای «دەوڵەتەشار» وەرگیراوە. «ئەفلاتوون» (٤٢٧-٣٤٧ پ. ز) بیرۆکەی «یۆتۆپیا» (شاری باش)ی خستەڕوو و تیایدا جەختی لەسەر چەند مەسەلەیەکی وەکو چینە کۆمەڵایەتییەکان، موڵکایەتی، سیاسەت، ئەخلاق، و دابەشکردنی کار کرد. ئەفلاتوون بەشەکانی کۆمەڵگای لەگەڵ بەشەکانی لەشی مرۆڤدا بەراورد دەکرد، دیموکراسیی بەحکومەتێکی نەگونجاو لە قەڵەم دەدا، و خۆی بەچاکسازێکی کۆمەڵایەتی لە قەڵەم دەدا [٢٦/٤٥-٤٦].

«ئەرستۆ» (٣٨٤-٣٢٢ پ. ز) لە بەرهەمەکانی لە بواری سیاسەتدا، زیاتر لە کۆمەڵناس دەچێت نەک فەیلەسووف. ئەرستۆ رەوتی وەرچەرخانی دەوڵەتی لەرێی تێپەڕبوون بە قۆناغی خێزان، کۆمەڵی لادێیی و ئینجا شاردا، روون کردۆتەوە. حکومەتەکانی لە سێ جۆردا، واتە «ئەرستۆکراسی»، «پاشایەتی» و «دیموکراسی» پۆلێن کرد، و تایبەتمەندییەکانی هەریەکەیانی دیارکرد.

لەکاتێکدا کە ئەفلاتوون لە ریزی بیرمەندانی بابەتی شەرعییەتی سیاسی حسێب دەکرێت، ئەرستۆ بەلایەنگری یەکسانیی سیاسی دەژمێردرێت. ئەرستۆ کەمتر بایەخی بە یاسا ئەزەلییەکان دەدا و زیاتر دەپرژایە سەر کردار. بیرکردنەوەی ئەو لە بواری بونیادی سیاسیدا لایەنێکی یەکسانخوازانەی هەبوو، چونکە دەیگوت: رژێمی پاشایەتی نابێ بگۆڕێت بۆ ئیستبداد، حکومەتی خانەدانان نابێ بگۆڕێ بۆ ئۆلیگارشی، هەروەها دیموکراسی بۆ دیکتاتۆریی جەماوەری خەڵک یان

ئاژاوە [١٢/٣٤].

هزرە سەرەتاییەکانی سەر بەئایینی مەسیحییەتیش لە بارەی کۆمەڵگا لە لایەن «قەشە ئۆگوستین» (٣٥٤-٤٣٠ز، St. Augustine)ەوە بەرچاو دەکەون. ئەو لە کتێبی «شاری خوا»دا وەسفی دامەزراوەکانی کۆمەڵگای کردووە لە رووی باش یان خراپەوەو لە روانگەی ئەو رۆڵەی کە بۆ رزگارکردنی مرۆڤ دەیگێڕن. لە بنەڕەتدا ئۆگوستین سەرنجی «دنیایەکی دیکە»ی دەدا.

### فەلسەفەی کۆمەڵایەتی لە ئێران و شارستانیەتی کۆنی ئیسلامیدا

«ئەبو نەسرِ فارابی» (٢٥٩-٣٣٩ کۆچی) کە بۆ رزگاری و بەختەوەریی مرۆڤ بیری لە دامەزرانی سیستمێکی جیهانی دەکردەوە، بنچینەی بیروباوەڕەکانی خۆی لە کتێبی «بیروڕای ئەهلی شاری باش» (آراء اهل المدینة الفاضلة)دا خستەڕوو. فارابی کۆمەڵگاکان بۆ دووجۆر دابەش دەکات: «فاضلة» و «جاهلیة». لە شاری «فاضلة»دا سێ تایبەتمەندیی گرنگ بوونەتە ئامانج: ئامانجی کۆتایی کۆمەڵگا گەیشتنە بە بەختەوەریی راستەقینە، تاکەکەسان یارمەتی یەکتر دەدەن، و تاکەکەسان بەپێی خواستی سەرکردەی کۆمەڵگا هەڵسوکەوت دەکەن. لە بەرانبەر ئەمەدا، شاری «جاهلیة» هەیە، کە ئەویش کۆمەڵگایەکە خەڵک تیایدا بەدوای بەختەوەریی راستەقینەدا ناگەڕێن، بەڵکو هەموویان بەدوای پارەو دەسەڵاتدا وێڵن. فارابی شاری «جاهلیة» بۆ چەند جۆرێک دابەشدەکات کە سیمای زاڵ تیایاندا بریتییە لە وەسەریەکنانی سەروەت و سامان، رابواردن، نزمی (خسّة)، ئیحتیرام خوازی (بەشێوەیەکی زیادەڕۆیی و سلبی)، دەسەڵاتخوازی و فریودانی خەڵکی رەشۆکی. بەڕای ئەو رێکخستنی کۆمەڵایەتیی گونجاو هۆکارێکە کە هەلومەرجی پێویست بۆ بەرقەرارکردنی هاوکاریی نێوان تاکەکەسان دابین دەکات. «فارابی»ش وەکو «ئەفلاتوون» بە دوای کۆمەڵگای نموونەییدا دەگەڕا.

لە بیروڕاکانی «ئەبولعەلای مەعەڕڕی» (٣٦٣-٤٤٩ کۆچی) فەیلەسووفی عەرەبدا، کۆمەڵێک تێبینی کۆمەڵایەتی بەرچاو دەکەون. لە بواری زیادبوونی دانیشتووواندا ئەو پێی وابوو: ئەگەر خەڵک زیاد بن گەندەڵی بڵاودەبێتەوە. وەک چۆن ئەگەر قسە زۆرکرا ئەوا پڕوپووچ دەبێت. ئەو جگە لە خستنەڕووی نموونە رەفتارییەکان، دەستی کرد بە رەخنەگرتن لە بارودۆخی کۆمەڵایەتی و هەستا بەباسکردنی کێشەگەلێکی وەک ستەمی دەستەی فەرمانڕەواو نەبوونی دڵنیاکردنی

کۆمەڵایەتی (الضمانة الاجتماعیة)و وشکەساڵی (بێ بەربوومی) و شتی تر [١٨٧/٣٦]. لە کۆنترین بەرهەمی سۆسیۆگرافی (Sociography) لە ئێراندا دەتوانین ئاماژە بەکتێبی «تحقیق ماللهند» لە نووسینی «ئەبو رەیحان بیرونی» (٣٦٢-٤٤٠ک) بکەین، کە هەندێ لایەنی ژیانی کۆمەڵایەتی و کولتووریی وڵاتی هیندستانی تیادا روون کردۆتەوە.

لە نێوان ئەو کۆمەڵە فەیلەسووف و بیرمەندە ئێرانیانەی کە بایەخیان بەکاروبارو کێشە کۆمەڵایەتییەکان داوە، بەزۆری ئەو بابەتەی کە زیاتر پرژاونەتە سەری، «سیاسەتی شار»ە، کە دەبێ بەبەشێکی حیکمەتی کردەیی (فەلسەفەی کردەیی لە بەرانبەر فەلسەفەی تیۆریدا) لە قەڵەم بدرێت. بابەتی «سیاسەتی شار» هەردەم کەم تا زۆر یەک شت بوو، و ئەویش «بەرژەوەندیی کۆمەڵایەتی» بوو. ئەوەی لە کتێبێکی وەک «سیاسەتنامە» (سەدەی پێنجەمی کۆچی)ی «خواجە نیزامولمولک» باسی لێوەکراوە چەمکێکی ئەبستراکتی حکومەت و دادگەری نییە. ئەو ئاماژەی بە چەند خاڵێک کردووە کە یارمەتیی پتەوبوونی پێگەی حکومەتی سەردەمی خۆی دەدا. ئەویش وەک گشت ئەو بیرمەندانەی کە لەو سەردەمدا دەژیان پێی وابوو کە پێویستە «دەرەبەگە» دەسەڵاتدارەکان لە حکومەتدا بەشداربن و رۆڵیان پێ بدرێت، ئەوە لە سەردەمێکدا کە سیستمی «دەرەبەگایەتی» باوبوو [٢٧/٢٥].

«خواجە نەسیرەددین تووسی» (٦٠٧-٦٧٢ک) گرنگی بە «دەبێ»یەکان دەداو دەتوانین بەیەکێک لەو بیرمەندانەی دابنێین کە باسیان لە «ئەخلاق لە کۆمەڵگادا» بەشێوەیەکی نووسراو لە ئێراندا کرد و بەپێی پێوەرو نۆرمە زاڵەکانی ناو کۆمەڵگایەکی دەرەبەگایەتی هەوڵی پتەوکردنیان دەدا. بەڕای ئەو رێکخستنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان بەندە بەقبووڵکردنی نایەکسانییە کۆمەڵایەتییەکان. نەسیرەددین تووسی سێ گرووپ لێک جیادەکاتەوە: بەرزتر لە تاک، یەکسان لەگەڵ تاک، نزمتر لە تاک. جگە لەوە بایەخێکی تایبەتیش بەپۆلێنکردنی زانست و کۆمەڵگاکان دەدا.

«ئیبن خەلدون» (٧٣٢-٨٠٨ک) بیرمەندی ئیسلامی لە بەرهەمە ناودارەکەی خۆیدا «کتاب العبر و دیوان المبتدأ والخبر في ایام العرب و العجم والبربر ومن عاشرهم من ذوي السلطان الاکبر» کە بە «مقدمة» بەناوبانگە بنەما تیۆرییەکانی خۆی لە بارەی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی کە لە روانگەی فەلسەفەی مێژوو و کۆمەڵناسی و کولتوورەوە گرنگی هەیە، خستۆتەڕوو. ئەو لە لێکۆڵینەوەکانی خۆیدا

بەو ئەنجامە گەیشتووە کە شارستانییەتەکان لە چەندین توخمی سەرەکی پێکهاتوون، وەک : ئایین، نەریت، دەوڵەت و سەرکردە، ئەخلاق، پیشە، پیشەسازی، سەروەت و سامان، و دانیشتووان، هەریەکەشیان سەرەتاو ئەنجامێکی دیاریکراوی هەیەو گۆڕان و وەرچەرخانیان حاڵەتی «بازنەیی» (Cycle)ی هەیەو تێپەڕبوون بەناو قۆناغەکانی هێرشبردن، چڵەپۆپە (قمة)، خۆڕازاندنەوە، چەوساندنەوەو هەرەسهێنان شتێکی حەتمییە [١٨-٩/٣٨]. لە لێکۆڵینەوەکانی «ئیبن خەلدون»دا پەڕینەوە لە قۆناغی بەدەوییەوە بۆ شارنشینی تەوەری سەرەکیی تۆژینەوەکانە. ئەو پێی وابوو خەڵکی بەدەویی خاوەن «دەمارگیری»ن، ئەو دەمارگیرییەش لە رەفتارگەلێکی وەک ئازایەتی، ئەخلاق، مێرخاسی، پەیوەندییە خوێنی و نەتەوەییەکان، دلێری، و بەخشندەییەوە دەردەکەوێت. لەبەرئەوەی کە رەوتی [گۆڕان لە] بادیەنشینەوە بۆ شارنشینی هاودەمە لەگەڵ رابواردن و حەسانەوەخوازی، لە ئەنجامدا دەمارگیری هێدی هێدی لاواز دەبێت. «ئیبن خەلدون» بڕوای وابوو گرنگترین هۆی نەمانی دەمارگیری بریتین لە: رووکردنە ژیانی کشتوکاڵی و پتەوبوونی، لەناوچوونی دەسەڵاتی بەرگری لە شاردا، دامەزرانی سیستمی باجەکان، برەوسەندنی خۆڕازاندنەوە، تێکەڵاوبوونی رەگەزیی و نەتەوەیی، لاوازبوونی بنەما ئەخلاقی و ئایینییەکان و تەشەنەسەندنی زۆرداری [٨٥-٨٤/٣٨]. «ئیبن خەلدون» بڕوای وابوو ئامانجی مێژوو ئەوەیە کە جەوهەری کۆمەڵایەتیی مرۆڤ واتە شارستانییەت و دیاردەکانی بەمرۆڤەکان ببەخشێتەوە [٢٠/٣٩].

### فەلسەفەی کۆمەڵایەتی سەردەمی رێنسانس لە رۆژئاوا

تا ساڵی ١٨٠٠ی زایینی، لێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتییەکان بەبەشێکی فەلسەفە لە قەڵەم دەدران، ئەوەی بیری ئەم بیرمەندانەی تەنیبوو بریتی بوو لە نیگەرانی لە تێکچوونی باری کۆمەڵگا و ترسان لە گۆڕانکارییە لەناکاوەکان. فەلسەفە سیاسییەکان دەبێ بەزەمینە سەرەتاییەکانی فەلسەفە کۆمەڵایەتییەکان لە قەڵەم بدرێن. ئامانجی ئەم فەلسەفانە کە سەرچاوەکەیان بۆ بیری نووسراو دەگەڕایەوە، بریتی بوو لە دابینکردنی سەقامگیریی کۆمەڵگا، دادگەری، گونجاندنی رێکخستنی کۆمەڵگا لەگەڵ ئازادیی مرۆڤەکان و چەند بابەتێکی تر کە زۆربەیان تائێستاش جێی باس و لێکۆڵینەوەن [٩/٣٤].

فەیلەسووفە کۆمەڵایەتییەکان بەرلەوەی کۆمەڵگا لەسەر بنچینەی ئەو راستییە بابەتییانەی کە لەناو کۆمەڵگاکە خۆیدا هەن راڤە بکەن و شی بکەنەوە، لە هەوڵی پێشکەشکردنی وێنەیەکی خەیاڵی یاخود ئایدیالیزمییانەی کۆمەڵگا دابوون و جیاوازی فەیلەسووفانی کۆمەڵایەتی لەگەڵ کۆمەڵناسان زیاتر لەو رووەوەیە کە بیرورِای فەیلەسووفانی کۆمەڵایەتی زیاتر پشتیان بە «ئەوەی کە پێویستە ببێت» بەستووەو دەبەستن، لەکاتێکدا کە کۆمەڵناسان بەشێوەیەکی گشتی بایەخ بە «ئەوەی کە هەیە یان بووە» دەدەن. ئاماژەکردن بەچەند نموونەیەک لەوانەیە باسەکەمان رۆشنتر بکاتەوە.

لە سەدەکانی ١٧ و ١٨ لە ئەوروپادا «جۆن لۆک» (١٦٢٣-١٧٠٤) لە بەریتانیاو «جان جاک رۆسۆ» (١٧١٢-١٧٧٨) لە فەرەنساو چەندانی تر، تیۆرگەلێکیان خستەروو کە داکۆکییان لەسەر فاکتەرە دەروونی یان کۆمەڵایەتییەکان دەکرد. لەو سەردەمەدا رووکردنە بیرورِا کۆمەڵایەتییە نوێیەکان لە برەوسەندندابوو، و ئەم رێرەوانە هاوسەردەم بوون لەگەڵ زیادبوونی شەپۆلی نارەزاییەکان لە دژی نایەکسانی لە سیستمی کۆمەڵایەتی کۆندا. پەیوەندیی نێوان دەوڵەت و ئەندامانی کۆمەڵگاو هەروەها بەرپرسیارێتییەکانی هاووڵاتییان لە بەرانبەر دەوڵەتدا لە گرنگترین ئەو خاڵانەن کە لە ماوەی چەند سەد ساڵێک جێی باسی فەیلەسووفانی کۆمەڵایەتی بوون. چەمکی پەیمانی کۆمەڵایەتی (Social Contract) کە بیرمەندانی وەک «تۆماس هۆبز» (١٥٨٨-١٦٧٩)، «جۆن لۆک»، «مۆنتسکیۆ» (١٦٨٩-١٧٥٥)و «جان جاک رۆسۆ» باسیان لێوە کردووە باوترین بیرۆکە بوو لەو بوارەدا. بەچاوخشاندنێکی خێرا بەبنچینەی بیرورِاکانی ئەم کۆمەڵە بیرمەندانە دەبینین:

- «ماکیاڤیللی» سیاسەتی پیادەکردنی هێزو دەسەڵاتی پشتبەستوو بەچەک و فریودانی خستەروو، و پشتیوانیی لە زەرووەرەتی خۆ دەرخستن و ریاکاری بۆ پاراستنی دەسەڵات کرد.
- «تۆماس مۆر» هەوڵی هێنانەدیی کۆمەڵگایەکی نموونەیی دەدا.
- «هۆبز» پێی وابوو تاکەکەسان لە دۆخی سروشتیدا (بارودۆخی سەرەتایی) دوژمنی یەکترن، بیرۆکەی پەیمانی کۆمەڵایەتی خستەروو و ویستی فەرمانرەوایی بەویستی گشتی یان یاسا لە قەڵەم دەدا.
- «لۆک» فەرمانرەوایانی بە خاوەن دەسەڵاتی بێ سنوور نەدەزانی بیرۆکەی

جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکانی (یاسا دانان، جێبەجێکردن و دادوەری) خستەڕوو.

– «مۆنتسکیۆ» بایەخیدا بەبوارەکانی وەک جەوهەری یاساکان و هۆی دانانیان، جۆرەکانی حکومەت، بنەمای جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان، هۆکارەکانی گۆڕانی کۆمەڵگا مرۆییەکان، و کاریگەری هۆکارە جوگرافییەکان لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی.

– «ڤۆڵتێر» بیرۆکەی دنیای نیشتمانیی خستەڕوو، رەخنەی لە بارودۆخی کۆمەڵایەتی سەردەمی خۆی گرت، و لە کۆتاییدا نەهێشتنی نایەکسانی لە کۆمەڵگا مرۆییەکاندا بەشتێکی مەحاڵ زانی.

– «رۆسۆ» هۆکارە کاریگەرەکانی نایەکسانیی مرۆڤەکانی ئاشکراکرد، ئاماژەی بە کاریگەرییە سلبییەکانی شارستانییەت لەسەر پەروەردەکردنی مرۆڤ کرد، و نموونەی پەروەردەکردنی تایبەتی خۆی خستەڕوو کە بریتی بوو لە «گەڕانەوە بۆ دۆخی سروشتی».

بیرۆکەی ئەو بیروڕایەی کە دەڵێ: کۆمەڵگاکانی مرۆڤایەتی دەتوانن بکەونە بەر گۆڕانکاریی بەردەوام و لێکچوو، سەرەتا لەبەرهەمەکانی ئەوانەی بڕوایان بەتیۆری «بازنەیی بوونی» مێژوو هەبوو، خرایەڕوو. چەندین ساڵ دوای «ئیبن خەلدون»، ڤیکۆ (١٦٦٨-١٧٤٤) فەیلەسووف و مێژوونووسی ئیتالّی رایگەیاند کە گۆڕانی مێژوویی بریتییە لە پێشکەوتن و گەڕانەوە بۆ دواوە و چەمکی جوولەی «شێوە سپرینگ»ی مێژووی پێشنیارکرد. تیۆری سێ قۆناغەکەی «ئۆگست کۆنت» کە دواتر راگەیەنرا تارادەیەک لە بیروڕاکانی ڤیکۆوە وەرگیراوە [١٣/٤٠].

زیادبوونی ژمارەی بیرمەندانی کۆمەڵایەتی و گەشەکردنی بیروباوەڕی جۆراوجۆر کە هەندێکیان زۆر دژ بەیەک بوون بەرە بەرە پێویستبوونی سەرهەڵدانی زانستێکی وردبینتری لە بارەی کۆمەڵگاوە هێنایە ئاراوە. لە سەدەی نۆزدەهەمدا بیرۆکەی دروستبوونی «زانستی کۆمەڵگا» لەلایەن «سان سیمۆن» (١٧٦٠-١٨٢٥)(C. H. de Saint - Simon)ی فەرەنسایی خرایەڕوو. ئەو کە لە کۆلێژی پۆلی تەکنیکی پاریس وانەی دەگوتەوە کاریگەرییەکی فیکریی زۆری لەسەر قوتابییان هەبوو، و یەکێک لەم قوتابییانە، واتە «ئۆگست کۆنت» (١٧٩٨-١٨٥٧) دواتر بوو بەیەکێک لە هەڤاڵان و هاوکارانی «سان سیمۆن». «سان سیمۆن» کە بانگەشەی جۆرە سۆسیالیزمێکی ئایدیالیستییانەی دەکرد، زیاتر بڕوای بە بنیاتنان هەبوو نەک رەخنەگرتن، کۆمەڵگای بۆ دوو چینی بەرهەمهێنەر و نابەرهەمهێنەر دابەش دەکردو بەسوود و میرات و موڵکایەتی تایبەت رازی نەبوو.

## کۆمەڵناسی: قۆناغی سەرەتایی

«ئۆگست کۆنت» بۆ یەکەمجار لە ساڵی (١٨٣٩)دا وشەی کۆمەڵناسی (Sociologie) بەکارهێنا. لەگەڵ بڵاوبوونەوەی بەرهەمەکانی «ئۆگست کۆنت» لە فەرەنسادا، روانگەیەکی سەربەخۆ لە بواری لێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتییەکان هاتەئاراوە. لەو رووەوە بە باوکی «کۆمەڵناسی»یان ناو ناوە چونکە بڕوای وابوو کە دەتوانین بگەینە یاسا گەلێکی کۆمەڵایەتی وەکو چۆن زانایانی سروشت (لە بواری یاساکانی فیزیاو زیندەوەرزانی) پێی گەیشتوون. ناودارترین تیۆری «ئۆگست کۆنت» یاسای سێ قۆناغەکەیە کە پێی وایە زانستەکان بەرهەمی پێشکەوتنێکی سروشتین و بەڕای ئەو کۆمەڵگای مرۆڤایەتی قۆناغی: تیۆلۆژی (تەفسیرکردنی رووداوەکان بەیارمەتی هۆکارە سەروو سرووشتییەکانەوە)، میتافیزیکی (گریمان و گومانە نەسەلمێندراوەکان سەبارەت بەرێکخستن و رەوتی کاروباری دنیا) و زانستی (لێکۆڵینەوەی پرۆسەی ژیان لە رێی میتۆدو رێوشوێنی عەقڵییەکانەوە)ی بڕیووە [١/٥٢]. لە قۆناغی تیۆلۆژیدا شاعیرانی وابەستە بە قوتابخانەی تیۆلۆژیا (الهیات) دەسەڵاتیان هەیەو ئەفسانەو ئایین دروست دەکەن. لە قۆناغی میتافیزیکیدا خانەدان و پاڵەوانەکانی جەنگ دەسەڵاتیان هەیە، و لە قۆناغی زانستیدا کۆمەڵگا دەچێتە قۆناغی عەقڵەوە، و گیانی پۆزێتیڤیستی کە لە سەردەمی دەسەڵاتی زانستدا زاڵ دەبێت سێ تایبەتمەندیی تیایە کە بریتین لە واقیعیبوون. دڵنیابوون، وردبینی.

هەڵبەتە بەرهەمەکانی «ئۆگست کۆنت» نموونەیەکی تەواوی ئەوتۆ نین کە بەپێی میتۆدێکی زانستی (بەلای کەمەوە بەو شێوەیەی کە «ئۆگست کۆنت» خۆی بانگەشەی بۆ دەکرد) دانرابن، هەر لەبەرئەوە رەخنەیان لێگرتووە، و لەو کەسانەیان داناوە کە لەپشت دەرگای داخراوەوە سەیری کۆمەڵگای کردووەو لە بەرهەمەکانیدا زیاتر «قیاس» بەکارهاتووە نەک «ئیستقرا». لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە بڵێین ئەو ناوی کۆمەڵناسیی داهێنا، لەو بوارەدا زۆرکاری کرد شایەتی دروستبوونی زانستێکی نوێ بوو، و سەرنجی زۆربەی تۆژەرانی سەردەمی خۆی بۆ ئەم لقە زانستییە راکێشا. کۆنت تینوگوڕێکی بێ سنووری هەبوو و خۆی بە دامەزرێنەری زانستێک دادەنا کە (بەڕای ئەو) دەتوانێت یارمەتی مرۆڤ بدات لە دروستکردنی دنیایەکی باشتر کە پێشتر مرۆڤ نەیبینوە و نەیناسیوە [٤١/٧-٩].

لەم قۆناغەدا، هەندێ فەیلەسووف یان زانایانی ئەم سەردەمە کە دوای

بڵاوبوونەوەی وشەی «کۆمەڵناسی» ناوی خۆیان نا کۆمەڵناس، لەراستیدا کەسانێ بوون کە ئەمڕۆ بەمێژوونووسانی کۆمەڵایەتی یان فەیلەسووفانی کۆمەڵایەتی ناویان دەبەین.

هەندێکیان باسی ئەوەیان دەکرد کە لە نێوان بۆماوە و ژینگەدا کامەیان کاریگەری زیاترە لەسەر پێکهاتە و دروستبوونی کەسایەتی مرۆڤ، و هەندێکی تر باسیان لە «گیانی کۆمەڵایەتی» دەکرد. بەڵام بەتایبەت لەنیو سەدەی رابردوودا کۆمەڵناسان لەڕێی تۆژینەوە زانیاریی زۆریان کۆکردەوە، تیۆرەکانی خۆیان تاقیکردنەوە، و توانییان پێگەیەک بۆ کۆمەڵناسی لەنێوان زانستەکاندا بدۆزنەوە [١٤/١٠].

ڕێڕەوە فیکرییەکانی دژ بە ئایدیالیزم یەکێک بوون لە هۆکارە کاریگەرەکانی تاوسەندنی کۆمەڵناسیی نوێ. تا سەدەی نۆزدە وا پێویست بوو زانایان سەرنجی کاریگەریی «هێزی بزوێنەری مێژوو» لەسەر ڕەفتارە مرۆییەکاندا بدەن. «مۆنتسکیۆ» کۆمەڵگاکانی لەسەر بنەمایەکی ئەخلاقی پۆلێن کردو بڕوای وابوو کە سیستمی پاشایەتی لەسەر بنچینەی ئیفتخارات دامەزراوەو سیستمی کۆماریش لەسەر بنچینەی پایەبەرزی و خۆپارێزی.

لەسەردەمێکی زۆر نزیکتر لەسەردەمی ئێمەوە، «جبرائیل تارد» (١٨٤٣-١٩٠٤)، بیرمەندی فەڕەنسی باسی ڕۆڵی ئەو گەورە پیاوانەی دەکرد کە گیانی میللەتەکانیان ئاراستەکردووە [٤٠/١٥]، بەڵام لەراستیدا، لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا کۆمەڵناسی ئامرازێک بوو بۆ ناسینی ئەنجامەکانی شۆڕشی پیشەسازی. پێویست بوو چاکسازیگەلێکی کۆمەڵایەتیی بەرفراوان بۆ چاکترکردنی ژیانی هەژاران ئەنجام بدرێت و لەم ڕوانگەوە کۆمەڵناسی بەئامرازێکی کاریگەر دادەنرا.

فەلسەفەی «کارل مارکس» (١٨١٨-١٨٨٣) لەسەر بنەمای ماتریالیزم دامەزرابوو و هۆکاری ئابووریی بەهۆکاری دەستنیشانکەری پێکهاتە و پەرەسەندنی کۆمەڵگا دادەنا [٤٢/٤٨-٤٩]. «کارل مارکس» لەگەڵ خستنەڕووی بیروڕاکانی خۆی لە کتێبی «سەرمایە» (Das kapital)دا بیرۆکەی شۆڕشی کۆمۆنیستیی بە شێوەیەکی نووسراو خستەڕوو. «مانیفێستی کۆمۆنیست» کە لە ساڵی ١٨٤٨، لەلایەن «مارکس» و هاوڕێیەکی «ئنگلز» (F. Engels) بڵاوکرایەوە، ڕوونترین بەیاننامە بوو کە تا ئەو سەردەم لە بارەی هەڵوێستی ئایدیالییانەی کۆمۆنیزم بڵاوکرابێتەوە. تیۆرەکانی «مارکس» لە بارەی شەڕو پێکدادانی چینایەتی، و

هەرەسهێنانی ناوخۆیی سیستمی سەرمایەداریی هەر خێرا بایەخیان پێدرا، هەرچەندە لە ئەورووپای رۆژئاوادا نەیتوانی پیادە ببێ. میتۆدی دیالێکتیکی «مارکس» (کە لە هیگڵی وەرگرتبوو و خۆیشی گۆڕانکاریی تێدا ئەنجامدا) توانای ئەوەی پێبەخشی کە «کۆی دیاردەی کۆمەڵایەتی» بەشتێکی جیاواز لە کۆی ئەو بەشانەی کە پێکی دەهێنێت لە قەڵەم بدات، بیرۆکەیەک کە بنچینەییترین چەمکی کۆمەڵناسییە. بەرهەمەکانی «مارکس» کەڵکی لە میتۆدە سۆسیۆلۆژییەکان وەرگرتبوو، هەرچەندە ئەم میتۆدانە حاڵەتێکی سەرەتاییان هەبوو. لەکتێبی «سەرمایە»دا بەشێوەیەکی بەرفراوانتر سوود لە میتۆدی بەراوردکردنی مێژوویی (المقارنة التأريخية) و هەروەها میتۆدە ئامارییەکان (المناهج الاحصائية) وەرگیراوە [٤٣/١٩٧-١٩٨].

«مارکس» لە روانگەی ململانێی ئابووری نێوان چینە کۆمەڵایەتییەکانەوە مێژووی ژیانی کۆمەڵایەتیی دەخوێندەوە، بەبڕوابوون بەماتریالیزمی مێژوویی گۆڕینی کۆمەڵگاکانی بەهۆی پێداویستییە ئابوورییەکانەوە ئاڕاستە دەکرد. «مارکس» بڕوای وابوو کە ئەوەی دەستنیشانکەری بوونی مرۆڤە، هۆشیارییەکەی نییە، بەڵکو بوونی کۆمەڵایەتی هۆشیاریی مرۆڤ دیاری دەکات. ئەو لەڕێی بەدواداچوونی ئەم لۆژیکەوە لە کتێبی «سەرمایە»دا مرۆڤی بە «ئاژەڵێکی سیاسی» پێناسەکرد، بەڕای ئەو چاوەڕوانکردنی «بەرهەمهێنان» لە کەسانی گۆشەگیری کۆمەڵگا ئەوەندە هەڵەیە کە چاوەڕوانی گەشەکردنی زمان بکەین لە دەرەوەی کۆمەڵە کەسێک کە بەیەکەوە دەژین و دەدوێن.

دواتر قوتابخانەی «مارکسیزم» لەسەر بنەمای تیۆرەکانی «لینین» هەوڵیدەدا دەریبخات کە چۆن لەسەر بنچینەی رێکخستنێکی کۆمەڵایەتی دیاریکراو و دوای گەشەکردنی هێزە بەرهەمهێنەرەکان، شێوەیەکی گەشەکردووتری رێکخستنی کۆمەڵایەتی دەردەکەوێت و بڵاودەبێتەوە (بۆ نموونە وەک چۆن سەرمایەداری لە هەناوی فیۆدالیزمدا لەدایک دەبێ).

ئەمڕۆ زۆربەی ئەو چەمکانەی کە جێی سەرنج و بایەخی «مارکسییەکان» بووە، لەناو کۆمەڵناسیدا بەرە بەرە، ناوەڕۆکە مارکسیستییەکەیان لە دەست داوە. چەمکگەلێکی وەک «نامۆبوون» (Alienation)، «پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان»، و «سەرخان» کە لەسەرەتادا رۆڵێکی گرنگیان لە دروستبوونی کۆمەڵناسیدا گێڕاوە، ئەمڕۆ لەلایەن زۆربەی کۆمەڵناسانەوە بەشێوەیەکی تەواو جیاواز لەوەی

«مـارکسـیـزم» سـەیر دەکـرێن. چەمکی چینی کـۆمـەڵایەتی ئێـسـتـا زێتـر لەڕێی پۆلێنبەندییە کۆمەڵایەتی -پیشەییەکانەوە دەناسرێت. لە کاتێکدا کە «مارکس» باسی ملمـلانێی نێـوان چینە دژ بەیەکـەکـانی (بۆرژوازی و پرۆلیـتـاریا)ی دەکـرد، زۆربەی لێکۆڵینەوەکـانی ئێـسـتـا لە بنەڕەتدا پەیوەستن بەچینی ناوەڕاست و بەخەسپییەکانەوە [ ١٦/٤٠ ].

سـەدەی نۆزدەهەم سـەرهەڵدانی چەندین بیـرمـەندی لە بواری «زانسـتی کـۆمـەڵگا»وە بەخـۆوە دی. «هێـربرت سپنسـەر» (١٨٢٠-١٩٠٣، H. Spencer) زۆر بایەخی بەبابەتی پەرەسـەندنی کـۆمـەڵایەتی (Social Evolution)دا، واپێ دەچێ زۆر لە ژێر کاریگەری بیروڕاکانی «چارلز داروین»دا بووبێت [ ٤٤/٩-١١ ]. تونديی بایەخـدانی ئەو بە «داروینیـزم» تا ئەو رادەیە بوو کـە روانگەیەکی یەکـلایەنەی بۆ دروست بوو و هەوڵیـدا گـشت دیاردە کـۆمـەڵایەتییـەکـان لەو روانگەیەوە راڤە بکات. «سپنسەر» لە کتێبی «بنەماکانی کۆمەڵناسی»دا کە لە ساڵی ١٨٧٩دا بڵاوکرایەوە، لە بەراوردکردنی نێوان کۆمەڵگاو ئۆرگانیزمی مرۆییدا زیاتر رۆچوو کە پێشتریش باسی لێوەکرابوو و رایگەیاند کە کۆمەڵگاکانیش وەکو بوونەوەرە زیندووەکان بەپێی دابەشبوونی کار لەنێوان توخمە پێکهێنەرەکانیان گەشە دەکـەن و ئاڵۆز دەبن. ئەو بڕوای وابوو کە پێویستە سنوورێک بۆ چالاکییەکـان و دەسەڵاتی دەوڵەت دابنرێت [ ٤٥/٨-٢٢ ].

### کۆمەڵناسی: قۆناغی گەشەسەندن

لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا قـۆناغێکی نوێی کـۆمـەڵناسی دەستپێدەکات: قـۆناغی گـەشەکـردنی خێـرا. لەوانەیە بتـوانین بڵێین کـاریگەرترین بەشداریکردنی فـیـکری، لە قـۆناغی سـەرەتای گـەشەکـردنی کۆمـەڵناسـیدا دەگـەڕێتەوە بۆ «ئەمـیل دورکـهـایم» (١٨٥٨-١٩١٧ E. Durkheim)، کـە وەک «مـامـۆسـتـای پەروەردەو فـێـرکـردن و کـۆمـەڵناسی» لە فـەرەنسـا دامـەزرا. «دورکـهـایم» لە سـاڵی ١٨٩٨ «گـۆڤـاری کـۆمـەڵناسیی فـەرەنسی» بڵاوکـردەوەو بەهۆی ئەمـەوە یارمـەتییـەکی کـاریگەرانەی بەپێـشکـەوتنی ئەم لقـە زانسـتییـە دا. «دورکـهـایم» رەهەندو چەمکگەلێکی زۆری بۆ ناوەڕۆکی کـۆمەڵناسی زێدەکرد لەوانە: میـتۆدی ئاماری، چەمکی ئەبنۆرماڵ، هۆکارە کـۆمـەڵایەتییـەکانی خۆکوشتن، بەها کۆمەڵایەتییەکان، سـەرچاوەی ئایین، دینامیکییـەتی کۆنتـرۆڵی کـۆمەڵایەتی، و رەفـتـاری کۆمـەڵی.

تۆژینەوەکانی پەیوەندییان بەیاسا، سیاسەت، پەروەردەو فێرکردن، پەیوەندییە خێزانییەکان، دەروونناسی و مرۆڤناسییەوە هەبوو و لە هەریەک لەم بوارانەدا لە چەند مەسەلەیەکی کۆڵییەوە، کە پەیوەندییان بەکۆمەڵناسییەوە هەبوو[٨/٢٢].

«دورکهایم» کۆمەڵناسی بۆ سێ بەش دابەشکرد: مۆرفۆلۆژیا (Morphology)ی کۆمەڵایەتی کە کایەی ئیشکردەکەی بریتییە لە تۆژینەوەی پەیوەندی نێوان هۆکاری جوگرافی بەبونیادی دەزگا کۆمەڵایەتییەکانەوە، فیزیۆلۆژیای کۆمەڵایەتی کە کۆمەڵە لقێکی پسپۆڕیی جیاجیای کۆمەڵناسی دەگرێتەوە وەک خێزان و دەزگای سیاسی، هەروەها کۆمەڵناسیی گشتی کەتیایدا پێکهاتەیەک لە ئەنجامی زانستە کۆمەڵایەتییە جۆربەجۆرەکانەوە بەرهەم دێت. «دورکهایم» یەکەم کەس بوو کە لە روانگەیەکی جیاواز لە روانگە جوگرافی و فەلسەفی و دەروونناسییەکانەوە لە دیاردە سۆسیۆلۆژییەکانی کۆڵییەوە. لەبەرئەوەی ئەو بڕوای بەرەسەنایەتی تایبەتی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان هەبوو، لە راڤەکردنی کاروبارو کێشە کۆمەڵایەتییەکاندا تەنیا جەختی لەسەر «هۆکارە کۆمەڵایەتییەکان» دەکردەوە. «دورکهایم» کە دژی ماتریالیزمی مارکسیزم بوو بڕوای وابوو کە نابێ ژیانی کۆمەڵایەتی لەرێی چەمکسازیی ئەو کەسانەی کە تیایدا بەشدارن ئاڕاستە بکەین، بەڵکو پێویستە سەرنجی ئەو هۆکارە بنەڕەتییانەی دیاردەکان بدەین کە زۆربەی جار بەرچاونین. ئەم شێوە تێڕوانینە توانای ئەوەی پێدەدا کە کۆمەڵگا وەک یەکەیەکی «ئۆرگانێک» لەبەرچاو بگرێت کە توخمەکانی (واتە تاکەکەسانی) تەنیا لە رێی کۆی گشتییەکەیدا (واتە ژیانی کۆمەڵایەتییەوە) دەتوانین بناسین. بەپێی بڕوای«دورکهایم» ئامار یەکێکە لە سەرەکیترین میتۆدەکانی کۆمەڵناسی و هەمان ئەو میتۆدەشە کە لە کتێبە ناودارەکەی واتە خۆکوشتن (ساڵی ١٨٩٧)دا بەکاری هێناوە [٢٠/٤٠].

ناسراوترین کۆمەڵناسی ئەمریکی لەسەدەی نۆزدەهەمدا «ویلیام گراهام سامنێر» (١٨٤٠/١٩١٠، W. G. Summner)ە. سەرەڕای ئەوەی «لیستر وارد» (١٨٤١-١٩١٣، L. F. Ward) بەباوکی کۆمەڵناسی لە ئەمریکا دەناسرێت. بەڵام یەکەم وانە بەناوی «کۆمەڵناس» لەم وڵاتەدا لەلایەن «سامنێر»ەوە پێشکەشکرا. سامنێر لە کتێبی «شێوازە میللییەکان» (Folkways)دا بەتێروتەسەلی چەمکی کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی وەسف و شیدەکاتەوە. «سامنێر» پشتیوانیی لە تیۆری پەرەسەندنی کۆمەڵایەتیی «سپنسەر» دەکردو دژی چەمکی

پلانی کۆمەڵایەتی «لستر وارد» وەستا. هەر چەند ئەمڕۆ ئەو کۆمەڵناسانەی لەگەڵ بڕواکانی «سامنێر»دان زۆر کەمن، بەڵام گومانمان نییە لەوەی کە بیروڕاکانی ئەو هاندەری چەندین لێکۆڵینەوە بوون لە نێو قوتابییانیدا - کە ئەمڕۆ هەندێکیان بەناوبانگترین کۆمەڵناسی ئەمریکان [٨/٢١].

«لستر وارد» دامەزرێنەری «یەکێتی کۆمەڵناسانی ئەمریکا»، لە سەرەتادا گیاناس و زەویناس بوو و دواتر بایەخی بەکۆمەڵناسیدا. ئەو سەرەڕای ئەوەی هەندێ لە تیۆرەکانی «سپنسەر»ی لە بارەی «پەرەسەندنی کۆمەڵایەتیی خۆبەخۆی» پەسند کرد، بەڵام بڕوای وابوو مرۆڤ دەتوانێت گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکان ئاراستە بکات، ئەو کاتێکی زۆری بۆ توێژینەوەی چاکسازیکردنی کۆمەڵایەتی سەرفکرد، هەوڵی بۆ دامەزراندنی سیستەمی خوێندنی بەخۆڕایی دا، و کارو هەنگاوەکانی لە بواری یەکسانیی مافەکانی ژن و پیاو لە سیستەمی کۆمەڵایەتی و سیاسی وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمریکادا کاریگەربوون [٨/٢١].

گرووپی کۆمەڵناسی و مرۆڤناسی زانکۆی شیکاگۆ کە لە جۆری خۆیدا یەکەم گرووپ بوو لە وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمریکادا هەر لەو ساڵەی کە زانکۆی شیکاگۆ دەستی بەکارکرد، (واتە ساڵی ١٨٩٢) لەلایەن «ئەلیبون سماڵ» (A. Small)ی کۆمەڵناسی ئەمریکییەوە دامەزرا. «سماڵ» (١٨٥٦-١٩٢٩) نەک هەر تەنیا رۆڵێکی گرنگی لە دامەزراندنی بەشی کۆمەڵناسی لە زانکۆی شیکاگۆدا هەبوو، بەڵکو گرنگییەکی زۆریشی هەبوو لە دامەزراندنی کۆمەڵناسی لە ئەمریکادا. ئەو چەندین ساڵ لە دوای یەک رۆڵی سەرۆکایەتیی قوتابخانەی شیکاگۆی بەملەوەبوو [٢٨/٣-١١].

«جۆرج زیمێل» (١٨٥٨-١٩١٨، G. Simmel) کۆمەڵناسی ئەڵمانی لە توێژینەوە کۆمەڵایەتییەکاندا سوودی لە فەلسەفەی «کانت» (١٧٢٤-١٨٠٤، I. Kant) وەرگرت. ئەو هەستا بەلێکۆڵینەوە لە پەیوەندیی نێوان تاک و گرووپ، و بەشێوەیەکی گشتی سەرنجی بەربەرەکانێ، وابەستەیی، و دابەشکردنی کاری دا وەک ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییانەی کە لەگشت کۆمەڵگاکاندا هەن [٤٥/٨-٢٢].

«ماکس ڤێبەر» (١٨٦٤-١٩٢٠، M. Weber) کۆمەڵناسی ئەڵمانی بەشێوەیەکی وردبینانەتر لە بیرۆکەی شێوە یان جۆری پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی کۆڵییەوە کە لەلایەن، «زیمێل»ەوە باسی لێوە کرابوو. «ماکس ڤێبەر» کە هاوسەردەم

و هاوکاری «دورکهایم» بوو له ئەڵمانیا (له سەدەی نۆزدەهەمدا بەشێوەیەکی گشتی وەک ئابووریناسێک ناسرابوو) وەک «دورکهایم» بەشدارییەکی کاریگەری له چاکسازیی میتۆدەکانی لێکۆڵینەوەی کۆمەڵناسیدا کرد [٢٤/٨]. ئەو بۆ دۆزینەوەی پەیوەندیی هۆو ئەنجامی نێوان دیاردە کۆمەڵایەتییەکان سوودی له میتۆدی بەراوردکردنی مێژوویی وەرگرت. جگە له مانە ڤێبەر میتۆدی «تێگەیاندن» (Verstehen)ی بۆ میتۆدەکانی لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتی زیادکردو بەقەد میتۆدەکانی تر بەهای پێدا. ئەو پێی وابوو میتۆدی ناوبراو هەردوو لایەنی بابەتێتی (Objectivity)و خودێتی (Subjectit) بەخۆوە دەگرێت. کاتێک بەس نییە تەنیا لەرێی بابەتێتییەوە سەیری دیاردە کۆمەڵایەتییەکان بکەین، بۆ تێگەیشتنی قووڵی ماناکەیان پێویستە لەرێی فراوانکردنی هەستی «هاودڵی» (Empathy)یەوە، ناسینێکی قووڵ و هاورێک لەگەڵ هەستپێکردن له دیاردەکە وەدەستبێنین. بەکارهێنانی میتۆدی بەراوردکردنی مێژوویی له لێکۆڵینەوەکانی «ماکس ڤێبەر» له بواری ئایدیۆلۆژیا ئایینییەکاندا بەتەواوی دیارەو میتۆدە «تێگەیاندن»یەکەی بەشێکی جیانەکراوەیە له بەرهەمە هەرە ناودارەکەی واتە «ئەخلاقی پرۆتستانتی و گیانی سەرمایەداری» [٢٤/٨].

ئەو هەوڵیدەدا لەسەر بنچینەی دەروونناسیی ئایینی سەرمایەداری شیبکاتەوەو پشتیوانی لەو بۆچوونە دەکرد کە ئەخلاقی پرۆتستانتی بۆتە هۆی برەوسەندنی گیانی سەرمایەداری. بەبڕوای «ماکس ڤێبەر» پەیڕەوانی تایفەکانی چاکسازیی ئایینی (Reform)له ئایینی مەسیحیدا (سەدەی شازدەهەمی زایینی) گرنگترین هۆکاری سەرهەڵدانی بیری نرخدانان بۆ گوێڕایەڵی و هەوڵدان بۆ وەدەستهێنانی داهات و سامان لەرێی کارەوە بوون. بڕوابوون بەوەی کە سەرکەوتنە مادییەکان بەبەرهەمی ژیانێکی پڕ هەوڵ و کۆشش و عەقڵییەتی گوزەران دەژمێردرێن، و له هەمان کاتدا هەژاری ئەنجامێکی راستەوخۆی له دەستدانی بیروباوەڕە ئایینی و ئەخلاقییەکانە یەکێکە له تایبەتمەندییەکانی ئەخلاقی پرۆتستانتی.

«ڤیلفەر دوپارێتۆ» (V. Pareto-١٨٤٨) پسپۆری ئابووریی سیاسی و کۆمەڵناسی لەئیتالیا بە لەبەرچاوگرتنی «بونیادی کۆمەڵگا» وەک «سیستمێکی هاوسەنگ»، سەرچاوەی گۆڕانکارییەکی گەورە بوو لەپەرەسەندنی کۆمەڵناسیدا ئەو جەختی دەکردەوە کە پێویستە کۆمەڵناسی تەنیا سوود له میتۆدە زانستییەکان (بەتەعبیری ئەو میتۆدی لۆژیکی- ئەزموونگەری) وەربگرێت [١٢٩/٤٦].

پارێتـۆ بڕوای بەجیـاوازی «بژاردە»و«جەمـاوەر» هەبوو و بەوپێیـە مێژووی وەک مــەیدانێک بۆ جــێگرتنەوەی بەردەوامی بژاردەیەک لەلایەن بژاردەیەکی ترەوە شیدەکردەوە. ئەو بەرەتکردنەوەی تیۆری ململانێی چینایەتیی مارکسیزم، تیۆری «ڕەوتی سەرهەڵدانی بژاردەکان»ی خستەڕوو(٤٧/ ٢١٥-٢١٦). ئەو بڕوای وابوو کە ئەم ڕەوتە هۆکاری چاخەکانی گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییە خێرا وسستەکانە.

«فــێــردیناند تۆنیس» (F. Tonnies,١٨٥٥-١٩٣٦) چەمکی «کــۆمــەڵ» (Gemeinschaft)و«کۆمەڵگا» (Gesellschaft)ی لێکجیاکردەوە(ساڵی١٨٨٧).

بەرای «تۆنیس» کۆمەڵ وەک شێوەیەک لەشێوەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی بەرهەمی ئیرادەی سروشتی و ئۆرگانیکییەو شێوە سەرەتاییەکەی لەکۆمەڵگا هاوخوێنەکان، پەیوەندییە خزمایەتییەکان، کۆمەڵگای خۆجێیی، دراوسێیەتی و هتد ... بەرچاو دەکەوێت. بەپێچەوانەوە کۆمەڵگا بەرهەمی ویستی هەڵبژاردنەو پەیوەندییەکان تیایدا لەسەر بنچینەی ئارەزووی تاکەکەسی دامەزراوە و پەیوەندییە گرێبەندییەکانی بەسەر کۆمەڵگادا زاڵن (کە نموونەکەی لەدامەزراوەیەکی بازرگانیدا بەدی دەکرێت).

«تۆنیس» بەو ئەنجامە گەیشت کە ڕێڕەوی کۆمەڵایەتی باو لەقۆناغی «کۆمەڵ»ەوە و بەرەو «کۆمەڵگا» دەڕوات. بەکورتی کۆمەڵ نموونەی ژیانی کۆمەڵایەتیی لادێ نیشان دەدات، کە تیایدا خەڵک بەشدارن لەهەستێکدا کە لەئەزموون و ژیانی لێکچوویان سەرچاوەی گرتووە.

لەم شێوە ژیانەدا ئەرک و پەیوەندییە تاکەکەسییەکان لەیەکتر جیانابنەوە و گیانی هاوکاری و یەکێتی زاڵە، کە هەڵبەت لەم ڕەوشەدا گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتی ڕەهەندێکی سنوورداری هەیە. لەبەرامبەر ئەمەدا کۆمەڵگا لەسەر بنچینەی ژیانی شاری دروست دەبێت و هەستکردنی پەیوەندی بەکۆمەڵ لاوازە. جیاوازیی خەڵک لەڕووی ئەزموون و پێشینەی کۆمەڵایەتییانەوە لەلێکچوونیان زیاترە و «پەیوەندییەکان» لەژێر دەسەڵاتی «ئەرکەکان»دان. لەو حاڵەتەدا، مەرام و ئارەزووە تاکەکەسییەکان ڕۆڵێکی باڵادەستیان هەیە و گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکان خەسڵەتێکی ئاشکراو دیاریان هەیە، تەنانەت لەناویەک نەوەشدا. لەکۆتاییدا، لە «کۆمەڵ» دا پەیوەندییەکان حاڵەتێکی تاکەکەسی، نارەسمی، نەریتی سۆزاوییان هەیە،و لەکاتێکدا کە لە «کۆمەڵگا»دا پەیوەندییەکان لایەنی ناتاکەکەسی، ڕەسمی وگرێبەندی، بەرژەوەندیخوازانە، و ریالیستانەی هەیە[١٩٧/٧].

## چەند دامەزرێنەرێکی ناوداری کۆمەڵناسی

ئۆگست کۆنت (١٧٩٨-١٨٥٧): پێشنیارکردنی زانستی کۆمەڵگا
کارل مارکس (١٨١٨-١٨٨٣): بنچینەی ئابووریی ژیانی کۆمەلایەتی
هێربرت سپنسەر (١٨٢٠-١٩٠٣): زانستی پەرەسەندنی کۆمەلایەتی
ویلیام سامنێر (١٨٤٠-١٩١٠): زانستی دابونەریت و شێوازە میللییەکان
لستر وارد (١٨٤١-١٩١٣): زانستە کۆمەلایەتییەکان وچاکسازیی کۆمەڵگا
ئەمیل دورکهایم (١٨٥٨-١٩١٧): میتۆدی زانستی ئامارو شیکردنەوەی وەزیفی
جۆرج زیمێل (١٨٥٨-١٩١٨): پەیوەندی نێوان تاک وگرووپ
ماکس ڤیبەر (١٨٦٤-١٩٢٠): میتۆدی زانستی: بەراوردکردنی مێژوویی
ڤیلفەردی پارێتۆ (١٨٤٨-١٩٢٣): تیۆری بژاردەکان(النخبة)
چارلس کوولی (١٨٦٤-١٩٢٩): گرووپە رووبەڕووەکان (Face to face)
جۆرج هـ.مید (١٨٦٣-١٩٣١): دەروونناسیی کۆمەلایەتی
فێردیناند تۆنیس (١٨٥٥-١٩٣٦): جیاوازی نێوان کۆمەڵ وکۆمەڵگا
رایت میلز (١٩١٦-١٩٦٢): کۆمەڵناسیی رەخنەیی
تالکۆت پاسۆنز (١٩٠٢-١٩٧٩): چەمکدارشتن- پێکهاتەی کردارە کۆمەلایەتییەکان.

## چەند قوتابخانە یان روانگەیەک

چاوخشاندنێک بە تیۆرەکانی سەرەوە لەقۆناغی سەرهەڵدانی کۆمەڵناسیی زانستیدا سەرنجمان بۆ لای رەوتە جۆراوجۆرەکانی (لەرووی روانگە یان میتۆدەوە) شیکردنەوەی دیاردە کۆمەلایەتییەکان رادەکێشێ و کۆمەڵێک لەکۆمەڵناسانی هاوچەرخیش هەوڵی پۆلێنکردنی تیۆرەکانی کۆمەڵناسییان داوە، کە هەڵبەتە ئەم پۆلێنکردنانە جێی رەزامەندی هەمووان نین. رێبازە جیاوازەکانی کۆمەڵناسان کە هەریەکەیان بەجۆرێک کۆمەڵگا شیدەکاتەوە هەرکات پۆلێن بکرێن و ئەگەر شوێنکەوتووانی ئەم تیۆرانەش لێی بدوێن ئەوا قوتابخانەی کۆمەڵناسی دروست دەبن. کەواتە قوتابخانە کۆمەڵێک بیروڕا و فیکری بەیەکەوە بەستراو یان بەیەکەوە گونجاون کە بەناوی هەندێ لەناودارانیانەوە ناسراون.لەرووی زانستییەوە کۆمەڵناسی لەکۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەدا سەریهەڵدا و لە چوارچێوەی چەند

قوتابخانەیەکی وەک ئەرکگەریتی (الوظیفیة) و بونیادگەریتی (البنائیة)دا، دەرکەوت [٢٦/ ١٢٠]، جگە لەمە لەکایەی کۆمەڵناسیدا وەک روانگەیەکی سەربەخۆش چەند گۆرانکارییەک روویدا و ئێستا چەند کایەکی تایبەتی وەک : سۆسیۆلۆژیای بیرکاری،کۆمەڵناسیی سیستماتیک، کۆمەڵناسیی ماکرۆ و میکرۆ، کۆمەڵناسیی دینامیک یان کۆمەڵناسیی فەلسەفیش لەئارادان. لەدرێژەی ئەم باسەدا بەکورتی لەبیرورا بنچینەییەکانی چەند قوتابخانەیەکی گرنگ دەکۆڵینەوە.

فۆنێکشنالیزم(Functionalism) :

پشت بە چەمکی «پێداویستی» دەبەستێ وئەم قوتابخانەیە بەتایبەت لە ئەنترۆپۆلۆژیایی کۆمەلایەتیدا لەناوی «برۆنیسالاف و مالینۆفسکی» (١٨٨٤- ١٩٤٢، B, Malinowski) ئەنترۆپۆلۆجیستی بەرەچەڵەک پۆلۆنی جیا نابێتەوە. لەروانگەی ئەم قوتابخانەوە دامەزراوە کۆمەلایەتییەکان، خواستە سەرەتاییەکانی مرۆڤ رێکدەخەن و تێریان دەکەن. بۆ نموونە خێزان وەک پێگەیەک لەکۆمەڵگادا زانیارییە کولتوورییەکان پێشکەش بە تاکە کەس(وەک بوونەوەرێکی بایۆلۆژی) دەکات و ژیانی ئاراستە دەکات [٤٨/ ١١٠].بەرای «دورکهایم» کەیەکێکە لەدامەزرێنەرانی قوتابخانەی وەزیفی، بۆ بینینی هەر دیاردەیەکی کۆمەلایەتی پێویستە سەرەتا هۆی بوونی بدۆزینەوە و دواتر لەرۆڵ و ئەرکەکەی لەناو چالاکییەکی کۆمەلایەتیدا بکۆڵینەوە.

فۆنێکشنالیزم کە سەرەتا گریمانەیەکی میتۆدۆلۆژی بوو و دواتر بووە رێبازێکی زانستی هەوڵدەدات هەر دیاردە یان دامەزراوەیەکی کۆمەلایەتی لەرووی پەیوەندیی بەگشت پێکهاتەی کۆمەڵگاوە (کەئەو دیاردە یان دامەزراوە بەشێکە لێی) بناسێت.بەبروای فۆنێکشنالیستەکان ئاشکراکردنی چەمکی واقعیانەی هەر دیاردە یان دامەزراوەیەکی کۆمەلایەتی تەنیا لەرێی پەیبردن بە پیوەندییە وەزیفییەکانی لەگەڵ گشت دیاردەکانی تر یان دامەزراوە کۆمەلایەتییەکاندا مومکینە. ناسینی باوێکی کۆمەلایەتی پێویستە لەرێی لێکۆڵینەوەی چۆنیەتی شێوەی پەیوەندییەکەی لەگەڵ ژیانی ئابووری، یان سیاسیدا ئەنجام بدرێت. لەبەر ئەوەی وەک باوە لەم روانگەیەدا، لایەنێکی «سوودخوازانە» بۆ واقیعە کۆمەلایەتییەکان دەخرێتەروو، زۆرجاران خەڵکانی تر لەدژی ئەم روانگەیە وەستاونەتەوە، چونکە قبوولکردنی ئەم گریمانەی کە دەڵێ هەموو شتێک لەناو سیستمێکی کۆمەلایەتیدا خاوەن ئەرکێکی دیاریکراوە، بوارێکی ئەوتۆ بۆ گۆرانکارییەکان ناهێڵێیەوە[٤٨/١٠٩- ١١٠].

وەزیفە کۆمەڵایەتییەکان هەم حاڵەتی ئاشکرایان هەیە وهەم شاراوە و نیمچە دیاریکراو. بەبڕوای «ڕۆبرت مێرتۆن(R.K. Mrton) وەزیفە ئاشکراکانی دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان حاڵەتێکی کراوە، دیارکەوتوو و هۆشیارانەیان هەیە، و لەبەرانبەر ئەمەشدا وەزیفە نادیارەکان، حاڵەتێکی شاراوە، رانەگەیەنراو و ناهۆشیارانەیان هەیە. بۆ نموونە یەکێک لە وەزیفە ئاشکراکانی زانکۆ پێگەیاندنی هێزی مرۆییە لە لقە زانستی و هونەرییە جۆراو جۆرەکاندا و لەهەمان کاتدا وەزیفەیەکی نادیاری هەیە ئەویش لەوانەیە ڕوودانی هاوسەرێتی بێت لەنێوان قوتابییاندا.

بەپێی تێڕوانینی وەزیفییەکان هەموو کۆمەڵگایەک حاڵەتێکی نیمچە نەگۆڕی هەیە، هەر بەشێکی کۆمەڵگا بەزۆری بۆ مانەوەی خۆی هەوڵدەدات، هەموو کۆمەڵگایەک بەشێوەیەکی گشتی حاڵەتێکی تەبای هەیە، وسەقامگیریی کۆمەڵایەتی بەندە بە ڕێکەوتنی نێوان ئەندامەکانی [٥١٣/٧]. لەهەمان کاتدا وەزیفییەکان دان بەوەدا دەنێن کە هەردەم گشت بەشە جیاجیاکانی کۆمەڵگا دەورنابینن لەهێنانەدیی سەقامگیریی کۆمەڵگاکە و بەم شێوەیە چەمکی «وەزیفەی خراپ» (Dysfunction) دێتە ئاراوە. لەوانەیە توخمێکی ژیانی کۆمەڵایەتی هەستێ بەتێکدانی سیستمی کۆمەڵایەتی یان بۆ کەمکردنەوەی سەقامگیریی کۆمەڵایەتی هەنگاوبنێت [١٨/٢٠].

### بونیادگەری

«بونیادگەری» (Structuralism) وەک میتۆدێکی شیکردنەوە، کە سەرەتا لەلایەن «فێردیناند دی سۆسۆر» (١٩١٣-١٨٥٧ F. De Saussure ) لەزمانناسیدا سەریهەڵدا و پەرەی سەند،بەهۆی «کلۆد لیڤی شتراوس» (C. Levi- Shtrauss) ەوە لە مرۆڤناسیی کۆمەڵایەتیدا بەکارهێنرا[١٢٥/١٢٤/٤٩]. ئامانجی شیکردنەوەی بونیادگەری ئەوەیەکە هەستێ بەپشکنینی«بونیادەکان» کە لەبنەڕەتدا حاڵەتێکی ناهۆشیاریان هەیە و لە پێکهاتەی واقیعە کۆمەڵایەتییەکاندا خۆیان حەشارداوە: بۆنموونە دۆزینەوەی بونیادەکان لەحاڵەتی وەک بنەماکانی خزمایەتی، ئەفسانەکان، ڕێوڕەسمە کۆمەڵایەتییەکان، هونەرەکان، ئایدیۆلۆژییە سیاسییەکان، هەڵسوکەوتەکانی تایبەت بەخواردن [٢٤٦/٤٨].

«بونیاد» بەزمانێکی سادە بریتییە لەشێوازێک کە بەهۆی ئەوەوە بەشەکانی شتێک ڕێکخراون. ئۆتۆمبێل کە ڕۆژانە بەکاریدێنین بونیادی خۆی هەیە و هەروەها

یەکەکانی تێدا نیشتەجێ بوون وەک خانوو، قوتابخانە، و فەرمانگە کە تاکەکەسان تێیدا دەژین و دەخوێنن و کاردەکەن، هەریەکەیان پێکهاتەی خۆیان هەیە[ ٤٨/٣٠ ]. سەرەڕای ئەوەی نموونەی وەک ئۆتمبێل یان خانووبەرە بەسوودن بەڵام پڕاوپڕ تەواونین. بۆ لێوردبوونەوەی زێتر باسەیری فەرمانگەیەک بکەین. لەفەرمانگەیەکدا هەم بینایە هەیە هەم پرەنسیپ و ڕێنماییەکان، و پرۆسەگەلێک کە بەکردەوە پەیوەندی بەفەرمانبەران، موراجیعەکان و دەزگاکانەوە هەیە. وەک دەزانین هەندێ لەفەرمانگەکان بچووک و سادەن و هەندێکی تر گەورەو ئاڵۆزن. بونیاد، سیستمێکی کۆمەڵایەتی تەباو گونجاوە کە لەچوارچێوەیدا پرۆسەی کۆمەڵایەتی دروست دەبن. بونیاد بریتییە لەشێوازێک کە بەشە جیاجیاکانی دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی ئاوێتەی یەکتری دەبن و بەیەکەوە دەبەسترێنەوە. لەبونیادێکدا هەربەشێک یان توخمێک لەگەڵ توخمەکانی تردا پەیوەندیی هەیە. لەو ڕووەوە هەر گۆڕانێک لەهەر توخمێکدا ڕوودات گۆڕانکاری لەتوخمەکانی تری بونیادەکەی لێدەکەوێتەوە.

کاتێک یەکێک لەڕێنماییەکانی وەرگرتنی قوتابی(بۆنموونە نمرەی تاقیکردنەوەکان، مەرجی تەمەن، وهتد...) دەگۆڕێن، بەرەبەرە تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵی قوتابییانیش (بەدوای ئەم گۆڕانەدا) دەگۆڕێت [ ١٢٤/٢٦ ]. زۆربەی کۆمەڵناسان بونیادی کۆمەڵایەتییان بەوە پێناسە کردووە کە بریتییە لە گونجانکارییە سەقامگیرەکان، و تۆڕی ڕێسا و چوارچێوە نادیارەکان، کە ڕێنوێنیکەری ڕەفتاری مرۆڤە. پێکهاتەی کۆمەڵایەتی ئەو هەستەمان لا دروست دەکات کە بەشی هەرە زۆری ژیانی کۆمەڵایەتی لە دووبارەبوونەوە دایە. بۆ نموونە بونیادی کۆمەڵایەتی کۆلێژێک لەبەرچاوبگرە. لەهەر کۆرسێکدا قوتابی دەچێتە ناو وانەی نوێوە، بەرەبەرە گرفتی گونجانی لەگەڵ وانەو مامۆستا نوێیەکان کەم دەبێتەوە. وانە جیاجیاکانی لقێکی زانستی لەماوەی چەند ساڵێکدا یەک لە دوای یەک دەخوێنرێن، لە هەر کۆرسێکدا ژمارەیەک لە قوتابییانی کۆلێژ زیاد دەبن و ژمارەیەکی تر دەردەچن. کار بەدەستانی کۆلێژ دەپرژێنە سەر کاروبارە کارگێڕییە جیاجیاکان (بودجە، کاروباری فێرکردن، تاقیکردنەوەکان، تۆژینەوە.. هتد). هەموو ڕۆژێک گرووپگەلێکی جیاجیا دێنە کۆلێژەوە و کە کات تەواو بوو هەریەکەیان بەپێی بەرنامەی جێگیری خۆی دەچێتە دەرەوە. هەر بۆیە ئەوەی بەسەر خێزانێک، فەرمانگەیەک، فرۆشگایەک، سەندیکایەک، سینەمایەک، یانەیەکی وەرزشی،

کۆمپانیا، و تەنانەت ولاتێکدا دێت، هەموویان سیمای بونیادە کۆمەلایەتییەکانن ژیانی ئادەمیزاد وێنەیەکی رێکخستن و کۆنترۆڵ دەدا بەدەستەوە. [٢/٩٤-٩٥].

بونیادی کۆمەلایەتی دەشێ شێوەیەکی رەسمی یان نارەسمی بەخۆوە بگرێت. بۆ نموونە لە کارگەیەکدا، دەتوانین بونیادی رەسمی لە رێی لێکۆڵینەوە لە هەیکەلی رێکخستن و دیاریکردنی فرمانی بەشەکان و یەکەو ئیش و کارەکانی ناو ئەو کارگەیەدا بناسین، لە کاتێکدا کە بۆ لێکۆڵینەوەی بونیادی نارەسمی پێویستە سەرنجی گرووپە نارەسمییەکان و تۆڕی پەیوەندییە کۆمەلایەتییەکانی ناو کارگەکە بدەین. ئەم دوو جۆرە بونیادە پەیوەندییان بەیەکترەوە هەیە، بەلام لەوانەیە هەمیشە لەگەڵ یەکتردا نەگونجێن [٤/٣].

بە بڕوای «جان پیاجێ» (J.Piaget-١٨٩٦-١٩٨٠) دەروونناسی سویسری، بونیاد، سیستمێکە لە گۆڕانی شێوەکاندا کە وەک سیستمێک کۆمەڵە یاسایەکی گرتۆتەخۆ (لە بەرانبەر ماهیەتی توخمەکانیدا) کە بەردەوامی و پتەوبوونی لەرێی ریساکانی گۆڕانی شێوەکانیدا دروست دەبێت، بێ ئەوەی ئەم گۆڕانی شێوانە سنوورەکانی ببڕێت یان داوای توخمەکانی دەرەوە بکات. بە کورتی هەر بونیادێک سێ تایبەتمەندی هەیە: کۆگیری، گۆڕانی شێوە، و رێکخستنی خۆبەخۆ. بەڕای «جان پیاجێ» بونیاد سیستمێکی داخراوە کە بەشێوەیەکی خۆبەخۆیی (تلقائی) مانەوەو بەردەوامبوونی خۆی رێکدەخات [٥٣/٦-٧].

لە کۆتاییدا دەتوانین بڵێین بونیادگەری قوتابخانەی هاوبەشی هەندێ لە زانستە مرۆییەکانی وەک زمانناسی و مرۆڤناسیی کۆمەلایەتییە، کە پێی وایە دیاردە کۆمەلایەتییەکان لە توخم گەلێک پێکهاتوون کە لە ژێر کارتێکردنی ئەو یاسایانەی کە بەسەریاندا زاڵە لە رووی جەوهەرو ئەرکەوە، هەموویان پەیوەندییان بە یەکترەوە هەیە. بونیادگەری خۆی بە فەلسەفە لە قەڵەم نادات (بەپێچەوانەی بۆچوونی رەخنەگرانی) بەڵکو خۆی بە تیۆرێکی میتۆدۆلۆژی دەزانێت، میتۆدێک کە دەتوانێت لە هەموو کێشەیەک بکۆڵێتەوە [٤٨/٢٤٦].

## قوتابخانەی ململانێ

بەپێچەوانەی وەزیفییەکان کە جەخت لەسەر سەقامگیریی کۆمەڵگا دەکەن، لایەنگرانی قوتابخانەی ململانێ (Conflict) پێیان وایە کۆمەڵگا لە حاڵەتی ململانێ و پێکدادان (Tension)ی بەردەوام دایە. ئەمانە لەو بڕوایەدان کە رەفتاری کۆمەڵایەتی لە پەیوەندی بە چەمکگەلێکی وەک ململانێ و پێکدادانی نێوان گرووپە رکەبەرەکاندا چاکتر دەناسرێت. مەرج نییە ئەم ململانێیە حاڵەتێکی توندوتیژانەی هەبێت و دەشێ لە چەند شێوەیەکی وەک وتووێژی نێوان کرێکاران و خاوەن کارەکان، مشتومڕی گرووپە سیاسییەکان، کێبڕکێی نێوان گرووپە ئایینییەکان، تاووتوێکردن لە بواری شێوەی دیاریکردنی بودجە لە کاروباری جیاواز، و زۆر بواری دیکەی لەم جۆرەدا دەربکەوێت. لە لێکۆڵینەوەی هەر کولتوور، رێکخراو یان گرووپێکی کۆمەڵایەتیدا کۆمەڵناسیی ململانێخواز دەیەوێ بزانێت کە چ کەسانێ قازانج دەکەن و چ کەسانێ دەبنە قوربانی، و چ کەسانێ بەسەر ئەوانی دیکەدا زاڵدەبن. ئەم کۆمەڵناسانە بایەخ بەو ململانێیانە دەدەن کە بۆ نموونە لەنێوان ژن و پیاوان، باوان و منداڵان، شارەکان و دەوروبەریان، رەش و سپییەکاندا هەیە. گرنگ ئەوەیە ببینین کە دامەزراوە بەهێزەکانی کۆمەڵگا، وەک خێزان، حکوومەت، قوتابخانەو ئامرازەکانی گەیاندن چ هەڵوێستێک لە بەرانبەر ئەم ململانێیانە وەردەگرن[ ١٩/٢٠ ].

روانگەی ململانێخوازان کۆمەڵگا بە مەیدانێکی جەنگی پڕ لە گرووپە جیاوازەکان لە قەڵەم دەدات کە تەبایی بەشێوەیەکی زۆرەملێ نەک لەڕێی بیروباوەڕو بەها هاوبەشەکانەوە، شێوە دەگرێت، و سەقامگیرییەکەی نەک هەر نیشانەی ساغیی کۆمەڵگاکە نییە، بەڵکو جۆرە وەستانێکی کاتییە لەرووی سەرهەڵدانی دژایەتییەکانەوە.

بەپێی قوتابخانەی ململانێ، هەموو کۆمەڵگایەک بەردەوام لە گۆڕاندایە، هەر بەشێکی کۆمەڵگا بەزۆری بەشداریدەکات لە گۆڕینی بارودۆخی خۆیدا، هەموو کۆمەڵگایەک لە حاڵەتی پێکدادان و ململانێ دایە، و سەقامگیریی کۆمەڵایەتی بەرهەمی پیادەکردنی گوشاری گرووپێکە بەسەر گرووپێکی دیکەدا [ ٥١٣/٧ ].

### قوتابخانەی کارلێکی کۆمەڵایەتی

وەزیفییەکان و ململانێخوازەکان هەردووکیان کۆمەڵگا لە ئاستی درشت (ماکرۆ)دا شیدەکەنەوە، لە بەرانبەر ئەمانەدا هەندێ لە کۆمەڵناسانی هاوچەرخ زیاتر بایەخ بە لێکۆڵینەوەی کارلێکی کۆمەڵایەتی (Social Interaction) لە ئاستی میکرۆ (گرووپە بچووکەکان، وتوویژی برادەرانە، خێزان و هتد... )دا دەدەن. «جۆرج هێربرت مید» (G.H. Mead) بەدامەزرێنەری ئەم قوتابخانەیە دادەنرێت، چونکە کاتێکی زۆری لەرێی لێکۆڵینەوەی پەیوەندیی نێوان تاکەکەسان خەرج کردو بایەخێکی تایبەتی بەرەفتارگەلێکی وەک زەردەخەنە، خۆدەرخستن، و سەر راوەشاندن دەدا.

بەبڕوای لایەنگرانی قوتابخانەی کارلێکی کۆمەڵایەتی «رەمزەکان» (Symbols) گرنگترین بەشی پەیوەندییە مرۆییەکانن، ئەو شێوانەی پەیوەندی کە ئەمرۆ پەیوەندییە بێ ئاخاوتنەکانیان (غیرکلامي) پێدەڵێن، و بەیەکێک لە جۆرەکانی رەفتاری مرۆیی لە قەڵەم دەدرێت[ ۲۰/۱۹].

لە روانگەی ئەوانەوە دیاردەکان لە ئامانج و مەبەستە ستراتیژییەکانی بکەرەکانیانەوە سەرچاوە دەگرن، و ناتوانین دیاردەکان بە بەرەنجامی ژینگەی کۆمەڵایەتی تاک یان سیستەمە گشتییە باڵادەستەکان بەسەر کۆمەڵ (فۆرمە کۆمەڵایەتییەکان، بونیادەکان) لە قەڵەم بدەین.

یەکێک لە بابەتە نوێیەکانی کۆمەڵناسی، واتە «کۆمەڵناسیی تۆڕەکان»(Net works) کە هەڵدەستێ بەلێکۆڵینەوە لە کاریگەرییە کۆمەڵایەتییەکانی کەناڵەکانی زانیاری (کە لە ئەنجامی پەرەسەندنی تۆڕەکانی کۆمپیوتەرەوە هاتۆتە ئاراوە)، لێکۆڵینەوە لە گرووپە تایبەتی، یان دیاریکراوەکان بەکارێکی بنەڕەتی دەزانێت [۲۰۵ / ۹۵].

### قوتابخانەی شیکاگۆ

ئەم قوتابخانەیە لە دەوروبەری ساڵانی ۱۸۹۰ بەدواوە، واتە دوای دامەزراندنی گرووپی کۆمەڵناسی لە زانکۆی شیکاگۆ برەوی سەند، ئەو تۆژینەوە سۆسیۆلۆژییانەی کە لە درێژەی ساڵانی ۱۹۱۵ تا ۱۹٤۰ لەلایەن مامۆستایان و قوتابییانی زانکۆی شیکاگۆ لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە ئەنجام دران ناوی «قوتابخانەی شیکاگۆ» (Shicago School)یان لێنراوە. بۆ یەکەم جار لە ساڵی

١٩٣٠ ماوەیەک دوای دەستپێکردنی ئەم بزووتنەوەیە، «لۆتەر بێرنارد» (L. Ber-nerd) ئەم قوتابخانەی لەریزی قوتابخانەکانی دیکەی کۆمەڵناسیی ئەوسا دایەناسین. سەرەڕای ئەوەی لە قوتابخانەی شیکاگۆدا، هەردەم رەوتێکی تەباوگونجاوی فکریی، کە خاوەن روانگەیەکی تیۆری هاوبەش بێت بەرچاو نەکەوتووە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم قوتابخانەیە کۆمەڵە تایبەتمەندییەکی هەیە کە ناسنامەیەکی تایبەتی (لانی کەم لە کۆمەڵناسیی ئەمریکیدا) پێ دەبەخشێت [ ٣/ ٢٨].

یەکەم تایبەتمەندیی کۆمەڵناسیی قوتابخانەی شیکاگۆ ئەنجامدانی تۆژینەوەی ئەزموونگەرییە. لێکۆڵینەوە سۆسیۆلۆژییەکان بەرەو شێوازی تۆژینەوەی پشتبەستوو بەمیتۆدی زانستی رۆیشتن، ئەمە لە کاتێکدا کە پێشتر زیاتر لایەنێکی فەلسەفی و رۆژنامەنووسانەی هەبوو. دووەم تایبەتمەندیی ئەم قوتابخانەیە جەوهەری شارناسییانەی کۆمەڵناسییە. کۆمەڵناسان لەرێی بەکارهێنانی رێبازە زانستییەکانەوە لە کێشە کۆمەڵایەتییەکانی شاری شیکاگۆیان کۆڵییەوە، کێشەگەلێک کە هەندێکیان وەک کۆچکردن و توانەوەی کۆمەڵایەتیی ملیۆنان کۆچکردووی کۆمەڵگای ئەمریکا، پەیوەندی بەگشت شارە گەورەکانی ئەمریکاوە هەبوو. سێیەم خەسڵەتی ئەم قوتابخانەیە بایەخدانی تایبەتییە بەکۆمەڵناسیی تاوان و تاوانکاری و [٤٨/٤]. بەکورتی ئەو لێکۆڵینەوانەی کە لە چوارچێوەی ئەم قوتابخانەیەدا ئەنجام دراوە زیاتر لە بواری کێشەکانی شار، لادانە کۆمەڵایەتییەکان، رێکخراوە کۆمەڵایەتییەکان و کێشەکانی ئیش و کاردابوون، و بیرۆکەکانی ئەم قوتابخانەیە لەسەر ئەم سێ تێڕوانینەی خوارەوە دامەزراوە[ ٢٦٤/ ٥٠-٢٦٥]:

أ- مەیلی بینین (الملاحظة) و ئەنجامدانی لێکۆڵینەوە بەشێوەیەکی راستەوخۆ لە شوێنەکەدا، وەک کەرەستەیەکی سەرەکی لە تۆژینەوە کۆمەڵایەتییەکاندا.

ب- شیکردنەوە ئیکۆلۆژییەکانی دیاردە شارییەکان و دروستکردنی پەیوەندی لە نێوان سوود وەرگرتن لە کەشوهەوای شار لەگەڵ تێڕوانین و رەفتاری تاکەکەس و گرووپەکان.

پ- کاری گرووپی: بارودۆخی کۆمەڵایەتی بەئەنجامێکی کردەوە تاکەکەسی و گرووپییەکان لە قەڵەم دەدرێت. بەم پێیە رێکخستنی کۆمەڵایەتی شتێک نییە کە لە دەرەوە بەسەر تاکەکەساندا بسەپێندرێت، بەڵکو ئەنجامی پرۆسەیەکی

ئالۆزە کە لە کارلێکە کۆمەڵایەتییەکانەوە سەرچاوە دەگرێت. کۆمەڵناسانی وەک «پارک» (Park)، «بێـــرجس» (Burgess)و «ویرث» (Wirth)و «بێکەر» (Becker) بەپێشڕەوی ئەم قوتابخانەیە لە قەڵەم دەدرێن.

### قوتابخانەی فرانکفۆرت

قـوتابخـانەی فـرانکۆرت (Die Frankfarter Schule)، بەو شـێـوە تێـڕوانینە دەگوترێت کە دوای دامـەزرانی «ئەنسـتیـتۆی لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایـەتی» لە ساڵی ١٩٢٣ لە فرانکفۆرتدا دەستی پێکرد، ئەگەرچی زاراوەی قـوتابخـانەی فـرانکفۆرت لە ساڵی ١٩٥٠ بەدواوە لە وڵاتی ئەڵمـانیـادا برەوی سەند. پێویسـتـە بڵـێین کە لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەدا هاودەم لەگەڵ گەشەکردنی بیری کۆمەڵایەتی لەم وڵاتەدا بوارێکی تازە هاتە ئاراوە کە حسێبی کۆمەڵناسیی بۆ دەکرا نەک فەلسـەفە (لانی کـەم بەواتای ئێـسـتـای وشـەکـە)و ئەویش بریتی بوو لە تێـڕوانینێکی هاوشـێـوەی کۆمەڵناسی و پشـتـبەسـتوو بەئەخلاق. لەگـەڵ دامـەزرانی ئەنسـتیـتۆی لێـکۆڵینەوە کۆمـەڵایەتییـەکان لە فـرانکفۆرتدا ئەم رابردووە فـیـکرییە کاریگەریی هەبوو لەسەر لێکۆڵینەوەی بیرمـەندەکانی و کۆمـەڵێک بەرهەم هاتنەدی کە تیایدا کۆمەڵناسی، بیرکردنەوە لە بارەی شارستانییەت و مێژوو، بیرە کۆمەڵایەتییەکان، ئەخلاقی نوێی پشـتـبەسـتوو بەبیروڕاکانی «کانت» و فەلسـەفەی بەهاکـان تێکەڵ بەیەکتر کرابوون. ئەوانەی ئەم بیروڕایانەیان بڵاوکردەوە پێکهاتبوون لە چەند کەسێک لەوانە ماکس ڤێبەر (M.Weber)، «ماکس شیلەر» (M. Scheler)، «لیـۆپولد فـون ڤیـزێ» (L. V.Wiese)، «ئادۆلف راینـاخ» (A. Reinach) «ویلهێلم سۆمـبارت» (W. Sombart) و«کـارل یاسـپێـرس» (K.Jaspers)، «جـۆرج زیمێل» (G.simmel). لەڕێی چاوخـشـانـدن بەناو ئەم بەرهەمـانـەدا دەتوانین پەی بە سـەرچاوەی بیـروڕاکـانی قـوتابخـانەی فـرانکفـۆرت بەرین، ئەوەی لە ئەڵمـانیـادا بە «ناسـینی ئەخـلاقی - کۆمـەڵایەتی» ناو دەبرا تێکەڵێک بوو لە زانسـتـە کۆمـەڵایـەتییـەکـان، ئەخلاق، فەلسەفەی مێژوو و کولتوور، دەروونناسیی کۆمەڵایەتی و ئابووریی سیاسی [٢٩/ ٥-٢٠].

سـەرچاوەی تیـۆری قـوتابخـانەی فـرانکفـۆرت لەگـەڵ تیـۆری رەخنەییـدا دەست پێـدەکـات، کـە «مـاکس هۆرکـهـایمەر» (M. Horkheimer) واتە دامـەزرێنەری قوتابخـانەی فرانکفۆرت لە ساڵانی ١٩٣٠دا خستـیـیەڕوو و سەرەنجام لە ساڵی

۱۹۳۷دا وتارێکی تیروتەسەلی لە ژێر ناونیشانی «تیۆری تەقلیدی و تیۆری ڕەخنەیی» ئامادەکرد. قوتابخانەی فرانکفۆرت لە ماوەی ساڵانی جەنگدا (جەنگی دووەمی جیهانی) پێگەی جوگرافیی خۆی لە دەست داو لەگەڵ تەواوبوونیدا دووبارە چالاکییەکانی خۆی دەست پێکردەوە. کرۆکی سەرەتایی قوتابخانەی فرانکفۆرت لەسەر بناغەی «تیۆر» دامەزرابوو. لە قۆناغی «تاراوگە» (ساڵانی جەنگ)دا کارەکانی قوتابخانەی فرانکفۆرت لەلایەن «تیۆدۆر ئەدۆرنۆ» (T. Adorno)وە درێژەیان هەبوو و دوای ئەویش دەشێ ناوی کەسانی وەک «هێربرت مارکۆزە» (H. Marcuse) «ڤاڵتەر بنیامین» (W. Benjamin)، (ر. س) «ئێریک فرۆم» (E. Fromm) و «یورگن هابەرماس» (Y. Habermas) بەرین، هەرچەندە هەندێکیان دواتر چ بەهۆی کۆچکردن بۆ ئەمریکا یان گۆڕانی بیروڕاکانیان لە قوتابخانەی فرانکفۆرت دوورکەوتنەوە.

بەپێی ئەوەی گوتمان «قوتابخانەی فرانکفۆرت» ناونیشانێکە بۆ ڕووداوێک (دامەزراندنی ئەنستیتۆ)، پرۆژەیەکی زانستی (لەژێر ناونیشانی فەلسەفەی کۆمەلایەتی)، ڕوانگەیەک (تیۆری ڕەخنەیی) و هەروەها ڕەوتێکی تیۆری بەردەوام و لە هەمان کاتدا جیاواز (پێکهاتوو لە بیرمەندانی پەرتوبڵاو). سەرەڕای ئەمانە ئەوەی کە سیمای دیاریکراوی سەرەکی و فاکتەری دەستنیشانکەری ناسنامەکەیەتی تایبەتمەندیی «ڕەخنەییانە»ی زاڵە بەسەر بیروڕاکانی تایبەت بەم قوتابخانەیە.

زەمینەکانی تیۆری ڕەخنەیی قوتابخانەی فرانکفۆرت چەند لایەنێکی فراوان دەگرێتەخۆ لەوانە: ڕەخنەگرتن لە چەمکی عەقڵ لای هیگڵ، ڕەخنەگرتن لە چەمکی ناسنامە، و ڕەخنەگرتن لە تێڕوانینە وەزعییەکانە. دەتوانین بگەینە ئەو ئەنجامەی کە کۆمەڵناسیی ڕەخنەیی لە سەرەکیترین دەستکەوتەکانی قوتابخانەی فرانکفۆرتە. دەسەڵات چەمکێکی سەرەکییە لە کۆمەڵناسیی ڕەخنەیی داو گەیاندن (اتصالات) وەک فاکتەرێکی ڕەخنەیی کۆمەلایەتی لەبەرچاو دەگیرێت. مارکسیزم بۆ ئەم قوتابخانەیە وەک ئامرازێک وایە کەتەنیا لە حاڵەتە زەرووربیەکاندا سوودی لێ وەردەگرن ئەویش جۆرێک لەجۆرەکانی مارکسیزم کە دەتوانین ناوی بنێین«مارکسیزمی ئەکادیمی». لە تیۆری ڕەخنەییدا شیکردنەوەی دەروونیش وەک کەرەستەیەک سوودی لێوەردەگیرێت و بە«ئامرازێک» لەو «سندووقی ئامراز»ە ڕەخنەییە لە قەڵەم دەدرێت، چونکە بۆ خزمەتی دەروونناسیی کۆمەڵایەتی بەکاردەهێنرێت. «ئێریک فرۆم» لەو کەسانەیە کە بیروڕاکانی خۆی لەم لایەنەدا

خستەکارو هەوڵیدا شیکردنەوەی دەروونی لە چەمکێکی وەک «لیبیدۆ» (Libido) پاکبکاتەوە. لە کۆتاییدا پێویستە بڵێین لە قوتابخانەی فرانکفۆرتدا «جوانناسیی رەخنەیی»ش شوێنێکی تایبەتی هەیە کە دەتوانین بابەتەکانی تایبەت بەم بوارە لە لێکۆڵینەوەی رەخنەیی لەمەڕ کولتووردا بەدی بکەین. لەو چەمکانەی کە لەم بوارەدا ئیشیان لەسەرکراوە بریتین لە «مۆسیقاناسیی رەخنەیی» و هونەرو بەرهەمهێنان، و ئەدەبی رەخنەیی [٢٩/٥-٢٠].

**قوتابخانەکانی کۆمەڵناسی و ڕێبازە هەنووکەییەکان**

کۆمەڵناسان بەشێوەی جیاجیا لە کۆمەڵگا دەکۆڵنەوە. هەندێکیان کۆمەڵگا بەخاوەن گشتایەتی و یەکێتییەکی کەم تا زۆر جێگیر دادەنێن چونکە لە ژێر کاریگەریی بەردەوامی خێزان، ئایین، ڕێکخراو، و دامەزراوە کۆمەڵایەتییە تەباکان دان. هەندێکی تریان کۆمەڵگا وەک پێکهاتەیەک کە پڕیەتی لە گرووپی ناکۆک و دژبەیک دەبینن، کە بۆ وەدەستهێنانی بەرژەوەندییە دیاریکراوەکانیان لە پێشبڕکێ دان. لەلای گرووپێکی تری کۆمەڵناسان سەرنجڕاکێشترین لایەنی ژیانی کۆمەڵایەتی بریتییە لە پەیوەندییە رووبەڕووە ئاسایی و رۆژانەییەکانی نێوان تاکەکەسان [٥١/٥-٧].

**بەراوردکردنی چەند قوتابخانەیەکی کۆمەڵناسی لە رووی چەند بابەتێکەوە [٣٧/٣]**

| بابەتی بەراورد کردن | قوتابخانەی وەزیفی | ململانێ | کارلێک |
|---|---|---|---|
| ئاستی شیکردنەوەو لێکۆڵینەوە | درشتە کۆمەڵناسی (ماکرۆ) | درشتە کۆمەڵناسی | وردە کۆمەڵناسی (میکرۆ) |
| جەوهەری کۆمەڵگە | سیستمی کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵە بەشێکی سەربەخۆ پێکهاتووە | سیستمی کۆمەڵایەتی لەژێر کاریگەری بەرژەوەندی گرووپی دایە | واقیعی کۆمەڵایەتی لەسەر پەیوەندییەکانی تاکەکەسان بەیەکەوە دامەزراوە |
| بناغەی کارلێکی کۆمەڵایەتی | ڕێککەوتنی کۆمەڵایەتی بەهۆی بڕوابوون بە بەها هاوبەشەکانەوە | ململانێ، دەسەلات و شەڕ | مانا بەخشین بەشتەکان، تاکەکان، رووداوو کۆمەڵگەو رەمزەکان |
| تەوەری لێکۆڵینەوە | ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی و پاراستنی سیستمی کۆمەڵایەتی لەڕێی گێڕانی ئەرکە سەرەکییەکانەوە | ئەو بەرژەوەندییانەی کە ئەندامانی کۆمەڵگە لێکجیادەکاتەوە | گەشەکردنی تاکگەرێتی و پەیوەندی چالاک و دینامیک لە نێوان تاک و کۆمەڵ |

له راستیدا، ئەم روانگە جۆراوجۆرانەی سەیرکردنی کۆمەڵگا، هەموویان میتۆدی تاقیکردنەوەی یەک دیاردەن. لە لێکۆڵینەوە سۆسیۆلۆژییەکانی ئێستادا یەک یان تێکەڵێک لەم روانگە تیۆرییانە بۆ ناسینی رەفتاری مرۆیی بەکاردەهێنرێت. بەڵام لە وەڵامی ئەو پرسیارەی کە دەڵێ: پێویستە کۆمەڵناسی کام لەم قوتابخانە یان رێبازانە هەڵبژێرێت، دەتوانین بڵێین بۆ لێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتییەکان لەم ساتەوەختەدا کۆمەڵناسی سوود لەگشت ئەم رێبازانە وەردەگرێت و کۆمەڵناسیی ئەمرۆ کەمتر هەوڵدەدات وەک پێشینانی خۆی لە چوارچێوەی یەک قوتابخانەدا بگیرسێتەوە. ئەگەر بابەتی پێویستبوونی دانانی سزای توند بۆ تاوانباران لەبەرچاوبگرین لەوانەیە وەزیفییەکان داکۆکی لەسەر کاریگەرێتی ئیجابیی سزای توند لەسەر کەمبوونەوەی رێژەی تاوانەکان بکەن. لایەنگرانی رێبازی کارلێکی کۆمەڵایەتی، لەوانەیە بایەخ بە کاریگەری بەها خێزانییەکان و گرووپە خەتاکارەکان (لارێبووان) لەسەر تاوانباران بدەن. هەروەها لایەنگرانی قوتابخانەی ململانێ باس لەوە دەکەن کە ئایا ئەوانەی ئەم سزا توندانە دەیانگرێتەوە لەبنەڕەتدا گرووپە هەژار وکەمخوێندەوارەکانی کۆمەڵگانین؟

لەوانەیە هەندێ لە کۆمەڵناسان ئەم بۆچوونە بخەنەڕوو کە قوتابخانەی جیاجیا لەگەڵ یەکتر کۆناکرێنەوە، و چاکتر وایە کۆمەڵناس روانگەیەکی دیاریکراوی هەبێت. لەبەرامبەر ئەمەدا کۆمەڵێکی تر دەڵێن لەوانەیە لە لێکۆڵینەوەی لایەنە جیاجیاکانی یەک بابەت کەڵک لە چەند روانگەیەکی جیاواز وەربگرین، یان لە بنەڕەتدا چ پێویست دەکا پێڕەوی لە روانگەیەکی تیۆری قاڵبگرتوو بکەین. قەبارەی ئەم کۆمەڵە توێژینەوە سۆسیۆلۆژییانەی هیچ روانگەیەکی تیۆری دیاریکراویان تێدانییە هەمیشە لە زۆربوون دایە.

### کورتەی بەش

١- لەسەردەمانی رابردوودا بیرمەندان و فەیلەسووفان زیاتر لە رووی فەلسەفی و ئەخلاقییەوە سەرنجی ژیانی کۆمەڵایەتییان دەدا.

٢- لەسەردەمانی زۆر زوودا جۆرە کۆمەڵناسییەکی کردەیی نەنووسراوە لە رێی کەڵک وەرگرتن لە هونەرەکانی کاریگەری خستنەسەر خەڵکانی تر لە ئارادا بووە.

٣- کۆمەڵناسی هەمیشە لە روانگە و بەئامانجی جیاجیاوە وەک کلیلێک بۆ

کۆنترۆڵکردنی چارەنووسی مرۆڤ و بۆ پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی لە قەڵەم دراوە.
٤- مێژووی کۆمەڵناسی لە هزرە کۆمەڵایەتییەکانەوە دەست پێدەکات. ئەم قۆناغە دوورودرێژترین قۆناغە لە مێژووی کۆمەڵناسیدا، و نموونەگەلێکی زۆری ئەم هزرە کۆمەڵایەتییانە لەشارستانییەتە کۆنەکان و تەنانەت لەسەردەمی ئێستاشدا بەدی دەکەین. ئەم هزرانە دیاردەگەلێکی وەک کۆچکردنی دانیشتووان، چینە کۆمەڵایەتییەکان، پەروەردە و فێرکردن، ژینگە، بونیاد و رێکخستنی خێزان، یاساو رێساکان، بەها کۆمەڵایەتییەکان، دڵنیاکردنی کۆمەڵایەتی و هتد... دەگرێتەوە.
٥- فەلسەفە کۆمەڵایەتییەکان لە هزرە کۆمەڵایەتییە رێکوپێکەکانەوە دروست دەبن و زۆربەیان شێوازو رێبەرگەلێکی تایبەتییان تێدایە بۆ چاکترکردنی رەوشی کۆمەڵایەتی.
٦- لە یۆنانی کۆندا ئەفلاتوون بیرۆکەی کۆمەڵگایەکی نموونە (یۆتۆپیا)یی خستەڕوو.
٧- «ئەرستۆ» بەیەکێک لەلایەنگرانی یەکسانیی سیاسی لەسەردەمی کۆندا لەقەڵەم دەدرێت.
٨- فارابی کۆمەڵگاکانی مرۆڤایەتی بۆ دوو جۆری «فاضلة» و «جاهلیة» پۆلێن کرد، و تایبەتمەندییەکانی هەریەکەشیانی روونکردەوە. ئەو بایەخی بەپێوەری ئەخلاقی دەدات لە پۆلێنکردنی کۆمەڵگاکاندا و بیرۆکەی کۆمەڵگای نموونەییشی خستەڕوو.
٩- «ئەبولعەلائی مەعەڕی» لەبارەی گەشەکردنی دانیشتووانەوە خاوەنی کۆمەڵێک بیروڕای کۆمەڵایەتیی تایبەت بوو.
١٠- «ئەبو رەیحان بیرونی» یەکێکە لە دامەزرێنەرانی سۆسیۆگرافی (وەسفکردنی کۆمەڵگا).
١١- نووسەری «سیاسەتنامە» سەرنجی بەرژەوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و بارودۆخی بەردەوامبوونی دەدا.
١٢- «خواجە نەسیرەددین تووسی» باسی ئەخلاقی دەکرد لە پەیوەندی بەبارودۆخی کۆمەڵایەتییەوە.
١٣- «ئیبن خەلدون» لە کتێبی «موقەدیمە»دا لە هۆکارەکانی سەرهەڵدان و لەناوچوونی شارستانییەتەکان دەکۆڵێتەوە ئەویش لەسەر بنەمای تیۆری بازنەیی

له مێژوو.

١٤- فەیلەسووفانی کۆمەلآیەتی، بۆ دروستکردنی کۆمەڵگایەکی باشتر زیاتر لە هەوڵی خستنەڕووی نموونەیەکی ئایدیالیستییانەدابوون نەک شیکردنەوەیەکی بابەتییانەی رووداوە کۆمەلآیەتییەکان.

١٥- بیرمەندانی وەک «مۆنتسیکیۆ»، «هۆبز» و «لۆک» خاوەن فەلسەفەیەکی کۆمەلآیەتی تایبەت بوون لە بواری گرێبەندیی کۆمەلآیەتیدا.

١٦- ئامانجی فەلسەفە سیاسییەکان بریتی بوو لە دابینکردنی سەقامگیریی کۆمەڵگا، بەرقەرارکردنی دادگەری، و بەیەکەوە گونجاندنی رێکخستنی کۆمەڵگاو ئازادیی مرۆڤەکان.

١٧- «ماکیاڤیللی» باسی لە بیری سیاسیی پشتبەستوو بەچەک و فریودان دەکرد.

١٨- «هۆبز» گرێبەندیی کۆمەلآیەتی بە مەرجی بەردەوامبوونی کۆمەڵگا لەقەڵەم دەدا.

١٩- «لۆک» تیۆری لێکجیاکردنەوەی دەسەلآتەکانی خستەڕوو.

٢٠- «مۆنتسیکیۆ» فەلسەفەی «یاسا»ی کردە تەوەری بیرکردنەوەکانی خۆی.

٢١- «ڤۆلتێر» بیرۆکەی جیهانی نیشتمانیی خستەڕوو.

٢٢- «رۆسۆ» روانگەیەکی سلبی هەبوو بۆ شارستانییەت و پێشکەوتنەکان.

٢٣- «ڤیکۆ» بایەخێکی تایبەتی بە فەلسەفەی مێژوو دەدا.

٢٤- «سان سیمۆن» سەرنجی رۆڵی بەرهەمهێنان و هێزە بەرهەمهێنەکانی دا.

٢٥- لەگەڵ فراوانبوون و بلآوبوونەوەی فەلسەفە کۆمەلآیەتییە جۆربەجۆرەکان کە هەندێکیان دژبەیەک بوون لەلایەک و گۆڕانکارییە کۆمەلآیەتی- ئابوورییەکانی جیهان لەسەدەکانی ١٩و ٢٠دا لەلایەکی ترەوە، زەمینەیەکی پێویست بۆ سەرهەڵدانی کۆمەڵناسی هاتە کایەوە.

٢٦- وشەی کۆمەڵناسی بۆ یەکەمجار لە ساڵی ١٨٣٩ لەلایەن «ئۆگست کۆنت» پێشنیارکرا.

٢٧- یاسای سێ قۆناغەکە ناودارترین دەستکەوتی ئۆگست کۆنتە، کە بەپێی ئەوە وێنەی رەوتی گۆڕانی کۆمەڵگا دەکێشێت و تێیدا «مەعریفە» پێوەری سەرەکیی پۆلێنکردنەکەیە.

٢٨- «مارکس» بەپێی لۆژیکی دیالێکتیک و پشتبەستن بە ماتریالیزمی مێژوویی هۆکاری ئابووری بەدەستنیشانکەری بونیاد و گۆڕانی ژیانی کۆمەلآیەتی لەقەڵەم

دەدا. بەپێی بۆچوونی ئەو هۆشیاریی مرۆڤ لە ژێر کاریگەری بوونە کۆمەڵایەتییەکەیدایە.
٢٩-سەرەڕای ئەوەی ئەو چەمکانەی کە مارکس لە کۆمەڵناسیدا بایەخی پێدەدان- بەتایبەت لە قۆناغە سەرەتاییەکانیدا- بەشێوەیەکی بەرفراوان بڵاوبوونەوە، بەڵام زۆربەی ئەم چەمکانە پەیتاپەیتا لە هزری زۆربەی کۆمەڵناساندا ناوەڕۆکە مارکسیستییەکەی خۆیان لەدەست دا.
٣٠- «سپنسەر» بە پشتیوانیی تیۆری پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی لەبەریتانیا پەرەی بە کۆمەڵناسی داو هەستا بە بەراوردکردنی کۆمەڵگا و ئۆرگانیزمی مرۆیی.
٣١- لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەدا لەگەڵ دەرکەوتنی کۆمەڵناسانی وەک «وارد» و «سامنێر»، کۆمەڵناسی لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا بووژانەوەیەکی زۆری بەخۆوە دی.
٣٢- «لستر وارد» کۆمەڵەی کۆمەڵناسیی ئەمریکای دامەزراند و بایەخی تایبەتی بە چاکسازیی کۆمەڵایەتی دەدا.
٣٣- «ئەلیپۆن سمال» گرووپی کۆمەڵناسیی لە زانکۆی شیکاگۆ دامەزراند، ئەو گرووپەی کە دواتر «قوتابخانەی شیکاگۆ»ی هێنا ئاراوە.
٣٤- لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەدا «دورکهایم» دەستی کرد بە یەکەمین لێکۆڵینەوەی ئاماری کە لە لێکۆڵینەوەکانی ئێستای کۆمەڵناسی دەچوو و لەچەند دیاردەیەکی وەک خۆکوشتن، ئایین، پەروەردە و فێرکردن، کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی و رەفتاری کۆمەڵی کۆڵییەوە
٣٥-«دورکهایم» پێی وابوو دیاردە کۆمەڵایەتییەکان خاوەن رەسەنایەتییەکی تایبەتن و بەجیا لە گشت دیاردەکان لێی دەکۆڵینەوە.
٣٦- «ماکس ڤێبەر» بایەخی بەمیتۆدی تێگەیاندن دەدا و یەکەم لێکۆڵینەوەی گشتگیری لەبارەی کاریگەریی ئایین لە سەر ئابووریدا بەئەنجام گەیاند.
٣٧- لە روانگەی «پارێتۆ»وە کۆمەڵگا سیستمێکی هاوسەنگە کە سەربژاردەکان رۆڵێکی گەورەی تێدا دەگێڕن.
٣٨- کەسانی وەک «زیمێل»، «ڤێبەر» و «تۆنیس» لە رێی بەرهەمەکانیانەوە بە دامەزرێنەری کۆمەڵناسی لە ئەڵمانیادا دادەنرێن.
٣٩- بەبڕوای «تۆنیس» کۆمەڵگا مرۆییەکان پێکهاتوون لە کۆمەڵ (الجماعە) و کۆمەڵگا (المجتمع).

٤٠- له نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم بەملاوە پەیتا پەیتا قۆناغی دەرکەوتنی کۆمەڵناسانی ناوداری وەک «دورکهایم»- کە لە ماوەی ژیانی زانستیی خۆیاندا کۆمەڵێک بەرهەمیان لە بوارە جۆراوجۆرەکاندا دەهێنایەدی- بەسەردەچێ و کۆمەڵناسی زیاتر سیمایەکی پسپۆری بەخۆوە دەگرێت.

٤١- بەپێی بۆچوونی وەزیفییەکان (فۆنێکشنالیست) توخمە جۆراوجۆرەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی خاوەنی وەزیفەی دیاریکراوی خۆیانن. ئەرک و وەزیفەکان دەشێ ئاشکرا یان شاراوەبن.

٤٢- وەزیفییەکان سەقامگیریی کۆمەڵایەتی دەبەستنەوە بە رێککەوتن و رێکخستن لە کۆمەڵگادا.

٤٣- بونیادگەرەکان لە هەر دیاردەیەکی کۆمەڵایەتیدا توخمگەلێکی بەیەکەوە بەستراو دەبینن و لەو یاسایانەی کە بەسەر ئەم پەیوەندییانەو جەوهەرەکەیاندا زاڵە، دەکۆڵنەوە.

٤٤- بونیاد شێوەیەکە کە بەپێی ئەوەوە بەشەکانی شتێک (فەرمانگە، کۆلێژ و هتد...) رێکخراون. بونیاد سیستمێکی کۆمەڵایەتیی رێکوپێکە کەپرۆسە کۆمەڵایەتییەکان لە ناویدا شێوە دەگرن.

٤٥- بونیادی کۆمەڵایەتی دەشێ ئاشکرا یان شاراوە بن.

٤٦- ململانێخوازەکان بڕوایان بە رۆڵی پڕ بایەخی ململانێ، پێکدادان، کێبڕکێ و شەڕ لە رەوتی ژیانی کۆمەڵایەتیدا هەیە.

٤٧- قوتابخانەی ململانێ کۆمەڵگا لە حاڵەتێکی پێکدادانی بەردەوامدا دەبینێت، و سەقامگیری بەئەنجامی پیادەکردنی گوشارە گرووپییەکان لەقەڵەم دەدات.

٤٨- لە قوتابخانەی کارلێکی کۆمەڵایەتی (التفاعل الاجتماعي)دا لە روانگەی میکرۆوە کۆمەڵگا دیراسەدەکرێت، ئەویش بە لەبەرچاوگرتنی دینامیکییەتە کۆمەڵایەتییەکان لەناو گرووپە بچووکەکاندا لە رووی جۆری پەیوەندی سیمبۆلەکان و پلەی پەیوەستەیی.

٤٩- قوتابخانەی شیکاگۆ پشت بەسێ بوار دەبەستێ: بینین (الملاحظة) و ئەنجامدانی لێکۆڵینەوە بەشێوەیەکی راستەوخۆ لە شوێنێکی دیاریکراودا، شیکردنەوەی ئیکۆلۆژییانەی دیاردە شارییەکان، و کاری گرووپی.

٥٠- قوتابخانەی شیکاگۆ بایەخێکی تایبەتی بە کۆمەڵناسیی تاوان و تاوانکاری

دەدا.

٥١- لە قوتابخانەی فرانکفۆرتدا روانگەی تیۆری لەگەڵ رەخنەی کۆمەڵایەتیدا دەستپێدەکات. لەم قوتابخانەیەدا دەسەڵات چەمکێکی سەرەکییە و پێکگەیشتنەکانیش (Communication) وەک هۆکارێکی رەخنەیی لەبەرچاو دەگرێت.

٥٢- لە قوتابخانەی شیکاگۆدا بەپێی پێویست پەنا دەبرێتە بەر مارکسیزم و شیکردنەوەی دەروونی.

٥٣- پێویستە قوتابخانە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵناسی بەشێوە روانینی جیاجیا بۆ یەک شت بشوبهێنین.

## چەمک و تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگای مرۆیی

کۆمەڵگاکان بەنموونەیەکی گشتگیرترین و ئاڵۆزترین جۆری پێکهاتەی کۆمەڵایەتی لە دنیای ئەمڕۆدا لە قەڵەم دەدرێن. جەوهەری سەرەکیی کۆمەڵگا، لە خەڵک، پێکهاتووە خەڵکانێک کە لەناو گشتێکی ئاڵۆزی چالاکیی بەیەکەوە گرێدراودان. ئادەمیزادەکان لە ڕێی بەیەکەوە گونجاندن و هەماهەنگکردنی چالاکییەکانی خۆیان لەگەڵ یەکتردا چالاکیگەلێک ئەنجام دەدەن کە بەهیچ شێوەیەکی تر ئەنجام نادرێن. کەواتە کۆمەڵگا خاوەن میکانیزمێکی بەیەکەوە گونجاوە. کۆمەڵگا دەشێ وەک هۆزێکی بچووک بریتی بێت لە چەند کەسێک، یان وەک وڵاتێکی گەورە لە سەردەمی نوێدا خاوەنی سەدان ملیۆن دانیشتووان بێت [٣/ ١١٠].

وشەی کۆمەڵگا (Society) لە «فەرهەنگی معین»دا بەم شێوەیە پێناسەکراوە: «کۆمەڵێ لە خەڵکی شارێک، وڵاتێک، جیهان یان دەستەخەڵکێک». وەک دەزانین ئەم وشەیە چەمکێکی سەرەکی و زۆرباو، و لە هەمان کات ئاڵۆزی کۆمەڵناسییە، کە بەکارهێنانەکەی لە سنووری ئەم لقە زانستییەش تێدەپەڕێت. وشەی کۆمەڵگا، بەواتا بەرفراوانەکەی بریتییە لە کۆمەڵێک مرۆڤ، ڕووەک و ئاژەڵ [٥٧/ ٣١٠-٣١١].

وشەی کۆمەڵگا پشت بەبوونی بەردەوامی ئەو مرۆڤانە دەبەستێ کە زەمینەیەکی هاوبەش کۆیان دەکاتەوەو پەیوەندییان بەیەکترەوە هەیە. سەرەڕای ئەوەی کە دەتوانین چەندین شێوەی جیاوازی کۆمەڵگا لە ڕووی جۆری پەیوەندی و جەوهەری ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەی لە نێوان ئەندامانیدا هەیەو هتد...، لە یەکتر جیابکەینەوە [٥٨/ ٤٥]، بەڵام وشەی کۆمەڵگا بەزۆری بۆ ناونانی گرووپێکی تایبەتی خەڵک بەکاردەهێنرێت کە کۆبوونەوەکەیان کەم تا زۆر بەردەوام و جێگیرە، و شوێنێکی دیاریکراویان داگیرکردووە. چەمکی کۆمەڵگا چەند تایبەتمەندییەکی هەیە؛ وەک: بەردەوامی، بوونی پەیوەندیی کۆمەڵایەتیی ئاڵۆز، و پێکهاتەی فیئەی

تەمەنی، ڕەگەزی، پیشەیی و چینایەتی جۆراوجۆر.

چەمکی کۆمەڵگای مرۆیی دوو واتا دەگەیەنێت؛ یەکەم بوونەوەرە مرۆییەکان وەک گرووپێک حسێب دەکرێن و خاوەنی پەیوەندیی کۆمەڵایەتیی سەقامگیرن. دووەم ئەم گرووپە مرۆییە کە حاڵەتێکی کەم تا زۆر سەربەخۆی هەیە، جۆرە بەردەوامییەکی گرووپی هەیەو لە ناوچەیەکی تایبەتدا دەژیت لە هەردوو ڕەگەزو هەموو تەمەنەکان پێکدێت و لە ڕووی کولتوورییەوە ناسنامەیەکی دیاریکراوی هەیە [٣٠٦/٦٠].

بە زۆری بەپێی سێ بۆچوونی جیاوازو لە هەمان کاتدا بەیەکەوە بەستراو لە کۆمەڵگا کۆڵدراوەتەوە [٥٦/٢٧-٣٠].

أ- کۆمەڵگا «کۆمەڵە کەسێک»ە کە بەشێوەیەکی کەم تا زۆر ڕێکوپێک ڕێکخراون، خاوەن شێوازێکی تایبەتی ژیان (کولتوور)ن، ئەندامانی ئاگایان لە یەکتر هەیەو خۆیان وەک یەکەیەکی بەیەکەوە بەستراو لە قەڵەم دەدەن.

ب- کۆمەڵگا «گەورەترین گرووپە» کە تاکەکەس بەندە پێیەوە، هەروەها گشت ئەو گرووپە کۆمەڵایەتییانە دەگرێتەخۆ کە لەلایەن ئەندامانییەوە ڕێکخراون، و بەم پێیە دەتوانین کۆمەڵگایەک لە ڕووی گرووپەکانی ناوی و پەیوەندیی نێوان ئەندامەکانەوە شیبکەینەوە.

جـ- کۆمەڵگا سیستمێکی «پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان»ە کە لەنێوان تاکەکەساندا هەیە. کاتێک باسی سیستمی کۆمەڵایەتی دەکەین، لە ڕاستیدا جەخت لەسەر ئەو خاڵە دەکەینەوە کە: ڕەفتاری هەر تاکێک لە ژێر کاریگەریی خەڵکانی تر دایە، ئەنجامدانی هەندێ ڕەفتار قەدەغەیە، هەر جۆرە ڕەفتارێک لە پەیوەندیی بە سیستمێکی یەکگرتووەوە ماناداره. ئەم پەیوەندییانە لەڕێی کولتوورەوە دیاریدەکرێن و بەهۆی بوونی کەلەپوورێکی کولتووریی هاوبەش، تەبایی لە نێوان تاکەکەسانی کۆمەڵگا دێتەکایەوە. تاکەکەسانی کۆمەڵگا فێر دەبن کە لە هەلومەرجی جۆراوجۆردا چۆن هەڵسوکەوت بکەن، هەڵسوکەوتێک کە لەلایەن زۆرینەی ئەندامانی کۆمەڵگا پشتگیری لێ دەکرێت و یارمەتی تەبایی و گونجانکاری گرووپیی دەدات.

لە پێناسە کلاسیکەکانی کۆمەڵگادا زۆر بایەخ بە چەمکێکی وەک هزری کۆمەڵی یان هۆشیاریی کۆمەڵی نەدراوە [٥٦/٨٥]. سەرەڕای ئەوەی کە کۆمەڵگای مرۆیی لە تاکەکەسان و پەیوەندییەکانی نێوانیان پێکهاتووە، بەڵام دواتر

تەنیا بریتی نییە لە تاک تاکی ئەندامە پێکهێنەرەکانی، بەڵکو شتێکی ترە. پەیوەندیی نێوان تاکەکەسان بەهۆی پێداویستییەکان و پەیوەندییە مرۆییە جۆراوجۆرەکانەوە دروست دەبێت، کۆمەڵگا بوونێکی سەربەخۆی هەیە، و خاوەنی چەندین گرووپ و رێکخراوە. پێویستە لە هەڵکشان و داکشانی کۆمەڵگاو گۆڕانە ناوخۆیی و دەرەکییەکانیدا بەدوای سەرچاوەی گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکاندا بگەڕێین، هەرچەند هۆکاری تریش لەو بوارەدا کاریگەرن. کۆمەڵگای مرۆیی گرووپێکی رێکخراوی تاکەکەسانەو کولتوور هۆکارێکە کە پەیوەندی بە زانست و هۆشیارییە هاوبەشەکانی کۆمەڵگایەکی دیاریکراوەوە هەیەو گشت تاکەکەسان بەیەکەوە دەبەستێتەوە. کۆمەڵگا هۆی مانەوەو بەردەوامبوونی سیستەمی کۆمەڵایەتییە [١٩/٤١١-٤١٩].

دەتوانین بەو ئەنجامە بگەین کە: کۆمەڵگای مرۆیی بریتییە لە کۆمەڵێک مرۆڤ کە خاوەنی رێکخراوو دەزگای تایبەتی خۆیانن، کاروبارو کێشەی هاوبەشیان هەیە، جۆرەها پەیوەندی بەیەکتریانەوە دەبەستێتەوە. کەواتە، کاتێک کۆمەڵە کەسێک بەئامانج و مەبەستێکی تایبەتەوە لە دەوری یەکتر کۆببنەوە، و پەیوەندی نێوانیان دیاریکراوبێت، لەم حاڵەتەدا کۆمەڵگا هاتۆتەکایەوە.

بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی تائێستا گوترا، دەتوانین تایبەتمەندییە گشتییەکانی کۆمەڵگای مرۆیی بەم شێوەیەی خوارەوە کورت بکەینەوە [١٧٣/٢٦]:

١- کۆمەڵگا وەک رێکخراوێکی گەورەی ژیانیی (حیاتی) هەموو تاکەکەسان دەگرێتەخۆ، و تاکەکەسان هەستی وابەستەیی (ئینتیما)یان بۆ کۆمەڵگا هەیە.

٢- ئەو بەردەوامبوونەی کە لە کۆمەڵگادا هەیە لە ئاستی تاکەکەسی تێدەپەڕێت. تاکەکەسان لەو کۆمەڵگایەدا کە پێویستە لەگەڵیدا بگونجێن دێنە دنیاوە، و دوای ماوەیەک لەنێو دەچن.. ئەم رەوتە بەردەوام و هەمیشەییە.

٣- هەموو کۆمەڵگایەک لە ئەرک و گێڕانی رۆڵەکانیدا سەربەخۆیی خۆی هەیە. پێویستە تاکەکەسان گوێڕایەڵی یاسا بن. لەناو کۆمەڵگادا بتوێنەوەو تاڕادەیەک خۆیان بدەنە دەست ئەو یاسایانەی کە پەیوەندیان بەئەرکی کۆمەڵگاوە هەیە.

٤- لە هەر کۆمەڵگایەکدا هەندێ جیاوازیی ناوخۆیی لەرووی پەیوەندییەکان، ئەرکەکان و رۆڵەکانەوە هەیە.

٥- بەشداریکردنی کەم تا زۆر چالاک و ئیرادییانەی تاکەکەسان لەناو کۆمەڵگادا لە بنەڕەتدا هۆشیارانەیە.

## سیستمی کۆمەڵگای مرۆیی

کۆمەڵگا مرۆییەکان زۆربەی جار خاوەن میکانیزمێکی بەیەکەوە گونجاوە. بەواتایەکی تر کۆمەڵگاکان خاوەن ئەرکگەلێکی ئەوتۆن کە مرۆڤ بۆ تێرکردنی پێداویستییەکانی سوودی لێوەردەگرێت. مرۆڤەکان پەیوەندییەکی راستەوخۆیان بەسروشتەوە هەیە، و بەهۆی ئەو شتانەی کە خۆیان دروستیان کردوون رووبەڕووی دەبنەوە. هەندێ لەو توخمانەی کە لە ژینگەدا هەن بۆ گشت زیندەوەران هاوبەشن و مرۆڤ لە درێژەی ژیانیدا پەیوەندی بە دنیای گژوگیاو ئاژەڵ و سەرچاوە سروشتییەکانەوە دەبەستێ ئەویش بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانی و هەوڵدان بۆ مانەوەی. لەم رووەوە پێداویستییە تایبەتییەکانی مرۆڤ پێکهاتە و ئەرکی کۆمەڵگا پێکدەهێنن.

زۆربەی پێداویستییەکانمان لەوەوە سەرچاوە دەگرن کە لە کۆمەڵگادا دەژین. لەوانەیە ئەگەر مرۆڤی سەرەتاییش هەر لە سەرەتاوە وەکو هەندێ جۆری گیانلەبەران بەتەنیایی و دابڕاوی بژیایە ئەمڕۆ کێشەی کەمترمان دەبوو و بەو گوێرەش پێداویستییەکانیشمان سنووررداتر دەبوون! لەوکاتەی کە کۆمەڵگاکان دروست دەبن، پێداویستییەکانیش زۆرتر دەبن. ئەگەر کۆمەڵگایەک بیەوێ بوونی خۆی بپارێزێت، پێویست دەکا بارودۆخێکی تایبەتی هەبێت، کۆمەڵناسان بەم بارودۆخە دەڵێن «سیستمەکان»ی کۆمەڵگاکان و گرنگتریشیان بریتین لە [ ٥٩/٢٧-٣٠ ]:

أ- سیستمی پەیوەندییەکان یەکێکە لە پێداویستییە سەرەتاییەکانی ئەرکی کۆمەڵگاکان. هیچ رێکخراوێکی کۆمەڵایەتی ناتوانێت بەبێ ئەم سیستمە درێژە بە ژیانی خۆی بدات. پێویستە ئەندامانی کۆمەڵگا بتوانن زانیارییەکانیان ئاڵوگۆڕ پێ بکەن، واتە سەروسەودا بەزانیارییەکان بکەن. لە کۆمەڵگا مرۆییەکاندا بۆ دروستکردنی پێکگەیشتن کۆمەڵێک نیشانە بەکاردەهێنرێن و هەرچەندە کۆمەڵگا ئاڵۆزتربێت، پێکگەیشتنەکان گرنگییەکی زیاتریان دەبێت و رێکخستنەکەشیان ئاڵۆزتر دەبێت.

ب- سیستمی بەرهەمهێنان یەکێکی ترە لە پێویستییەکان. کۆمەڵگا لەو حاڵەتەدا بە سەقامگیری دەمێنێتەوە کە ئەندامانی گەشە بەهونەرەکانی ئامادەکردنی کەرەستەو ئامرازە پێویستەکانی ژیان بدەن. سەرەڕای ئەوەی مرۆڤ هەندێ لە پێداویستییەکانی بەشێوەیەکی تاکەکەسی پڕدەکاتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا بەرهەمهێنان پڕۆسەیەکی کۆمەڵایەتییە.

ج- سیستمی دابەشکردن لەو رووەوە پێویستە کە دەبێ شتومەک و خزمەتگوزارییەکان بکەونە بەردەستی بەکاربەرانەوە. بەرهەمهێنەران و بەکاربەران هەرگیز بەتەواوی و لە هەموو کۆمەڵگاکاندا یەک کەس نین، واتە دوو لایەنی لێکجیان.

د- سیستمی بەرگریش پێویستییەکی ترە. هەر کۆمەڵگایەک ناچارە لەرێی گەشەپێدانی هونەری تایبەتەوە بەشێوەی تاکەکەسی یان کۆمەڵی لە بەرانبەر هێزە نەیارە و دەستدرێژکەرە یان هەڕەشەکەرەکاندا بەرگری لە خۆی بکات. هەڵبەتە لەوانەیە هیچ کۆمەڵگایەک هەمیشە و بەتەواوی لەو بارەوە سەرکەوتوو نەبێت. ئەوەی بۆ مانەوەی کۆمەڵگا گرنگە ئەوەیە کە ژمارەیەکی زۆری ئەندامانی ماوەیەکی درێژترو بەتەندروستییەکی باشترەوە بژین بۆ ئەوەی وەچەی داهاتوو بتوانێت بگاتە قۆناغی پیرییەوە. سیستمی بەرگری، تەگبیری سەربازی و پزیشکی - تەندروستی، واتە هەردووکیان دەگرێتەوە [١٢/٦٢].

هـ- سیستمی جێگرتنەوە لەو رووەوە پێویستە کە چارەنووسی کۆتایی هەموو ئەندامێکی کۆمەڵگا مردنە. جێگرتنەوە لەرێی میکانیزمی زاوزێ ئەنجام دەدرێت. بەتایبەت لە رابردوودا، لە هەندێ کۆمەڵگادا دیاردەگەلێکی وەک کۆچکردن، بەدیلگرتن لە شەڕەکاندا، یان کڕینی کۆیلە لە بازاڕەکانی دەرەوە ئەم سیستمەی پێ جێبەجێ دەکرا.

و- سیستمی کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی (Social Control) لەو رووەوە پێویستە کە توانای دیاریکردنی لێپرسراوێتیی کۆمەڵایەتی و کارکردن بەبنەماکانی لەلای گشت ئەندامانی کۆمەڵگا وەکو یەک نییە. سیستمی کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی دەکرێ بۆ دووبەش دابەش بکرێ. بەشی یەکەم ئەو سیستمی رێساو بەهایانە دەگرێتەوە کە بەهۆی ئەوانەوە رەفتاری راست و دروست پێناسە دەکرێت (سیستمی بیروباوەڕەکانی کۆمەڵگا پاساو و بەڵگەی بوونی ئەم رێساو بەهایانەیە). دووەم بەش سیستمی سزا (جزاء) و تەمبێکردن دەگرێتەوە، کە بزوێنەری رەفتاری تاکەکەسانە، و دەریدەخات کە چ شێوازێک لەلایەن کۆمەڵگاوە پشتگیریی لێ دەکرێت.

پێویستە هۆکارە بایۆلۆژی - دەروونییەکان وەک هۆکارێک کە کۆمەڵگا دروست دەکەن لێیان بکۆڵینەوە. منداڵ بوونەوەرێکی بێ بەرگرییەو بەبێ وەرگرتنی لایەنی کەمی یارمەتیی پێویست توانای مانەوەی نییە. لە قۆناغەکانی دواتردا لەرووی تەمەنیشەوە مرۆڤ بەبێ تێرکردنی پێداویستییەکانی لە خۆراک و خواردنەوە و نووستن و هی دیکە توانای درێژەدان بە ژیانی نییە. ئەم راستییە دەبێتە هۆی ئەوەی کە لێکچوون لە نێوان کۆمەڵگا مرۆییە جۆراوجۆرەکاندا بێتە ئاراوە [١٤/٥٢].

دەتوانین لە دوو روانگەی جەستەیی و دەروونییەوە لە هۆکارە بایۆلۆژییەکانی کاریگەر لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتیدا بکۆڵینەوە. بۆ بەزیندوویی مانەوە و تەندروست بوون، پێویستە مرۆڤ لەرووی جەستەوە چاودێری هەلومەرجێکی تایبەت بکات. لەو رووەوە مرۆڤ سێ پێداویستیی سەرەکیی هەیە کە بریتین لە خۆراک، پۆشاک و خانوو. مرۆڤ لە پێناوی تێرکردنی ئەم پێداویستییانە بەپێی پلەی گەشەکردنی تەکنیکی رێکخراوگەلێک دادەمەزرێنێت. لەو رووەوە هەلومەرجی مرۆڤ کاریگەرییەکی بنبڕی هەیە لەسەر سەلامەتی و چۆنیەتی گونجانی لەگەڵ ژینگەدا [٣/٦٣].

لە رابردوودا وایان دەزانی مرۆڤ لە کۆت و بەندی هەندێ غەریزە (Instinct) یان ئارەزووگەلێکی نەگۆڕی رەفتاریی دایە، کە بەبۆچوونی زانایان ژمارەیان جیاوازبوو. ئەم تیۆرە رەگوڕیشەیەکی کۆنی هەیەو تائێستا لە نێو دەروونناساندا لایەنگری هەن. لە نێوان ئەو دەروونناسانەی کە زۆر جەخت لەسەر ئەمە دەکەنەوە. دەتوانین ناوی «ویلیام مەکدۆگڵ» (W. MC Dougall) دەروونناسی ناوداری ئەمەریکی بەرین کە بنچینەی تیۆرەکانی خۆی لەسەر چەمکی «غەریزە» بنیات نابوو.

هەرچەندە غەریزە لە ئاراستەکردنی رەفتاری زۆربەی جۆرەکانی گیانلەبەراندا چەمکێکی قبووڵکراو بێت، بەڵام توانای روونکردنەوەی رەفتارە ئاڵۆزەکانی مرۆڤی لە شوێنگەو گرووپ و کۆمەڵگا و سەردەمە جیاوازەکاندا نییە. دەروونناسیی کلاسیک جەختی لەسەر چەمکی «خودی غەریزی» دەکردەوە و گشت رەفتارەکانی مرۆڤی دەبەستەوە بە غەریزەیەکی دیاریکراوەوەو ژینگەی کۆمەڵایەتیشی وەک هۆکارێکی کاریگەر لەبەرچاو دەگرت. بەڵام لێکۆڵینەوەی بەرفراوانی دەروونناسان و مرۆڤناسان لە سەدەی نۆزدە و بیستدا بایەخی ئەم چەمکەی لە ناوبرد [١٤/٦٢]. سەرەڕای ئەوەی کە هەندێ لە پاڵنەرەکان لایەنی بایۆلۆژییان هەیەو

ژیانی سروشتیی تاکەکەسانیش بەندە پێیانەوە، بەڵام ئەم پاڵنەرانە لەژێر کۆنترۆڵی کۆمەڵگا دان و مرۆڤ بەهۆی هەلومەرجە کۆمەڵایەتی و پەروەردەییەکانی خۆیەوە گۆڕانکاریی سەرەکی لەو پاڵنەرانەدا ئەنجام دەدات. هەستکردن بەبرسێتیی یەکێکە لە پاڵنەرە سەرەکییەکانی ژیان، بەڵام جۆر و چۆنیەتی و چەندیەتی خواردن و رێکخستنی بەپێی هەلومەرجی ژینگەی کۆمەڵایەتی دەگۆڕێت، چ خواردنێک بخۆین؟ لەگەڵ کێدا بخۆین؟ کەی بخۆین؟ چۆن بخۆین؟ لە کوێ بخۆین؟ و هتد... ئەوە هەمووی کۆمەڵگا دەستنیشانی دەکات. «پێکەنین»وەک دیاردەیەکی باوی بایۆلۆژی - دەروونی بە لەبەرچاوگرتنی یەک یان چەند هەلومەرجێک لەوانەی خوارەوە دەشێ حاڵەتێکی «نائاسایی» یان «پاتۆلۆژیانە»ی هەبێت: توندی و ماوەی نائاسایی پێکەنین، پێکەنین لە حاڵەتێکدا هیچ پاڵنەرێکی پێکەنین لە ئارادا نەبێت، پێکەنینی کۆنترۆڵنەکراو یان پێکەنینی بێ هۆ [٥٥/٤٩].

لەو تیۆرانەی کە تائێستا چەندین جار لە بارەی پاڵنەرەکانەوە پشتی پێ بەستراوە، تیۆری «مازلۆ» (A. M. Maslow)یە. مازلۆ پێداویستییە مرۆییەکان بۆ پێنج دەستە دابەش دەکات:

١- پێداویستییە فیزیۆلۆژییەکان (خواردن و خواردنەوەو نووستن و هتد...)
٢- پێداویستیی ئاسایش.
٣- پێداویستیی ئینتیما (بۆ گرووپێک).
٤- پێداویستیی رێزگرتن (بایەخدان بەتاک لەناو کۆمەڵگادا).
٥- پێداویستیی پەروەردەکردنی تاکەکەسی (لەرێی وەرزش، هونەرەکان و هتد..)

بەڕای «مازلۆ» تاکەکەس ئەوکاتە بەدوای تێرکردنی پێداویستییەک لە ئاستێکی دیاریکراودا دەگەڕێت کە پێداویستییەکانی لە پلەیەکی خوارتردا (مەبەست پێنج پلەی پۆلێنکراوی سەرەوەیە) دابینکرابێت. لەبەرئەوەی ئەو پێداویستییانەی کە دەکەونە ریزی دەستەی پێنجەمەوە ناکرێ هەمیشە و بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ بە دابینکراوی بمێننەوە (ناچار) تاک هەمیشە لە هەوڵ و تێکۆشاندا دەبێت و هیچ کات ناوەستێت. هەرچەندە هەندێ لێکۆڵینەوەی ئەزموونگەری لە وڵاتە جۆراوجۆرەکاندا ئەم تیۆرەیان بەشێوەیەکی گشتی تەئیید کردووە، لەگەڵ ئەوەشدا کۆمەڵێک ئێتنۆلۆگ (میللەتناس) گومانیان لەم تیۆرانە کردووە و رایانگەیاندووە کە لە هەندێ کۆمەڵگای سەرەتاییدا ئەم هیرارکیەتەی بەهاکان هەمیشە لەبەرچاو

ناگیرێت. تێبینی کراوه [هەندێجار] کە تاکەکەسێک لە برسێتییەکی بەردەوام دایەو لە هەمان کاتدا هەوڵی دابینکردنی هەندێ لە پێداویستییەکانی دەستەی پێنجەمیش دەدات [١٠٤/٢٠١].

**بنەما ژینگەییەکانی کۆمەڵگای مرۆیی**

«ژینگە» (Envionment) بەواتایەکی بەرفراوان گشت ئەو فاکتەر و هەلومەرجە بایۆلۆجی، سروشتی و کۆمەڵایەتی وکولتوورییانە دەگرێتەوە کە دەتوانن کار لەژیانی گرووپە مرۆییەکان بکەن. لە لێکۆڵینەوەی پەیوەندییە دوولایەنەکانی نێوان بوونەوەرو ژینگەکەدا چەمکی «ئیکۆسیستم» (Ecosystem) تەعبیر لەو یەکە سروشتییانە دەکات کە لە توخمی گیاندار و بێ گیان - کە پەیوەندیی نێوانیان سیستمێکی نەگۆڕ دێنێتەکایەوە - پێکهاتوون. وەک دەزانین «ئیکۆسیستم»ەکان هەمەجۆرن و بریتین لە چەند شوێنێکی وەک لەوەڕگە، دارستان، بیابان، رووبار، جۆگە، دوورگەی مەرجانی و هتد... کە لە نێوانیاندا دەریاچە لە هەموو ئەوانی تر زیاتر لێی کۆڵدراوەتەوەو تۆژەران هەوڵیان داوە پەیوەندیی دوولایەنەی بەشە چالاکەکانی ئەو سیستمە واتە گیاو گیانلەبەران بەیەکترەوە روون بکەنەوە [٢٢٤/٦٤].

لە هەمان کاتدا لە دنیادا «ئیکۆسیستم»ە جیاوازەکان سیستمگەلێکی بچووکتر لە خۆیان دروست دەکەن و خاوەن سنوورگەلێکی نیمچە دیاریکراون [٥٦/٦٥]. بەواتایەکی تر، گشت بوونەوەرەکان و ژینگەکەیان «ژینگەی زیندوو» (Biospher) پێکدەهێنن.

بایەخدان بەکاریگەری هۆکارە ژینگەییەکان لەسەر کۆمەڵگا مرۆییەکان، رەگوریشەیەکی کۆنی هەیە. لەوانەیە «ئەرستۆ» یەکەم کەس بێت کە ئاماژەی بەکاریگەری هۆکارە جوگرافییەکان لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی مرۆڤ کردووە. ئەو کەسەی کە لەسەردەمی نوێتردا، پێش هەمووان بە تێروتەسەلی لەوبارەوە دوا «مۆنتسکیۆ» فەیلەسووفی فەرەنسی بوو. ئەو دەیگوت بارودۆخی سروشتی کاردەکاتە سەر خەسڵەتە دەروونی، جەستەیی و کۆمەڵایەتییەکانی مرۆڤ. بەبڕوای «مۆنتسکیۆ» دانیشتووانی ناوچە ساردەکان، کەم هەست و سۆزن، حەزو ئارەزوویان کەمەو بێ باکن، و لە رووی جەستەوە بەهێز و ئازاترن. لە بەرانبەر ئەمەدا خەڵکی ناوچە گەرمەکان، شەهوانی، هەستیار، پلەوپایەخوازو تەماعکارن هەروەها لەرووی

جەستەوە لاوازترن.

ئەو زانایانەی کە بڕوایان بە ڕەسەنایەتی جوگرافیا (Geographism) هەبوو گشت قۆناغەکانی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی و گۆڕانکاریی شارستانییەتەکانیان بەم هۆکارەوە دەبەستەوە. ئەوان وەیاندەزانی کە شارستانییەتە گەورەکانی سەردەمی کۆن وەک میسرو نێوان دووزێ(بين النهرين) لە قەراغ رووبارە گەورەکاندا هاتوونەتەکایەوە، و بەپێچەوانەوە لە ناوچە زۆر ساردەکاندا هەرگیز شارستانییەتی گەورە گەشەیان نەکردووە.

گونجان لەگەڵ ژینگەی سروشتیدا حاڵەتێکی مۆرفۆلۆژیک، فیزیۆلۆژیک و کولتووریی هەیە. هۆکاری دەستنیشانکەر لە ژینگەی سروشتیدا تەنیا پلەی گەرمی نییە، بەڵکو لە چەندین هۆکاری وەک شێ، بەرزی (لە ئاست دەریاوە)، با و خاک پێکهاتووە [٦٦/ ١٠]. یەکێک لە کارتێکردنەکان لەڕێی تیشکی خۆرەوەیە، و وەک دەزانین سەرەکیترین بنەمای ڕەگەزەکان خانە ڕەنگاوڕەنگەکان پێستە کە لەژێر کاریگەری رووناکیی خۆردایە. رووناکیی خۆر تیشکی سەروو وەنەوشەیی تێدایە کە ئەگەر بڕەکەی زیاد بکات خانەکان لەناو دەبات و سووتان دروست دەکات، بەڵام بڕێکی کەمی بۆ ئۆرگانیزم پێویستە.

هەموو ساڵێک کرداری پێکهاتە رووناکی (Photosynthesis) - کە بەهۆی وزەی خۆرەوە دێتە ئاراوە - نزیکەی ٨٣ ملیارد تەن مادەی ئۆرگانی دروست دەکات. دارستانەکان گرنگترین بەرهەمهێنەری رووی زەوین. کشتوکاڵ تەنیا نزیکەی لە ١٠ ٪ی رووی زەوی (دەرەوەی ناوچە ئاوییەکان) دادەگرێت و لەم زەویانەشدا رێژەیەکی زۆر مادەی خۆراکی بەرهەم دەهێنرێت کە نیوەی راستەوخۆ وەک خۆراک لەلایەن مرۆڤەوە بەکاردەبرێت و نیوەکەی تری لەلایەن گیانلەبەرانەوە بەکاردەبرێت یان لە پیشەسازیدا بەکاردەهێنرێت و بەگشتیش بەشێکی لەناودەچێت [٨٨/٦٥]. مرۆڤ پێویستی بەکەڵک وەرگرتنە لە خۆراکی گیایی و ئاژەڵی و لەو رووەوە نیشتەجێبوونی لەسەر رووی زەویدا بەشێوەیەکی رێژەیی بەندە بەم بارودۆخەوە، چونکە ئاساییە کە ژیان لەو ناوچانەدا کە تواناو ئیمکانی پێویست بۆ رووانی رووەک پەروەردەکردنی ئاژەڵ لە ئارادا نەبێت، نەشیاوە. سەرەڕای ئەوەش پەیوەندییەک لە نێوان رژێمی رووەکی و ژیانی ئاژەڵان و هەروەها ژیانی مرۆڤیشدا هەیە [٦٧/ ٢٤١-٢٤٥].

لە مێژووی وڵاتاندا بەڵگەو نیشانەی زۆر لەمەڕ گۆڕانکاریی هۆکارە

سروشتییەکان و کاریگەرییان لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتیدا بەرچاودەکەون. جوگرافیناسی ئەمریکی «ئیلسورت هانتینگتۆن» (E. Huntington) بڕوای وابوو کە گۆڕانکاریی خێراو دووبارە بووەوە لە ئاووهەوادا رادەو توانای چالاکیی تاکەکەسان کەم دەکاتەوە، چونکە شارستانییەتە هەرە گەورەکان لەناوچە هەوا مامناوەندییەکاندا سەریانهەڵداوە. ئەگەر بۆچوونەکەی هانتینگتۆن قبووڵ بکەین ئەم پرسیارە دێتە ئاراوە کە بۆ نموونە بۆچی سوورپێستەکانی نیشتەجێی ناوچەکانی کالیفۆرنیا کە ئاووهەوایەکی لەبارو گونجاویان هەبووە لە ریزی دواکەوتووترین سوورپێستانی ئەمریکادا بوون. زۆرێک لە کۆمەڵگا مرۆییەکان کە لەیەک ناوچەی جوگرافیدا دەژین بارودۆخی کۆمەڵایەتی و ئابووریی جیاوازیان هەیە. بۆنموونە سوورپێستانی «هۆپی» (Hopi) لە باشووری رۆژئاوای ئەمریکا بەکشتوکاڵەوە خەریکن و لە خانووی چەند نهۆمیدا ژیان بەسەر دەبەن، بەڵام سوورپێستانی «ناڤاهۆ» (Navaho) لە هەمان ناوچەدا بە ئاژەڵدارییەوە خەریکن و لە خانووی یەک نهۆمیدا نیشتەجێن [ ٧٠/ ٨١-٨٨].

ژینگەیەکی جوگرافی دەتوانێت ببێتە جێگەی سەرهەڵدانی چەندین شارستانییەتی جۆراوجۆر. نموونەی سەرنجڕاکێشی جیاوازی نێوان رەوشی ژیان لە نێوان «ئەسکیمۆ» کان، «چوکچی» (Chuckchee) یەکان و «کۆریاک»ەکان (Koryak)دا دیارە.. لەبەرئەوەی «ئەسکیمۆکان» هەمیشە لەناو بەفردان، ناچارن خانووەکانیان لەناو بەفردا دروست بکەن و خۆیان لەسەرما بپارێزن، لەکاتێکدا کە لە تەنگەی «برینگ»دا کە میللەتانی «چوکچی» و «کۆریاک» لە هەمان بارودۆخی هەرێمیدا دەژین خانووی بەفرینی لێ نییە. ئەوانە لێرەو لەوێ خێوەتی گەورە هەڵدەدەن کە بەهۆی سنگی لە داردروستکراوەوە بەزەوییەوە بەستراوەتەوە. لەبەرئەوەی بەهۆی کۆچکردنی زۆرەوە، بەبەردەوامی خانووەکانیان لەگەڵ خۆیاندا دەبەن، کەمتر هەوڵدەدەن شێوەی خانوو دروستکردنیان بگۆڕن. جگە لەمە گاکێوی کە گیانلەبەرێکی ناوچە ساردەکانە لەلایەن «چوکچی»ەکان و «کۆریاک»ەکان کەوی (ماڵی) کراوەو بۆ باروگواستنەوە بەکاردەهێنرێت، لەکاتێکدا کە لەنێو ئەسکیمۆکاندا ئەم ئاژەڵە تەنیا بۆ خواردن سوودی لێوەردەگیرێت و باروگواستنەوە بەهۆی سەگەوە ئەنجام دەدرێت [ ٧٠/ ٨١-٨٨]. سەرەکیترین کەرەستەی بارگواستنەوە لەنێو ئەسکیمۆکاندا - بەتایبەت ئەو گرووپانەی کە هێشتا لە بەندی سروشتدا دەژین (بەسەرنجدان لە داپۆشرانی زەوی بە بەفرو سەهۆڵەوە) «گاری»یە

کە لە ئێسقانی گیانلەبەران دروست دەکرێت و چەند سەگێکی بەهێز بەخێرایی رایدەکێشن. لەو ساڵانەی دواییدا بینراوە کە لە هەندێ حاڵەتدا بەهۆی پەیوەندیکردنی زیاتر بە ژیانی نوێوە لە جیاتی کەڵک وەرگرتن لە سەگ، گارییەکان بەهۆی ماتۆڕەوە ئیش پێ دەکەن.

خۆ گونجاندنی بوونەوەران لەگەڵ ژینگەکەیاندا لەوانەیە کەموکورت یان تەواوبێت و دەشێ چەندین جۆری جیاواز هەبێ: تاکی و کۆمەڵی یان کاتی و هەمیشەیی [٢٢/١٦]. مرۆڤ وەک ئاژەڵ پێویستی بەوە نییە کە هەمیشە خۆی لەگەڵ سروشتدا بگونجێنێت، بەڵکو تارادەیەکی زۆر دەتوانێت سروشت لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی خۆیدا بگۆڕێت و رێگەچارە بۆ کارتێکردنەکانی سروشت بدۆزێتەوە. سەرەڕای ئەوەی کە رێگرتن لە سەرهەڵدانی لافاو، رەشەباو بوومەلەرزە لەم سەردەمەدا کارێکی نەشیاوە یان لەوانەیە زۆر سەخت بێت، بەڵام مرۆڤ دەتوانێت بەپانابردنە بەر تەکنۆلۆژیا دژی بوەستێتەوە. هۆکارە جوگرافییەکان لەرووی تواناکانەوە سنوورو بارودۆخێکی تایبەت دێننەکایەوەو خۆتێهەڵقورتاندن لە ژیان لە هەندێ حاڵەتدا بەرتەسک دەکرێتەوە. هەرچەندی پێشکەوتنە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان قووڵتر بن، توانای هۆکارە جوگرافییەکان کەمتر دەبێتەوە [١٧٦/ ٢٦]. مرۆڤ دەتوانێت تارادەیەک بەسەر هۆکاری سروشتیدا زاڵ بێت، یان بۆ پێداویستییەکانی خۆی سوودی لێوەربگرێت. لە درێژەی مێژوودا بینیومانە کە ئەسکیمۆکان، خانووەکانیان لەبەفر دروست کردووە، خەڵکی لاپاڵە سەوزەکان بە ئاژەڵدارییەوە خەریک بوونە، خەڵکی کوێستانەکان سوودیان لە ئەشکەوتەکان وەرگرتووەو ئامرازی بەردینیان دروست کردووە، خەڵکی دورگەی «ساموا» (Samoa) جلوبەرگیان لە توێکڵی دارەکان دروستکردووەو هەروەها حوشتر و خورماش لە ژیانی عەرەبە بەدەوییەکاندا سەرەکیترین ئیمکاناتی ژیان بووە. چاوخشاندنێک بەمێژووی کۆمەڵایەتیی جیهان دەریدەخات کە ئەگەرچی هۆکاری سروشتی لە ژیانی ئادەمیزاددا کاریگەرە، بەڵام لەگەڵ پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیدا، مرۆڤ دەتوانێت لە تواناو دەسەڵاتی ئەم هۆکارە کەم بکاتەوە. زۆربەی ناوچە پێشکەوتووەکانی ئەمرۆ لە کۆندا شارستانییەتێکی درەوشاوەیان نەبووە (بۆ نموونە دانیمارک، سوید، نەرویج و ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا) و لە کاتێکدا کە بارودۆخی هەرێمایەتی و ئاووهەوا گۆڕانکارییەکی ئەوتۆی بەسەردا نەهاتووە.

ئادەمیزاد ناچارە لە پێناوی هێنانەدیی پەیوەندییەکی گونجاو لەگەڵ خۆی و

ژینگەی جوگرافیدا ڕێوشوێن دابڕێژێت. بۆ ئەم مەبەستە خانووی گونجاو لەگەڵ هەلومەرجی هەرێمایەتیدا دروست دەکات، پۆشاکی وەرزی ئامادە دەکات، پیشەسازیگەلێکی تایبەت لە پێناوی بەرەنگاربوونەوەی هۆکاری سروشتی دەخاتەکار (کارگەی سەهۆڵ، فێنککەرەوە). لەو شوێنانەدا کە دەتوانرێت تەحەممولی ئاووهەوا بکرێت مرۆڤەکان پەرشوبڵاو بوونەتەوە.

زاڵبوونی مرۆڤی ئەمڕۆ بەسەر سروشتدا لەرادەبەدەر زیادی کردووە، چونکە مرۆڤ: هەڵدەستێ بەشیرینکردنی ئاوی دەریا، هەوڵی کشتوکاڵکردن لە ژێر دەریاکان دەدات، لەسەر مانگ دەزگای پەیوەندیکردن دادەمەزرێنێت، دارستانەکان لە ماوەیەکی کورتدا لەناو دەبات، دەستکاری ژیانی ڕووەکەکان دەکات و بەپێی ئارەزووی خۆی گەشەکردنەکانیان ڕێکدەخات، لە جەمسەری باکووردا بینایە دروست دەکات، بارانی دەستکرد سازدەکات، ڕێڕەوی ڕووبارەکان دەگۆڕێت، دەریاکان بەیەکترەوە دەبەستێتەوە، پێچ و پەناو کێوە بەرزەکان بەرێگر لەبەردەمی خۆی نازانێت، بەپێی بەرژەوەندییەکانی خۆی دەریاچەو زەلکاوەکان پڕ لە ئاو یان وشک دەکات، و لە ڕێی داهێنانی مانگە دەستکردەکانی ڕاگەیاندن و جۆرەها ئامرازی پێکگەیاندنەوە ناوچە جیاجیاکانی دنیا لە یەک کات و شوێندا کۆ دەکاتەوەو بەیەکتریان دەبەستێتەوە. لە ماوەی ئەو بیست ساڵەی دواییدا، گەشەکردنی خێرای تۆڕی زانیارییە تەکنۆلۆژییە نوێیەکان پەیوەندیی نێوان «بۆشایی/ پانتایی»و «کات»ی بەتەواوی گۆڕیوە. هەواڵی وێنەیی لە ئاستی جیهاندا لە کورتترین ماوەدا و دوورییە جوگرافییەکانی بەگشتی لە ئیعتیباری پێشوو خستووەو چەمکی «مرۆڤ لە هەموو شوێنێک ئامادەیە»ی هێناوەتە ئاراوە [٩٥/٢٠٥]، و تۆڕی زانیارییەکانی «ئینتەرنێت» خەڵکانێکی زۆری لە گۆشەو کەنارەکانی دنیادا بەیەکەوە بەستۆتەوە.

### مۆرفۆلۆژیای کۆمەڵایەتی و کۆمەڵگا

لە دەقە کلاسیکەکانی کۆمەڵناسیدا چەمکی «مۆرفۆلۆژیای کۆمەڵایەتی (Social Morphology) سەرەتا بۆ ئەوە بەکارهێنرا کە هەندێ لە دیاردە کۆمەڵایەتییەکان لە ڕووی تایبەتمەندییەکانیانەوە بخەنە بەرانبەر دەستەیەکی ترەوە کە بە «فیزیۆلۆژیای کۆمەڵایەتی» (Social Physiology) ناو دەبران. بەم پێیە خێزان، ئایین، ئابووری و هی تر لە دەستەی فیزیۆلۆژیای کۆمەڵایەتی حسێب دەکران

و خانوو، شێوەی دابەشبوونی دانیشتووان لە شوێنێکدا، شێوەی کۆبوونەوە مرۆییەکان (لادێ - شار)، تۆڕی پێکگەیاندنەکان (ڕێگاکان) بە مۆرفۆلۆژیای کۆمەڵایەتی ناودەبران. بەم شێوەیە دیاردەکان بەهۆی هەبوونی ڕواڵەتی مادی یان دەرەکییەوە خرانەریزی گرووپی مۆرفۆلۆژیای کۆمەڵایەتییەوە.

زاراوەی مۆرفۆلۆژیای کۆمەڵایەتی بەو شێوەیەی کە «مۆریس هالبواکس» ئاماژەی بۆ دەکات [ ١١/٧١ ] یەکەمجار لەلایەن «ئەمیل دورکهایم» لە «سالنامەی کۆمەڵناسی»دا بەکارهێنراوە. «هالبواکس» رادەگەیەنێت کە لە بواری زانستە سروشتییەکاندا دەتوانین چەند شتێکی وەک کانزاکان، جێگیریی چینە جیۆلۆجییەکان، هەمەجۆریی ڕووەک و بوونەوەرەکان، و بونیادی ئۆرگانەکان و پێکهاتەکان بەنموونە گەلێکی دیاردە مۆرفۆلۆژییەکان لە قەڵەم بدەین. ئەو دەڵێت دابەشبوونی دانیشتووان لەسەر زەویدا دیاردەیەکی بەڕواڵەت سروشتییە کە ئەنجامی پەیوەندیی نێوان فەزای هەیی و بارودۆخی ناوچەییە، پەیوەندییەک کە دەتوانین لە نێوان دەرکەوتەی دەرەکیی ژیانی گرووپێک و سەقامگیربوونی لە دورگەیەکدا، کۆبوونەوەی دانیشتووان لە دەوری دەریاچەیەکدا یان پەرشوبڵاوبوونەوەی لە دۆڵێکدا بەدی بکەین. ناوەندی کۆبوونەوەی شارنشینی وەکو کۆمەڵە شتێکی کەڵەکەبوو وایە کە توخمەکانی بەرەو ناوکێک ڕێدەکەن و پانتاییەکی نیمچە جێگیریان هەیە. کۆمەڵگا مرۆییەکان تەنیا لەرێی شتومەکەوە پەیوەندییان بەیەکترەوە نییە، بەڵکو وەکو کۆمەڵە شتێکی زیندوو و مادی وان. ئەم کۆمەڵگانە لە بوونەوەرگەلێک پێکهاتوون کە لە کەشوهەوایەکی نیمچە کەڵەکەبوو و لێک نزیکدا دامەزراون و وەکو گشت بوونەوەرە هەستەوەرەکان خاوەنی ڕووبەر، قەبارە، شێوە، و تەنانەت چڕین. ئەم کۆمەڵانە دەتوانن گەشە بکەن یان لە گەشەکردنیان کەم بێتەوە. بەهۆی مردنەوە هەمیشە هەندێ لە توخمەکان خۆیان لە دەست دەدەن و لە ڕێی زاوزێوە جێگەیان پڕ دەکەنەوە. یەکێک لە تایبەتمەندییەکانیان بریتییە لە توانای جموجۆڵ، و هەندێ کاتیش بەشێوەیەکی کۆمەڵی دەگۆڕێن، وەک عەشیرەتەکان یان سوپاکان کە هەمیشە لە جموجۆڵدان. هەرچۆنێک بێت بەشەکانی ئەم کۆمەڵانە کەم تا زۆر حاڵەتێکی گۆڕاو (ناجێگیر)یان هەیە. لەم گرووپانەدا دەتوانین گۆڕانکارییە ناوخۆییەکان و پرۆسەکانی هاتن و چوونی دانیشتووان دەستنیشان بکەین.

بەبڕوای «هالبواکس» مۆرفۆلۆژیای کۆمەڵایەتی بەندە بە ڕواڵەتەکانی ژیانی

کۆمەڵایەتییەوە و لەبەر ئەوە بایەخێکی تایبەت بە رواڵەتە مادییەکان دەدات، بۆ ئەوەی لەبەر رۆشناییدا بتوانێت گۆشەیەک لە دەروونناسیی کۆمەڵایەتی پیشان بدات. کۆمەڵگا لە کەشوهەوایەکی پابەند بەرواڵەتە مادییەکانەوە تەواوەتەوەو پێویستە بیرورای گرووپی لەناو رواڵەتە مادییەکانی هەڵقولاوی بارودۆخی شوێنی (الظروف المکانی) لێی بکۆڵدرێتەوە، بارودۆخێک کە «رێکخستن» و «سەقامگیری» بەسەریدا زاڵە [١١/٧١].

هیچ کۆمەڵگایەک نییە کە پێگەی شوێنیی خۆی لە کەشوهەوایەکی تایبەتدا رێکنەخات و لە هەمان کاتدا خودان وابەستەییەکی مادی نەبێت، و زەرووڕەتی هەر جۆرە چالاکییەکی گرووپی گونجانە لەگەڵ بارودۆخی سروشتیدا. سیاسەتمەدارێک، زانایەکی ئایینی، یان پیشەکارێک پێویستە لانی کەمی زانیاریگەلێکی لە بارەی بارودۆخی دەوروبەرو ژمارەی ئەوکەسانەی مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات، لەبەردەستدا بێت. گشت چالاکییە کۆمەڵایەتییەکان (هەرجۆرێک بن) خودان لایەنێکی مۆرفۆلۆژین. «هالبواکس» لە کتێبی «مۆرفۆلۆژیای کۆمەڵایەتی»دا لایەنە جۆراوجۆرەکانی ئەم دیاردەیەی دابەشکردووە کە بریتین لە ئایینی، سیاسی، ئابووری و دیمۆگرافی و بەتێروتەسەلی لەسەر یەکە یەکەیان دواوە.

**جموجۆڵی دانیشتووان و کۆمەڵگا**

دەتوانین لەرووی دانیشتووان و جموجۆڵییەوە لە کۆمەڵگا مرۆییەکان بکۆڵینەوە. لێکۆڵینەوە لە جموجۆڵی دانیشتووان پێکهاتووە لە ناسینی هۆکارو لەهەمان کاتدا ئەنجامەکانی گۆڕانکارییە دیموگرافییەکان و چەند بابەتێکی وەک ژمارە، پێکهاتەو دابەشبوونی دانیشتووانیش دەگرێتەوە. پێویستە بزانین چ هۆکارێک دەبێتە هۆی گۆڕانی بونیاد، پێکهاتە، و جموجۆڵی دانیشتووان، و ئەم گۆڕانکارییانە چ کاریگەرییەکیان هەیە [٧٠٩/٧٢].

بایەخدان بە دانیشتووان و گۆڕانی لە جیهاندا رابردوویەکی زۆر کۆنی هەیە. ئەگەر لەسەردەمی نوێدا رادەی گەشەکردنی دانیشتووانی زۆربەی دەوڵەتەکان لە ئاستێکی بەرزدابێت، بەزۆری لەبەر ئەوەیە کە لەم سەردەمەدا رێژەی مردن کەمتر بۆتەوەو ئەم دیاردەیە بەشێوەیەکی جیاو سەربەخۆ لە گۆڕانکارییەکانی تر کە دەیتوانی لە شێوەی ژیانی تەقلیدیدا دەربکەوێت، هاتۆتە ئاراوە.

بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە خواست و ئاواتی گشت تاکەکەسان ئەوەیە لە

تەندروستییەکی باش دابن و ماوەیەکی درێژ بژین، دامودەزگا تەندروستییەکانیش وەکو تاکەکەسان هەمیشە ئامانج و بەرنامەگەلێکیان پەسندو پشتیوانی لێکردووە کە دەبنە هۆی دواخستنی مردن.

جۆرەها کوتان، ئەنتی بیوتیکەکان، مەگەز کوژەکان و دەرمانە کیمیاوییەکان کە لە سەرەتای سەدەی بیستەوە پەیتا پەیتا لە ئاستێکی بەرفراواندا بەکارهێنراون. لەلایەکی ترەوە سوود وەرگرتن لەم شتانە، کە هاورێک بوو لەگەڵ پەرەسەندنی تەندروستی و گەشەکردنی رێکخراوە کۆمەڵایەتییەکان بووە هۆی کەمبوونەوەی لە ناکاو خێرای رێژەی مردن لە هەموو دنیادا، بێ ئەوەی رێژەی پیتێن (خصوبة) لە گشت شوێنەکاندا کەم ببێتەوە [٧٣/١١-١٧].

**تیۆری گواستنەوەی دانیشتووان [٧٢/٤٣٢]**

| قۆناغ | رێژەی لە دایکبوون | رێژەی مردن | دانیشتووان |
|---|---|---|---|
| پێش پیشەسازی | بەرز | بەرز | وەستاو |
| سەرەتای سەردەمی پیشەسازی | بەرز | بەرەو نزمی | گەشەکردنی خێرا |
| سەردەمی پیشەسازی | نزم | نزم | وەستاو |

کاتێک باس لە گەشەکردنی خێرای دانیشتووان لە دنیای ئەمڕۆدا دەکرێت، لە بنەڕەتدا وتووێژەکان لە دەوری رێژەی زیادبوونی لەدایکبوون و خێزانی گەورە لە وڵاتانی تازە پەرەسەندوودا چەقدەبەستێت و بەزۆری ئەم پرسیارە دەکرێت کە خێزانی گەورە چ کاریگەرییەکی هەیە؟ بەزۆری لە سێ ئاستی تەندروستیی دایک، خێزان و کۆمەڵگا (کۆمەڵی خۆجێیی و دەوڵەت)دا لەم کاریگەرییانە دەکۆڵنەوە [٧٢/٧٠٩-٧١٥].

رێژەی لە دایکبوون، بەبەراورد لەگەڵ رێژەی مردندا، بەخێراییەکی کەمتر بەرەو کەمبوونەوە دەڕوات. بڕیارە کۆمەڵی و دەوڵەتییەکان دەتوانن بەرێژەیەکی بەرچاو کاربکەنە سەر مردن، بەڵام بۆ هێنانەدیی گۆڕان لە پیتێندا، ئەم مەسەلەیە بەندە بەڕازیبوونی هەزاران ژن و مێرد. لەراستیدا لە هەندێ وڵاتانی تازە پەرەسەندوودا جیاوازییەکی زۆر لە نێوان «ئاستی نزم و بێ وێنەی مردنی» و.. رێژەی بەرزی لە دایکبوونیدا هەیە کە دەتوانێت گەشەکردنی بەرچاوی دانیشتووان نیشان بدات [٧٦/٧-٩].

## جۆرەکانی کۆمەڵگا مرۆییەکان

چەشنناسی (Typology)ی کۆمەڵگا مرۆییەکان لەلایەن تۆژەرانەوە، بەزۆری بەپێی دانانی هۆکارێکی باڵادەست وەک پێوەرێک بووە. هەندێ بایەخیان بەهۆکاری دانیشتووان داوە (وەک مالتۆس و تارادەیەک زیمەرمان)، هەندێکی تر بەهۆکاری تەکنیکی (بەرد، کانزا، ئامێر و هی تر)، هەندێکی تر بەسیستمی پەیوەندییەکان و گەیاندن (وەکو ماک لوهان)، هەندێکی تر بەمیتۆدە مەعریفییەکان (وەک ئۆگست کۆنت) یان سیستمی ئابووری (وەکو مارکس). ئەوەی بەزۆری دەبینرێت تایپۆلۆژیاکانی ئەو گۆڕانکارییەیە کە جەخت لەسەر جیاوازیی قۆناغە جۆراوجۆرەکان لە ڕەوتی مێژوویی کۆمەڵگاکاندا دەکات [٧٤/ ٨٠-٨٤].

بیروڕای تۆژەرە کۆمەڵایەتییەکان لە بارەی ڕەوتی وەرچەرخانی کۆمەڵگا مرۆییەکان لە درێژەی مێژوودا و لە پەیوەندیی بە بارودۆخی ئێستایانەوە جیاوازە، و بەسەختی دەتوانرێت ئەنجامێکی روون و ئاشکرا لەم تیۆرانە هەڵبهێنجرێت. بۆ نموونە «ماکسیم کۆڤالۆفسکی» (M. Kovalowsky) ڕەوتی گۆڕانکاریی کۆمەڵگا مرۆییەکان بەم شێوەیەی خوارەوە دیاردەکات:

أ - خێزانی نیمچە پێکهاتوو، کە تیایدا سیستمی ڕەچەڵەکی دایک هەیە.

ب- خێل، کە تیایدا پێوەری ناسینی تاکەکەسان دەگۆڕێت و ڕەچەڵەکێتی لەرێی باوکەوە باوە.

پ- سیستمی کاست کە بنچینەکەی لەسەر حکوومەتی توێژە جۆراوجۆرەکان دامەزراوە و ماوەیەکی زۆر لە دنیادا باوبوو.

ت- کۆمەڵگای دیموکراتیک کە سیستمێکە لەسەر یەکسانی و ئازادی دامەزراوە.

پێوەری«خواجە نەسیرەددین تووسی» فەیلەسووف و سیاسەتمەداری ئێرانی لە پۆلێنکردنی کۆمەڵگا مرۆییەکاندا پێوەرێکی ئەخلاقی بووە [٢٥٣/٧٥].

نەسیرەددین تووسی کۆمەڵگاکانی بۆ دوو جۆری سەرەکی دابەش دەکرد: شاری ئاکارباش (المدنیة الفاینة)و شاری ئاکار خراپ (المدینة الغیر الفاضلة).

لە باسی «شاری ئاکار خراپ»دا «خواجە نەسیرەددین تووسی» ناوی سێ کۆمەڵگای جیاوازی بردووە، کە هەرسێکیان لە جۆری لارێبوو حسێب دەکرێن، کە بریتین لە: شاری نەفامی (الجاهلة)، شاری بەدڕەوشت (الفاسقة) شاری گومڕابوو (ضالة). بەڕای ئەم فەیلەسووفە ئەم جۆرانەی سەرەوە حاڵەتێکی نەگۆڕیان نییەو لەبەر هۆی جۆراوجۆر لەوانەیە شاری ئاکارباش بگۆڕێت بۆ شاری ئاکار خراپ.

«جۆرج گۆرڤیچ» (G. Gur Vitch) کۆمەڵناسی فەرەنسی کۆمەڵگا مرۆییەکان بۆ چەندین جۆر دابەش دەکات کە بریتین لە : کۆمەڵگای یەزدانی (تیۆلۆژی)، باوکسالاری، فیۆدالی، دەوڵەتە شار، ئیستبدادیی ئارام، لیبراڵ دیموکرات، سەرمایەداری گەشەسەندوو، فاشیزم و بەرنامە بۆ دارێژراو (مبرمج)، کە بۆ هەندێکیشیان چەند جۆرێکی تر دەستنیشان دەکات و نموونە بۆ هەریەکێکیان دێنێتەوە [٧٤/ ٨٠-٨٤].

بۆ ئاسانکردنی لێکۆڵینەوەی چەشنە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگا مرۆییەکان، کۆمەڵناسان چەندین دابەشکردنیان کردووەو ناویان هێناون وەک: کۆمەڵگای نەریتی، پیشەسازی، سەروو پیشەسازی، یان: خێڵەکی، لادێیی و شارنشینی، یاخود کۆن و نوێ، کە لە بەشەکانی داهاتووی ئەم کتێبەدا لە هەندێ لەم چەمکانەدا دەدوێین.

## کورتەی بەش

١- کۆمەڵگا ئاڵۆزترین و گەورەترین بونیادی کۆمەڵایەتییەو ناوکە سەرەکییەی بریتییە لە خەڵک.

٢- کۆمەڵگا لەرووی قەبارەوە دەشێ زۆر بچووک یان زۆر گەورە بێت.

٣- کۆمەڵگە بەواتا گشتییەکەی چەندەها جۆری جیاوازی بوونەوەران دەگرێتەخۆ.

٤- کۆمەڵگا مرۆییەکان لەسێ شێوازی جیاوازدا، واتە: کۆمەڵە تاکەکەسێک، گەورەترین گرووپ، و سیستمی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا دیراسەکراون.

٥- تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی کۆمەڵگای مرۆیی بریتین لە: رێکخستنی ژیانی کۆمەڵایەتی، بەردەوامیدان بەژیان، سەربەخۆیی کارکردن لە گێرانی رۆڵ و ئەرکەکاندا، بوونی جیاوازی لە رۆڵ و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و هەروەها بەشداریکردنی هۆشیارانەی تاکەکەسان.

٦- پێداویستییەکانی ئەرکە کۆمەڵایەتییە مرۆییەکان بریتین لە: بوونی سیستمی پەیوەندیکردن یان پێکگەیشتن (نظام الاتصالات)، بەرهەمهێنان، دابەشکردن، بەرگریکردن، لەجیاتی دانان، و کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی.

٧- هۆکارە بایۆلۆژی - دەروونییەکان کاریگەرییان هەیە لە دروستبوونی دیاردە و رەفتارە کۆمەڵایەتییەکان، و پێویستە رۆڵی ئەوانە لە پەیوەندی بەهۆکاری کۆمەڵایەتییەوە تاووتوێ بکەین.

٨- بوونی غەریزە و ئارەزووگەلێکی رەفتاریی نەگۆڕ لە کۆمەڵگای هاوچەرخدا، ئێستا بەپێچەوانەی جاران خراوەتە بەرگومانەوە.
٩- «مازلۆ» پێداویستییە مرۆییەکانی دابەشکرد بۆ پێنج کۆمەڵە: فیزیۆلۆژی، ئاسایش، پەیوەست بوون (خۆشەویستی)، رێزگرتن، و پەروەردەکردنی تاکەکەسی، و پێی وابوو دابینکردنی ئەم پێداویستییانە بەیەکەوە بەستراونەتەوە.
١٠- ئەمڕۆ تیۆری حەتمییەتی جوگرافی لایەنگری زۆری نین.
١١- ئیکۆسیستم لە شتی گیاندار و بێ گیان لەناو یەک سیستمی ژینگەیی تایبەتدا دروست دەبێت.
١٢- پێویستە رۆڵی هۆکاری سروشتی لە رووی پلەی گەشەکردنی کولتووری و تەکنیکی شیبکرێتەوە.
١٣- گونجان لەگەڵ ژینگەی سروشتیدا رەهەندی مۆرفۆلۆژی، فیزیۆلۆژی و کولتووریی هەیە.
١٤- یەک ژینگەی سروشتی دەتوانێت ببێتە شوێنی گەشەکردنی کۆمەڵگاکان بەشارستانییەتی جیاوازەوە.
١٥- تەکنۆلۆژیای نوێی پێکگەیشتن پەیوەندی نێوان «پانتایی» و «کات»ی گۆڕیوە.
١٦- مۆرفۆلۆژیای کۆمەلایەتی رواڵەتی ژیانی کۆمەلایەتی (بەتایبەت دابەشبوون و جموجۆڵی دانیشتووان) بەهۆکاری ژینگەی سروشتییەوە دەبەستێتەوە.
١٧- پێویستە زۆربوونی خێرای دانیشتووان لە وڵاتە تازە پەرەسەندووەکاندا لەرووی کەمبوونەوەی رێژەی مردن و نەگۆڕیی رێژەیی رادەی پیتێن (الخصوبة) لە بەرچاو بگیرێت.
١٨- لە تیۆری جموجۆڵی دانیشتوواندا رێژەی لە دایکبوون و مردن بە قۆناغە جیاجیاکانی پەرەسەندنی کۆمەلایەتی لە درێژایی مێژوودا دەبەسترێتەوە.
١٩- دەتوانین کۆمەڵگا مرۆییەکان بەپێی چەند هۆکارێکی وەک دانیشتووان، تەکنۆلۆژیا، سیستمی گەیاندن، بونیادی سیاسی، میتۆدە مەعریفییەکان، و سیستمی ئابووری و هەروەها گشت پێوەرەکان پۆلێن بکەین.
٢٠- ئەو تیۆرانەی کە لە بارەی رەوتی وەرچەرخانی کۆمەڵگا مرۆییەکاندا خراونەتە ڕوو هەمەجۆرن و زۆربەیان داکۆکی لەسەر پەرەسەندنی کۆمەڵگاکان لە سادەوە بۆ ئاڵۆز دەکەن.

## چەمک و تایبەتمەندییەکانی کولتوور

کـولتـوور (Culture) تەنیـا کـۆمـەڵێکی کـەڵەکـەبوو لە دابونەریت و شـێـوە جیاوازەکانی ژیان نییە، بەڵکو سیستمێکی ڕێکخراوە لە ڕەفتارەکان، یان شێوەی گشـتـیی ژیانی گرووپێک یان چەند گـرووپێکە لە خـەڵک. ڕەگەزەکـانی کولـتـوور، وەکو دابونەریت و بیروباوەڕەکـان هەروەها بەهاو و بیروڕا هاوبـەشـەکان، مرۆڤـەکان بەیەکەوە دەبەستێتەوەو ناسنامەی کۆمەڵایەتییان پێ دەبەخشێت [ ١/٣٤ ].

چەندین پێناسـە بۆ کـولتـوور کـراوە کـە زۆربەشـیـان، لەلایەن کـەسـانی ترەوە ڕەخنەیان لێگیـراوە[ ١٠٧-١٠١/٧٧ ]. یەکـێک لە یەکـەمین پێناسـەکـانی کـە بۆ کـولتـوور کـراون و تارادەیەک گـشـتـگیـر بێت لەلایەن «تـایلۆر» (E. B. Taylor)ـەوەبووە لە سـاڵی ١٨٧١ زاییـنیـدا. ئەم مـرۆڤناسـە بەریتـانیـیـە لەو باوەڕەدابوو کـە کولتوور بریتییە لە گشتێکی ئاڵۆز لە زانست و زانیاری و هونەرو، هزرو بیروباوەڕو یاسـاو دیسـپلین و دابونەریت و، ترادیسـیـۆنەکان، بەکـورتی گـشت ئەو فـێـربوون و عادەتانەی کە مرۆڤێک وەکو ئەندامێکی کۆمەڵگا وەریدەگرێت[ ١٨/٢٥ ]. بەڕای «سـامنێـر» کـۆمـەڵناسی ئەمـریکی کولـتـوور بریـتـیـە: لە کـۆمـەڵێک دابونەریت و ترادیسـیـۆن و دامـەزراوەی کـۆمـەڵایەتی. «سـپنسـەر» لەکـتـێـبی «بنەمـاکـانی کۆمەڵناسی»دا کـولتووری وەکو کایەی «سەرو جەستەیی» (Superorganic) مرۆڤ ناودەبردو مـەبەسـتی جـیـاکـردنەوەی کـولتـوور بوو لە هۆکـارە جـەسـتـەیی و سروشـتـییـەکان. ئەو لەو باوەڕەدابوو کە کـایەی «سەرو جەستەیی» تایبـەتە بەمرۆڤ. ئەمە لەکاتێکدا کە مرۆڤ لەلایەنی دوو کایەکەی دیکەوە (سروشتی و جەستەیی) لە گـیـانلەبەر دەچێت[ ٢٠٤/٢٦ ]. دەتوانرێت کـولتـوور وەها پێناسـە بکرێت کـە بریتـیـیـە لە کـۆمـەڵێک لە ڕەفـتـارو شـێـوازی کـۆمـەڵایەتی کـە لەناو کـۆمـەڵگادا دێنەکایەوەو دەگـوازرێنەوە، هەروەها ڕەگەزەکـانی وەک زمان و ڕێوڕەسم و ترادیسـیۆن و جلوبەرگ و خـانـوو، پیشـەو هونەرو زانسـتـەکـان، بنەمـاکـانی کـولتـوور پێکدەهێنن [ ٧٨/٤٠ ].

هەندێ جار مرۆڤناسە کۆمەڵایەتییەکان کـولتووریان لەبەرامبەر سروشت داناوە. لەم حاڵەتەدا دەتوانرێت ئەم پرسیارە بکرێت کە ئایا کولتوور بریتییە لەو شتانەی کە فێرکردن (بەواتای گشتی) لە سروشتدا زیادی دەکات یان ئەو شـتـانە دەگرێتەوە کە فێرکردن بۆ تاک بەرهەمی دێنێت؟

فـێـربوونی کولـتـوور لە ڕێگای مـرۆڤـەکـانی ترەوە دەبێت. فـێـرکـردنیـشی بەهۆی

پەیوەندییە بەرامبەرەکان لە نێوان مرۆڤەکاندا شێوە وەردەگرێت. کولتوور بە ڕێگای بۆماوەیی ناگوازرێتەوە بەڵکو بەرهەمێکی کۆمەڵایەتییە. کولتوور بەرهەمی پاشماوەی کۆمەڵایەتییەو لە دروستبوونیدا چەند هۆکاری وەکو ئەو زانیاری و زانستانەی کە لەناو کۆمەڵگادا هەن، گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکان، پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، هۆکارەکانی پێکگەیشتنی دەستەجەمعیی دەور دەبینن.

کولتوور کۆمەڵێک ڕەگەزە: لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر دەگوازرێتەوە، ڕەگەزەکانی بەسەریەکەوە کەڵەکە دەبن، لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر بڵاودەبێتەوە، دەست بە هەڵبژاردن دەکات و دەتوانێت ڕەهەندی پسپۆڕی وەدەستبێنێت، و دابەش دەبێت بۆ هەندێ جۆرو دواجار تووشی قەیران دەبێت. کولتوور چەند ئەرکێکی تایبەتی هەیە کە بە «ئەخلاقی مرۆڤ» ناو براون. کولتوور ئەوە دیاریدەکات کە پێویستە خێزان چ پێکهاتەیەکی هەبێت. پیاوێک دەتوانێت چەند ژن بهێنێت و ئایا پەیوەندیی پێش هاوسەرگرتن قۆناغێکە بۆ خۆ ئامادەکردن بۆ پێکهێنانی خێزان یاخود کردەیەکی دژ بەئاکار دادەنرێت. کولتوور هەندێ دیسپلین بەدیدەهێنێت لە پێناو بەکۆمەڵایەتی کردن و چاودێری منداڵان: چ کاتێک دەبێ منداڵ لە شیرخواردن بکەینەوە، پەروەردەکردنیان دەبێت چۆن بێت، تا چ ڕادەیەک دەبێت سەربەخۆییان بدرێتێ. کولتوور دروستکەری سیستمی فێرکردنە (نەک تەنها فێرکردنی ڕەسمی)، ئەوەش دیاری دەکات کە منداڵ پێویستە چی بزانێت و چی بکات. کولتوور بەدیهێنەری بەهاکانە بۆ ئەوەی منداڵ ڕاستی لە هەڵە جیا بکاتەوەو لە داهاتوودا بتوانێت هەندێ ئامانج بۆ خۆی هەڵبژێرێت.

**هەندێک لە تایبەتمەندی و ئەرکەکانی کولتوور** [٧٥/٨]

| کولتوور شتێکە کە | کولتوور خاوەنی ئەم ئەرکانەیە |
|---|---|
| - لە نەوەیەکەوە دەگوازرێتەوە بۆ نەوەیەکی تر. | - بە کۆمەڵایەتیکردنی تاکەکان. |
| - حاڵەتێکی کەڵەکەبووی هەیە. | - فێرکردن و پەروەدەکردن. |
| - لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر دەگوازرێتەوە. | - بەهاکان: ڕاست و هەڵە. |
| - لە پەسندکردن و ڕاگرتنی شتەکاندا هەڵدەبژێرێت | .- چاودێریی کۆمەڵایەتی. |
| - ماهیەتێکی ئاڵۆزی هەیە | .- نۆرمەکان و دابونەریت. |
| | - بیروباوەڕەکان. |
| | - سیستەمی ژیانی خێزانی. |

سەرەنجام هەندێ لە ئەزموونەکان لە تەواوی کولتوورەکاندا هاوبەشن. لە هەموو شوێنێکی جیهاندا چاودێریی منداڵان دەکرێت و خواردنیان بۆ دابین دەکرێت، لەناو گرووپە مرۆییەکاندا دەژین. لەڕێی زمانەوە شێوازی بەرقەرارکردنی پەیوەندییەکان فێر دەبن. جۆرەها سزاو پاداشت تاقی دەکەنەوە، و لە زۆر لە ئەزموونەکانی تردا لەگەڵ هەموو مرۆڤایەتیدا هاوبەشن.

هەر کۆمەڵگایەک گشت تاکەکانی ڕووبەڕووی ئەو تاقیکردنەوانە دەکاتەوە کە تایبەتن بەخودی ئەو کۆمەڵگایەوە. کولتوور بەدیهێنەری ئەو قارەمانانەیە کە بۆ ئەوانی تر دەبن بەسەرمەشق. سەرەنجام ئەوەیە کە سنووری ئەرکەکانی کولتوور زۆر فراوانەو سەرەڕای ئەوەی کە گوترا بابەتەکانی وەکو دیاریکردنی پێویستییە ئابوورییەکان، دابینکردنی هۆیەکانی چاودێریی کۆمەڵایەتی و ڕێکخستنی پەیوەندی نێوان مرۆڤ و هۆکارە میتافیزیکییەکانیش لە خۆوە دەگرێت[٧/٨٤].

## کولتوورو کەسێتی

کەسێتی (Personality) پێکهاتەیەکە لەبۆماوەی بایۆلۆژی، ژینگەی فیزیکی، کولتوور، ئەزموونی گرووپی و ئەزموونی تاکەکان.

لەگەڵ ئەوەی کە هەموو تاکەکان دان بەوە دادەنێن کە بۆماوەی ژیانیی و پرۆسەی بەکۆمەڵایەتیبوون، هەردووکیان لە گەشەکردنی کەسێتی مرۆییدا ڕۆڵی سەرەکییان هەیە، بەڵام ئەو خاڵەی کە هەموویان لەسەری کۆک نین گرنگی ڕێژەیی ئەو هۆکارانەیە. ئەم ڕێکنەکەوتنەش بووەتە هۆی ئەوەی کە کۆمەڵێک باس لە «سروشت» بکەن لە بەرامبەر «ژینگە»دا (یان بۆماوە لە بەرامبەر ژینگەدا). زۆر جار ئەستەمە - سەختە دەست نیشانی ئەوە بکەین کە کام یەک لە هۆکارە کۆمەڵایەتیی و ژیانییەکان کاریگەرتر بووە لەسەر گەشەکردنی کەسێتی مرۆیی. بۆ نموونە پرۆسەی بەکۆمەڵایەتیبوون وا دەکات کە کەسێک فارسی یان چینی نووسین فێربێت، بەڵام ئایا دەتوانرێ بەهەمان ڕادەی وردی و بنەبڕ بگوترێ کە بەهۆی پرۆسەی بەکۆمەڵایەتی بوونەوە بلیمەتی وەکو حافزو سەعدی و شکسپیرو... هتد هاتوونەتە کایەوە؟ لە هەمان کاتدا کۆمەڵناسەکان لەسەر ئەم خاڵەش ڕێککەوتوون کە زۆربەی جار بۆماوەو ژینگە لەگەڵ یەکتردا پەیوەندیی دوولایەنەیان هەیە.

هەموو تاکێک لە ڕێگای بەشداریکردنی کۆمەڵایەتییەوە وێنەیەکی خۆی بەدەست دێنێ. هەندێ کەس لەبەر ڕەوش و بارودۆخی خۆیان هەست بە

لەخۆباییبوون و شانازی دەکەن، لە هەمان کاتیشدا تامەزرۆی بەدەستهێنانی تاقیکردنەوە نوێیەکانن، و لە بەرامبەر ئەمانەشدا هەندێکی تر خۆیان لە وێنەی کەسانی نەزان (گێل)، تووڕە (عصبی)، لێنەهاتوو، و پڕ لە شێواوی و نائارامدا دەبیننەوە.، ئەم جۆرە هەستانە کاریگەرییەکی زۆریان هەیە لەسەر ڕەفتاری مرۆڤەکان.

کاتێ کە دەبیستین دەڵێن «فلان کەس کەسێتییەکی زۆرباشی هەیە» لەوانەیە مەبەست ئەوەبێت کە ئەو کەسە، کەسێکی سەنگین و بەئەدەبە. هەڵبەت لێرەدا لەڕووی زانستییەوە زاراوەی «کەسێتی» وەک چەمکێکی ڕاست و تەواو بەکار نەهاتووە، چونکە کەسێتی تاکێک هەموو تایبەتمەندییە ڕەفتارییەکانی ئەم تاکە دەگرێتەوە. بەشێوەیەکی دروستتر بڵێین، کەسێتی هیچ تاکێک زیاتر نییە لە تاکێکی تر بەڵکو کەسێتی هەر تاکێک جیاوازە لەگەڵ ئەوی تردا. لەراستیدا کەسێتی، تەواوی ڕەفتارەکانی تاکێکە لەگەڵ سیستمێکی تایبەت لە ئارەزوو بۆ کردار لە بارودۆخ و هەلومەرجی دیاریکراودا. «سیستمێکی تایبەت لە ئارەزووەکان» بەو واتایەیە کە هەر تاکێک شێوازێکی تایبەتی هەیە لە ڕەفتاردا. کاتێک دەڵێن (بەرهەم) کەسێتییەکی وەکو دلێری نییە مانای ئەوەیە کە تایبەتمەندییە ڕەفتارییەکانیان جیاوازن لەگەڵ یەکتردا.

بەم پێوەرە هەندێ خەڵک لەو باوەڕەدان کە مرۆڤە قەڵەوەکان کەسانی شادو بەزەوقن، کەسانی نێوچەوان درێژ زاناو زیرەکن و ئەو کەسانەی کە شەویلگەی درێژیان هەیە زۆر بەهێزن. هەرچەندە تۆژینەوە زانستییەکان نادروستی زۆربەی ئەو بیروباوەڕە گشتییانەیان سەلماندووە، لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانین بڵێین کە ئەم جۆرە چەمکانە لەراستیدا پێناسەی کۆمەڵایەتی و کولتوورین بۆ تایبەتمدییە فیزیکییەکانی تاکەکان.

وشەی کۆمەڵگا، بەو شێوەیەی ئاماژەی پێکرا نیشاندەری بوونی یەکێتییە لە نێوان هەندێ لە تاکەکان و هەروەها کولتووریش گێڕەرەوەی نموونە ڕەفتارییەکانی فێربوو و هاوبەشی ئەندامانی کۆمەڵگایێکە. لەگەڵ ئەوەشدا کە کەسێتی بەرهەمی ڕەفتارە، بەڵام جیاوازە لەگەڵ ڕەفتار خۆیدا. کەسێتی لەودیوی ڕەفتارەوە خۆی حەشارداوە لەناخی تاکدا جێی گرتووە. ئەو هێزانەی لە کەسێتییەوە هەڵقوڵاون وەکو ئامادەبوونن بۆ وەڵامدانەوە. بێجگە لەمەش چەمکی کەسێتی هەڵگری ئەو ڕاستییە کە ئەم ئامادەبوونانە لە چوارچێوەی جۆرە یەکگرتنێکدا حاڵەتێکی ڕێکخراویان

هەیە. کەسێتی لە پەیوەندی دایە لەگەڵ ئامادەییە ڕێکخراوەکانی تاک بۆ ئەنجامدان، وەرگرتن، بیرکردنەوە، و هەستکردن بەجۆرێکی تایبەت لە بارەی کەس یان شتێک[ ٥٨/٧٨ ].

لەو ڕووەوە کە کەسێتی وەکو چەمکی کۆمەڵگاو کولتوور لەواقعیەتێکی بابەتییەوە (تاکەکان و ڕفتارەکانیان) وەرگیراوە، پەیوەندییە ڕووبەڕووەکان (بەرامبەرەکان) لە نێوان ئەم سێ چەمکەدا زۆر ئاڵۆزن. هەروەک «ڕالف لینتون» ئاماژەی پێکردووە[ ٢٩/٧٩ ]. کۆمەڵگاو کولتوورو کەسێتی پەیوەندییەکی وایان لەگەڵ یەکتردا هەیە کەوا دێتە بەرچاو کە تۆژەرەکان تووشی هەڵە دەبن کاتێک کە هەوڵ دەدەن لە یەکتریان جیابکەنەوە.

لەگەڵ ئەمەشدا هەریەک لەم سێ چەمکانە سیفەتی تایبەتی خۆیان هەیەو ڕۆڵێکی دیاریکراویان لە دروستکردنی ڕەفتاردا هەیە.

زۆربەی ئەو شتانەی کە لە ڕابردوودا دەدرانە پاڵ ڕەگەز یان بۆماوە، ئێستا بەئەنجامی (بەرهەمی) فێرکردنی کولتووری لە قەڵەم دەدرێت. کولتوور مۆرکێکی دیاریکراوی تایبەت لە کەسێتی تاکەکان دەدات. تاڕادەیەک وەک ئەوەی کە دەبینین لەسەر هەندێ کالای پیشەسازی بۆ نموونە دەنووسرێت «دروستکراوی ئێران». هەڵبەت ئەم خاڵە بەو واتایە نییە کە لەناو کولتوورێکی یەکگرتوودا هەموو تاکەکان وەکو یەکن، چونکە هەر تاکێک لەڕووی بۆماوە و ئەزموونە کولتوورییەکان و ئەزموونە خێزانییەکان و، لە دواییشدا ئەو پێشینانەی کە تایبەتن بەتاک، هەلومەرجی تایبەتی خۆی هەیە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەزموونە گشتییەکانی پەروەردەبوون لەناو کولتوورێکی دیاریکراودا، کاریگەری خۆیان لەسەر کەسێتی تاک دەسەپێنن، بەجۆرێک کە بۆ نموونە ئەگەر منداڵێکی بەڕەچەڵەک هیندی لە ئێران گەورە بێت وەکو ئێرانییەک خۆی دەنوێنێت. لەگەڵ ئەوەی کە مرۆڤەکان داهێنەری کولتوورن، بەڵام هێشتا دەتوانرێ لافی ئەوە لێبدرێ کە کولتووریش گەشە بەمرۆڤەکان دەدات [ ٦٧/٨ ].

هەمیشە بینیومانە کە جیاوازییە کولتوورییەکان زۆرجار لە زمانی ئەو بێگانانەی کە لەگەڵ خەڵکی وڵاتێک پەیوەندییان هەبووە بەچەند جۆرێکی جیاواز دەربڕاون.

## پێکگەیشتن - کولتوور و زمان

پێکگەیشتن یان پەیوەندیکردن (Communication) پرۆسەیەکە کە بەهۆیەوە، «هەواڵەکان» بەبێ ڕەچاوکردنی ماهییەتەکەیان و ئەو هۆکارەی کە بەکاردەهێندرێت لەتاکێکەوە دەگوازرێتەوە بۆ تاکێکی ترو بەم شێوەیە کردەی کارلێکی کۆمەڵایەتی (Social Interaction) بواری ئەنجامدانی بۆ دەڕەخسێت [ ۱/ ۲۲ ]. دەتوانین ئەو کۆمەڵە هەلومەرجانەی کە زاڵن لەسەر کاری پێکگەیشتن چڕو کورت بکەینەوە لە: ڕەهەندە فیزیکییەکان (ژینگەی دروستکردنی پێکگەیشتن وەکو هۆڵ (قاعە) پۆل و هتد...)، ڕەهەندە کولتوورییەکان (شێوەی ژیان، بیروباوەڕەکان، بەهاکان هتد...) ڕەهەندە دەروونی - کۆمەڵایەتییەکان (پایەی کۆمەڵایەتی تاکەکان، ڕێسا کولتوورییە زاڵەکان بەسەر کۆمەڵگادا، ڕەسمی یاخود نارەسمی بوونی هەلومەرجەکان و هتد...)، هەروەها ڕەهەندی کاتی (کاتی پێکگەیشتن) [ ۷/ ۲۰۲ ].

لە ماوەی چەند دەیەی رابردوودا، کە زانست و تەکنۆلۆژیا زۆر گەشەی کردووە، چەمکی پێکگەیشتن زۆر فراوان بووەو ڕەهەندە جیاوازەکانیشی ئەمڕۆ بریتین لە: ڕێگاو هۆکارەکانی پێکگەیشتن، گواستنەوەی هەواڵەکان و بەڵگەنامەکان، پێکگەیشتنە زانستی و کارگێڕییەکان، پێکگەیشتنە گفتوگۆیی و تەلەفۆنییەکان، تەکنیکەکانی گەیاندن، پێکگەیشتنی نێوان تاکەکان، پێکگەیشتنی نێوان دەزگا کۆمەڵایەتییەکان، پێکگەیشتنی پشت ئەستوور بە هۆکارەکانی پێکگەیشتنی دەستەجەمعی، پێکگەیشتنە ڕامیارییەکان، پێکگەیشتنی نێوان حکوومەت و خەڵک و هتد....

زمان سەرەکیترین هۆیە کە مرۆڤەکان هەیانەو سوودی لێوەردەگرن بۆ دروستکردنی پێکگەیشتنی ناو کۆمەڵگا. بەم پێیە زمان وەک سیستمێک وایە کە بوار بۆ بەیانکردنی گوتارێکی دیاریکراو لەناو کۆمەڵێکی دیاریکراو لە مرۆڤەکاندا دەڕەخسێنێت. زمان بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ نابینرێت، بەڵکو خاوەن تایبەتمەندیگەلێکی ئەو قسانەیە کە دەکەونە پێش ئەوەوە. ئەگەر زمان بابەتی سەرەکی زمانناسی بێت زمانەکان بەلەبەرچاوگرتنی ئەو جۆر بەجۆرییەی کە هەیانە، لە ڕوانگەی کۆمەڵایەتییەوە دەربڕی سێمبولیانەی کردارە زمانییەکانن، لەبەر ئەوەشە کە فارسی و ئینگلیزی دوو زمانی لە یەکتر جیاوازن و لە وڵاتانی وەکو سوریاو مەغریب، خەڵک بەزمانێکی یەکگرتوو قسە دەکەن. لەگەڵ ئەوەشدا زمانی

ئاخاوتنی خەڵکی سوریاو مەغریب لێک جیاوازن. لە نێوان زمانەکان، زارەکان، دەربڕینەکان و ڕەهەندەکانی قسەکردن جیاوازی هەیەو ئەوەی کە پێی دەگوترێ زمان لە نێوان بێژەرەکان و لەسەردەمە جیاوازەکاندا وەکو یەک نییە. [٥٨/٣-٥].

مرۆڤ وشەکان وەکو ئامرازێک بەکاردەهێنێت بۆ کۆنترۆڵکردنی ڕەفتاری خۆی و کەسانی تر، و وشەکان گرنگییەکی زۆریان هەیە لە ژیانی مرۆڤەکاندا (زمان درێژ سەری خاوەنی دەخوات). تایبەتمەندیی سەرەکی ئەم ئامرازە گوتارییە، [illegible] هیەتە کۆمەڵایەتییەکەیەتی، چونکە لە ڕێگای قسەکردن و زمانەوەیە کە مرۆڤەکان دەتوانن هزرەکان، هەستەکان، و مەبەستەکانی خۆیان بگوازنەوە بۆ کەسانی تر. گوتوویانە کە وشە وەک «سێمبول» (ڕەمز) وایە، شتێکە بەکاردەهێندرێت بۆ باسکردنی شتێکی جیاواز لە خۆی. روون و ئاشکرایە کە وشەی «مار» هیچ لێکچوونێکی لەگەڵ «ماری» ڕاستەقینەدا نییە، بەڵام لەبەرئەوەی کەوا وشەی «مار» لە مێشکی تاکەکاندا زەینیەتێکی تایبەت دروست دەکات لەبەر ئەوەیە کە بەشێوەی پەیمانێک ئەم وشەیە بۆ ماری واقیعی پەسەند کراوە، بەڵام بەمەرجێک کە واتاکەی بزانن یان توانای خوێندنەوەیان هەبێت (چیرۆکی کۆنی نووسینی وشەی ماروکێشانی وێنەکەی بەبیر خۆت بێنەرەوە). ئەوەی کە بەهۆی وشەیەک دەخرێتەڕوو لەوانەیە شتێک یان بوونەوەرێکی بابەتی و واقیعی (وەکو مار)بێت، یان چەمکێک یان حاڵەتێکی دەروونی و هەستی بێت (وەکو ددان ئێشان). بێجگە لەمانەش لەناو زۆر لە زانستەکان و بەشەکاندا هێماکان واتای ئیتیفاق لەسەر کراویان هەیە، و وەکو ڕەش وان (وەکو نیشانەی یەکسان = لە ماتماتیکدا). لەڕاستیدا وشە بۆ وەسفکردنی ئەو شتەیە کە ئێمە لەسەری ڕێککەوتووین و پێویست نییە کە سەدا سەد پەیوەندییەک هەبێت لە نێوان وشەو شتداو ئەگەر پەیوەندیش هەبێت لەسەر بنەمای پەیمانی کۆمەڵایەتی دەبێت [٨٤/٢٧٣-٢٧٦]

باسکردنی ئەو چەمکە کە شێوازی قسەکردنی کەسێک نیشانەی کەسێتیی ئەوە، لە جیهاندا ڕەگوڕیشەی کۆنی هەیە. ئەوەمان بیستووە کە گوتوویانە: تا پیاو قسە نەکات کەموکورتی و هونەرەکانی بەشاراوەیی دەمێننەوە.

ئاخاوتنی مرۆڤەکان دەربڕی ئەو چەمک و ناوەڕۆکانەیە کە مرۆڤەکان حەز دەکەن وابێت یاخود زاڵە بەسەر زەینیاندا. بەهەمان ڕێژە کە لەناو عەرەبە کۆنەکاندا بۆ ناولێنانی «حوشتر» وشەی جۆربەجۆریان هەبوو، لەناو ئەسکیمۆییەکانیشدا بۆ ناولێنانی «بەفر» وشەی جۆراوجۆریان هەبوو. جۆرەکان و حاڵاتی زۆر جیاوازی

«حوشتر»و «بەفر» لە کاتێکدا کە ئەم دووانە دەورێکی گرنگییان هەیە لە ژیانداو بۆ کۆمەڵگا بە بەشێکی زۆر پێویست دەژمێردرێت، و بۆ وردتر وەسفکردنیان دەبێت وشەی جیاجیا بەکاربهێنرێت. گرنگی زمان لە ناساندنی کولتووردا بەرادەیەکە کە گوتراوە زمانی نەتەوەیەک کلیلێکە کە بەهۆیەوە دەتوانرێت کولتووری ئەو نەتەوەیە بناسرێت.

بوونی زمانە تایبەتییەکان لە گشت کۆمەڵگاکاندا شتێکی دیارە، ئەو زمانانەی کە لەناو زمانی سەرەکی و بەیارمەتی ئەوەوە دروست دەبن. تۆژینەوەکانی زمانناسان ئەوەیان دەرخستووە کە ئەم زمانانە بەدرێژایی مێژوو هەمیشە بوونیان هەبووە. ئەو زمانە تایبەتییانەی کە لەناو چین و توێژەکان و گرووپەکان و دەستە جیاجیاکانی کۆمەڵگایەکدا دەبینرێن هەروەکو زمانی سەرەکیی کۆمەڵگا بەرهەمی ئەزموونە هاوبەشەکانی ئەندامانی گرووپ و نیشاندەری ئەو زەمینەو مەسەلانەیە کە حەزیان لێیە بەئارەزووی ئەوانە. زمانی تایبەتی گرووپێک لەلایەکەوە پەیوەندی و پێکگەیشتنەکان لە بوارگەلێکی هاوبەش و یان ئەو بوارانەی ئارەزوویان لێیەتی. ئاسان دەکات و لەلایەکی تریشەوە هەستی هەماهەنگی گرووپی، بەهێز دەکات[ ٢٩٢/٨٤ ].

## جۆرناسی کولتووری

بەسەرنجدان لە جیاوازی ناوەڕۆکی کولتوور لە کۆمەڵگا جیاجیاکانداو هەروەها گۆڕانی بەدرێژایی مێژوو هەوڵی جیاجیا بۆ پۆلین کردنی جۆرە جیاجیاکانی کولتووری لەلای کۆمەڵناسەکان و مرۆڤناسە کۆمەڵایەتییەکاندا ئەنجام دراون، بەڵام ئەوەی دەبێتە هۆی ناکۆکی لە نێوانیاندا جیاوازی ئەو پێوەرانەیە کە سوودی لێوەردەگرن. جۆراوجۆرێتی کولتووریی لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە مرۆڤەکان بۆ بەدەستهێنانی پێویستییە کۆمەڵایەتی، دەروونی، و ژیانییەکانی خۆیان سوود لە شێوازو هۆکارە جۆراوجۆرەکان وەردەگرن.

پۆلبەند کردنی کولتوور بۆ هەردوو جۆری مادی و مەعنەوی پۆلینێکی کۆنە. لەسەر ئەو بنەمایە کولتووری مادی ئەو رەگەزە کولتوورییانە لە خۆ دەگرێت کە حاڵەتی شت بوونیان هەیە، هەروەها هەندێ شتی وەکو هۆیەکانی گواستنەوەو گەیاندن، خانوو، ئامێرو کەرەستەکانی کارو ژیان و جلوبەرگ و شتی لەو جۆرە دەگرێتە خۆی. لەبەرامبەر ئەمەشدا رووکارەکانی کولتووری مەعنەوی راستەوخۆ لە

واقعیدا دەرناکەون، وەکو ئایدیۆلۆژیا، ئایین، فەلسەفە، بیروباوەڕەکان، باوەڕ پێ هێنراوەکان و بەها کۆمەڵایەتییەکان. «راس بێنێدێکت - R. Benedict» مرۆڤناسی ئەمریکی بەپێی لێکۆڵینەوەکانی خۆی و لە روانگەی رەفتارگەرایانەوە کە دەکرێ لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا بخرێتە روو. کولتوورەکانی دابەش کردووە بۆ دوو جۆری «فەلسەفی» و «پاڵەوانی». «جۆرناسییەکەی» لەسەر ئەم گریمانەیە بیناکراوە کە هەر کولتوورێک لەناو توانا رەفتارییە جۆراوجۆرەکاندا هەندێک جۆری رەفتارەکان هەڵدەبژێرێت. لەناو کولتووری فەلسەفیدا حاڵەتەکانی وەکو قەناعەت، ئاشتیخوازی، میانڕەوی، یەکسانی، و ئارەزوو بۆ ژیانی هاوبەش، بەئاشکرا زاڵە، و لەکاتێکدا لەناو کولتووری پاڵەوانیدا رەفتارەکان پشت بەشەڕخوازی، ناکۆکی و بەربەرەکانی، ململانێ، سەربەخۆییخوازی، و پلەو پایەخوازی دەبەستن.

بەگوێرەی روانگەی «رەفتارگەرایانە»، «دێیڤید ریزمەن» سێ جۆری جیاواز لە کولتوور دیاری دەکات. جۆری یەکەم ئەو کولتوورەیە کە تاکەکان تیایدا خاوەن «توانای داهێنان»ن و بۆ گەیشتن بە ئامانجە تایبەتییەکان هەوڵ دەدەن. لە جۆری دووەمی کولتووردا، رەفتاری تاکەکانی کۆمەڵگا لەژێر کاریگەری سەرچاوەی زۆر جیاوازدایەو ئەوان توانای گونجانێکی زۆریان هەیە لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی دەوروبەردا، (وەکو کۆمەڵگا پیشەسازییەکان) و بەکورتی کەسێتی تاکەکان حاڵەتێکی کارتێکراوانی هەیە. لە سێیەمین جۆری کولتووردا، پەیڕەویکردنی بێ ئەم لاو ئەولا لە دابونەریت و ترادیسیۆنەکان شتێکی زاڵە، مردووەکان بەزەقی (بەعەمەلی) دەسەڵاتی راستەوخۆیان بەسەر کۆمەڵگادا هەیە. بەکورتی دابونەریت بەهۆکاری سەرەکی کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی (Social Control) دەژمێردرێت.

ئەو چەمکانەی کە بەدرێژایی ئەم ساڵانەی دوایی بەتایبەتی کۆمەڵناسە فەرەنساییەکان سوودیان لێوەرگرتوون، چەمکی «کولتووری تەکنیکی» (Techno Culture)یە، کە بەکارهێنانەکەی زیاتر بۆ روونکردنەوەی ئەو جیهانبینییە بووە کە لەسەر کولتووری تەکنیکی یان تەکنۆلۆژی بیناکراوە. ئەوان دەڵێن: ئەم جیهانبینییە پشت ئەستووورە بەهەندێ بەهای نوێ، کە هەوڵیداوە بۆ هێنانیان بۆ ناو بەها کۆنەکان، سیفەتە سەرەکییەکانی بریتین لە: دووپاتکردنەوەی «خود» وەکو تاکێکی سەربەخۆ و لەهەمان کاتدا ئارەزوو بەرەو توانەوە لەناو کۆمەڵەیەکی دیاریکراودا (گرووپ یان رێکخراو) - زاڵبوون بەسەر سروشتدا و رێزگرتنی - مەعریفەی بیناکراو لەسەر ئەقڵ و لۆژیک- رکابەرایەتی و هاوکاری - و لە کۆتاییدا

بەچەندێتی کردنی ڕاستی و شتەکان.

پێکەوە بەستنی جۆرەکانی کولتوور لە ڕێگای لێکۆڵینەوەی کاریگەری دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکانی زاڵ بەسەریاندا لەوانەیە لە یەکەمین هەوڵەکان بن کە بۆ ناسینی جۆرەکانی کولتوور دراون، بۆ نموونە هەندێ کولتوور هەن کە دەتوانرێت بە کولتووری بازرگانی یاخود پیشەسازی ناوبنرێن، چونکە لەناو ئەوانەدا دامەزراوە ئابوورییەکان گرنگییەکی زیاتریان هەیە هەندێ کولتووری تر حاڵەتێکی خێزانییان هەیە، وەکو کولتووری وڵاتی چین لە سەردەمی پێش جەنگدا دەتوانرێت نموونەیەک لە زاڵبوونی دامەزراوەی سیاسەت لە ڕۆمانی کۆندا ببینرێت [ ١٠/١٧٥ ].

جۆرناسی کولتووری بەوەندەی کە باسکرا سنووردار ناکرێت و هەمیشە کۆمەڵناسەکان بەسوود وەرگرتن لە دیسپلینە جۆربەجۆرەکان جۆری جیاوازیان خستۆتەڕوو کە بەهۆی جیاوازی سەرەکی لە تێڕوانینەکاندا پەسەندکردنی یەکێک و فڕێدانی ئەویتر نە تەنیا ئاسان نییە، بەڵکو کردەییش نییە.

## چەمکی وردە کولتوور

لەهەر کۆمەڵگایەکدا، تاک پەیوەندی بە کولتوورە تایبەتییەکانی ئەو گرووپە تایبەتییانەوە هەیە کە لەگەڵیاندا دەژی، لەبەر ئەوە ناوی گرووپ بەکاردێنین چونکە لە کۆمەڵگا گەورەکاندا ژمارەی ئەو گرووپانە زۆرن کە تاک ئەندامە تیایاندا لەو ڕووەوە کە هەموومان ئێرانین لە کولتووریشدا هەموومان لەگەڵ یەکتردا هاوبەشین، بەڵام لە ناوەوەی ئەم کۆمەڵگا گەورەیەدا، هەروەها ئەندامی بەشی بچووکترین کۆمەڵگا بن، لە هەندێک لایەنەوە گرووپە ناسەرەکییەکانی، ناوچەیی، چینایەتی، نەتەوەیی و ڕەگەزی بەڵگەن بۆ جۆراوجۆرێتی کولتووری ئەم گرووپانە. تەنیا لەڕووی سیفەتێک یان دوو سیفەتی تایبەتییەوە ئەم گرووپانە جیاوازنین بەڵکو لە زۆر لایەنەوە چەند سیستمێکی کولتووری تایبەت پێکدەهێنن. ئەم «بەشە کولتوورانە» «Subculture» لەڕاستیدا چەند جیهانێکن لە چوارچێوەی کولتووری نەتەوەییماندا.

زۆربەی خێزانە ئێرانییەکان لە هەندێ لایەنەوە هاوبەشیان هەیەو قوتابخانە، ڕادیۆو تەلەفزیۆن و کتێبەکانی منداڵان زۆربەی منداڵان دەخەنە بەر بزوێنەری کولتووریی وەکو یەکەوە. لەگەڵ ئەمەشدا زۆربەی ئەو ڕەگەزە کولتوورییانەی کە کاریگەرن لەسەر منداڵێکی لادێنشین هیچ کاتێک لەلایەن منداڵێکی شارنشینەوە

تاقی ناکرێنەوە.

جیاوازی کولتووری لە نێوان پەیڕەوانی ئایینە جۆراوجۆرەکانیشدا جێگای سەرنجدانە تاکێک لەیەک کاتدا دەتوانێت ئەندامی چەندین وردە کولتوور بێت. ئەو وردە کولتوورانە تاکێک پەیوەستە پێیانەوە. ئەو شتانەی کە منداڵێکی چینی خوارەوەی کۆمەڵگا فێریان دەبێت جیاوازن لەگەڵ ناوەڕۆکی ئەو شتانەی کە منداڵێکی چینی ناوەندی کۆمەڵگا فێریان دەبێت. بەم پێوەرە ئەو بەهاو حەزو ئارەزووانەی کە منداڵێکی جوولەکە فێریان دەبێت جیاوازن لەگەڵ ئەو شتانەی منداڵێکی مەسیحی فێریان دەبێت، بەڵام لە هەمان کاتیشدا ئەم کەسانە دەتوانن لەناو گرووپ یان دەستەیەکی تایبەت (وەکو پارتێکی سیاسی یان کۆمەڵەیەک)یشدا ئەندامێتیان هەبێت. لەسەر ئەو بنەمایە گەنجەکان، گرووپە نەتەوەییەکان، یان گرووپە پیشەییەکان و هاوشێوەکانیان، دەتوانن خاوەن کولتوورێکی تایبەتی بن. بەواتایێکی تر وردە کولتوور بریتییە لە «کولتوورێکی بچووکتر لەناو کولتوورێکی گەورەتردا، کە سەرەڕای تایبەتمەندییەکانی، وەکو بەشێک لە سیستمێکی کولتووریی بەرفراوان دەژمێردرێت». هەڵبەت ئەم چەمکە پێوەری زۆر وردی نییە. ئایا ئەندامانی هۆزێکی بچووک و لاپەڕی ئێرانی خاوەن کولتوورێکی تایبەتین (وردە کولتوور)، هەرچەندە کە پەیڕەوی لە یاساکانی وڵات دەکەن و سەر بەئێرانن و، باج دەدەن بەحکومەت؟ لەگەڵ ئەمەشدا ئەگەر مانایەکی تر بدەین بە زاراوەی بەشە کولتوور باس لە وردە کولتووری لادێیی یان وردە کولتووری شاری بکەین، پێوەرەکان دەگۆڕێن.

هەندێک لە پیشەکان دەبنە هۆی دروستبوونی وردە کولتووری تایبەت. بۆ نموونە پزیشکەکان خاوەن کولتوورێکی تایبەتین کە کاریگەریی هەیە لەسەر رەفتاری ئەندامانی گرووپی پزیشکان و ئەوان لە کەسانی تر جیا دەکاتەوە لەڕووی بەهاکان، باوەڕەکان، رەفتارە نۆرماڵەکان، گفتوگۆ، جل پۆشین، نووسین و بیرکردنەوە. گشتگیریی ئەم رەفتارانە بەڕادەیێکە کە هەندێ جار دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەو کەسانەی لەناو گرووپێکی پیشەییدا پەیڕەوی لە نموونە باوەکانی ئەم گرووپە ناکەن حاڵەتێکی «پەنجە بۆ راکێشراو»یان دەبێت، لەناو مامۆستایانی زانکۆشدا جۆرێک لە وردە کولتوور دەبینرێت[٦٦/٥٩-٦٠].

سەرەڕای ئەم حاڵەتانە لەناو کۆمەڵگا نوێیەکاندا هەندێ گرووپی وا هەن کە لەڕووی تایبەتمەندییەکانەوە لەگەڵ بەشی تری کۆمەڵگادا گونجاونین. بۆ نموونە

گرووپە کۆچکەرەکان تێکەڵەیەک لە کولتووری کۆمەڵگای خانەخوێ و وڵاتی خۆیان لەگەڵ یەکتر پێکەوە دەبەستن و گەشەیان پێدەدەن، و شێوەی ژیانی کۆچکەرە دەوڵەمەندەکانیش جیاوازە لەگەڵ هەژارەکاندا. کولتووری تازە پێگەیشتووان لە هەندێ وڵاتی پیشەسازیدا دروستکەری هەندێک شێوەی تایبەتییە لەڕووی رەفتار، بیرکردنەوە، جلوبەرگ و تەنانەت زمانیش (بەتایبەت ئەو وشانەی بەکاریان دێنن).

هەموو وردە کولتوورێک خاوەنی کۆمەڵێک وشەی تایبەت بەخۆیەتی، کە رۆڵی پتەوکردنی جیهانی تایبەتی ئەوان لە بەرامبەر بێگانەکاندا لە ئەستۆ دەگرێت. دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان بەرهەمهێنەری ئەو جۆرە نموونە رەفتاریانەن کە لە دەرەوەی ئەم کۆمەڵە دامەزراوەیەدا کەمتر بەرچاو دەکەون و زاراوەکانی وەکو «کولتووری قوتابخانە»، «کولتووری کارگە» «ژیانی سەربازی» و «بورجی عاج» دەربڕی وێنەگەلێکی کۆمەڵە کولتوورییە تایبەتەکان [٧/ ٦٤-٦٥].

**وردە کولتوورەکان**

دەتوانین جۆرە سەرەکییەکانی چەمکی وردە کولتوور بەم شێوەیەی خوارەوە بژمێرین [٧٨/ ٦١-٦٨].

١- وردە کولتوورە ناوچەییەکان لەسەر بنەمای جۆراوجۆرێتی رەفتارەکان و پەیوەندیی لەگەڵ ناوچە جیاجیاکانی وڵاتێکدا دەناسرێتەوە.

٢- وردە کولتووری لادێیی و شاری کە بەتایبەت لە رابردوودا دەبوونە هۆی پەروەردەکردنی هەندێک کەس بەشێوازی هەستکردن، کردەوەو مەعریفەیی. هەڵبەت لە ساڵانی دواییدا لە زۆر شوێنی جیهاندا لەگەڵ هاتنی رادیۆو تەلەفزیۆن و ئۆتمبیل و دروستکردنی رێگا، قوتابخانە، کارەباو... هتد زۆربەی جیاوازییە کولتوورییەکانی نێوان شارو لادێ کەم بوونەتەوە.

٣- وردە کولتوورەکانی بیناکراو لەسەر چینە کۆمەڵایەتییەکان کە هەرچەندە ئەم چەمکە ناوەڕۆکی تەقلیدیی خۆی تارادەیەکی زۆر لەدەست داوە، بەڵام کەسانی خاوەن پلەو پایەی جیاجیای کۆمەڵایەتی، شێوازی رەفتاری جیاوازیان هەیە، کە ماهیەتێکی تایبەتییان پێدەبەخشێت. ئەم وردە کولتوورانە لەناو ئەو کۆمەڵگایانەی کە لەناویاندا جیاوازیی چینایەتییان هەیە چاکتر دەردەکەون.

٤- ئەندام بوون لەناو وردە کولتوورە رەگەزییەکاندا دەبێتە هۆی پەیدابوونی ئاراستەی کولتووریی و ئامادەبوون بۆ وەڵامدانەوە لە بەرامبەر هەلومەرجە

جیاوازەکاندا دەگۆڕێت.

٥- وردە کولتووری نەتەوەیی یاخود ئەتنیەکان کە زۆربەی جار بەهۆی کۆچکردنی کەسانێک لەوڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی ترو لە نێوان نەتەوە جیاجیاکانی دانیشتوونی وڵاتێکدا هەن.

٦- وردە کولتوورە ئایینییەکان سەرچاوەیەکی گرنگی دیکەن لەڕووی جۆراوجۆریتی رەفتارە نۆرماڵە کۆمەڵایەتییەکان کە کاریگەرن لەسەر رەفتار. لەم بارەیەوە نابێت گرنگی گرووپە ئایینییەکان کە لە چوارچێوەی ئایینێکدا دروست دەبن لە بەرچاو نەگیرێت.

٧- وردە کولتوورە پیشەییەکانیش دەتوانن بەهۆی ئەو ماهیەتە تایبەتییەی کە هەرکام لە کۆمەڵە پیشەییەکان هەیانە رەنگ و رووییێکی تایبەت بەرەفتارە مرۆییەکان بدەن.

٨- وردە کولتوورە گرووپییەکان. ئەم جۆرە کولتوورانە دەشێ لەناو هەر کۆمەڵگایێکدا هەبن و وردە کولتووری وا دروست بن کە دەقاودەق هاوشێوە نەبێت لەگەڵ گرووپە لێکچووەکانی خۆی لەناو کۆمەڵگایەکی دیکەدا. وەکو نموونەیەک: لە ئێراندا دەستەی «لمپن»ەکان یان بەمانای دیاریکراوەکەی لە زمانی فارسیدا «نەزانەکان» هەمیشە خاوەن وردە کولتووری تایبەتی خۆیان بوونە کە ئەمانی لەڕووی رەفتارییەوە لەوانی تر جیاکردۆتەوە. (خێزان - گەشتوگوزار - جل پۆشین - ئاخاوتن - پیاسەکردن - پیشە - شوێنی نیشتەجێ بوون-پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و... هتد). لە کتێبی «لمپنیزم»دا دەخوێنینەوە کە «لمپن»ەکان زاری تایبەت بەخۆیان هەیەو سوود لەو قسە نەستەق و داستانانە وەردەگرن کە سیمبولی ژیانیانە. تا چەند ساڵ لەمەوبەر چاکەت و شەرواڵی رەش لەگەڵ کڵاوێکی مەخمەری هاورەنگ و پێڵاوی رەشی بەسەر پێوەکراو و بزمار رێژکراو و کراسی یەخەکراوەو بێجامەی درێژی خەت خەت (کە زۆرجار لە شەرواڵ دێتە دەرەوە)و فانیلەی ئاوریشمیی نیوقۆڵ، جلوبەرگی رەسمیی «لمپن»ەکان بوو. «لمپن» حەزی لە پاڵتۆی (بارانی) و چەتر نەبوو چونکە پاڵتۆی (بارانی) و چەتر لەم سنوورەدا بەیاری ژیگول (جۆرە یارییەکی تایبەتە) دادەنرێت.. لەشی پڕ لە کوتان و خاڵ و زۆربەی کوتانەکانیشی وێنەی ژن، ئەژدیها، فریشتەکان و شێری لەسەربوو.. دەڵێن شێر ئیمپراتۆری دارستانەو «لمپن» حەز دەکات کە زلهێزی دەستوەشێنی دارستانی

«لمپن»ەکان بێت و چونکە لە کردەوەدا سەرکەوتوو نابێت لە زەینی خۆی و لەسەر سینگی خۆی جێبەجێی دەکات. هەندێک لەو کەسانە بەناوی زێدەکەیان نازناو وەردەگرن وەکو عەلی یەزدی، غولام مەحەلّلاتی، محەمەد تورکێ... مەڵبەندە گرنگ و پلە یەکەکانی نیشتەجێ بوونیان بریتییە لە شەقامی مەولەوی، مەیدانی گومرک، پردی ئیمامزادە مەعسووم، ئیمامزادە حەسەن، باغی فیردەوس، سابوونی پەزخانە، خانی ئاباد، دەروازەی غار، دەروازەی قەزوین، مەیدانی غار، سەرچەشمە، پامنار، بازارچەی مەروی، بازارچەی قەوامولدەولە و.. هتد. قسەکردنی ئاسایی «لمپن» جنێودان و قسەی بێ مانایەو لە هەموو شوێن و بۆ هەمووکەس بەکاری دەبات، بەڵام توندی و لاوازیی هەیە. گاڵتەکردن و قسەی خۆش و گفتوگۆی جنێو ئامێز لە شوێنی کارکردنی «لمپن»ەکاندا زۆر باو و ئاساییە. دەبێ ئەوەش بڵێین کە لەناو کۆمەڵگادا کولتووری «لمپن»ەکان لە حاڵی حازردا بەرەو لەناوچوونە، بەڵام سەرەڕای ئەمەش بەدرێژایی مێژوو لەوانەیە هەندێک لە رووکارەکانی ژیانی کولتووری ئەوان بچێتە ناو توێژەکانی دیکەی کۆمەڵگاوە [٨٧/٥٢-٦٨].

٩- وردە کولتووره لادەرەکان. جۆرەکانی وردە کولتوورە تەنیا بریتی نین لە ئایینی، قەومی، چینایەتی و... هتد. هەندێک جۆری وردە کولتوورەکان لە دەوروبەری هەندێک گرووپی وەکو ئەوانەی خوویان بە مادە بێهۆشکەرەکان گرتووە. (معتادین)، لادەرە سێکسییەکان، زیندانیان، مەشروبییەکان، گرووپە سیاسییە توندڕەوەکان، تاوانباران، و سۆزانییەکانیش دروست دەبن[ ٢٢ ].

### دژە کولتوور

ئەو بەشە کولتوورانەی کەوا لەگەڵ کولتووری زاڵدا لەناکۆکییەکی چالاکانە (ئەکتیڤ)دان، بە دژە کولتوور (Contera Culture) ناودەبردرێن. بۆ نموونە گرووپێکی تایبەت لە تاوانباران گرووپێک نین کە هیچ ستانداردێکیان نەبێت، بەڵام یەکەم: بەها زاڵەکان بەسەر ئەندامانیدا حاڵەتێکی زۆر دیاریکراو و پێناسەکراویان نییە. دووەم: جیاوازییان هەیە لەگەڵ نموونە پەسەندکراوەکانی چینی ناوەندی کۆمەڵگادا، ئەو گەنجانەی کە لەناو ئەم کولتوورەدا پەروەردە دەبن حاڵەتێکی پێچەوانەی بەهاکانی کولتووری زاڵ بەخۆیانەوە دەگرن و لەم رووەوە ئەو کەسانەی کە حاڵەتێکی لاساریان هەیە بەدژە کولتووریش ناو دەبرێن [٧/٦٤-٦٥] دەبێ

ئەوەش بزانیّن کە دژە کولتووریّک هەمیشە هەندیّک لە رەفتارە نۆرمالّەکانی کولتووری زالّ لە خۆیەوە بەدوور دەخات نەک هەمووی.

لەسەرەتادا کۆمەلّناسە ئەمریکییەکان و هەروەها ئەوانەی ناکۆک بوون لەگەلّ قوتابخانەی پزیشکی دەروونیدا لە ئینگلتەرا (لە سالانی ١٩٦٠) ئەم زاراوەیان بەکارهیّنا بۆ ئاراستەکردنی خۆپیشاندانە گشتییەکانی چەند گرووپیّک لە خەلّک و بەتایبەت گەنجەکان و رۆشنبیران لە ولاتە پیشەسازییە پیّشکەوتووەکاندا [٤٠/٧٤-٧٥]. ئامانجی ئەم گرووپانە هیّنانەدیی شۆرشیّکی کۆمەلایەتی و گۆرانی زۆرخیّراو تەواوی کۆمەلّەی کولتووری زالّ بەسەر ولاتە پیّشکەوتووەکاندا بوو. یەکیّک لە کۆمەلّناسە هاوچەرخەکان بەناوی «پول گودمان» (P. Goodman) لەو کەسانەبوو کە ئەو گەنجانەی هاندەدا کە ناکۆک بوون لەگەلّ رەوشە باوەکانی ناو ژیانی کولتووریی کۆمەلّگا پیّشکەوتووەکان بۆ هەنگاونان بەرەو بەدیهیّنانیی کۆمەلّگایەک کە بیناکراون بەشیّوەی خیّلّە سوورپیّستەکان و یان شارە یۆتۆپیا نوێیەکان. لە کۆمەلّگا پیشەسازییەکاندا بابەتی وەکو بزاڤە دژە ئەکادیمییەکان، شانۆییە ئازادەکان، سینەما نهیّنییەکان، رادیۆ ئازادەکان، گرووپەکانی لایەنگری ئازادیی سیّکسی، لایەنگرانی ژیان بە رووتی لەناو کۆمەلّگادا، رۆژنامە نهیّنییەکان و... هتد هەموویان لە دیاردە دژی کولتوورییەکانن.

### سەرمایەی کولتووری

زاراوەی سەرمایەی کولتووری کە لەم سالانەی دواییدا باوبووە لە ریّگای بەراوردکردن لەگەلّ سەرمایەی داراییدا جیّی باس بووە. لەلایەکی ترەوە، سەرمایەی کۆمەلایەتی پیّکدیّت لەو کۆمەلّە پەیوەندی و مەعریفانەی کە تاکیّک دەتوانیّت بەمەبەستی خۆ ئامادەکردن بۆ بەرگری کردن لە خۆی یان زالّبوون بەسەر هەلّەکاندا لە کۆمەلّگادا بەدییانبهیّنیّت. دەتوانین هاوسەرگرتن وەکو هۆکاریّکی زیادکردنی سەرمایەی کۆمەلایەتی دابنیّین، بەهەمان شیّوە کە کۆمەلّە جۆراوجۆرە خۆبەخشەکان (وەکو هاوپۆلانی رابردوو، دانیشتووانی شاریّک و...) ئاوها رۆلّیّکیان هەیە. لەسەر ئەم بنەمایە سەرمایەی کولتووری لەو کۆمەلّە هۆکارو توانایانە پیّکدیّت کە بەشیّوەیەکی بەردەوام توانای ئەوە بەتاک دەدات تاوەکو بەکاربەرو لەوانەشە وەک بەرهەمهیّنەریش دەستی بەکالا کولتوورییەکان بگات [٤٠/٥٨-٥٩].

چەمکی سەرمایەی کولتووری بەرفراوانترە لە چەمکی سەرمایەی مرۆیی کە

هەمیشە لەلایەن ئابووریناسەکانەوە بەتایبەت پسپۆرەکانی ئابووریی پەروەردەو فێرکردن سوودی لێوەردەگیرێت. ئەم گرووپە لەو باوەڕەدان کە هۆشیارییە تیۆری و هونەرییەکان کە لەلایەن قوتابییەکانی قوتابخانەکان و زانکۆکانی ولاتێک وەردەگیرێن، وەک سەرمایە وان و دەبێت وەکو سەرمایەیەکی ماددی ئەویش بەهۆکاری بەرهەمهێنان لە قەڵەم بدرێت. هەوڵدانی حکومەتێک لە بواری پەروەردەو فێرکردن جا چ لە بواری پەروەردەکردنی بنچینەیی یان پەروەردەکردنی بەردەوام دابێت، دەبێت بەسەرمایەگوزاری بژمێردرێت. دەتوانین جۆرەکانی سەرمایەی کولتووری بکەین بەسێ دەستە: لە دەستەی یەکەمدا واتە حاڵەتی زەینی و خوودی (مەعنەوی) سەرمایەی کولتووری بەهۆی کتێب خوێندنەوە، راهێنان و پەروەردەی کردەیی کەڵکە دەبێت. ئەم سەرمایە بێجگە لە رێگای فێرکردنی راستەوخۆ (لە ئاستێکی سنوورداردا) ناتوانرێت بگوازرێتەوە بۆ کەسێکی تر، لەگەڵ ئەو کەسەی هەڵگریەتی لەناو دەچێت و لە کولتوورێکەوە هەڵقوڵاوە کە لەناخی مرۆڤدا کۆدەبێتەوە. لە دەستەی دووەمدا واتە سەرمایەی بابەتی و دەرەکی (ماددی) سەرمایەی کولتووری بریتییە لە کۆمەڵێک کالای کولتووری، وەکو بەرهەمە هونەرییەکان، ئۆتمبیلەکان، راپۆرتە زانستییەکان، کتێبەکان، و... هتد. ئەم سەرمایەیە دەتوانرێت بگوازرێتەوە، (کڕین، فرۆشتن، فێرکردن، پێ سپاردن و... هتد)، بەڵام سیفەتە تایبەتییەکەی لەوەدایە کە لە ژێر کاریگەریی پەروەردەو (فێرکردنی) هەڵگرەکانییەتی. لە کۆمەڵی سێیەمدا، واتە سەرمایەی دامەزراوەیی و رێکخراو، سەرمایەی کولتووری لە رێگای بەڵگەنامە رەسمییەکان و بەڵگەنامەکانی خوێندن ئاراستە دەکرێت. وەکو دیپلۆمێکی دواناوەندی یاخود ئیمتیازی دۆزینەوەو داهێنان [٤٠/٥٨-٥٩].

لەم بوارەدا ئەوەی کە لەڕووی کۆمەڵناسییەوە گرنگییەکی زیاتری هەیە شیکردنەوەو راڤەکردنی چۆنیەتی گۆڕینی جۆرێکی سەرمایەیە بۆ جۆرێکی تری سەرمایە. بۆ نموونە کاتێک کە سەرمایەی ئابووری دەگۆڕێت بۆ سەرمایەی کولتووری و لە رێگای پلەکانی خوێندنی و ئەکادیمیاوە پشتگیری لێدەکرێت. هەڵبەتە لەوانەیە ئەم گۆڕانە ئیمتیازاتی تایبەتی بۆ چینی خۆشگوزەران بێنێتە کایەوە، بەتایبەت لەو بوارانەی کە مەسەلەی سەرمایەی ئابووری لە ئاستی کۆمەڵگادا رووبەڕووی دەسەڵات یان دەست تێوەردانی گرووپەکان یاخود چینە تایبەتییەکان دەبێتەوە. لەگەڵ ئەوەی کە جەماوەر زۆر هەست بە بوونی سەرمایەی کولتووری لەناو

کۆمەڵگادا ناکەن، بەڵام دەتوانن ببنە هۆی زیندووکردنەوەی دووبارەی سەرمایەی ئابووری، چونکە توانای چوونە نێو چەند جۆرێک پیشەی دیاریکراو بۆ چەند کەسێکی تایبەت دابین دەکات.

### گواستنەوەو بڵاوبوونەوەی کولتووری

کولتوور لە رێگای زمان و هێماکانی ترەوە دەگوازرێتەوە. لەگەڵ ئەوەی لەناو هەندێ جۆری گیانلەبەرەکاندا، دەنگ بەهۆکارێکی پێکگەیشتن دەژمێردرێت، بەڵام دەنگەکان رۆڵێکی کاریگەریان نییە لە گواستنەوەی کولتووردا. مرۆڤ لە رێگای زمانەوە، رابردوو و ئێستاو داهاتوو بەیەکەوە دەبەستێت. زمان دەبێتە هۆی کەڵەکەبوونی زانستەکان لە رابردووەوە تائێستاو داهاتووش، و بواری دەست گەیشتن بەم زانستانە لە جێگاکانی تریش دەڕەخسێنێتەوە. کاتێک کە زمان بێجگە لە حاڵەتی قسەکردن، شێوەی نووسینیش وەردەگرێت، توانای نوێ بۆ کەڵەکەکردنی کولتووری دێتەکایەوەو پرۆسەی گەشەسەندنی کولتووری خێرایی زیاتر بەخۆیەوە دەبینێت. بەدرێژایی مێژوو، کولتوور، هونەرەکان، هزرەکان، بەرهەم و لێهاتووییەکانی زیاتر خەزن دەکات، و هەمیشە هەرچەند کولتوورێک ناوەرۆکی پڕتر بێت توندو تۆڵییەکەی زیاترە. لە حاڵێکدا کە رەگەزی نوێ بۆ کولتوور زیاد دەکرێن، هەندێک رەگەز کە کارامەیی خۆیان لە دەست دەدەن بەبەشە ناچالاکەکانی مێژووی کۆمەڵگا دەسپێردرێن.

کاتێک کە نقارێک (ابداع) لەلایەن ئەندامانی کۆمەڵگایەکی تر پەسەند دەکرێت یاخود فێری دەبن ئەمە خۆی کاری بڵاوبوونەوە یان گواستنەوەی دیاردە کولتوورییەکانە، گومانی تێدانییە کە ئەگەر داهێنان لە شوێنێکدا شێوە وەرنەگرێت بڵاوبوونەوەی کولتووریش نابێت، بەڵام دەزانین کە کۆمەڵگا زێتر رەگەزە کولتوورییەکانی خۆی لە رێگای بڵاوبوونەوەوە بەدەست دەهێنێت نەک داهێنانی (توانای ئەفراندنی) ناوەخۆیی ئەندامانی ئەو کۆمەڵگایە. بڵاوبوونەوەی کولتووری تەنانەت لەناو ئەو کۆمەڵگا سەرەتاییانەی کە دەگەڕێنەوە بۆ هەزاران ساڵ پێش هەر هەبووە. لە جیهانی رابردوودا، بەسەرنجدان لەسەرەتایی بوونی شێوازەکانی گەشتیاری، گواستنەوەی هزرەکان و پیشە دەستییەکان زۆر لەسەرخۆ بووە [٧٨/٥١]. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە رێگای چالاکییەکانی وەکو بازرگانی، شەڕ یاخود کۆچکردن، پەیوەندی نێوان خێڵەکان بەو رادەیە بووە کە هۆکارەکانی

گواستنەوەی نقار لە کۆمەڵگایەک بۆ کۆمەڵگایەکی تر دابین بکات. بێگومان ئاسانکارییە نوێیەکان لە گەشتیاری و پەیوەندییەکاندا بۆتە هۆی ئەوەی کە بڵاوبوونەوەی کولتووری لە هەندێک شوێن خێراتر ئەنجام بدرێت وەک لە شوێنەکانی تر. لەگەڵ ئەوەی کە زانیارییەکانمان ناتەواون لە بارەی رێگا مومکینەکانی گواستنەوەی کولتووری زۆرێک لە رواڵەتەکانی ژیانی کولتووری لە چاخە مێژووییەکاندا، بەڵام کاتێک کە ئێمە ساتەوەختی سەرەتای بەدیارکەوتنی یەکێک لە رەگەزە کولتوورییەکان لە شوێنێکی جیهاندا بزانین، دەتوانین رێگاکانی بڵاوبوونەوەی ئەو رەگەزە دەستنیشان بکەین. لەم بارەیەوە پرسیارێک دێتە پێشەوە کە ئایا دەتوانرێت داهێنانێک بەشێوەیەکی سەربەخۆ لە شوێنە جیاجیاکانی جیهاندا شێوە وەرگرێت و ئایا بوونی هەندێک رواڵەتی کولتووریی لە شوێنێکدا بەو مانایەیە کە ئەم داهێنانە لەسەرەتادا لە شوێنێکەوە سەری هەڵداوەو لە شوێنەکانی تریشدا بڵاوبووەتەوە؟ وەڵامی ئەم پرسیارە لەوانەیە ئەوە بێت کە هەندێک لە داهێنانەکان (بۆ نموونە پیتەکانی ئەلف و بێ) تەنیا لە شوێنێکدا شێوەی وەرگرتووە، بەڵام هەندێکی تر (بۆ نموونە پەروەردەکردنی رووەکەکان) شوێنەکانی سەرهەڵدانی زۆرن. لەراستیدا بەپشت بەستن بەو بەڵگانەی لەبەردەستدان هەندێ جار قبووڵکردنی گریمانەی بەدیارکەوتنی داهێنانێک لە چەند شوێنێکی جیهاندا زیاتر جێگای قبوولکردنە لە گریمانەی بڵاوبوونەوەی کولتووری. مێژووی زانست و داهێنانەکان پیشان دەدات کە داهێنانێک تەنانەت لە زۆر حاڵەتدا بەشێوەیەکی هاوکات لەلایەن دوو یان چەند کەسن بەشێوەیەکی سەربەخۆ لە شوێنە جیاجیاکاندا شێوەی وەرگرتووە. راستی ئەوەیە کە شارستانییەت لە قۆناغە پێشکەوتووەکانیدا بەند نەبووە بەدەرکەوتنی یەک یان چەند «کەڵە پیاوێک». ئایا ئەگەر «ئەدیسۆن» لە منداڵیدا لەناوچووبایە کەسانی تر پەیدا نەدەبوون کە هەمان داهێنان ئەنجام بدەن؟.

لەگەڵ ئەوەشدا بوونی بەڵگەی زۆر کە ئاماژە بەداهێنانی دوو هێندە دەکەن، حەقیقەتی بڵاوبوونەوەی کولتووری لە ئیعتیبار ناخەن، لەگەڵ ئەوەی کە کولتووری زۆرێک لە نەتەوە سەرەتاییەکان کە لە شوێنە دوورکەوتووەکاندا دەژین رواڵەتی کولتووری زۆریان بە نەتەوەکانی تر نەبەخشیوە، بەڵام زۆربەی کولتووره بەئەزموونە ئاڵۆزەکانی جیهانی ئێستا، لە شارێگاکانی جیهانیدا کە توانای بەیەکگەیشتنی کولتووری زیاترو بەرفراوانتر بووە، گەشەیان کردووە [٥١/٧٨].

هزرەکان و نقارە کولتوورییەکان نەتەنیا بەسەریەکەوە کەڵەکە دەبن، بەڵکو بڵاویش دەبنەوە، واتە لە شوێنێک دەچن بۆ شوێنێکی تر. لە چاخەکانی بەردینی ناوەڕاست و بەردینی نوێدا زانستی سوود وەرگرتن لە تیروکەوان بێجگە لە ئوستراليا - لە هەموو ناوچەکانی جیهاندا بڵاوبووەوە پیتەکانی ئەلف و بێ کە لەلایەن فینیقییەکانەوە نووسراون یۆنانییەکان و ڕۆمییەکان سوودیان لێوەرگرت و لەلایەن ئەم دوو نەتەوەیەو ئەوانی دیکەشەوە شێوەی ئەم پیتانە گۆڕان و چوون بە زۆر شوێنی دیکەی جیهان. نموونەی وەک ئەمە لە مێژووودا زۆرن. کاتێک کە نقاری کۆمەڵگایەک ئەندامانی کۆمەڵگایەکی تر فێری دەبن و پەسندی دەکەن - واتە هەندێک لە رەگەزە کولتوورییەکان دەگوازرێنەوە - مەسەلەی بڵاوبوونەوەی کولتووری دێتە ئاراوە. بڵاوبوونەوە لە کۆنترین چاخەکانداو لەناو سەرەتاییترین کۆمەڵگاکاندا هەمیشە هەبووە، بەڵام گومان لەوەدا نییە کە لە حاڵەتی کەمیی هاتوچۆو گەشتیاریدا، بڵاوبوونەوەی هزرە نوێیەکان ڕووبەڕێکی زۆر سنوورداری هەبووە [٥١/٧٨]. لەگەڵ ئەوەی کە نەبوونی پەیوەندییە جوگرافیاییەکان و گەشت نەکردن کۆسپێکی سەرەکی بووە لە بەردەم بڵاوکردنەوەدا، بەڵام هەندێ جار، سەرەڕای ئەمەش، رەگەزە کولتوورییەکان مەودایەکی زۆریان بڕیوە بۆ نموونە هەندێ لە ئەفسانەکانی «کتێبی پیرۆز» وەکو «بورجی بابل» چووەتە زۆر شوێنی جیهان (هەڵبەت بەکەمێک گۆڕانکارییەوە). بڵاوبوونەوەی رەگەزە جیاجیاکانی کولتووری وابەستەی هەلومەرج و یاسا تایبەتییەکانە. وادێتە بەرچاو کە هەندێک لە رەگەزە کولتوورییەکان، بەپێچەوانەی هەندێکی تر لە پەیوەندی لەگەڵ کولتوورێکی دیاریکراودا تەبابن. سنووردار بوون لە بواری بڵاوبوونەوەی کولتووریدا لەوانەیە لە کۆمەڵێک هۆکاری وەکو ترس، دوودڵی و گومان بەرانبەر بێگانەکان و هزرەکانیانەوە سەرچاوە بگرێت. گۆشەگیری فیزیکیش لە هۆکارە زۆر گرنگەکانە. ئەو مرۆڤانەی بەدوور لە خەڵکی دەژیان کەمتر توانای ئەوەیان هەبووە کە رەگەزە کولتوورییەکان لەوانی تر وەربگرن. نموونەی زۆر بەرچاو لەم گرووپە ئەسکیمۆیەکانی دانیشتووی «گرینلەند»ن کەتا چاخی دۆزینەوەیان لە سەدەی نۆزدەیەمدا لەگەڵ هەموو جۆرەکانی تری ژیاندا نامۆ بوون. بەگشتی ئەوەندەی گۆشەگیری زیاتربێت کۆمەڵگا حاڵەتێکی سەرەتاییتری دەبێت و چەندیش کۆمەڵگا زیاتر دەست بداتە «خواستنی کولتووری». حاڵەتێکی چالاکتری دەبێت. تەنانەت لەناو کۆمەڵگا پێشکەوتووە نوێیەکانیشدا ئەو گرووپانەی کە گۆشەگیرترن، پێشکەوتنێکی کۆمەڵایەتی هێواشتریان هەیە.

## دواکەوتنی کولتووری

کولتوور هەمیشە لە حاڵەتی گۆڕاندایە، تەنانەت لەناو ئەو کۆمەڵگایانەش کەوەستاوو کەم جووڵە دێنە بەرچاو. لەبەر ئەوەی کە نموونە کولتوورییەکانی کۆمەڵگایەک پێکهاتووە لە شێوازە رەفتارییەکان، دەزگاکان و رەگەزە بەیەکەوە بەستراوەکانی تر، گۆڕان لە بەشێکی کولتووردا (داهێنان، زۆربوونی رێژەی دانیشتووان، یاخود سەرهەڵدانی هەرشتێکی نوێ یان جیاواز) دەبێتە هۆی دروستبوونی گۆڕانکاری و ململانێ و گوشار لەناو بەشەکانی تریشدا. لەم حاڵەتەدا زەرووەرەت و پێویستیی گونجان و دووبارە رێکخستنەوەی، کە دەبێتە هۆی ئەوەی کولتوور بە هاوسەنگییەکی نوێ بگات، لەوانەیە گۆڕانکاریی هاوشێوەبوون دروست بکات، بەڵام زۆرجار ئەم پرۆسە هاوسەنگییە زۆرخێرا دەرناکەوێت و لەوانەیە کاتێکی زۆری بوێت بۆ ئەوەی بەشێکی دواکەوتووی کولتوور بتوانێت بگاتەوە بە بەشەکانی ترو یەکبوونی کولتووری بەرهەم بێت. بۆ نموونە دوای هاتنی ئۆتمبیل بۆ ناو کۆمەڵگا بەرەبەرە حکوومەتەکان لە وڵاتە جیاجیاکاندا بیریان لە دروستکردنی شەقامی گونجاو و رێگای گەورە کردەوە. هەروەها نیشانە چەقاندن کە شەقامەکان و دانانی گڵۆپی سوور لە زۆر لەڕێڕەوە گشتییەکانداو بەرەبەرە پاش زۆربوونی ژمارەی ئۆتمبیلەکان شێوەی وەرگرت. باری دیسپلینەکانی هاتووچۆو و دروستکردنی گەراج نموونەیەکی ترە لەم بوارەدا. سەرەڕای ئەو هەوڵانەی لە ئاستی جیهانیدا لەم بارەیەوە دراون، مەودای نێوان زۆربوونی ژمارەی ئۆتمبیلەکان لەلایێکەوەو لەلایەکی تریشەوە هۆکارو تواناکانی پەیوەست پێیانەوە بەشێوەیەکی ئاشکرا لەزۆر شوێنەکانی جیهاندا دەبینرێت، هەرچەند هەنگاونانی زۆر بۆ بەیەکەوە گونجاندنی هەلومەرجەکان لەئارادابوو. لە دەیەکانی دواییدا، گەشەسەندنی بەربڵاوی خزمەتگوزارییەکان و کەرەستە کۆمپیوتەرییەکان بەرەبەرە بووەتە هۆی گۆڕانکاری زۆر لە زۆربەی بوارەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیدا. یەکێک لەم رەهەندانە کە هەمیشە درەنگ و پاش روودانی سەرپێچیکردنەکان یان کێشەی زۆر شێوە وەردەگرێت. پەسەند کردنی چەند یاسایەکی تایبەتی پێویستە لەم بوارەدا کە ئەوانیش بەخێرایی کارایی خۆیان لە دەست دەدەن، چونکە خێرایی گۆڕان لە سیستمی یاسایی حکوومەتەکاندا، هەمیشە کەمترە لە خێرایی گۆڕانە تەکنۆلۆژییەکان (بۆ نموونە: ئەلیکترۆنیک و ئامرازی پەیوەندیکردن وەک تەلەفۆن و فاکس).

بەتایبەت لەسەردەمی نوێدا، زۆربەی نقارەکان بارودۆخێکی ئەوهایان

هەیە[٥٤/٧٨]. کۆمەڵناسەکان ئەم حاڵەتە بە «دواکەوتنی کولتووری» (Cultural Lag) ناو دەبەن. بۆ یەکەمجار ئەم چەمکە لەلایەن «ویلیام ئۆگبێرن» (W.Ogburn) کۆمەڵناسی ئەمریکی خراوەتەڕوو. بەبۆچوونی ئەو، گۆڕانکارییە خێراکانی سەردەمی ئێمە سازگاری و گونجانی کۆمەڵایەتییان سەخت کردووە، مەبەست لەوەش حاڵەتەکانی وەکو: گونجانی مرۆڤ لەگەڵ کولتوورو هەماهەنگی و گونجانی نێوان بەشە جیاجیاکانی کولتوورێکە. بەڵام ئەوەی کە «ئۆگبێرن» مەبەستییەتی لە چەمکی دواکەوتنی کولتووریدا پەیوەندی هەیە لەگەڵ حاڵەتی دووەم (هەماهەنگی)دا. تەواوی بەشەکانی کولتوورێک پێکەوە ناگۆڕێن. هەندێک لە ڕەگەزە کولتوورییەکان خێراتر لەلایەنەکانی تر بەرەوپێشەوە دەچن و ئەوانی تر کەمتر گەشە دەکەن، ئاکامی ئەم کارە دواکەوتنی کولتوورییە، و دەشێ هەلومەرجی دەرکەوتنی قەیران لەناو کولتووردا بڕەخسێنێت. [٨٦/٧١-٧٩]

ئۆگبێرن چەمکی دواکەوتنی کولتووری لە ڕێگای لێکۆڵینەوەی کاریگەرییە تەکنۆلۆژییەکان و کاریگەریی نشارەکان بەسەر گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکاندا خستۆتەڕوو. بەڕای ئەو ئەگەر گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکان دەبنە هۆی دروستبوونی ململانێ لەبەرئەوەیە کە بۆ گونجانی دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان یاخود تاکەکان (کە بەهۆی کولتووری خۆیانەوە لە پەراوێزدان) لەگەڵ پێشکەوتنە تەکنیکییەکان و دۆزینەوە زانستییەکاندا ڕوودانی کەمێک دواکەوتن بەدوور نازانرێت [٥١/٢٨].

## دژایەتییەکان و قەیرانە کولتوورییەکان

هیچ کولتوورێکی زیندوو لەحاڵەتی وەستاندا نییە. نە کەمی ژمارەی تاکەکان، نە گۆشەگیریی جوگرافیایی و نەسەرەتایی بوونی هۆکارو کەرەستەکان، هیچ یەکێکیان نابنە هۆی وەستانی تەواو لە هەلومەرجی ژیانی مرۆڤەکاندا، لەوانەیە لە کۆمەڵگایێکدا شێوازو دیسپلینە تەقلیدییەکان زۆر توند بن و پێویست بێت جێبەجێ بکرێت و، سزادانی توند هەبێت و تاکەکانیش بەتەواوی لەژێر چاودێریی گوشارە کۆمەڵایەتییەکاندا بن. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر چاودێرێکی ئاسایی - تەنانەت لە کۆمەڵگایەکیشدا کە تا ئەوپەڕی پارێزگارە - پاش ماوەیەک گۆڕانکاریی (هەرچەندە سنووردارو کاریگەرییان کەم بێت) لە ژیانی کولتووریدا دەبینێت. [٨٨/١٧٠]

کۆمەڵگا نوێیەکان هەندێک دژایەتی لە بەرامبەر بەهاکان و نۆرمە کولتوورییەکاندا بەخۆیانەوە دەبینن، کە لە ئاستی تاکەکان و وردە کولتوورەکاندا بەرچاو دەکەوێت، چ ئەوەی بتوانین ئەوانە لەریزی دژە کولتوور دابنێین یان ئەو هەلومەرجانە بوونیان نەبێت. [٨٩/١٥-١٨] کولتوورە نوێیەکان بەهۆی بوونی گرووپە دانیشتووانییە ناتەباکان کە خواست، دیدگا، سەرقاڵی و هەلومەرجی جیاوازیان لەڕووی چینی کۆمەڵایەتییەوە هەیە، حاڵەتێکی ئاڵۆزو پڕ لە ناکۆکی دروست دەکات. لە زۆربەی کۆمەڵگا نوێیەکاندا بوونی گرووپە نەتەوەیی، رەگەزیی، زمانی و ئایینییە جیاجیاکان، بەشێوەیەکی وا جۆراوجۆرێتی بەکولتوور دەدەن کە هەندێ جار تەنانەت گەیشتن بە پێناسەیەکی سادە بۆ تایبەتمەندییە کولتوورییەکانی ئەو کۆمەڵگایەش روبەڕووی کۆسپ و تەگەرە دەبێت. بەها کولتوورییەکانی گرووپی زۆرینە، هەمیشە هاوواتا نییە لەگەڵ بەها کولتوورییە تایبەتییەکانی وردە کولتوورە جیاجیاکان [٩٠/٦٠-٦٦].

لە هەلومەرجی کولۆنیالیزمدا، پەسەندکردنی کولتوور لە زۆر باردا حاڵەتێکی پاسۆلۆژی (زیانناسی) بەخۆوە دەگرێت «ویلیام ریڤێرس» (W. Rivers) لێکۆڵەری بەریتانی لەو باوەڕەدا بوو (ساڵی ١٩٢٢) کە بەهۆی ئاکامەکانی دژایەتی نێوان کولتووری رۆژئاواو کولتووری خۆجێیی لەناو هەندێک خێڵدا (کە لەحاڵەتی سەرەتاییدا دەژیان) «تامی ژیان نەماوە» بەم پێیە «لە کولتوور رامالین» کە بەهۆیەوە تاک ئەو پێوەرانە لە دەست دەدات کە وای لێدەکرد پشت بەرەفتاری خۆی ببەستێت، دەبێتە هۆی بەدیارکەوتنی هەندێک کێشەی کۆمەڵایەتی. کێشەی وەک خواردنەوە، بەکاربردنی کەرەستە بێهۆشکەرەکان، بڵاوبوونەوەی داوێن پیسی، زۆربوونی تاوانکاری، و خۆکوشتن. لە بەرامبەر ئەمەشدا رەتکردنەوەی کۆلۆنیالیزم دەتوانێت ببێتە هۆی فرێدانی تەواوی رەگەزە کولتوورییەکانی کۆمەڵگای کۆلۆنیالیست و گەڕانەوە بۆ بەها کۆن و میللییەکان یان پێکهاتە تەقلیدییەکان. لەناو هەندێک لە وڵاتە ئەفریقییەکان لە پاش نەمانی هێزی کۆلۆنیالیستی هەموویان وازیان لە گشت دیاردەکانی ژیانی رۆژئاوایی هێنا (وەکو زمان، جلوبەرگ، کاتژمێری دەستی و...)

«جەلالی ئال ئەحمەد» بە ئاماژەپێدانێکی هۆشمەندانە لە بارەی رۆڵی هەندێک لە هۆکارە کاریگەرەکان لەسەر مەسەلەی رۆژئاواگەرایی رۆشبیران لەناو کۆمەڵگای ئێرانیدا دەنووسێت [٩٣/٤٠]: «خۆرئاواو قوتابخانە خۆرئاواناسەکانی ئێمە

گەنجەکان پەروەردە دەکەن بۆ ژیان لەناو ژینگەی رۆژئاوایی (میتروپول) و پاشان لەناو مەیدانە کۆمەڵایەتییە تەقلیدییەکانی دیلی کولۆنیالیزمدا ئازادیان دەکەن بەرهەمی ئەم گرفتە یەکەم، کۆچکردنی ئەقڵەکانە (هجرة العقول) - رووبەڕووبوونەوەیە لەگەڵ بیروباوەڕە تەقلیدییەکان - لە ئاکامدا، ئازادبوونی خەڵکە بەحاڵ و رەوشی خۆیانەوە ئەگەر رۆشنبیرێکیش لەناو ئەم ژینگە تەقلیدییانەدا بمێنێتەوە زیاتر وەکو هۆکارێکی کۆلۆنیالیستییە یان وەرگێڕیانە، نەک ئەندامێکی شوێنگرتوو لە کۆمەڵگای تەقلیدیدا».

هەندێک لە کۆمەڵناسەکان ویستوویانە وەسفی ئەو ناهەماهەنگییە بکەن کە لەنێوان تاک و کۆمەڵگاو کولتووردا هەیە. لە کۆمەڵگایەکدا کە لەسەر هەلومەرجی ئاڵۆز بیناکراوە، تاک دەگۆڕێت بۆ یەکێک لە ئەندامە زۆرەکانی کۆمەڵگا. تاکێک کە لە کۆمەڵگایەکی ئارام و بچووکدا ریشەکێش دەکرێت و لە ژینگەیەکی شاریدا کە لەسەر پەیوەندییە ناتایبەتییەکان دامەزراوە جێگیر دەبێت، بەلای کەمەوە لە قۆناغەکانی سەرەتاییدا حاڵەتێکی نالەبار لەگەڵ ئەوانی تردا وەردەگرێت. بەها تەقلیدییەکان و بیروباوەڕە کۆنەکان لە ژینگەیەکدا کە لە حاڵی گۆڕاندایە بەخێرایی ئیعتیبارو مانای خۆی دەدۆڕێنێت، و لەم حاڵەتەدا مرۆڤ رووبەڕووی تەنیایی و نامۆبوون دەبێتەوە. لە بەرامبەر ئەمەدا، کۆمەڵێکی تر لە کۆمەڵناسان ئەم جۆرە روونکردنەوانە بۆ کێشە کۆمەڵایەتییەکان رەتدەکەنەوەو دەڵێن لە کۆمەڵگا پیشەسازییە نوێیەکاندا، جۆراوجۆرێتی ئەنجوومەنە ئازادو خۆبەخشەکان ئەو توانایە بەتاکەکان دەدەن خۆیان بەگرووپەکان و سیستمێکی نوێ لە بەها کۆمەڵایەتییەکان ببەستنەوە [٥٢/٢٢-٢٥].

### ئەندازیاریی کولتووری

لەو باسە نوێیانەی کە بەدرێژایی دەیەی ئەم دواییە لە ئاستی وڵاتە پیشەسازییەکاندا خراوەتەڕوو چەمکی «ئەندازیاریی کولتوورییە» (Cultural En-gineering)، کە بریتییە لەزانست و هونەرو توانای وەڵامدانەوەی گونجاو لەڕووی چۆنیەتی، گوژمەو کات بەو داخوازیانەی کە لەلایەن پسپۆرەکانی بواری کولتووری بۆ وەدەست هێنانی ئامانجە کولتوورییەکان، ئەنجامدانی بەرنامەکان، دابینکردنی سەرمایە بۆ بەرنامەکان، و بەدەست هێنانی هونەری بەرنامەکان دەکرێت [٣/ ٢٠٣]. کەرەستەی سەرەکی ئەندازیاریی کولتووری بۆ گەیشتن بە ئامانجی خۆی

سوود وەرگرتن لە خوێندنەوەو بەکارهێنانی شێوازە تایبەتییەکانی شیکردنەوەو چۆنیەتی کارکردن بۆ ئەنجامدانی پیلانە کولتوورییەکانە، بۆ ئەوەی بتوانرێت ئەو دیسپلینە ئەقڵگەرایانەی بەڕێوەبەرایەتیکردن لەگەڵ چەمکی ئەفراندنی کولتووریدا بگونجێت. هەڵبەتە ئەم تێڕوانینە بۆ کولتوور جیاوازە لەگەڵ چەمکی گشتیی کولتووردا کە لەم بەشەدا ئاماژەمان پێکرد. ئەندازیاریی کولتووری لەو رووەوە کە بە لقێکی پراکتیکی دەژمێردرێت توێژی کولتوورییە لە سیستمی کولتووریدا کورت دەکاتەوەو لە چوار بەشدا ریزیان دەکات:

١- بەرهەمهێنەرانی کولتوور واتە: نووسەران، هونەرمەندان، شاعیران، دەرهێنەران و..هتد.

٢- موخاتەبەکان، واتە: موخاتەبە پیشەییەکان، موخاتەبە ئاساییەکان، جەماوەری خەڵک، بەکاربەرەکانی کاڵا کولتوورییەکان و.. هتد.

٣- بڕیاردەرەکان، واتە: حکوومەت و رێکخراوە حکوومییەکان، رێکخراوە داراییەکان، بانکەکان، دامەزراوە گەورە ئابوورییەکان و بەرهەمهێنەران و..هتد.

٤- نێوبژیکەران، واتە: رەخنەگران، رۆژنامەنووسان، رۆشنبیران و هتد.

لەسەر ئەم بنەمایە «بەرهەمهێنەرە کولتوورییەکان» لە ناوەڕاستی سیستمی کولتووریدان، چونکە لە رێگای ئەوانەوەیە کە بەرهەم و مۆدیل و رووداوەکان بڵاودەبنەوە. وزەو روحییەت لەوانەوە سەرچاوە دەگرێت. کات، توانایی، و حەز دەبێت لەلایەن موخاتەبەکان پێشکەش بکرێن. بڕیاردەرەکان، دراو، کارو کەرەستەکان دەخەنەڕوو، لە کۆتاییدا ناوبژیکەران رەخنە، ئەندێشەو روئیاو هزر لە مەیدانی کولتووریدا دەجووڵێنن [١٣/٢٠٣] ئەندازیارانی کولتووری هەر لەوانەی کە لە بەشی حکوومییدا چالاکن، یاخود لە بەشی تایبەتیدا (سەرەڕای ئەو گرنگییەی کە ئەم بەشە هەیەتی هەمیشە کەمتر باسی لێوە دەکرێت) لە یەکە جیاجیاکانی بەرهەم هێنانی کولتووریدا کە لە ئاستی کۆمەڵگادا بڵاوبوونەتەوە چالاکییان هەیە. لە باسکردنی ئەندازیاریی کولتووری دوولایەن کە بەدرێژایی ساڵانی دوایی جێگای باس بوونە بریتین لە: دامەزراوە کولتوورییەکان و دیاردە کولتوورییەکان.

دامەزراوە کولتوورییەکان ئەو دامەزراوانەن کە هەمیشە ئامانجیان قازانج کردن نییەو، بەرهەمی داهێنەرە کولتوورییەکان لەگەڵ موخاتەبەکانی یاخود خەڵکدا دەخەنە پەیوەندییەوە تا بتوانن یارمەتیی بدەن بۆ پاراستنی کەلەپووری کولتووری،

ئەفراندن و داهێنانی هونەری، و بڵاوکردنەوەی ئەم بەرهەمانە. ئەم چالاکییانە هەمیشە لەو مەڵبەندە تایبەتییانەی کە بۆ ئەم مەبەستە دروست دەبن ئەنجام دەدرێن. دەتوانین دامەزراوە کولتوورییەکان لەڕووی رەهەندی چالاکییەکان (بودجە،سەرمایە گوزاری و چالاکی)، ناوەرکردن (چۆنیەتی کارکردن)، ئەرکەکان (مۆزەخانە، بینایەی مێژوویی، کتێبخانە، پیشانگا) بۆ چەندین جۆری جیاجیا دابەش دەکەین.

دیاردە یان رووداوە کولتوورییەکان بەو کۆمەڵە چالاکییە کولتووریانە دەوترێت کە ماهیەتێکی کاتیان هەیەو لەوانیش شانۆگەرییەکان، کونسێرتەکان، پیشانگاکان و.. هتد. پسپۆڕی کولتووری ئەم کۆمەڵە چالاکییانە لە بەرامبەر چالاکییە هەمیشەییەکاندا وەکو (کتێبخانەکان، مۆزەخانەکان، بینایە مێژووییەکان) دادەنێین[١٢/٩٤-١٤] ئەوەی کە جیاکردنەوەی رووداوە کولتوورییەکان لە چالاکییە هەمیشەییەکاندا (بەتایبەت لە ئاستی دامەزراوە کولتوورییەکاندا) وەزەحمەت دەخات پەیوەندی روو لە زیادی دامەزراوەکانی هەر کۆمەڵێک لە چالاکییە هەمیشەییەکان و کاتییەکان (بۆ نموونە ئەو کتێبخانانەی کە لە ماوەی ساڵێکدا چەند جار هەڵدەستن بە سازدانی پیشانگای جیاجیا). دیاردە کولتوورییەکان لە سێ گرووپی خوارەوەدا پۆلێن دەکرێن:

أ- شانۆ وەکو (شانۆگەری، کۆنسێرت، ئۆپێراو...هتد).

ب- پیشانگاکان کە وەک باوە لە شوێنە جێگیرەکاندا سازدەدرێن و لایەنی پسپۆڕیی لە بەشە جیاوازەکاندا هەیە.

ج- فیستیڤاڵەکان لە بەشە جیاوازەکانی مۆسیقا، هونەرو.. هتد.

### کورتەی بەش

١- کولتوور چەند گرووپێک لە خەڵک بەیەکەوە دەبەستێتەوە و یەکیان دەخات و بیروباوەڕ، ترادیسیون، دابونەریت، بەهاو فێربووەکانیان دەگرێتەخۆ.

٢- کولتوور جەوهەری تایبەتیی خۆی لەسەر کەسایەتی ئەو مرۆڤانەی پەیوەستن پێیەوەو وێنا دەکات.

٣- کولتوور بەرهەمێکی کۆمەڵایەتییەو خاوەن ئەرکگەلێکی تایبەتە.

٤- سەرەڕای ئەوەی کە چەمکەکانی کۆمەڵگا، کولتوورو کەسێتی هەریەکێکیان ناوەڕۆکێکی تایبەتیان هەیە، بەڵام بەتەواوی لە یەکتر جیاناکرێنەوە.

٥- پێکگەیشتن پرۆسەیەکە لەڕێیەوە پەیامەکان لە تاکێکەوە بۆ تاکێکی تر دەگوازرێنەوە.
٦- پێکگەیشتن خاوەن رەهەندی فیزیایی، کولتووری، دەروونی-کۆمەڵایەتی و زەمەنییە.
٧- چەمکی پێکگەیشتن زۆر بەرفراوانە و دیاردەی جیاواز لە خۆ دەگرێت.
٨- زمان وەک سیستمێک وایە کە گوتارێکی دیاریکراو لە کۆمەڵگایەکی دیاریکراو لە مرۆڤەکان دەربرێت.
٩- وشەکان لە گواستنەوەی زانیارییەکاندا وەک سێمبۆلی کولتووری وان. پەیمانی کۆمەڵایەتی پەیوەندی نێوان وشەو شت (شیء) دیاریدەکات.
١٠- زمان و سێمبۆڵەکانی لە گرنگترین هۆکارەکانی گواستنەوەو بڵاوبوونەوەی کولتوورین.
١١- گۆشەگیریی جوگرافیایی لە ئاستەنگە گرنگەکانی بڵاوبوونەوەی کولتوورییە.
١٢- گۆڕانی کولتوورەکان لەژێر کاریگەری دووهۆکاری ئافراندن (داهێنان) و بڵاوبونەوەدایە.
١٣- دەتوانین سەرمایە کولتوورییەکان دابەش کەینە سەر سێ دەستەی زەینی و ناوەکی، بابەتی و دەرەکی، و دامەزراوەیی و رێکخراوی کە دەتوانن لە نێوان خۆشیاندا بگۆڕێن بۆ یەکتری.
١٤- جۆرناسیی کولتوورەکان بەسەرنجدان لە دیسپلینی جۆراوجۆرەوە ئەنجام دەدرێت، و بەزەحمەت دەتوانرێ جۆرێکی جۆرناسیی لەویتریان بەباشتر دابنرێ.
١٥- وردە کولتوور، کولتوورێکە لە چوارچێوەی کولتوورێکی گشتی ترداو دەتوانێت رەهەندی جیاوازی وەک ئایینی، نەتەوەیی، ناوچەیی، رەفتاری و پیشەیی هەبێت.
١٦- تاکێک لە یەک کاتدا دەتوانێ ئەندامی چەند وردە کولتوورێک بێت.
١٧- دژەکولتوور خاوەن ناوەڕۆکێکە لە ئاراستەی دژ بەرەهەندگەلێکی تایبەتی کولتووری زاڵ.
١٨- تیۆری دواکەوتنی کولتووری لەسەر گەشەی ناهەماهەنگی توخمە جیاوازەکانی بیناکراوە.
١٩- لەوانەیە کولتوورەکان لە ژێر کاریگەری گۆڕان یاخود هاتنە ناوەوەی توخمە ناهاوڕەگەزەکاندا رووبەڕووی دژایەتی ببنەوە.

٢٠- دەتوانین ئەندازیاریی کولتووری بە زانست و تەکنیک و توانای وەڵامدانەوەی گونجاو بەداخوازییە کولتوورییەکان پێناسە بکەین.
٢١- ئەندازیاریی کولتووری پێکدێت لە چوار بەش: داهێنەرە کولتوورییەکان، موخاتەبەکان، بڕیاردەرەکان و هۆکارەکان (نێوبژیکەران).
٢٢- دوو شێوەی بەرچاو لە چالاکییەکانی ئەندازیاریی کولتووری بریتین لە دامەزراوە کولتوورییەکان و ڕووداوە کولتوورییەکان.
٢٣- ڕووداوە کولتوورییەکان جەوهەرێکی کاتییان هەیە.

### چەمکی بەکۆمەڵایەتیبوون

چەمکی بەکــۆمــەڵایەتیـــبــوون (Socialization) ڕەنگدەرەوەی هەمــوو ئەو ئەزموونانەیە کە لە ڕێگەیانەوە ئەندامانی گەنج و منداڵی کۆمەڵگا فێری کولتووری کــۆمــەڵگاکــەی خــۆیان دەبن، ئەمــە لەکــاتێکدا کــە لە ڕوانگەیەکی کــۆمــەڵیــیــەوە دەڕوانینە ئەم چەمکە. بەڵام لە ڕوانگەی تاکەکەسییەوە (فردی) مرۆڤ لە ڕێگەی پرۆسەی بەکۆمەڵایەتیبوونەوە ئامادەیی هەڵسوکەوتی ناو ژیانی کۆمەڵی تێدا پەیدا دەبێت.

بە دەربڕینێکی تر بەکــۆمــەڵایەتیــبــوون پرۆســەیەکــە مــرۆڤــەکــان لەو ڕێگایەوە بیــروباوەڕو مــەیل و بەهاو پێــوەرو دابونەریتــەکــان لە کــولتــووری کــۆمــەڵگاکــەیان وەردەگرن. هەروەها ئەم پرۆسەیە یارمەتی تاک دەدات، تا کەسایەتییەکی تایبەتی وەدەست بێنێت، ئاشکرایە کە نموونە کــولتــوورییــەکــانی هەر کۆمــەڵگایەک لەلایەن هەموو تاکەکانەوە بەیەک ئەندازەو یەک شێوە وەرناگیرێن.

تاک لە ڕێگای پرۆســەی بەکــۆمــەڵایەتیـــبــوونەوە شــارەزای کــولتـــوور دەبێت (گــوێزانەوەی کولتوور). هەموو کەسێک لەم ڕێگەیەوە زانیاری و بیروباوەڕو بەهاو پێوەرو چاوەڕوانییــەکــانی کۆمەڵگاکەی خۆی وەدەست دێنێت. لە ڕێگەی فێــربوون وەرگــرتنی کــولتــوورەوە مرۆڤ دەتوانێ ناسنامەیەک بۆ خۆی بەدەست بێنێت. لە دوو توێی کــامــڵــبــوونی کــۆمــەڵایەتیی پرۆســەی بەکــۆمەڵایەتیبــوون تاک دەتوانێ ببــێتــە بوونەوەرێکی مرۆیی. لە ئەنجامی ئەم پرۆسەیەشدا مرۆڤ دەبێتە خاوەنی «خود» یان هەستکردن بەناسنامەی خۆی [١٩/٥٢].

ڕەنگە هەر کولتــوورێک لە هەڵومەرجێکدا ڕێگەی هەڵبژاردنی شێــوازی کــاریش پێشکەش بەتاکەکــانی بکات، ئەمــەش لە چەند ڕێگایەکی جۆراوجۆرەوە کــاریگەری دەبێت بەسەر پرۆسەی پێگەیاندنەوە. بۆ نموونە دەتوانرێ منداڵان بەشیری قــوتو یان شیــری دایک (یان تێکەڵەیەک لە هەردووکــیــان) گــەورەبکرێن. هەروەها کــاتــەکــانی شیــرپێــدانی منداڵ لە ڕۆژێکدا دەکرێ نەگــۆڕێت یان بەگــوێرەی داواکــاری منداڵەکە بێت. هەڵبژاردنی هەر لایەک لەم لایەنانەی ڕەنگە کــاریگەری جیــاوازی هەبێت بۆ سەر کەسایەتی.

هۆکاره جیاجیاکانی بەکۆمەڵایەتیبوون وەکو قوتابخانە، خێزان، هاوەڵانی، هەموو ئەمانە هەماهەنگ نابنەوە لەگەڵ ئەو شتانەی کە تاک پێویستە فێری بێت. پەیڕەوی نەکردن لە کۆی خەڵکی و دەرکەوتنی «تاکێتی» (الفردیة) (سەرەڕای هەوڵەکانی فاکتەرەکانی بەکۆمەڵایەتیکردن) رەنگە بۆ گرووپێکی تایبەتی وەکو بەهایەکی کۆمەڵایەتی وابێت [١٢/٢٠٦].

لەبەر ئەوەی کە پێکهاتەو بونیادی بایۆلۆژی کەسەکان لێکجیایە، هەندێ کەس چەند بەشێکی گرنگتر، یان رێژەیەکی زیاتر لە رەگەزەکانی کولتوور فێر دەبن. بەهۆی ئەزموونە تایبەتییەکان هەرکەسێک چەند شتێکی جیا فێر دەبێت. ئەزموونە لێکجیاکان رەنگێکی تایبەتی دەبەخشن بەکاردانەوەی مرۆڤەکان لە رەوتی بەکۆمەڵایەتیبووندا، لە ئەنجامدا کەسەکان لە ئاست ورووژێنەرێکی دیاریکراودا بە چەند شێوازێکی جیاجیا کاردانەوە دەنوێنن. لەلایەکی دیکەوە کولتووریش دەگۆڕێت و تاکەکان لە قۆناغە زەمەنییە جیاجیاکاندا چەند شتێکی جیاجیا فێر دەبن. لەناو خێزاندا کەسێکی بەساڵداچوو بەبەراورد لەگەڵ گەنجێک بەجۆرێکی جیاواز بەپرۆسەی بەکۆمەڵایەتیبووندا تێدەپەڕێت، چونکە دایک و باوک خۆیشیان دەگۆڕێن. ئەم راستییە - دیارە لە چەند روویەکی جیاجیاوە - مەسەلەی «نێوانی نەوەکان» دەردەخات. ئەو دایک و باوکانەی کە لەسەردەمی قەیرانی ئابووری یان شەڕوشۆڕدا گەورە بوون ئەزموونێکی زۆر جیاوازیان هەیە لەچاو رۆڵەکانیان (کە رەنگە ئەمان ئەو پرۆسە بەراییەی بەکۆمەڵایەتیبوونی خۆیان لەسەردەمی ئاسوودەیی رێژەیی و خۆشگوزەرانیدا بەسەرببەن). سەرەڕای ئەمەش هەموو کەسەکان بەیەک ئەندازە بەهۆکارەکانی بەکۆمەڵایەتیبوونەوە نابەسترێنەوە. لەکاتێکدا کە کەسێک لە زانکۆ دەردەچێت چەندان کەسی دیکەش هەن کە لەبەر هۆی جۆراوجۆر ناتوانن قۆناغی سەرەتاییش تەواو بکەن.

لە کۆتاییدا چاوەڕوانییەکانی کۆمەڵگا لە تاک کە لە رێگەی پرۆسەی بەکۆمەڵایەتیبوونەوە فێر دەکرێت و لە چەند بەشێک پێکدێت کە بریتین لە:

١- بنەماکانی تایبەت بەسیستم و رێکخستنی رۆژانە کە چەند شارەزاییەکی بنەڕەتین بۆ ژیان لەناو کۆمەڵگادا (شێوازەکانی خۆشۆردن، شێوەکانی خواردن و خواردنەوە و هتد..).

٢- ئارەزووەکان کە بەهاو ئامانجە پەسەندکراوەکانی کۆمەڵگا دەگرێتەوە (پاڵنەرەکان، سەرکەوتن، دەوڵەمەندبوون و هتد...).

٣- شارەزاییەکان، بریتین لەو جۆرە زانیارییانەی کە بەهۆیانەوە دەتوانین بگەین بەئامانج و ئارەزووەکان وەکو خەریک بوون بەمامەڵەکردنی گەورە گەورەو دەوڵەمەند بوون).

٤- رۆڵەکان، بریتین لەو نموونە رەفتارییانەی کە بۆ بەدەستهێنان و پاراستنی پێگە کۆمەڵایەتییەکان پێویستە رەچاو بکرێن.

رەنگە لە هەندێ باردا بەکۆمەڵایەتیبوون سەرکەوتوو نەبێت. بۆ نموونە ئایا لەو کاتانەدا کە تاکەکان ئامادەیی هەماهەنگییان نییە لەگەڵ نۆرمەکانی کۆمەڵگادا، دەبێ پرۆسەی بەکۆمەڵایەتیبوون بە شکست خواردوو یان سەرنەکەوتوو بزانین؟ هەندێ جار وا رێکدەکەوێت کە ئەو کەسانە لە قۆناغی لە پێشترین لە کۆمەڵگاو خاوەنی بیرکردنەوەی نوێ لە ئایندەدا کۆمەڵگا وەکو قارەمان سەیریان بکات. بەڵام بەشێوەیەکی ئاسایی ئەو جۆرە ناکامیە (لە پرۆسەی بەکۆمەڵایەتیبوون) مەبەستە کە بەهۆیەوە کەسەکان روو دەکەنە تاوانکاری و خواردنەوەو ترياکخۆری یان رەفتاری لادەرانەی دیکە.

**هەشت قۆناغەی ژیان لە روانگەی (ئەریکسۆن)ەوە [٩٩/٧] و [٨١/٥]**

| تەمەن/ قۆناغ | قەیرانی دەروونی کۆمەڵایەتی | شوێنگەی کۆمەڵایەتی | ئەنجامە خوازراوەکان |
|---|---|---|---|
| منداڵی | پشت بەستن/ پشت نەبەستن | خێزان | هیوا |
| بچووکی بەرایی (٢-٣) | سەربەخۆیی/ شەرم و ترس | خێزان | ویست |
| قۆناغی یاریکردن (٤-٥) | دۆزینەوە/ کەتن | خێزان | ئامانج |
| تەمەنی قوتابخانە (٦-١١) | هەوڵ/ کینە | دراوسێ/ قوتابخانە | شارەزایی |
| هەرزەکاری (١٢-١٨) | خۆناسین/ شاراوەیی | گرووپی برادەران | وەفاداری |
| پێگەیشتن و گەورەیی بەرایی (١٩-٣٠) | دۆستایەتی/ گۆشەگیری | گرووپی برادەران | خۆشەویستی |
| پێگەیشتن و گەورەیی ناوەندی (٣١-٥٠) | بەرهەمهێنان/ تەمبەڵی | خێزانی نوێ/ کار | چاودێریکردن |
| پیری و بەساڵدا چوون (٥١ بۆ زیاتر) | کاملبوون/ بێئومێدی | خانەنشینی | عەقڵ |

## هۆکارەکانی بەکۆمەڵایەتیبوون

ئەو ناوەندانەی کۆمەڵگا کە بەدرێژایی قۆناغەکانی پێگەیشتنی مرۆڤ شێوازەکانی ژیان و بەگشتی کولتوور دەگوێزنەوە بە«هۆکارەکانی بەکۆمەڵایەتیبوون» ناو دەبرێن. گرنگترین ئەو هۆکارانەش بریتین لە خێزان، هاوەڵان، برادەران، قوتابخانەو هۆیەکانی پەیوەندی کۆمەڵی. ئەم هۆکارانە هەمیشە کۆمەڵە

ڕێنومایییەکی نەگۆڕ فێری کەسەکان ناکەن، بەڵکو هەرکەسێک لە هەر هۆکارێکەوە شتی جیاجیاو تەنانەت هەندێ جار شتی دژ بەیەکیش فێر دەبێت. سەرەڕای ناوەڕۆکی هەریەک لەم هۆکارانە، کاریگەری و شێوازی فێرکاری هەریەک لەمانەش جیاوازن [٧/٦٤-٦٥].

**تۆڕی پەیوەندییە کۆمەڵاتییەکان**

بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین سەرلەبەری کۆمەڵگا بەهۆکاری بەکۆمەڵایەتیبوون دابنێین. چەندین دەستەی بچووک لەنێوان کۆمەڵگا (بەمانایەکی گشتی) و تاکدا ڕۆڵی نێوانگیر دەبینن و لەراستیشدا ئەم گرووپانە هۆکارە بنەڕەتییەکانی بەکۆمەڵایەتیبوون. سەبارەت بەمنداڵ ئەم پرۆسەیە لە خێزانەوە دەست پێدەکات و هاوکات لەگەڵ گەورە بووندا دەگۆڕێت [١٠/٣٩] کەسایەتی مرۆیی لە خۆوەو لە چوارچێوەی چەند توانایەکی زۆر بەرچاوو پێشتر دیاریکراودا پێناگات. هەرچەندە بۆ پێگەیشتنی هەندێک شارەزایی، پێویستە مرۆڤ بگات بە ئاستێکی جەستەیی و دەروونیی دیاریکراو. بەڵام پێگەیشتن یان پێنەگەیشتنی شارەزاییە مرۆیییەکان و پاشان پێگەیاندن پەیوەستە بەکارلێکی مرۆڤ لەگەڵ کەسانی دیکەو ئاشنابوون

بەزمان و دواتر ئامادەیی سۆزداری (عاطفی) مرۆڤ. ئەو هۆکارانەی سەرەوە (واتە هۆکارەکانی بەکۆمەڵایەتیبوون) لە قۆناغەکانی گەشەکردنی کۆمەڵایەتی و فیزیکیدا پەیوەندییان پێکەوە دەبێت. لە ڕێگای کارلێکی کۆمەڵایەتییەوە مرۆڤ نموونە رەفتارییە گونجاوەکان فێر دەبێت و بەماف و ئەرک و بەڵێنەکانی خۆی ئاشنا دەبێت و پەی بەوە دەبات کامە کار قەدەغەیەو کام کار ڕێگە پێدراوە. لەلایەکی دیکەوە وەرگرتنی ڕەگەزە کولتوورییەکان لە ڕێگای زمان و سەرجەم ڕەمزو زناکەکانی پەیوەندیکردنەوە بە ئەنجام دەگات. «سیمبول» بریتییە لەو شتەی کە لە بواری مەعریفی و لێکدانەوەدا دەبێت بەشتێکی دیکە. وشەکان و جووڵەکان و نیشانەکان، ئاڵاکان، ئەڵقەی مارەیی، جلوبەرگی ڕەش، نیشانەکانی هاتووچۆ ئەمانە هەموو جۆرەکانی «سیمبول»ن. ئاشنابوونی مرۆڤ لەگەڵ کولتوور دەبێتە هۆی دەرککردنی چەمکی «سیمبول»و وشەکانیش لە گرنگترین سیمبولەکانی کولتوورن [٥٧-٥٦/٢٠٧]

لە بەرئەوەی کە بەهۆی پرۆسەی بەکۆمەڵایەتیبوونەوە، کەسەکان بەها کولتوورییەکانی کۆمەڵگای خۆیان وەردەگرن و فێری دەبن، هەر کولتوورێک لەهەوڵی ئەوە دایە منداڵانی لەسەر بناغەی نۆرمە تایبەتییەکانی خۆی پێبگەیەنێت. لە کۆمەڵگایەکی تەقلیدیدا نموونەکانی بەکۆمەڵایەتیبوونی منداڵان چەند حاڵەتێکی زۆر لێکجیایان هەیە.

کولتووری زاڵ بەردەوام هەوڵدەدات بەها تایبەتییەکانی خۆی وەکو تاکە بەهای بایەخدار بەسەر سەرجەم ئەندامانی کۆمەڵگادا بسەپێنێ. لەبەرئەوە پارێزگاران بەردەوام حەزدەکەن کەمترین ئەندازەی گۆڕان بەدابونەریتەکانەوە بنێن. لیبراڵەکان بەزۆری لایەنگری بەدیهێنانی گۆڕانکاری هێواش و سنووردارن و لە بەرامبەر ئەواندا ڕادیکاڵەکان بەردەوام لە خەمی بەدیهێنانی گۆڕانکاریی بنەڕەتیدان.

**بەکۆمەڵایەتیکردنی سەرەتایی**

منداڵ وەک بوونەوەرێکی ئۆرگانی بچووک کە بەندی پێویستییە سروشتییەکانی خۆیەتی، هەر کە پێ دەخاتە ئەم جیهانەوە بەرە بەرە دەگۆڕێ بۆ بوونەوەرێک کە خاوەنی، مەیل و بەهاو دۆستایەتی و دوژمنایەتی و ئامانج و ئارەزوو و میکانیزمی بەرگری لەخۆکردن و چەندین خاسیەتی دیکەیە [١٠١/٢٠]. منداڵ هەرزوو هەست بە سنوورەکانی جەستەیی خۆی دەکات و تێدەگات کە لەکوێدا جەستەی کۆتایی

پێدێت و شتەکانی تر دەست پێدەکەن. منداڵ بەرە بەرە فێر دەبێت کەسانی دیکە بناسێت و خێرا ڕوودەکاتە ناولێنانی تایبەتی (کە هۆکاری لێکجیاکردنەوەی کەسەکانە). لە سنووری تەمەنی (١٨) مانگی تا دوو ساڵی منداڵ دەست دەکات بەبەکارهێنانی وشەی «من» ئەم ڕووداوەش نیشانەی بوونی «خۆئاگاییە» [١٠١/ ٢٠]

**دوو شێوازی لێکجیای بەکۆمەڵایەتیبوون [٨٠/١٠٠]**

| شێوازی سەرکوتکارانە | شێوازی هاوبەشیکارانە |
| --- | --- |
| ورياکردنەوە لە ڕەفتاری هەڵە | پاداشتدانەوەی ڕەفتاری چاک |
| پاداشتی ماددی و تەمبێکردن | پاداشتی ڕەمزی و ئاگادارکردنەوە |
| گوێڕایەڵی منداڵ | سەربەخۆیی منداڵ |
| پەیوەندی ناقسەیی | ئاڵوگۆڕی قسەکردن |
| پێکگەیشتن وەک ڕێو شوێن | پێکگەیشتن وەک هەڵسوکەوتی کۆمەڵایەتی |
| بەکۆمەڵایەتیکردنی پشتبەستوو بەدایک و باوک | بەکۆمەڵایەتیکردنی پشتبەستوو بەمنداڵان |
| مەیلی منداڵ بەرەو خواستەکانی باوانی | مەیلی باوان بەرەو پێویستییەکانی منداڵ |

## بەکۆمەڵایەتیبوونی لاوەکی لە نەوجەوانییەوە تا بەساڵاداچوون

قۆناغی نەوجەوانی و هەرزەکاری لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا بوونی نییە. لەو کۆمەڵگایانەدا منداڵان یەکسەر باڵق دەبن. ئەم قۆناغە بەشێوەیەکی گشتی لە کۆمەڵگا نوێیەکاندا پەیدا دەبێت چونکە کۆمەڵگا پێویستی بەهێزی کاری شارەزا هەیە. چەندە ماوەی فێرکردن درێژ ببێتەوە هێندە ژمارەی ئەوکەسانە زیاد دەکات کە دەکەونە قۆناغی بەر لە گەورەیی یان (گەنجێتی). لەم قۆناغەدا کەسەکان بۆ لە ئەستۆ گرتنی بەرپرسیارێتی کۆمەڵایەتی ئامادە دەکرێن. لەڕاستیدا بەکۆمەڵایەتیبوون لە قۆناغی نەوجەوانیدا پردێکە لەنێوان ئێستاو داهاتوودا. قۆناغێکە لەنێوان منداڵی و گەورەییدا، وابەستەیی و سەربەخۆیی. لە زۆر شوێندا کەسەکان لە قۆناغی نەوجەوانیدا ئامادە دەکرێن بۆ هەندێک ڕۆڵ کە دەبێ بەدرێژایی (٥٠ تا ٦٠) ساڵی ژیانیان لە ئایندەدا لە ئەستۆی بگرن (دیارە لەو وڵاتانەدا کە لاوەکی «معدل» تەمەن درێژترە).

بەکۆمەڵایەتیبوون لە تەمەنێکی دیاریکراودا کۆتایی نایەت، بەڵکو پرۆسەیەکی بەردەوامە کە بەدرێژایی ژیان بەردەوامە. یەکێک لە گرنگترین جۆرەکانی بەکۆمەڵایەتیبوون فێربوونە بۆ کامڵبوونی لە کۆمەڵگاداو گەیشتنە بەژیانێکی باشتر. هەروەک چۆن ساوایەکان پێویستە فێری چۆنیەتی ژیانی ناو کۆمەڵگا بن، لە قۆناغەکانی دواتریشدا دەبێ فێربن کە چۆن چۆنی نەوجەوانی و گەنجێتی و گەورەیی و پیری بەڕێبکەن. لەسەرجەم ئەم قۆناغانەدا سەرەڕای پێگەیشتن و گۆڕانکاریی بایۆلۆژی هۆکارێکی دیکەش لە ئارادایە ئەویش پێگەیشتنی کۆمەڵایەتییە. پێگەیشتنی کۆمەڵایەتی پرۆسەیەکە تیایدا تاک لە هەر قۆناغ و هەلومەرجێکی کۆمەڵایەتیدا بێت کۆمەڵێک رۆڵی کولتووری پەسەند کراو وەردەگرێت و فێریان دەبێت. هەندێ جار بیستوومانە هەندێ بەساڵداچووان وەکو نەوەکانیان جلوبەرگ لەبەر دەکەن! ئەو بیروباوەڕە لە کۆمەڵگادا هەیە کە پێویستە هەر کەس بەگوێرەی تەمەنی خۆی رەفتار بکات. بیستوومانە کە بەهەرزەکاران گوتراوە «ئیدی تۆ منداڵ نیت». ئێمە هەموومان کە تەمەنمان زیاد دەکات یەکسەر ناگەین بە پێگەیشتنی کۆمەڵایەتی. پێگەیشتنی کۆمەڵایەتی شتێکە فێری دەبین.

هەرچەندە لەو باوەڕەداین کە بەکۆمەڵایەتیبوون لەسەردەمی منداڵیدا گرنگترین بەشی بەکۆمەڵایەتیبوونە، بەڵام هەموو کەسێک بەدرێژایی ژیانی خەریکی فێربوونە، هەرچەندە ئەندازەی ئەو فێربوونە هاوشان لەگەڵ بەتەمەنداچوون (بەتایبەتی لە قۆناغی بەساڵداچووندا) بەرەو کەمبوونەوە دەڕوات. جگە لە خێزان هۆکارە سەرەکییەکانی بەکۆمەڵایەتیبوون (وەکو دەستەی هاوەڵان، قوتابخانە، هۆیەکانی پێکگەیشتنی کۆمەڵی) هەر ئەمانەن بەتەمەنەکانیش وەکو منداڵ بەرەگەزەکانی کولتوور ئاشنا دەکەن. ماهیەتی ژیانی نوێ کە پڕیەتی لە گۆڕانکاریی خێرا بەکۆمەڵایەتیبوون بۆ بەساڵداچووانیش بەشتێکی زەرووری دەزانێت. لەکاتێکدا کە تاک رۆڵی کۆمەڵایەتی خۆی دەگۆڕێتەوە بەرۆڵێکی دیکە، رەنگە بەکۆمەڵاتیبوون سەردەمی منداڵی بەس نەبێت یان لەبار نەبێت بۆ ئامادەکردنی ئەو تاکە بۆ قبووڵکردنی ئەو شوێنگە نوێیە. پێویستیی فێربوونی شتی تازەتر بەزۆری وەختێک هەست پێدەکرێت کە پێویستیی راهاتنی تاک لەگەڵ باروزرووفێکی نوێ دێتە ئاراوە (وەک: هاوسەرگری، لەدایک بوونی یەکەم منداڵ، لات بوون و....هتد)، رەنگە پەڕینەوە لە رۆڵێکەوە بۆ یەکێکی تر لەناکاو نەبێت و بە هێواشی رووبدات، ئەمەش کاتێک دەبێ کە تاک بتوانێ خۆی لە رۆڵێکدا ببینێتەوە کە لە ئایندەدا

پەیدای دەکات (واتە زوو بەکۆمەڵایەتیبوون). کاتێک کە گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی دابڕاو لەو شتانەی پێشتر فێریان بووە دێتە ئاراوە، حاڵەتێک پەیدادەبێت کە دەتوانین ناوی بنێین (بەکۆمەڵایەتیبوونەوە سەرلەنوێ). بۆ نموونە کاتێک گەنجێک دەچێت بۆ ئەنجامدانی خزمەتی سەربازی هەست بەجیابوونەوە دەکات لە گرووپە کۆمەڵایەتییەکانی پێشووی و ئەزموونەکانی ژیانی. ئەو دەبێ فێری شارەزایی تازە بێت لە مانەش گرنگتر بزانێت چۆن چۆنی دوژمن لە نێو ببات و خۆشی نەکوژرێت. لە راستیدا زەروورەت وادەخوازێ کە سیستمێکی نوێی بەهاکان بێتە ئاراوە، ئەو بەهایانەی کە کوشتنی دوژمن رێزی بۆ پەیدابکات و لە کاتێکدا کە پێشتر پێیان گوتووە بەکوشتنی خەڵکی بە گوێرەی یاساکانی سزادان بە تاوان دادەنرێت و قەدەغەیە. چەند مرۆڤ بە تەمەنتر بێت بەکۆمەڵایەتیبوون سەختتر دەبێت.

بەکۆمەڵایەتیبوونی ئۆرگانی (Organizational Socialization) جۆرێکە لە بەکۆمەڵایەتیبوونی لاوەکی (ثانوي) کە بەو گوێرەیە رێکخراو کارمەندی نوێ کێشدەکات بۆ ناو کولتووری خۆی و دەتوانین پێناسەی بکەین بە گواستنەوەی کولتوور لە کارمەندانی کۆنەوە بۆ کارمەندانی نوێ. ئەمەش پرۆسەیەکە کە بەهۆیەوە زانیاری کۆمەڵایەتی و شارەزایی پێویست بۆ بەجێگەیاندنی سەرکەوتووانەی رۆڵ و کارە رێکخراوەییەکان وەدەست دەهێنرێت [٣١٦/٨١].

**ئەنجامە چاوەڕوانکراوەکانی پرۆسەی بەکۆمەڵایەتیبوونی لاوەکی لە بواری پیشەییدا [٣١٨/٨١].**

| رووکارەکانی بەکۆمەڵایەتیبوونی نێوەنجیی سەرکەوتووانە | رووکارەکانی بەکۆمەڵایەتیبوونی نێوەنجیی سەرنەکەوتووانە |
|---|---|
| رازیبوون بەکار | رازینەبوون بەکار |
| رۆڵی ئاشکرا | نارۆشنی لە رۆڵ و ناکۆکی تێیدا |
| پاڵنەری زۆرتر بۆ کارکردن | کەمی پاڵنەری کارکردن |
| هاوکاری پیشەیی زۆر | هاوکاریی پیشەیی کەمتر |
| بەڵێندان لەبەرامبەر رێکخراو | بێ بەڵێنی بەرانبەر رێکخراو |
| ئامادەیی رێکوپێک لە شوێنی کار | ئامادەنەبوون- هەڵاتن لەکار |
| بەرهەمهێنانی زۆرتر | بەرهەمهێنانی کەمتر |
| بوونی چەند بەهایەکی وەرگیراو | وەلانانی بەهاکان |

**پێگەیاندنی تایبەتی: مێشک شوشتنەوە**

زاراوەی «مێشک شوشتنەوە» ئەوکاتە بەکاردەهێنرێت کە بەکۆمەڵایەتیبوون سەر لە نوێ حاڵەتێکی قووڵ و زیادەڕەوانەو مەبەستداری هەبێت. سەرەڕای ئەوەی کە ئەم زاراوەیە لە رووی مێژووییەوە کۆنەو بەکارهێنانی بەشێوەیەکی بەرفراوان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەردەمەی کە کۆمۆنیستەکانی چین هەوڵیان دەدا بەچەند شێوازێکی تایبەتی دەستە جیاجیاکانی خەڵکی چین و بەتایبەتی بەندکراوە سیاسییەکان لە رووی سیاسییەوە ناچاربکەن بە بیروباوەڕی ئەوان رازی بن و بەواتایەکی دیکە واتە سەر لەنوێ فێر بکرێنەوە. ئەو شێوازانەی بۆ مێشک شوشتنەوە لە ماوەی چەند ساڵی رابردوو لە وڵاتە جۆراوجۆرەکاندا بەکارهاتوون بریتین لەمانە:

١- جیاکردنەوەی بەندکراوەکان لە کەس و کارو هاوەڵانیان و بەگشتی لە سەرجەم سەرچاوەکانی زانیاری.

٢- سەرجەم هەڵسوکەوت و رەفتاری رۆژانەی بەندییەکان دەخرێتە ژێر چەند رێساو یاسایەکی زۆر ورد (وەک خواردن، خەوتن، خۆشوشتن و..هتد).

٣- سەپاندنی چەندین جۆر فشاری فیزیکی و تەمبێکردن (وەکو رێگەنەدان بە نووستن و خواردن و پشوودان) بەچەندین بەهانەی جۆراوجۆر لەوانە بە بەهانەی هاوکاری نەکردن.

٤- خولقاندنی بارودۆخێکی ئەوتۆ بەهۆیەوە بەندکراو واهەست بکات کە ئازادییەکەی بەستراوەتەوە بە گۆڕینی بیرکردنەوەو تێڕوانینەوە.

٥- سەپاندنی فشاری دەروونی لە رێگەی بەشداری پێکردنی زیندانی لە گفتوگۆی دوورودرێژ (لەگەڵ توندوتیژی و سووکایەتی پێکردن). هەندێجار لەم جۆرە گفتوگۆیانەدا هەموو بەندکراوە کۆنەکانیش ئامادە دەکرێن و داوا لە زیندانییە کە دەکرێت کە لەڕێی نووسینێکەوە گۆڕانی بیروراکانی خۆی رابگەینێت.

٦- پێکهێنانی چەند دەستەیەکی تۆژینەوە لە ژێر چاودێریدا کە تیایدا گفتوگۆ دەربارەی بیروباوەڕی سەپێنراو دەکرێت، لەو دانیشتنانەدا کە بۆ ئەم مەبەستانە ساز دەکرێن سەرەتا چەند کتێب و بڵاوکراوەیەکی دیاریکراو دەخوێنرێتەوە پاشان لەلایەن ئامادە بووانەوە تاوتوێدەکرێن.

چەندین لێکۆڵینەوە ئاشکرایان کردووە کە چەسپاندنی «بیروباوەڕی نوێباو» لە پرۆسەی مێشک شوشتنەوەدا بە یارمەتی ئەم چوار هونەرەی خوارەوە دێتەدی

:[٧٧/٢٠٨]
١- سوود وەرگرتن لە پاڵنەرە نیمچە غەریزییەکان لە ڕێگەی بەستنەوەی مەرجی تێرکردنی پێویستییە بەراییەکانەوە (پشوودان، برسێتی، تینوویەتی) بە پێشاندان و ڕاگەیاندنی بیروباوەڕو بۆچوونی جێگەی مەبەست.
٢- داباراندنی دروشمەکان (دووبارەکردنەوەی بەردەوامی چەند فۆرمۆلێکی سادە لەمەڕ بیروبۆچوونی جێمەبەست).
٣- بەکارهێنانی ڕەتاندن و فشاری بەکۆمەڵی بۆ هاودەنگکردن و باوەڕپێهێنان بەتاکەکەسەکان.
٤- بەدیهێنانی ژینگەیەکی تازە بەمەبەستی ئاسانکردن و بەردەوامی و وەکویەک لێکردنی کەسەکان.

**چەند تیۆرێک**

«دێڤید ڕەیزمان» (D. Reisman) کەلەم بەشەدا ئاماژە بە تیۆرەکەی ئەو دەکەین دەربارەی نموونە کولتوورییەکان، چەند مەسەلەیەکی تاوتوێ و شیکردۆتەوە لەمەڕ جۆرەکانی کەسێتی و نموونەکانی کۆمەڵایەتیبوون [٢٢/٨٣-٢٥]. ئەو باس لەوە دەکات کە پرۆسەی وەرگرتنی نۆرمە کۆمەڵایەتییەکان لە ڕێگەی کەسانی ترەوە لە کولتووره جیاجیاکاندا دەشێ بەچەند شێوازێکی جۆراوجۆر ڕووبدات. هەندێک کۆمەڵگا هەیە تیایدا هەموو کەسەکان وەکو یەک هەڵسوکەوت دەکەن، بە جۆرێک کە میکانیزمی وەرگرتنی پێوەرەکان تەنها لەسەر لاساییکردنەوەی دابونەریت نەوەستاوە. ڕەیزمان دەڵێ: بۆ نموونە ئەگەر گوندێکی بچووکی سەدەکانی ناوەڕاستی ئەوروپا یان لەمڕۆدا شوێنێکی دوورە دەستی وەکو هیندستان لەبەرچاوبگرین لەم کۆمەڵگایانەدا ناکۆکی بیروباوەڕی و ناکامی لە ئەنجامی باری کارکردن زۆر بەرتەسک بۆتەوە. هەموو شتێک لە ڕێگەی نەریتەوە فێردەبن بەو مانایە ڕێپیشاندەری ئەم جۆرە کۆمەڵگانە نەریتە. لەبەرامبەر ئەوەدا لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا، لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەمریکییەکان وەکو سەرجەم خەڵکی دنیا چەند دابونەریتێکیان هەیە، بەڵام بەڕادەیەکی زۆر جۆراوجۆری لە ئارادایە، بەجۆرێک کە تاکە ڕێپیشاندەری کەسەکان لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا بەتەنها نەریت نییە. لەگەڵ بەسەرچوونی کات و فراوانبوونی شارنشینی و سیستەمی فێرکردن و پەروەردەی ئاڵۆزو نوێ، پرۆسەی فێربوون، پێوەرو شێوەکانی کەسایەتی کە لەوانەوە

سەرچاوەی گرتووە، گۆڕاوە. مرۆڤی نوێ دەتوانێ نیشانەو ئاماژە جۆراوجۆرەکان لە سەرجەم خەڵکی کە لە دەوروبەریدا دەژین وەربگرێت. بە بڕوای «رەیزمان» مرۆڤی نوێ فێر دەبێت کە لەگەڵ خەڵکانی دیکە بەرەو پێشەوە بڕوات و دەبێتە خاوەنی کەسایەتییەک کە بەرەو کەسانی دیکە رێنومایی کراوە (ئەمەش لەبەرامبەر حاڵەتی رینۆمایی رووەو ناوخۆ لە کۆمەڵگای تەقلیدیدا).

لەم زەمینەی سەرەوەدا وادەخوازێ کە ئاماژە بە دوو تیۆری تریش بکەین لە بواری بەکۆمەڵایەتیبوون واتە تیۆرییەکانی هەردوو کۆمەڵناسی ئەمریکی «چارلز هۆرتون کوولی» (C. H. Cooly) و «جۆرج هێربەرت مید». کوولی پێی وایە کە سروشتی کۆمەڵایەتی مرۆڤ بە هۆی پەیوەندی و پێکگەیشتنی بەردەوامی لەگەڵ کەسانی دیکەدا دروست دەبێت. ئەو لەرێی تۆژینەوەی تایبەتی لەمەڕ پرۆسەی بەکۆمەڵایەتیبوونی منداڵان، ئەو کەسانەی کە وردە وردە دێنەناو جیهانی منداڵەوە دابەشدەکات بۆ دوودەستە: «خێزان و هاوەڵان»و «کەسەکانی تر». منداڵ لە میانەی پەیوەندی لەگەڵ کەسانی دەستەی یەکەمدا «خێزان و هاوەڵان» هەست بەبوونی خۆی دەکات. ئەمەش بەهۆی ئەو گرنگییەی کە بەرەفتاری منداڵان دەدەن، دێتەکایەوە. پاشان منداڵ بۆچوونی کەسەکانی دەستەی دووەم «ئەوانی تر» دەربارەی خۆی دەزانێت و پەی بەوە دەبات کە کەسانی تر چۆن دەڕواننە ئەو. لەم رێگەوە منداڵ بۆچوونێکی تایبەتی لەبارەی خۆیەوە پەیدادەکات. منداڵ ناتوانێ وێنەیەکی راستەقینەی خۆی «وەک ئەوەی هەیە» ببینێ، بەڵکو پێودانگی کاری ئەو لە باش و خراپیی رەفتارەکانی خۆی ئەوەیە کە بۆچوونی کەسانی دیکە لەبارەی خۆیەوە بزانێت [٢٦/٢٢٧].

«جۆرج هێربەرت مید» لە بواری بەکۆمەڵاتیبووندا دەستی داوەتە شیکردنەوەو یەکالاکردنەوەی چۆنیەتی پێگەیشتنی کەسایەتی لە قۆناغی «یاری منداڵانەوە» بەرەو سەر. لە قۆناغە بەراییەکانی «گاڵتەویاریدا» منداڵ سەرنج دەدات و هەوڵدەدات رۆڵی گەورەکان ببینێ و لەم حاڵەتەدا بەرە بەرە لەگەڵ ئەم رۆڵانەدا فێری هەندێک جۆری تێڕوانین دەبێت بۆ نموونە کچۆڵە وەکو دایکی بایەخ بەمنداڵ دەدات.

یەکەمین تێڕوانین لەمەڕ منداڵی باش یان خەراپ لەم قۆناغەدا وردە وردە بە هۆی پەیوەندی و یاریکردن لەگەڵ منداڵاندا پێکدێت. لەم قۆناغەدا رۆڵە تایبەتمەندییەکانی کچ و کوڕ لە زەینی منداڵدا دەچەسپێ و دەکەوێتە ناخیەوە. لە

قۆناغەکانی دواتری پێگەیشتندا، منداڵ هاوشان لە ئەندامێتی لە دەستەی یاریکردندا چەند رۆڵێکی جیاجیاو راستەقینەتر (کە لە هەمان کاتدا بەشداری چالاکانەی لەگەڵدایە) لەگەڵ رۆڵ و تێگەیشتنی تایبەتی لەمەڕ زۆر شتی جۆراوجۆردا فێردەبێت. ئەم قۆناغەش گرنگترین لایەنی وەرگرتنی نۆرمە کۆمەڵایەتییەکانە و لێرەوە رەفتاری کەسانی تر بەگشتی(تعمیم) دەکرێت.

### بەکۆمەڵایەتیبوون و دووری لە کۆمەڵگا

بەو پێیەی کەلە پرۆسەی بەکۆمەڵایەتیبووندا باوان رۆڵی سەرەکی دەبینن، لێرەوە ئەو پرسیارە دێتە گۆڕێ: ئەگەر باوان لە ئارادا نەبن چارەنووسی منداڵ بەکوێ دەگات؟ رەنگە یەکێ لە رێگاکانی وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە لێکۆڵینەوەی باری ئەو منداڵانە بێ کە بەبێ هیچ شێوە پەیوەندییەک لەگەڵ باواندا پێگەیشتوون [٩/٢٠٩-١٢].

ئاوڕدانەوەیەک لە شوێنەوارەکانی دوورکەوتنەوە لە کۆمەڵگاکەیان هەڵاتن لە کۆمەڵگا بە گەڕانەوە بۆ چەند حاڵەتێکی تایبەتی- دەشێ رۆڵی بەکۆمەڵایەتیبوون لە پەروەردەکردنی کەسایەتی مرۆڤدا زیاتر ئاشکرابکات. لەم بارەیەوە با لەسەرەتاوە روو بکەینە لێکۆڵینەوەکانی «کینگزلی دێڤیس» (K. DAVIS) لەمەڕ رەفتاری ئەو منداڵە کێویانەی کە دوور لە کۆمەڵگا پێگەیشتوون. ئەو زانایە لە رەفتارو هەڵسوکەوتی دوو منداڵی بەناوی (کەمالا) و (ئامالا) کۆڵیوەتەوە کە ناوی لێناون «گورگەئادەمی». ئەم دوو منداڵە کاتێ کە لە دارستانەکانی هیندستاندا دۆزرانەوە زیاتر بەو کێویانە دەچوون کە لە دارستاندا دەژیان نەک بەمرۆڤ. وەک ئاژەڵان لەسەر چوار پەل دەجووڵانەوە، قسەکردنیان نەدەزانی چەند جووڵە و نیشانەیەکی نارۆشنیان دەردەخست، هەست و سۆزی ناو کۆمەڵگای مرۆییان نەبوو، گۆشتی خاویان دەخوارد. هەروەها ئەم تۆژەرە لێکۆڵینەوەی لەسەر منداڵێکی دیکەش ئەنجامدا بەناوی «ئیزابیل» کە قۆناغە سەرەتاییەکانی منداڵیی بەدابڕاویی لە کۆمەڵگا بەسەربردبوو. ئەو دەڵێ لەبەرئەوەی «ئیزابیل» منداڵێکی ناشەرعی بوو و دایکی کەڕو لاڵ بوو لە شوێنێکی لاتەریکەوە بە خێوی دەکرد، منداڵە کە دۆزرایەوە شەش ساڵان بوو. تا ئەو کاتە قسەی نەکردبوو و تەنیا بە چەند جووڵەو ئاماژەیەک لەگەڵ دایکی هەڵسوکەوتی دەکرد. بەهۆی چەند ناتەواوییەکی تەندروستییەوە (دووری لە تیشکی خۆر و بەدخۆراکی) چەند نەخۆشییەکی جەستەیی هەبوو و

لەکاتی رووبەڕوو بوونەوەی کەسانی نەناسراودا تووڕە دەبوو و توندوتیژی دەنواند [٢٠/١٥].

دەتوانین لەم بارەیەوە ئاماژە بە حاڵەتێکی دیکەش بکەین کە لەساڵی ١٩٧٠دا لە گوندی «باباکلو»ی سەر بە «گەچساران»ی ئێران بەرچاوکەوتووە. رۆژنامەی «کەیهان» بڵاوی کردۆتەوە کە پیرەمێردێکی «٧١» ساڵی دوای چەندین ساڵی ژیانی لە دارستان، گەڕاوەتەوە گوندەکەی خۆی، بەڵام بەهۆی لەبیرچوونەوەی وشەکانەوە نەیدەتوانی قسەبکات و بە چەند دەنگێکی سەیر مەبەستەکانی خۆی دەردەبڕی، دوای گەڕانەوەشی بۆ ناو خێزانەکەی ئامادە نەبوو جل و بەرگ لەبەربکات و سەرماو گەرما کاری تێنەدەکرد. شەوانە لە دەرەوە دەخەوت. ئەو پیرەمێردە «٦٠» ساڵ پێشتر لە تەمەنی «١١» ساڵیدا بەبێ ئاگاداری کەس و کاری لە گوند دەرچووبوو رووی کردبووە دارستان لەو ماوەیەدا وەک ئاژەڵە کێوییەکان لە ناو دارو درەخت و پەنای تاشەبەردان دەژیاو، تەنانەت چەند جارێک کە تووشی ئادەمیزادان ببوو لەناو دارستاندا لێیان هەڵات بوو و لە ناو دارو درەختەکاندا ون ببوو [٨٣].

## کورتەی بەش

١- لە رێگەی بەکۆمەڵایەتیبوونی ئەندامانی کۆمەڵگایەکەوە کولتوور دەگوێزرێتەوە. مرۆڤەکان کولتوور وەردەگرن و لە دووتوێی قۆناغەکانی پێگەیشتندا ئاشنای رەگەزە جۆراو جۆرەکانی کولتوور دەبن.

٢- کەسایەتی، پێکهاتەیەکە لە بۆماوەی بایۆلۆژی و ژینگەی فیزیکی، کولتوور، ئەزموونی کۆمەڵی و کۆمەڵێک ئەزموونی تاکەکەسی.

٣- مرۆڤ لە رێگای بەشداریکردن لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا وێنەی کۆمەڵایەتیی خۆی دەدۆزێتەوە.

٤- «ئەریکسۆن» قۆناغەکانی ژیانی بۆ هەشت بەش دابەشکردووە: کۆرپەلەیی، منداڵیی (منداڵی، بچووکی بەرایی،، قۆناغی یاریکردن، تەمەنی قوتابخانە، مێرمنداڵی پێگەیشتووی، پێگەیشتوویی مامناوەندی، پیری.

٥- گرنگترین هۆکارەکانی بەکۆمەڵایەتیبوون بریتین لە (خێزان، هاوەڵان و برادەران، قوتابخانە هۆکارەکانی پێگەیشتنی کۆمەڵی).

٦- بەکۆمەڵایەتیبوون لە قۆناغی نەوجەوانیدا قۆناغێکە لە نێوان منداڵی و

پێگەیشتوو ییدا.

٧- بەکۆمەڵایەتیبوون بە درێژایی ژیانی مرۆڤ بەردەوامە.

٨- پێگەیشتنی کۆمەڵایەتی شتێکە مرۆڤ فێری دەبێت و وەریدەگرێت.

٩- بەها کولتوورییەکان لە رێگەی پرۆسەی بەکۆمەڵایەتیبوونەوە وەردەگیرێن.

١٠- چاوەڕوانییەکانی کۆمەڵگا لە رەوتی پێگەیاندندا بریتین لە: بنەماکانی رێکخستنی ژیانی رۆژانە، ئارەزوو، شارەزایی و رۆڵەکان.

١١- لە میانەی پرۆسەی بەکۆمەڵایەتیبوونی ئۆرگانیکدا ئۆرگان کارمەندی نوێ بۆ ناو کولتووری خۆی کێشدەکات و ئەوانیش زانیاری و شارەزایی وەردەگرن.

١٢- دەشێ بەکۆمەڵایەتیبوونی لاوەکی سەرکەوتوو یان ناسەرکەوتوو بێت.

١٣- دەتوانین مێشک شوشتنەوە بە یەکێک لە شێوازە توندڕەوەکانی بەکۆمەڵایەتیبوون دابنێین.

١٤- مێشک شوشتنەوە بەچەند شێوازێکی جیاجیا ئەنجام دەدرێت.

١٥- «دێڤید رەیزمان» دوو جۆرە نموونەی بەکۆمەڵایەتیبوون دیاردەکات: پێگەیاندن لەسەر دابونەریت، رێنماییکراو بەرەو کەسانی تر.

١٦- کولی بەکۆمەڵایەتیبوونی منداڵان لەسەر بنەمای دوو دەستە تاوتوێدەکات «خێزان و هاوەڵان» (کۆی کەسەکانی تر».

١٧- جۆرج هێربەرت مید جەخت دەکاتە سەر رۆڵە کۆمەڵایەتییەکان لە پەروەردەکردنی منداڵاندا.

١٨- دوورکەوتنەوەی درێژ خایەن لە کۆمەڵگا کاردەکاتە سەر پێگەیشتنی کەسایەتی.

١٩- پرۆسەی بەکۆمەڵایەتیبوون لەبەر چەندین هۆ رەنگە تووشی هەندێک ناکامی یان هۆکاری پاشخستن ببێتەوە.

**پێشەکی**

ئەندامەکانی تیپێکی تۆپی پێ، قوتابییانی یەکێک لە هۆبەکانی کۆلیج، ئەو منداڵانەی پێکەوە لە گەڕەکێک یاری دەکەن، ئەندامانی دەستەیەکی سیاسیی نهێنی، کارمەندانی هۆبەی ژمێریاری وەزارەتێک و هتد.... هەموویان گرووپی کۆمەڵایەتی (Social Group)یان پێ دەگوترێ: لە کۆمەڵگا هاوچەرخەکاندا کە تاکگەرایی بەسەر پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا زاڵە یاخود نەریتی تاکگەرایی لە حاڵەتی دروستبووندایە، لەوانەیە هەندێک خەڵک پێیان سەیر بێت کە بۆچی کۆمەڵناسان لەجیاتی «تاکەکەس» لە گرووپەکان دەکۆڵنەوە. ڕەنگە هۆی ئەم بۆچوونە ئەوە بێت کە ئێمە حەزدەکەین تاکەکان بە بیرو هزری تایبەتی خۆیانەوە لەبەرچاو بگرین، و ئەو چەمکانە ڕەتبکەینەوە کە باس لە تەبایی و گونجانی ئێمە لەگەڵ شتەکانی دیکەی جگە لە خۆمان دەکەن. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو ڕوانگەو بەهایانەی کە کاریگەرییان لەسەر ئێمە هەیە لەژێر نفووزی خێزان دان، فۆرمە تایبەتییەکانی گرووپی برادەرانمان لە قۆناغی منداڵی و ئێستاش کاریگەرییان لەسەرمان هەبووەو هەیە، و لەهەمان کاتیشدا ئەو دادوەرییانەی کە لەلایەن هاوسێ و خزم و هاوکارانەوە دەکرێن هەستمان دەبزوێنن. ئێمە چاوەڕوانی پارێزگاری مەعنەوی و ماددی لە برادەرو خزمانمان دەکەین، و تەنیا ئەو کاتە ئامانجەکانمان لە ژیاندا بە لۆجیکی و بەنرخ لە قەڵەم دەدرێن کە لەلایەن ئەو گرووپەی کە وابەستەین پێیەوە پارێزگارییان لێ بکرێت، و ڕێزیان لێ بگیرێت. گوشارە گرووپییەکان یارمەتیمان دەدەن، کە لە زۆربەی حاڵەتەکاندا گوێڕایەڵی یاسابین، بەڵام لەهەمان کاتدا ئەندامبوونمان لە گرووپە لاسارەکاندا دەتوانێت هانمان بدات بۆ گوێڕایەڵی نەکردن. گوشارە گرووپییەکان دەتوانن بمانگۆڕن بۆ تاکی پابەندو گوێڕایەڵ و لە هەندێ هەلومەرجدا بمانکەنە پاڵەوان کە تەنانەت ژیانی خۆشمان قوربانی ئامانجەکانی گرووپ بکەین. لە توانای گرووپدایە شێوازە چەوسێنەرەکانی خۆی بەسەرماندا بسەپێنێت، بەڵام لە هەمان کاتدا پارێزگاریشمان لێ بکات [٨/ ٣٥-٣٩].

دوورە لە واقع ئەگەر سەرەتای سەرنجدان لە دیاردەی گرووپ و بەتایبەتی گرووپە بچووکەکان، بۆ نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم و بەرەنجامی لێکۆڵینەوەکانی

کۆمەڵناسە ئەمریکییەکان بگێڕینەوە. لە کتێبی «کۆمار»ی «ئەفلاتون»و «سیاسەت»ی «ئەرستۆ» رووبەڕووی کۆمەڵێک هزرو بیرو راڤەکردن و شەن و کەوکردنی پێکهاتەو گۆڕانی ئەو دیاردانەی کە گرووپین، دەبینەوە. لەگەڵ ئەوەشدا گومانمان نییە لەوەی کە لێکۆڵینەوە لە گرووپ و پەیوەندییە مرۆییەکان، تا سەرەتای سەدەی بیست شێوازێکی ئەزموونگەرییانەی نەبووە. تا ئەو کاتە هەموو ئەو بابەتانەی لەم بارەیەوە نووسراون پشت ئەستوور بوون بە شێوازە تیۆرییەکان یاخود لەسەر بنچینەی شاری یوتوپیایی دامەزرابوون. هەندێک لەم بیروبۆچوونانە یان ماهییەتێکی عەقلانییان هەیە یاخود پشت ئەستوورن بە حەزو خەیاڵچنییە سۆزاوی و ئانارشیستییەکان، رووخساری هاوبەشیان ئەوەیە کە نموونەیەکی ئایدیاڵی دەخەنەڕوو [٩٥/ ل١١-١٤].

«ئەمیل دورکهایم» لە لێکۆڵینەوەکانیدا لەمەڕ گرووپ، بایەخی بە گرووپە تایبەتییەکانی وەک خێزان، هاوپۆلەکان و سەندیکاکان داوە. تیۆرەکانی ئەو لەبارەی گونجانی کۆمەڵایەتی، بێ نۆرمی و دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان رۆڵێکی کاریگەریان لە بایەخدان بە پرۆسە دەستەجەمعییەکان لە ئاستە جیاوازەکاندا هەیە.

**دەستەو گرووپە جیاجیاکانی کۆمەڵگای مرۆیی [٨/ ٤٣]**

**گرووپ** (Group)
بایەخپێدانی هاوبەش
زەمینەی پەیوەندیی رووبەڕووی کۆمەڵایەتی (هەڵسوکەوتی کۆمەڵایەتی)
پەیوەندییەکانی کۆمەڵەکان

**کۆمەڵە** (Association)
بایەخپێدانی لێکچوو
ئامانجە سنووردارو تایبەتییەکان

**دامەزراوە** (Institution)
قاڵبی شێوە گرتووی رەفتاری
درێژەدان بە خۆشگوزەرانیی کۆمەڵایەتی
پارێزەری شێوەی کۆمەڵگا

**کۆمەڵگا** (Society)
گەورەترین گرووپ کە تاک پەیوەستە پێیەوە
زۆربەی جار یەکسانە بە نەتەوە

**دەستە** (Category)
کۆمەڵی پەراگەندە
تایبەتمەندییە لێکچوو یاخود هاوبەشەکان

**کۆبوونەوە** (Aggregation)
لە یەکتر کۆبوونەوە لە شوێنێک
جێگیربوون بەبێ پەیوەندییەکی پێناسەکراو و تایبەت

زیندانییەکانی ناو یەک ژوور ـــــــــ زیندانییەکان ـــــــــ زیندان
(گـــــرووپ) (دەســـــتـــــە)
(کۆبوونەوە)

**گرووپی کۆمەڵایەتی چییە**

ئەمـرۆ زاراوەی «گـرووپی کـۆمـەڵایەتی» زۆر بەکـاردەهێنرێت و مـانایەکی بە رواڵەت ئاشکرا، بەڵام تا رادەیەک شـاراوەی هەیە. وشـەی گـرووپ کـۆمـەڵەیەک دەگرێتەوە کە لە رووی پانتایی و پێکهاتەوە زۆر جۆراوجۆرە، هەر لە کۆمەڵگاکان لە ئاستی نەتەوەییەوە بگرە تاکو دەستەبەندییە سست و نابەردەوامەکان دەگرێتەوە، رەنگە تاکە تایبەتمەندی هاوبەش لە نێوان هەموو ئەم کۆمەڵانە لە پەیوەستەیی و گونجانی دیار یاخود نادیاری تاکەکاندا کورت بکرێتەوە. لەم دیدگایەوە لەوانەیە زمانی عامەی خەڵک تا رادەیەک یارمەتیمان بدات بۆ تێگەیشتن لە مەسەلەکە، چونکە وشەی «ئەندام» کە بەو تاکانە دەوترێت کە گرووپ پێکدەهێنن، وێنەی «دەستەیەک» پیشاندەدات کە تاکەکان بەشەکانی ئەو دەستەیەن، ئەو بەشانەی کە لە هەمان کاتدا وابەستەو ئەکتیڤن. هەروەها پەیڤی گرووپ کۆمەڵە هەنگاونانێک دەگرێتەوە کە هەریەک لە تاکەکان دەتوانێت بە بەشداری لەگەڵ یەکتر بەئەنجامیان بگەیەنن.

لەلایەکی ترەوە گرووپ پەیوەندی بە چەمکی «هێز»ەوە هەیە. ئەندامەتی لە گرووپدا باس لە حەزی بەهێزبوونی پەیوەستەیی هاوبەشی تاکەکان دەکات، کە لە حاڵەتی تەنیاییدا هەست بەبێ دەسەڵاتی دەکەن. لەهەمان کاتدا ئەم دەسەڵاتە دەستەجەمعییە لە توانای دایە پەرچەکردارگەلێکی نادیار بخاتەڕوو، چونکە لە هەمان دڵنەواییکردنیدا هەڕەشەکەرە. لە هەموو حاڵەتێکداو بەپێی تایبەتمەندییە تایبەتییەکان، تاک خوازیاری قبوولکردن و پشتیوانیکردنی گرووپە یاخود ترسی لەناوچوون، بایەخپێنەدان یاخود دەرکردنی لێدەکات.

ئەو حاڵەتانەی کە باسمان کردن ئاڵۆزی چەمکی گرووپ پیشان ئەدەن. هەروەها لەلایەکی ترەوە جۆراوجۆری ئەو وشانەی بۆ وەسفکردنی گرووپ بەکاردەبرێن لە شاراوەیی مەسەلەکە زیاد دەکەن. ئەگەر بمانەوێت ماهییەتی گرووپێک دەستنیشان بکەین پێویستە سەرنج بدەینە هەندێک لە دیسپلینەکان، لەوانە: پلەی ڕێکخستنی گرووپ، ئەرکەکەی، پەیوەندییە رووبەڕووە کۆمەڵایەتییەکان، دابەشکردنی رۆڵەکان و.... [٩٥/ ١١-١٤]. لەلایەکی ترەوە، گرووپەکان لەدایک دەبن، گەشە دەکەن، لەناودەچن، دیاردەکەون یاخود ون دەبن. هەریەکێک لەوان مێژوویەکی تایبەتی هەیە، هەریەکێکیان پرۆگرامێکی هەیە، سنووری کاری تایبەتی هەیە، سەرگوزشتەی تایبەتی هەیە و رابەریان لەناودا هەیە. ئەم پرۆسانە هەموویان لە ڕێگەی هەندێ پرسیارەوە لەلایەن توێژەرانەوە لێیان دەکۆڵرێتەوە: لە کوێ؟ لەگەڵ کێ؟ بۆچی و چۆن گرووپێک دروست بووە؟

ئەو کاتەی کە خەسڵەتی کۆمەڵایەتیش بۆ گرووپ زیاد بکەین، لەوحاڵەتەدا «گرووپی کۆمەڵایەتی» دەبێتە خاوەنی مانایەکی پسپۆری. ئەم گرووپە، لە کۆمەڵێک تاکەکەس پێکهاتووە کە حەزی هاوبەش و پەیوەندیی رووبەڕووی کۆمەڵایەتییان لە نێوانیدا هەن. ئەگەری بوونی پەیوەندیی رووبەڕوو یەکێکە لە رەگەزە سەرەکییەکانی یان گرووپی کۆمەڵایەتی. خێزان، گرووپە برادەرییەکان، و گرووپە هاوسێکان، هەموویان گرووپی کۆمەڵایەتیی. تۆڕی گەیاندن و پەیوەندیی رووبەڕووی نێوان تاکەکانی ئەم گرووپانە بە زۆری تا چەند ماوەیەک بەردەوامن [٨٦/٤٦].

هەندێک جۆری تری دەستەبەندیی هەن کە ناتوانین بە گرووپی کۆمەڵایەتییان ناو ببەین. نموونەیەکی دیاری ئەم حاڵەتە، گرووپە بە واتا ئامارییەکەی، کە نموونەکانی وەک «هەموو تاکە تەمەن پەنجا ساڵییەکان و سەرووتر» یاخود «هەموو خێزانە

دەوڵەمەندەکان» دەگرێتەوە. رووخساری هاوبەشی تاکەکان لە گرووپی ئاماریدا، بەلای کەمەوە بوونی «خەسڵەتێکی هاوبەشە» (پەنجا ساڵ و سەرووتر- خێزانی دەوڵەمەند). لە گرووپی ئاماریدا بوونی پەیوەندیی رەسمی یاخود نارەسمی لە نێوان تاکەکاندا لە ئارادانییە. بۆ نموونە چەند کەسێک بە شەقامێکدا تێدەپەڕن یاخود لە پارکێکی گشتیدا دەسووڕێنەوە گرووپێکی ئاماری پێکدەهێنن، بەڵام هێزێک نییە لە نێوانیاندا کە بەیەکەوەیان ببەستێتەوە. بە پێچەوانەوە لە گرووپێکی کۆمەڵایەتی وەک ئەندامانی خێزانێک یاخود ئەو قوتابییانەی کە لە پۆلێکدا دەخوێنن، یاخود ئەو منداڵانەی کە لە گەڕەکدا گرووپی یاری پێکدەهێنن، پەیوەندیی، هێز، بیروباوەڕ، هەست و سۆز هەن [٢٦/ ٢٥٤].

کۆمەڵناسان پێناسەی جۆراوجۆریان بۆ گرووپی کۆمەڵایەتی کردووە کە هەر یەکێکیان تایبەتمەندی گەلێکی دیاریکراوی گرووپی کۆمەڵایەتی دەگرێتەوەو، لە هەندێک حاڵەتدا چەند خەسڵەت یاخود تایبەتمەندییەک وەک مەرجی سەرەکی دەخەنەڕوو کە لە سەقامگیربوونی هەندێک لەو پێناسانە کەمدەکەنەوە. «ئەلبیون سمۆل» (A. Small) لە کتێبی «کۆمەڵناسیی گشتی»دا گرووپی کۆمەڵایەتی بە ژمارەیەکی تاکەکان پێناسە دەکات کە پەیوەندییان لە نێواندا هەیە لە ئەنجامدا ژیان لەتەک یەکتردا دەبەنە سەر. لەبارەی ئەم پێناسەیەوە پێویستە بڵێین کە «مەرجی ژیان لەتەک یەک» چەمکی گرووپ سنوورداریی دەکاتەوە کە لە هەندێک حاڵەتدا ناچەسپێت. کۆمەڵناسێکی تر «هۆمانز» (G.G. Homans) پێی وایە گرووپی کۆمەڵایەتی لە ژمارەیەکی کەمی تاکەکان پێکدێت کە ماوەیەکی تا رادەیەک درێژ لەگەڵ یەکتر لە پەیوەندیدان و جۆرە پەیوەندییەکی رووبەڕوو لە نێوانیاندا هەیەو ئەم پەیوەندییە بە شێوەیەکی راستەوخۆو بەبێ واسیتەی تاکەکانی ترە.

وەک پێناسەی پێشتر، خستنەڕووی چەند خەسڵەتێکی وەکو ماوەیەکی درێژ، ژمارەیەکی کەم، پەیوەندی رووبەڕوو و راستەوخۆ، گرووپی کۆمەڵایەتی رووبەڕووی کەموکورتی دەکاتەوە کە لەگەڵ ئەو ئەزموونانەی لە چەشنە جیاجیاکانی ئەم جۆرە گرووپە بەدەستهاتووە تێکناکاتەوە. [٩٦/ ١٠٢].

«مۆلکم»و «هولدا نۆلز» (M. and H. Knowles) لەو بڕوایەدان کە گرووپی کۆمەڵایەتی، کۆمەڵێکی تاکەکانە خاوەن تایبەتمەندییەکانی وەک: «ئەندامێتییەکی پێناسەکرا، هۆشیاری و تێگەیشتن، هەبوونی ئامانجی هاوبەش، پشت پێک بەستن بە مەبەستی دابینکردنی پێویستییەکان، پەیوەندییە رووبەڕووە

کۆمەڵایەتییەکان، و رەفتارکردن وەک ئەندامێک بن» [٩٧/ ٥٤].

کۆمەڵناسی ئەمریکی «پیتریم سۆرۆکین» (Pitrim Sorokin) هەندێ لە گرنگترین ئەو هەلومەرجانەی کە تیایاندا تاکەکان بەدوای حەزو ئارەزووەکانیاندا دەگەڕێن و دەبن بە ئەندامی گرووپی کۆمەڵایەتی (یاخود بە دەستەواژەیەکی تر ئەو هۆکارانەی وادەکات تاک ببێتە ئەندامی گرووپی کۆمەڵایەتی) بەم شێوەیە کورت دەکاتەوە: خزمایەتی فیسیۆلۆجی و هاوبەشی لە خوێن یاخود رەگەز، هاوسەرێتی، لێکچوونی لە ئایین و بیروباوەڕو سرووتە جادووییەکان، پێکچوون لە رووی زمانی خۆجێیی و دابونەریتەکان، بەشداریکردن لە خاوەندارێتی و سوودوەرگرتن لە زەوی و زار، هاوسێیەتی، بەشداریکردن لە بەرپرسیارێتی، پێکچوون لە حەزە پیشەییەکاندا بەشداریکردن لە جۆرە جیاوازەکانی گرنگیدانە ئابوورییەکان، گوێڕایەڵیکردنی سەرپەرشت یاخود کەسی خاوەن کار، وابەستەیی ئازاد یاخود ئیجباری بە دامەزراوە یاخود رێکخراوێکی کۆمەڵایەتی وەک پۆلیس، حزبی سیاسی، یەکەی سەربازی، نەخۆشخانە، بەرگریی هاوبەش لە دژی دوژمن یاخود مەترسیی هاوبەش، هاوکاری و هەرەوەزی هاوبەش، ئەرکە بە کۆمەڵەکان [٧٨/ ١٣٠].

بە سەرنجدان لەم پێوەرو پێناسانە، دەگەینە ئەو ئەنجامەی کەوا: گرووپی کۆمەڵایەتی لە چەند تاکێک پێکدێت کە لە نێوانیاندا پەیوەندیی هەبێت و تاکەکان لەژێر کاریگەری ئەو هێزەی پێکەوەیان دەبەستێتەوە بە جۆرێک لە جۆرەکان تەبایی یان هاوبەندییان هەبێت.

### بنەماکانی تایپۆلۆجیای گرووپە کۆمەڵایەتییەکان

کۆمەڵناسی فەرەنسی جۆرج گورڤیچ (G. Gurvitch)، یەکێکە لەو کەسانەی کە هەوڵیان داوە چەند دیسپلینێک بۆ پۆلین کردنی گرووپە کۆمەڵایەتییەکان بخەنەڕوو [٩٨/٣٠٨-٣١١].

ئەو پانزە دیسپلینە بریتین لە: ئاستی یەکێتی، جۆری باڵادەستی، شێوەی کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی، پەیوەندیی بە گرووپەکانی ترەوە، پەیوەندی لەگەڵ کۆمەڵگا بەگشتی، قەبارە، بەردەوامی، ناوەرۆک، شێوەی چالاکی، رادەی نزیکیی نێوان ئەندامەکان، بنەمای دروستبوون، توانای چوونە ناو گرووپ، ئاستی رێکخستن، ئەرک، و هەڵوێست وەرگرتن [٩٩/١٠٤-١١٦]. بەبێ ئەوەی پێویست بێت ئاماژە بە جۆرەکانی تری ئەم دیسپلینانە بکەین، لە خوارەوە ئاماژە بە گرنگترین ئەو

پێوەرانە دەکەین کە لەم بوارەدا بەکارهێنراون و لە کردەوەدا توانای بەکارهێنانیان زیاترە.

**١- ڕەهەندەکانی گرووپ:** دەتوانین گرووپەکان لە ڕووی فرەوانی و ڕەهەندەکانیانەوە دابەش بکەین: گرووپە بچووکەکان، وەک خێزان بە تایبەتی خێزانی ناووکی و گرووپە گەورەکان، وەک کۆمەڵەو کۆڕو کۆبوونەوە سیاسی، کۆمەڵایەتی، زانستی و ئەدەبییەکان. ئەوکاتەی کە گرووپ لە ڕووی ژمارەی ئەندامییەوە زیاد دەبێت ئەو ئاراستەیە دێتە ئاراوە کە سەر دەستە بچووکەکاندا دابەش ببێت. تەنیا لە گرووپە بچووکەکاندایە کە هەرکەسێک دەتوانێت لەگەڵ ئەوانی تر وتووێژی دۆستانەو نزیکی هەبێت.

**٢- توانای بوونە ئەندام لە گرووپدا:** دەزانین کە چوونە نێو هەندێ لە گرووپەکان ئازادەو چوونە نێو هەندێکی تر مەرجدارەو لە هەندێک حاڵەتدا نهێنی هەیە هەمیشە تاکەکان ڕووبەڕووی یەکێک لەم حاڵەتانە دەبنەوە.

**٣- پلەی ڕێکخستن:** هەموو گرووپەکان لە ڕووی پلەی ڕێکخستن و پەیوەندییە ناوەکانی ناو گرووپ، وەکو یەک نین. هەندێک لەم گرووپانە خاوەنی ڕێکخستنی نوسراو و دیاریکراون و پەیوەندییە لە پێشدا حسێب بۆ کراوەکانیان تیادا هەیە (وەکو دابەشکردنی نیمچە عەسکەری و یەکە پەیوەستەکان پێییەوە). هەندێکی تر دەتوانین بە نیمچە ڕێکخراو دابنێین وەکو گرووپی خزمایەتی. جۆری دیکەی گرووپیش هەن کە هیچ جۆرە ڕێکخستنێکی نووسراوو دیاریکراویان نییە، وەک گرووپی یاری لە کۆڵانێکدا.

**٤- ئەرک:** دەتوانین گرووپەکان بەپێی جۆری چالاکی دابەش بکەین، وەک تیپە وەرزشییەکان، سەندیکاکان و دەزگا کە زۆر جۆریان هەیە. مەبەست لەم دابەشکردنە دیاریکردنی جۆری ئەو بەرنامەو چالاکییەیە کە گرووپ لە پێناویدا دروست بووە [٩٣/٢١٠].

**٥- ڕادەی دڵسۆزی:** لە هەریەکێک لە گرووپە کۆمەڵایەتییەکاندا ڕادەی دڵسۆزی و نارەسمیبوونی پەیوەندییەکان جیاوازە. لە هەندێک جۆری گرووپە کۆمەڵایەتییەکاندا هاودڵی و دڵسۆزی لە نێوان تاکەکاندا زاڵە و ئەندامانی گرووپەکە کەمتر هەڵسوکەوتی ڕەسمی و تەشریفاتییان هەیە. لە جۆرەکانی تردا پەیوەندییەکان، ڕەسمی، حیساب بۆکراو، هەڵسەنگێنراو و پشت ئەستوورن بە قازانج و زیان. چەند کەسێک کە لە فەرمانگەیەکدا پێکەوە لە ژوورێکدا کاردەکەن

لەوانەیە لە دەرەوەی پەیوەندییە ڕەسمییە ئیدارییەکاندا، پەیوەندی دڵسۆزانەو تەنانەت خێزانیشیان هەبێت.

سەرەڕای ئەوە گرووپە کۆمەڵایەتییەکان دەشێ زۆر جۆراوجۆربن، دەتوانین لەیەکتریی جیابکەینەوە کە لەم بەشەدا بە کورتی لە گرنگترینیان دەکۆڵینەوە.

## گرووپی سەرەتایی

کۆمەڵناسی ئەمریکی «چارلس هورتن کولی» لە ساڵی ١٩٠٩، زاراوەی «گرووپە سەرەتاییەکان» (Primary Groups)ی بۆ وەسفکردنی گرووپەکانی وەک خێزان، هاوسێیەتی و گرووپی منداڵە یاریکەرەکان بەکارهێنا. بە بڕوای کولی لەناو ئەم گرووپانەدا ئەندامان فێرە هەست و سۆزی وەک بەڵێن نەشکاندن، دڵسۆزی، و پەیوەستەیی بە ئەوانی ترەوە دەبن. خەسڵەتە هاوبەشەکانی گرووپە سەرەتاییەکان بریتین لە پەیوەندی ڕوو بە ڕوو (Face to face)، وەفاداری، پەیوەستەیی سۆزاوی، هاوکاریی نزیک، پەیوەندیی برادەرایەتی.

لە ڕوانگەی «کولی»یەوە هەریەکێک لەم خەسڵەتانە لە گرووپە سەرەتاییەکاندا «ئامانج»ن نەک «هۆ». گرووپی سەرەتایی تا ڕادەیەک بچووکە، بەڵام ئەو هەست و سۆزانەی کە لەنێوان تاکەکانیدا هەن گرنگن. گرووپی سەرەتایی بنچینە سەرەتاییەکانی مەعریفەی ژیانی مرۆیی پێشکەش بەتاک دەکات. بەم وەسفەش گرووپە سەرەتاییەکان بە سەرچاوەیەکی گرنگی هەستی دڵنیایی و ئارامی دەروونی تاک لە ڕووی سۆزییەوە دادەنرێن. ئەم گرووپە بۆ منداڵەکان وەک قوتابخانە وایە کە فێرە ڕێگاکانی بەرقەرارکردنی پەیوەندییە ڕووبەڕووە مرۆیی و پەیوەندییەکانی پەیوەست بە یاری و کارەوە دەبن. پەیوەندییە سۆزاوییەکان لە نێوان ئەو تاکانەی کە ئەندامی ئەم گرووپانەن تۆکمە و پتەون. لەوانەیە لە نێوانیاندا دەمەتەقێ (مجادلة) دروست ببێت و تەنانەت لەوانەیە تاکەکان هەندێ جار لە هەست و سۆزو پەیوەندییەکانی خۆیان لەگەڵ ئەوانی دیکەدا ئازاریان پێ بگات، بەڵام ئەوەی کە نامومکینە گرنگی پێنەدانە. زۆرجار ڕووی داوە کە ئێمە لە قۆناغەکانی منداڵیدا بە هاویاری یاخود برا یان خوشکی خۆمان گوتووە: «من ئیتر قسەت لەگەڵ ناکەم»و لە پاش کاتژمێرێک لەگەڵی ئاشت بووینەتەوە.

«کولی» بەو ئەنجامە دەگات کە خەسڵەتە چاک و باشەکانی مرۆڤ لە خێزان، گرووپی هاوسێیەتی، و گرووپە هاوپارییەکانەوە گەشە دەکەن، لە بەرامبەردا بێزاری

و دوژمنایەتی، دەمارگیری، و دانبەخۆدانەگرتن بە رادەیەکی زۆر لەوەی سەرهەڵدەدەن کە هەست و سۆزە باش و چاکەکان بۆ نێو ئەو کایانەی کە لەم گرووپە بچووکانە بالاترن دزە ناکەن [٨/ ٤٤].

ژمارەیەکی کۆمەڵناسان ئاماژە بە گرووپە برادەرییەکان (Peer Group) دەکەن کە لە راستیدا دەتوانین وەک حاڵەتێک لە حاڵەتەکانی گرووپە سەرەتاییەکان لەقەڵەم بدرێن، هەڵبەت ئەگەر چەمکی سەرەتایی بتوانێت بە هەمان شێوە بشێ بەکارببرێت. بەپێی بۆچوونی کۆمەڵناسی ئەمریکی «ویلیام گۆد» (W. Goode) یەکسانیی ئەندامەکان لە رووی تەمەن و چینی کۆمەلایەتییەوە یەکێکە لە تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی گرووپە برادەرییەکان، کە دەشێ شێوەی جۆراوجۆری هەبێت. گرووپی ئەو هاوکارە ئیدارییانەی کە لە دەرەوەی فەرمانگەش یەکتری دەبینن لەو دەستەیە دەژمێردرێن. بێگومان مەرجی یەکسانی ئەندامەکانی بەو مانایە نییە کە لە نێو گرووپدا کەسێک یاخود کەسانێک لە رووی نفووزی کۆمەلایەتییەوە نین بەسەر ئەوانی ترەوە بالادەست. لەنێو گرووپێکی قوتابییاندا کە لە دەرەوەی کاتەکانی وانەخوێندن لە زانکۆ، لە دەرەوەش لەگەڵ یەکتری دەسوورێنەوە، لەوانەیە نفووزی کۆمەلایەتی هەندێکیان، لە هەندێکی تریان زیاتر بێت. سەرەڕای ئەم لایەنە، گرووپ ماهیەتێکی ناڕەسمیی هەیە، و ئەگەر سەرۆک یاخود کەسێک هەبێت رێنمایی بکات، حاڵەتی ئیرادییانەی نییەو تاکەکان تا رادەیەک لەگەڵ یەکتر (بەلای کەمەوە لە بازنەی برادەرایەتی خۆیان) هەست بە یەکسانی دەکەن [٦٧/ ١٨٠].

**گرووپە سەرەتاییەکانی واسیتە[٨/ ١٤٨]**

| تاک | گرووپە واسیتەکان | رێکخراوە گەورەکان |
|---|---|---|
| ژنی ماڵەوە | ناسیاوانی خێزانی | گرووپی ئایینی/ سیاسییەکان<br>رێکخراوەکانی فێرکردن |
| کارمەند | هاوکارانی فەرمانگە | فەرمانگە/ کارگە |
| سەرباز | نەفەرەکانی ناو یەک شەمەندەفەر | سوپا |

گرووپە سەرەتاییەکان لە رووی سنووری کاریگەری لە تۆڕی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا، لە چوارچێوەی خۆیاندا نامێننەوە، و کاریگەرییەکەیان لەوانەیە بگاتە رێکخراوە کۆمەڵایەتی یاخود گرووپە ناسەرەکییەکانیش (ئەو بابەتەی کە ئێستا ئاماژەی پێ دەکەین). لەم حاڵەتەدا ئەم گرووپانە رۆڵی نێوانگیر (واسط) وەردەگرن.

### گرووپی لاوەکی

گرووپە لاوەکییەکان (Secondary Group) یاخود دووەمینەکان جۆرگەلێکی گرووپە کۆمەڵایەتییەکانن کە «کولی» وەک چەشنێک لە بەرامبەر گرووپە سەرەتاییەکاندا باسیان لێوەدەکات. بە بڕوای «کولی» گرووپە لاوەکییەکان حاڵەتی رەسمییان هەیە، و پەیوەندی نێوان تاکەکان تیایاندا کەمتر پشت ئەستوورە بە هەست و سۆز. ئەو قوتابییانەی کە لە کۆلیجێکدا دەخوێنن، یاخود ئەو کارمەندانەی لە وەزارەتێکدا کاردەکەن بە ئەندامی گرووپە لاوەکییەکان لەقەڵەم دەدرێن. گرووپە لاوەکییەکان هەستی دڵسۆزی و هاوبەندیی بەرادەیەکی زۆر پێشکەش بە تاکەکان ناکەن. بۆ ئەوەی تاکەکان لە کارکردن لە دەزگایەکدا هەست بە لەخۆبایی بوون بکەن وهەست بکەن کە ئەندامی ئەو رێکخراوەن، پێویستە زۆر تێبکۆشن. ئەم هەست و سۆزە بە هیچ شێوەیەک لەگەڵ هەست و سۆزی گرووپی یەکەم بەراورد ناکرێت. لە وەزارەتێکی زۆر گەورەدا، کارمەندێکی ئاسایی بە زۆری وا هەست دەکات کە بوونی ئەو لەو رێکخراوە گەورەیەدا ون بووە تەنانەت هەندێ جار هەستی بێ ریشەیی و نامۆبوون بەسەریدا زاڵ دەبێت.

لە وڵاتە پیشەسازییە پێشکەوتووەکاندا، لەم ساڵانەی دواییدا خەڵک زیاتر روو لە گرووپە لاوەکییەکان دەکەن. لە هەندێک حاڵەتدا مەسەلەکە بەم شێوەیە خراوەتەڕوو کە ئەگەر رۆژێک رێکخراوە گەورەکان لە جۆری لاوەکی شوێنی گرووپە یەکەمینەکان بگرنەوە، ئایا مرۆڤەکان رووبەڕووی شەرمەزاری یاخود نامۆبوون نابنەوە؟ خزمەتی سەربازی ئەرکی تاک لە خێزان، برادەرو دراوسێیەکانی جیادەکاتەوە. خوێندن هۆی برین یاخود لاوازکردنی پەیوەندیی تاکە بە گرووپە سەرەتاییەکان کە لە زانکۆیەکی گەورەدا بەرەڵلایدەکات، و لە کۆتاییشدا کارکردن لەوانەیە ببێتە هۆی ئەوەی کە تاک لە ژینگەی خێزانیی خۆی دووربکەوێتەوە [٤٦/٨].

## بەراوردێک لە نێوان گرووپە سەرەتایی و لاوەکییەکان

لە بارەی دابەشکردنی گرووپە کۆمەڵایەتییەکان بۆ دوو جۆری سەرەتایی و لاوەکی، پێویستە ئاماژە بە دوو خاڵ بکەین. یەکەم، لە راستیدا ئەم دوو جۆرانە چەشنی نموونەیی (Ideal type) و لەوانەیە بە شێوەیەک لێیان کۆڵرابێتەوە کە وەک بڵێین دەکەونە دوو جەمسەری دژبەیەکەوە. لە بارودۆخی ئاسایی ژیانی کۆمەڵایەتیدا، رووبەڕووی زۆر جۆرە گرووپ دەبینەوە کە ناتوانین بە وردی بە سەرەتایی یاخود لاوەکییەکان دابنێین، چونکە پەیوەندی ئەندامەکان خەسڵەت گەلێکی هەردوو جۆرەکەی تێدایە. گریمان یەکێک لە کارمەندە حکومییەکان کە لە وەزارەتێکی گەورە لە تەهران کاردەکات، بۆ یەکەیەکی سەر بەو وەزارەتە لە یەکێ لە شارە بچووکەکان (کە رێکخراوێکی ئیداریی بچووکە) بگوازرێتەوە. لەم بارودۆخەدا، ئەو کارمەندە لەوانەیە لەگەڵ خۆیدا ئەندامەکانی خێزانەکەیشی بباتە ئەو شارە، لەپاش جێگیربوون لەو شوێنە، لە تۆڕی پەیوەندییە گرووپییەکانیدا لە پەیوەندیدا لەگەڵ رێکخراوی ئیداری، گرووپە هاوسێیەکان، خێزانی هاوکاران و هەروەها خێزانەکەی تێکەڵەیەک لە پەیوەندییە گرووپییەکانی جۆری سەرەتایی و لاوەکی بەدی دەکەین. هەر تەنیا ئەو رێکخراوەی کە شوێنی کارەکەیەتی زۆر لە تایبەتمەندییەکانی گرووپە سەرەتاییەکانی تێدایە.

دووەمین خاڵ کە پێویستە لەم بوارەدا (جیاوازی گرووپە سەرەتایی و لاوەکییەکان لەبەرچاوی بگرین ئەوەیە کە لە زۆر حاڵەتدا گرووپە سەرەتاییەکان لەوانەیە لە بنەڕەتدا لە چوارچێوەی گرووپە لاوەکییەکاندا لەدایک بن، بۆ نموونە کارمەندێکی وەزارەتێکی گەورە لەوانەیە لەگەڵ ژمارەیەک لە هاوکارە نزیکەکانی پەیوەندیی زۆر دڵسۆزانە بەرقەراربکات، لەهەمان کاتدا کە ئەمانە هەموویان لە پێکهاتەی گشتیی رێکخراودا بێگانەبن، وەک یەکێک لە ئەکتەرێکی لاوەکی لەقەڵەم بدرێن، و هەروەها رێکخراویش پێکهاتە (هیکل)یەکی رەسمی هەبێت و تۆڕی پەیوەندییەکان پشت ئەستووربێت بە شێوازە گرێبەستییەکان (عقدی). لە زۆربەی زانکۆ گەورەکاندا بازنە گەلێک لە برادەرانی دڵسۆز دروست دەبن کە لەسنووری زانکۆش دەچنە دەرەوە و هەندێ جار تا دواساتی ژیانی ئەندامەکانی بەردەوام دەبێت، هەرچەندە ئەم زانکۆیە بە بەراورد لەگەڵ قوتابخانەی سەرەتایی لادێ وێنەیەکی زۆر وشک و نادڵسۆزانە بەرجەستە دەکات. هەڵبەت هەندێ جاریش بینیومانە کە لە نێو رێکخراوە گەورەکاندا چەند کەسێک بەهەمان شێوە بە تەنیا ماونەتەوە.

## گرووپی ژێدەر

گرووپی ژێدەر (Reference Group) ئەو گرووپەیە کە لە کاتی دادوەریکردندا بۆی «دەگەڕێینەوە». گرووپێک کە بیروڕاکانی، بەلای کەمەوە لە حاڵەتێکی تایبەتیدا وەکو ئەو دادوەرانەیە کە ئێمە پشتگیرییان لێدەکەین [٧/ ١٩١]. جیاوازی نێوان ئەو گرووپەی کە تاکەکەس ئەندامە تیایداو ئەو گرووپەی کە بۆ تاک حاڵەتی ژێدەری هەیە لێکۆڵینەوەی زۆری لەسەر ئەنجام دراوە. ئەو کاتەی کە لە ئاراستە سیاسییەکان و بزاڤە کۆمەڵایەتییەکان دەکۆڵرێتەوە، سەرنجدان لە گرووپە ژێدەرەکان وا دەکات، کە ئەو هێزە کۆمەڵایەتییە شاراوانەی سەرووی ئەو رەفتارانەی کە رووخسارێکی نهێنییانەیان هەیە، بدۆزینەوە [٤٠ / ١٠٨-١٠٩].

زاراوەی گرووپی ژێدەر یەکەمین جار لە ساڵی ١٩٤٢ بەهۆی یەکێک لە کۆمەڵناسە ئەمریکییەکان بەناوی «هیمان» (Hyman) خراوەتەڕوو. ئەو بە لێکۆڵینەوەکانی خۆی پیشانی دا کە پێگەی زەینی تاکێک مەرج نییە لەگەڵ پێگە کۆمەڵایەتی ئابوورییەکە بگونجێت (بە شێوەیەک کە لە رێگەی هۆکارە بابەتییەکانی وەک داهات و ئاستی خوێندن دەستنیشان دەکرێت). ئەو دیسپلینانەی کە بۆ هەڵسەنگاندنی بارودۆخی تاک لەم رووەوە بەکاردەبرێت مەرجە پەیوەست بێت بەو گرووپە کۆمەڵایەتییەی کە تاک وابەستەیە پێیەوە، لەوانەیە رەفتارەکان لە گرووپێکەوە سەرهەڵدەن کە تاکەکەس ئەندام نەبێت تیایدا بەڵام بۆ ئەو حاڵەتی سیاق و چوارچێوەی دادوەریکردنی هەبێت (گرووپی ژێدەر).

«روبێرت مێرتن» چەمکی گرووپە ژێدەرەکانی پوختەتر خستەڕوو و گرووپە ژێدەرە پۆزەتیڤەکان (ئەو گرووپانەی کە نۆرمەکانیان پەسەند دەکرێن)و نێگەتیڤەکان (ئەو گرووپانەی کە نۆرمەکانیان رەت دەکرێنەوە)ی لەیەکتر جیاکردنەوە. ئەو لەو بڕوایەدایە کە چەمکی گرووپی ژێدەری نێگەتیڤ بە کەرەستەیەکی بەسوود دادەنرێت بۆ لێکۆڵینەوە لە وردە کولتوور (Subculture)ی تاوانباران. لەوانەیە بۆ ئەندامەکانی گرووپێک، گرووپێکی تر گرووپی ژێدەری نێگەتیڤ بێت. گرنگی ئەم جۆرە حوکمدانە لە بارەی ئەو گرووپانەی کە لەوانەیە لەژێر کاریگەری چەند ئایدیۆلۆجیایەکی سیاسی (حزبە راستە توندڕەوەکان لە بەرامبەر چەپە توندڕەوەکان) دابن بەئاشکرا دەبینرێت.

هەموو گرووپە کۆمەڵایەتییەکان بە شێوەیەکی یەکسان لەلایەن تاک و

گرووپەکانەوە سەرنجیان لێنادرێت. پەیوەندییەکان هەر لە بایەخ پێنەدانی تەواوەوە تا پەیوەستەیی هاودەم لەگەڵ تامەزرۆییەوە هەن. گرنگی گرووپە ژێدەرییەکان لەوەدایە کە رفتارەکان، هۆشیاری، ئایدیۆلۆجی، و یاخود بیروڕای دیاریکراو دەگەیەنن بە تاکەکان. زۆر لە تاکەکان، گرووپە ژێدەرییەکان بە نموونە دادەنێن. گرووپی ژێدەر ئەو گرووپەیە کە بیروبڕوا، کارو رەفتارەکانی جێگەی سەرنج و پشت پێ بەستنن و کاری ئەندامەکان یاخود هەموو ئەو کەسانەیە کە لەوانەیە ئەندامیش نەبن لەو گرووپەدا. بۆ ئەوانەی کە بڕوایان بە ئایینێکی دیاریکراو هەیە، پێشەوا ئایینییەکان بە گرووپی ژێدەر دادەنرێن.

تەنانەت لەوانەیە لەم سەردەمەدا گرووپی ژێدەر بوونی نەبێت. مەرجی سەرەکی پەیڕەویکردن لە رەفتارەکانی گرووپی ژێدەر ئەندامێتی نییە تیایدا، چونکە لە هەندێک حاڵەتدا تاک ئەندام نییە لە گرووپی ژێدەردا بەڵام بایەخ بە رەفتارەکانی دەدات یاخود بە هیوای بە ئەندام بوونە تیایدا. شوێنی گرووپی ژێدەر لە هیرارکییەتی کۆمەڵایەتیدا بە کردەوە ئاستی ئەو ئارەزوویە تاکەکەسییانە دیاردەکات کە بایەخیان پێدەدات، لەم بوارەدا پێویستە ئەوەش بڵێین کە بەگوێرەی هەڵسوکەوت یاخود لەکاتی باسکردنی شوێنگە تایبەتییەکاندا، لەوانەیە تاکەکەسێک بە ریز سوود لە چەند گرووپێک وەک ژێدەر وەرگرێت.

**پەیوەندییە گرووپییەکان و جۆری کۆمەڵەکان [٨/ ٤٥]**

| جۆری گرووپەکان | گرووپی سەرەتایی (تیۆری کولی) | گرووپی لاوەکی (تیۆری کولی) |
|---|---|---|
| | **نموونەکان:** | **نموونەکان:** |
| | خێزان | سەندیکا |
| | گرووپە هاویارییەکان | زانکۆ |
| | گرووپە هاوسێییەکان | سوپا |
| | **تایبەتمەندییەکان:** | **تایبەتمەندییەکان:** |
| | رووبەڕووبوونەوەی سۆزاوی | ناسۆزاوی |
| | هاوکاریی نزیک | رکابەری |

| | |
|---|---|
| پەیوەندیی رووبەڕوو | کەمتر برادەرانەیە |
| ناسین | ناسینی کەمتر |
| ئارامی دەروونی | کاریگەریی ئابووری |
| خۆی لەخۆیدا ئامانجە | ئامرازە بۆ ئامانجێک |

| | | |
|---|---|---|
| **جۆری کۆمەڵەکان** | **تیۆری تونیس:** | **تیۆری تونیس:** |
| **(هاوشێوە** | کۆمەڵ | کۆمەڵگا |
| | (میحوەرییەتی تاکەکەسی) | (میحوەرییەتی کاروکاسبی) |
| | **تیۆری دورکهایم:** | **تیۆری دورکهایم** |
| | هاوبەستەیی میکانیکی | هاوبەستەیی ئۆرگانی |
| | (لێکچوونی ئەندامەکان) | (جیاوازیی ئەندامەکان) |
| | (پەیوەستەیی میکانیکی) | (پەیوەستەیی بەپێی وابەستەیی گرێبەستی) |

**گرووپی گوشار**

گرووپی گوشار (Pressure Group) بە گرووپێک دەگوترێت کە هەوڵدەدات بەگوێرەی بایەخپێدان و ئاراستەکانی خۆی یان جەماوەر (کە خۆی بە نوێنەریی دەزانێت) کاربکاتە سەر ئەو هێزانەی بڕیار لەسەر یاساکان دەدەن یاخود رێکخراوە حکومییەکان (پەرلەمان، دەستەی حکومەت، وەزارەت و دامودەزگاکان) و هەروەها گۆڕانکاریی پێویست بهێنێتە ئاراوە. هەرچەندە، ئەم جۆرە گرووپانە لە کۆنەوە هەر هەبوونە، بەڵام لە کۆمەڵگا نوێیەکاندا گرووپی نوێ سەریانهەڵداوە کە ئامانجیان گوشارخستنە لەسەر رێکخراوەکان، کاربەدەستەکان، گرووپەکان، دەوڵەتەکان، و رێکخراوە نێونەتەوەییەکان، و هتد...، بەقازانجی بەرژەوەندییە یان ئاراستە تایبەتییەکان. گرووپەکانی گوشار لەوانەیە پایەیەکی رەسمییان هەبێت یان بەپێچەوانەوە. کۆمەڵناسان، گرووپەکانی وەک سەندیکا، کارتێل، کۆمەڵەکانی پارێزگاری کردن لە بەرهەمهێنان یاخود بەکاربەران، کۆمەڵەی دایکان و باوکان لە رێزی گرووپەکانی گوشار لەقەڵەم دەدەن. بە زۆری حزبە سیاسییەکان لەبەرئەوە لە جۆری گرووپەکانی گوشار ناژمێرن چونکە بە شێوەیەکی راستەوخۆ و ئاشکرا هەوڵی گەیشتن بەدەسەلات دەدەن.

له وڵاته پیشەسازییەکاندا، گرووپە گەورە ئابوورییەکان بەشێکی دیاریکراو له پیشەسازی و بازرگانی (وەک بانکداری، تەونکاری) پێکەوە دەبەستێت. ئەم کۆکردنەوەیە دەبێتە هۆی ئەوەی کە یەکەی مۆنۆپۆلکراوی بەرفراوان سەرهەڵدەن و ئەم گرووپە بەهێزانە رۆڵی گەورە بگێڕن لە هەڵبژاردنی ئاراستە ئابووری و جاروبار سیاسییەکانی حکومەتەکان. بۆ نموونە کاتێک ئینگلتەرا چووە نێو بازاڕی هاوبەشی ئەورووپاوە لەلایەن گرووپی جۆراوجۆرەوە گوشار خرایە سەر حکومەتی ئینگلتەرا بۆ ئەوەی ئەم کارە نەکات.

بەرگری کردن لە کاروبارو مەسەلە ئەخلاقی، مرۆڤدۆستی یاخود ئایدیۆلۆجییەکانیش دەشێ گرووپی گوشاری لێ پێک بێت. ئەم گرووپانە بۆ پەسەندکردنی یاخود نەهێشتنی هەندێک لە بڕیارو یاساکان، خۆیان بەهێزدەکەن. هەڵوێست وەرگرتنی گرووپە جیاوازەکان لە پەیوەندیدا لەگەڵ مەسەلەکانی وەک جۆری ئەو ئامرازانەی رێگە لە زک پڕی دەگرن، تەلاق، لەباربردنی کۆرپەلە لە وڵاتە جیاوازەکاندا دەتوانین لەم بوارەدا بە نموونە بهێنینەوە. گرووپێکی گوشار لە وڵاتێک کە چالاکی دەنوێنێت خۆی رێکدەخات و پێگەیەکی تایبەتی بەدەست دەهێنێت. لەوانەیە لە هەندێک حاڵەتدا ئەم گرووپانە کەسایەتی یاساییان نەبێت. هەندێک لە گرووپە رەسمییەکان رەنگە نفووزێکی زۆریان لە چالاکییە هەنووکەییەکانی رێکخراوە رەسمییەکاندا هەبێت. شێوەی کاری گرووپەکانی گوشار بەپێی جەوهەرو پلەی گرنگیی ئەو گرووپانە دەشێ هەمەجۆر بێت. لە هەندێک حاڵەتدا لەوانەیە گرووپەکانی گوشار بگەڕێنەوە بۆ رای گشتی و لە رێگەی هۆیەکانی گەیاندنی گشتی چالاکی بنوێنن [ ٤٠ / ١٠٦-١٠٧ ].

دەتوانین گرووپەکانی گوشار لە رووی باڵندەی کارکردنەوە دابەشی سەر دوو دەستە بکەین: دەستەیەکیان ئەوانەن کە لە هەوڵی پاراستنی بەرژەوەندیی ئەندامەکانیاندان و دەستەی دووەم ئەو گرووپەیە کە هەوڵدەدات پەرە بە بابەتێک یاخود هزرێکی دیاریکراو بدات و بڵاوی بکاتەوە. هەڵبەت دەستەبەندی هەموو گرووپەکانی گوشار بەپێی دوو دیسپلینی «پارێزگاری» یان «پەرەدان و بڵاوکردنەوە» هەمیشە بێ گیروگازی نییە.

گرووپەکانی گوشار لە رووی فراوانی، دەسەڵات، و میتۆدەکانی کاریشەوە جۆراوجۆرن. زۆریی ژمارەی ئەندام هەمیشە مەرج نییە بتوانێت سەرکەوتن مسۆگەر بکات. زۆربەی ئەو گرووپانەی ئەندامیان زۆرە، گرووپی بچووکن. لەگەڵ ئەوەی

گرووپەکانی گوشار شێوەی کاری جیاوازیان هەیە، وێڕای ئەوەش چەکی سەرەکییان «باوەڕپێهێنان»ە و «گرووپی ئامانجی» ئەوان «بڕیاردەران»ن. لە زۆربەی وڵاتانی جیهاندا نوێنەرانی پەرلەمان، کاربەدەستە پایە بەرزە حکومییەکان و وەزیرەکان، لە رووی گرووپەکانی گوشارەوە هاوپەیمانی بەسوودن. لەهەندێک بواردا کە گرووپەکانی گوشار نەتوانن نفووزیان لەسەر بنکەکانی بڕیاردان پیادە بکەن بە زۆری هەوڵدەدەن رای گشتی بخەنە ژێر کاریگەریی [٨/ ١٥٩-١٦٠].

## گرووپی نهێنی

گرووپی نەهێنی ئەو گرووپانەن کە پشت بە ئەندام وەرگرتن، بەرنامەدانان، بڕیاردان و کاری شاراوە دەبەستن. ئەندامبوون لەم گرووپانەدا سنووردارییی خۆی هەیە و هەلومەرج و بڕیاری تا رادەیەک سەخت زاڵن بەسەر چۆنایەتی ئەندام وەرگرتن تیایاندا. لەگەڵ ئەوەی بەهۆی جۆراوجۆری زۆری ئەم گرووپانە ناتوانین تایبەتمەندییە هاوبەشەکانیان بە ئاسانی دەستنیشان بکەین، بەم پێیەش ئەو تایبەتمەندییانەی بە شێوەیەکی ئاسایی لەم گرووپانەدا دەبینرێن بریتین لە: شاردنەوەی چالاکی، ئاشکرانەکردنی ناوی ئەندامەکان، ئاراستە وەرگرتن لە پەراوێزی رێکخراوە رەسمییەکاندا، چالاکی لەپێناوی یاخود دژی دەسەڵاتی فەرمانڕەوا، و لە کۆتایشدا ئەوەی کە لە چەند بوارێکدا حاڵەتی نهێنی هەیە مەراسیم و ئاداب و رسوومی گرووپی یاخود بەلای کەمەوە واتا رەمزییەکەیان «سیمبولییانە». لەوێوە کە چوونە ناو زۆر لەم گرووپانە هاوکاتە لەگەڵ رەسمیات، بارودۆخ و ئاداب و رسوومی ئاڵۆزو لە رووی دەروونییەوە بۆ تاک ئەندامبوون لە گرووپدا هاوکاتە بە حاڵەتی «ئەهلی هونەر». ئەم پرۆسەی «گۆڕانە» لەوانەیە هاوکات بێت لەگەڵ هەندێک کرداری سیمبولی، ئەزموونی ئەخلاقی یان تەنانەت لەشییەکانیش و بۆ کەس ئەو هەستەی لا دروست بکات کە بۆ «سەر لە نوێ لەدایک بوون» «دەمرێت» ئەو حاڵەتەی کە لە هەندێک لە گرووپەکاندا بە لەدایک بوونی ناسەرەکی ناودەنێن [١٠٠ / ٦-٧].

ئەم گرووپانە ژیانێکی گرووپیی سنووردار بە خولێکی دیاریکراویان هەیەو ئەم ژیانە بە زۆری تا ئەو کاتەیە کە ئەندامەکانی گرووپ بتوانن بگەن بە ئامانجەکەیان. ئەم گرووپانە دەتوانن خاوەنی جەوهەرە جیاوازە سیاسی و ناسیاسییەکان بن و مێژووی مرۆیی لە رابردوویەکی زۆر زووەوە تاکو ئێستا لە کۆمەڵی جیاوازدا

بینیویەتی. لە سەردەمەکەماندا گرووپەکانی وەک هەندێک لە تاقمی پارتیزانە رزگارکەرەکان، گرووپە لایەنگرەکانی باشترییە نەژادی و نەتەوەییەکان، مافیا، فرماسونەری، و نازییە نوێیەکان دەتوانین لە ریزی گرووپە نهێنییەکان حسێب بکەین.

لە سالّی ١٨٦٦ لە ولاّتە یەکگرتووەکان گرووپێکی شاراوەی تیرۆرستی بە ناوی «کوکلوکس کلان» (Kuklux Klan) بە بەشداری گرووپێکی سپی پێستە ئەمریکییەکانی پەیڕەوی ئایینزای پروتستان بە مەبەستی دژایەتی کەلەشەقانەو لەناوبردنی گرووپەکانی تر، و بە تایبەتی رەشپێست، جولەکەو کاسولیکەکان هاتە ئاراوە. زۆربەی چالاکییەکانی ئەم گرووپە لە دژی رەشپێستەکان بوون و کەمتەرخەمییان لە کوشتن و بریندارکردنیان نەدەکرد. ئەوان لە کاتی ئەنجامدانی عەمەلیاتەکان جلی تایبەتی خۆیان دەپۆشی. ئەم گرووپە لە سالّی ١٩١٥دا دووبارە رێکخراوەکەیان بونیاتناوەو پەرەیان بە سنووری چالاکییەکانیان دا.

«ئیسماعیل رائین» لە کتێبی «فەرامۆشخانەو فراماسونەری لە ئێراندا» دەنووسێت: «سەدان سالّە رێکخراوە نهێنییەکان بە ناوی «پارێزەرانی ئازاد» لە زۆر لە ولاّتانی جیهاندا لە پەناوەو بە شاراوەیی چالاکی دەنوێنن... خاوەنی ئەم رێکخراوە هێشتا لە پەردەیەکی ئەستوور لە نهێنییەکان کارەکانیان ئەنجامدەدەن. ئەوان کەسانی بێگانەو تاکە «ناماسون»ەکان بۆ ناولوژەکانی خۆیاندا پەسەند ناکەن و بە کەسێک کە «ماسون» نەبێت دەلّێن «بێگانە»، «ماسونەکان» وەلاّمی گوتە، رەخنە تەنانەت جنێوی رکابەرەکانیشیان نادەنەوەو بە کرییەکی رەها نیەت و ئامانجەکانیان دەبەنە پێشەوە. هەمان نووسەر زیاد دەکات کە: ئەو کەسەی کە دەیویست بچێتە ناو تاقمی ماسونییەکان لە پاش بڕینی تاقیکردنەوە سەختەکان، مامۆستای گەورە جامە ئاوێکی بەتام دەداتە دەستی کە پێی دەلّێن: ئاوی فەرامۆشی، و ئەو موکەلەفە ئاوەکە بخواتەوە لە دوای ئەوە هەرچییەکی لە تاقمەکەیدا بینیوە فەرامۆشی بکات و هیچ شتێک بە زۆر دەرنەکات و وا پیشان بدات کە هەموو شتێکی فەرامۆش کردووە [ ١١/٣٦، ٤٩٩ ].

**گردبوونەوە**

مەبەست لە گردبوونەوە یاخود ئاپۆرەی خەلّک (Crawd) کۆبوونەوەی کۆمەلّە کەسێکە لە شوێنێکی دیاریکراودا لە ئەنجامی سەرهەلّدانی رووداو یاخود هۆیەکی

تایبەت. چەند کەسێک کە بۆ بینینی ڕووداوێک لە شوێنێک کۆدەبنەوە یاخود لە خۆپیشاندانە کۆمەڵایەتی و سیاسییە دیاریکراوەکاندا بەشداری دەکەن «گردبوونەوە» دروست دەکەن. گردبوونەوە سەرەتاییترین و نابەردەوامترین گرووپی کۆمەڵایەتییەو گرنگترین تایبەتمەندییەکانی بریتین لە:

١- بوونی پەیوەندیی کاتی و قابیلی پچڕان لە نێوان تاکەکاندا.

٢- گرووپ شێوە یاخود ڕێکخراوێکی تایبەتی نییە.

٣- تاکەکان زۆر پەیوەستن بە هەست و سۆزو هەڵچوونە ساتەوەختییەکانەوە.

٤- لە هەندێک حاڵەتدا ئەقڵ و لۆجیکی کافی و ئاسایی زاڵ نییە بەسەر ئاپۆرەی خەڵکدا.

٥- هەڵچوون و هەست و سۆزەکان خێراییەکی زۆریان هەیەو توانای سەرتاپاگیرییان هەیە.

٦- تاکەکان لەم بارودۆخەدا دەرفەتی خوێندنەوەو بیرکردنەوەی تەواویان لە بارەی ئەو شتەوە نییە کە ئەنجامی دەدەن.

٧- تاکەکان لە دوای پەیوەندیکردنیان بە گرووپەوە تا ڕادەیەک کەسایەتی و پایە کەسییەکەیان لە بیردەکەن.

لە کۆی ئەم تایبەتمەندییانەدا دەتوانین بگەینە ئەو ئەنجامەی کە یەکەم ئەوانەی گردبوونەتەوە لە کات و شوێنێکدا لە دەوری یەکتر کۆدەبنەوە. دووەم، جۆرێک ئاراستە، هزر، یاخود ڕوانگەیەکی تایبەتی هاوبەش لە نێوانیاندا هەیە کە بەرەو کارە تاکەکەسی یاخود دەستەجەمعییەکانیان دەبات و ئەمەش لەبەر هاوسێیەتی فیزیاییە کە لە نێوان تاکەکاندا هەیە. بە سەرنجدان لەو جۆراوجۆرییەی کە لە گردبوونەوەدا هەیە دەتوانین بە شێوەیەکی گشتی بۆ چەند دەستەیەک لە خوارەوە پۆلینی بکەین. هەرچەندە کە لە نێوانیاندا سنووری بنەبڕ نین:

١- ڕێکەوت: ئەم جۆرەی گردبوونەوە لەبەر ڕووداو یاخود بارێکی تایبەتی دێتە ئاراوە، حاڵەتێکی ڕێکخراوی نییەو هاوسێیەتی شوێنی هۆکاری پەیوەندی تاکەکانە، وەکو ئەو کەسانەی کە لەبەر ڕووداوێک لە شوێنێک ڕادەوستن و خۆیان لە ڕووداوەکە هەڵدەقورتێنن.

٢- گرێبەستی (عقدی): ئەم جۆرە گرووپانە لە پێناو ئامانجێکی تایبەتیدا لەیەکتر کۆدەبنەوەو ئەندامەکانی ڕەفتارگەلێکی تایبەتییان هەیە پەیڕەوی لە دیسپلین دەکەن، وەک ئەو کەسانەی کە لە هۆڵێکی وەرزشیدا بۆ دیتنی یارییەک

خرِدەبنەوە، یاخود دەچنە هۆڵێکی سینەما یاخود شانۆ، یان کۆڕێک و... بێگومان لە هەندێک باردا رەفتارە گرووپییەکان دەبنە هۆی سەرهەڵدانی حاڵەتی تایبەتی و لە هەندێک باریشدا زێدەڕوو و توندڕەوانە لەم ناوەندانەدا (هەڵچوونی جۆراوجۆر).

٣- ئامانجدار: هۆی سەرەکی بەشداریکردن لەم گردبوونەوانەدا بە تەواوی راگەیاندنی پەیوەستبوونی تاکە بە گردبوونەوەوە. چالاکی نواندن لە گردبوونەوەدا خۆی لە خۆیدا ئامانجە. تاکەکان لەبەر ئەوە بەشداری لەم گردبوونەوەدا دەکەن تاکو هەست و سۆزەکانیان لە حاڵەتێکی دیاریکراودا دەربڕن و پەیوەستەیی خۆیان بە کۆمەڵەوە بسەلمێنن، وەکو کەسانێک کە لە یەکێک لە خۆپیشاندانەکانی سەر شەقام، رێپێوان یاخود میتینگەکاندا بەشداری دەکەن.

٤- هەنگاونەر: لەم گردبوونەوانەدا ئەو تاکانەی بەشدارییان کردووە، لە حاڵەتی ئاسایی خربوونەوە یاخود رێپێوان و دەربڕینی سادەی هەست و سۆزو باوەڕەکان دەردەچن و بەپێی حاڵەتەکە هەڵدەستن بە هەنگاوی جیاواز لەوانیش راووڕووت، راپەڕین، تێکدان، ئازارو ئەشکەنجە، کوشتار، خۆپیشاندانە توندوتیژەکان، فڕێدانی شتە جیاوازەکان و هەندێک شتی خراپکەرو... لە زۆربەی بارەکاندا لەگەڵ هێزەکانی حکومەت رووبەڕوو دەبنەوە.

### ناوگرووپ و دەرەوەی گرووپ، مەرکەزییەتی ئێتنی

دوو زاراوەی «ناوگرووپ» (In-group)و «دەرەوەی گرووپ» (Out-group) بۆ یەکەمجار لەلایەن «سامنێر» بەکاربراون. ئەو گوروپانەی کە ئێمە ئەندامین تیایاندا بۆ ئێمە وەکو «ناو گرووپ»وان و بە پێچەوانەوە ئەوکاتە باس لە چەمکی دەرەوەی گرووپ دەکرێت کە لە گرووپێکدا ئەندام نەبین، بە تایبەتی ئەو کاتەی کە بە جۆرە دەمارگیرییەک باس لە پەیوەندیی گرووپی بکەین. ئەو کاتەی باس و خواس لە گرووپێکی تاوانباران دێتە ئاراوە ئەم دیاردەیە لە پێوەرێکی بچووکدا خراوەتەڕوو و ئەو کاتەی کە سەرنج بدەینە شەڕی نێوان وڵاتەکان، بابەتەکەمان بە پێوەرێکی فراوانتر خستۆتەڕوو [٨/ ٥٠].

ئەو گرووپانەی کە بە پاشگری «م» دەستنیشانیان دەکەین بۆ ئێمە حاڵەتی ناوگرووپییان هەیە (هاوکارانم، برادەرانم، هاوگەمەکانم)، چونکە هەست دەکەین کە پەیوەستین پێیانەوە. هەڵبەت لە نێوان هەموو ئەو تاکانەی کە پەیوەندیی ناو گرووپییان پێکەوە هەیە، هەمیشە ئاستێکی یەکسان لە پەیوەندیی یاخود

پەیوەندیی گرووپی نابینین و جۆرە «دووربیەکی کۆمەڵایەتی» دیارە، کە بە بینینی پەیوەندیی تاکەکان لە گرووپدا شیاوی لێتوێژینەوەیە [١٩١/٧].

لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا بە زۆری ئەو هۆکارەی کە دەرەوەی گرووپ یان ناوگرووپ بوونی تاک دیاری دەکات گرووپی خزمایەتییە. لە خێڵەکانی ئێراندا زۆر لە تاکەکان لە کاتی خۆناساندنیان لە جیاتی هێنانی ناوی کەسییان، ناوی خێڵ یاخود هۆزی خۆیان دەهێنن (گرووپی ئێتنی)و لە لادێکاندا بە ناوی باوک یاخود تەنانەت باپیر بانگی لاوەکان دەکەن (گرووپی خێزانی).

چەمکی ناوگرووپ پەیوەندییەکی زۆری بە دیاردەی «ئێتنۆسێنتەریزم یاخود مەرکەزییەتی گرووپییەوە» (Ethnocentrism) هەیە، کە ماناکەی لە رووی زمانەوانییەوە چەقبەستن و وابەستەیی توندە بە کولتوورێکی تایبەتییەوە، و پشت بەو تەسەورە دەبەستێت کە ئەو گرووپەی کە تاک پەیوەستە پێیەوە، لە هەمووان باشترە. مرۆڤ دەتوانێت سەبارەت بە کۆمەڵگای خۆجێیی، وڵات، گرووپی کۆمەڵایەتی، چینی کۆمەڵایەتی و یاخود نەژادی، «ئێتنۆسێنتەریست» بێت، ئەم چەمکە شوێنگەی کەسانێک پیشاندەدات کە لەو باوەڕەدان شێوەی تایبەتی رەفتار، ژیان، هەنگاونان یاخود بیرکردنەوەیان پێویستە لە هەموو شێوەکانی تر بە باشتر دابنرێت [٢/ ٤٩].

ئێتنۆسێنتەریزم حاڵەتێکە کە لەگەڵ حەزە دەروونییەکانی تاک لە پەیوەندیدایەو شتێک نییە جگە لە شێوەی فرەوانی «مەرکەزییەتی خود» (ئیگۆسێنتەریزم). دەروونناسەکان پیشانیان داوە کە مەرکەزییەتی خود پەیوەندی بە قۆناغەی گەشەی منداڵەوە هەیە کە تیایدا منداڵان هەموو شتێک بە خودی خۆیانەوە دەبەستنەوە. هەر تاکێک پەیوەستە بە گرووپێکی مرۆیی، بە کولتوورێک و بە سیستمێکی جیاواز لە بەهاکان، بە جۆرێک لە کولتوورێکدا نوقمبووە کە ئاگای لێی نەماوە. لەم حاڵەتەدا، ئەو هەموو کۆمەڵگاو گرووپەکان بە کولتووری خۆی دەپێوێت. ئەو کولتوورەی کە بە واقعی و راستەقینەی دەبینێت. بەم شێوەیەیە کە ئەتنۆگرافەکانی وەک لوسیان لیڤی بروهل (L. Levy Bruhl) لە سەدەی نۆزدەیەم کە باسی لە کولتووره ئەفریقی یاخود ئەمازونییەکان کرد، زاراوەی زەینییەتی سەرەتایی بەکارهێنا. کاری موژدەدەرانی ئایینی مەسیحی کە بانگەشە دەکەن ئایینی واقعی فێرە خەڵکی ئەمریکا یاخود سوورپێستەکان دەکەن یاخود ئەوەی کە ئەمڕۆ هەندێک لە شارنشینەکان، وا سەیری لادێیەکان دەکەن کە کولتوورێکی بچووکتریان هەیە،

لەسەر هەمان رەوت بوو! بەو پێیە، نەتەوە تەوەری پشت ئەستووره بە نرخدانانی زێدەڕۆیانە سەبارەت بە هەندێک لە بەهاکان [ ٤٠/ ٩٨-٩٩].

**چەند رواڵەتێکی ئێتنۆسێنتەریزم [١٠٢/ ٤٧٨]**

| هەڵوێستە ناوگرووپییەکان | هەڵوێستە دەرەوەی گرووپییەکان |
| --- | --- |
| بینینی خۆ لە ریزی کەسانی بەرزتر | بینینی ئەوانی تر وەک کەسانی بچووکتر |
| بەجیهانیکردنی بەهاکانی خۆی | رەتکردنەوەی بەهاکانی ئەوانی تر |
| خۆ بە بەهێز زانین | ئەوانی تر بە لاواز زانین |
| بەشداریکردن لەگەڵ ئەندامەکانی گرووپ | بەشدارینەکردن لەگەڵ ئەوانی تر |
| گوێڕایەڵی کردنی کاربەدەستان | نەبوونی گوێڕایەڵی |
| مەیل بۆ پاراستنی ئەندامەتی لە گرووپدا | رەتکردنی ئەندامەتی |
| حەزکردن لە مردن لەپێناو گرووپدا | حەزکردن بە لەناوچوونی ئەوانی تر |

یەکێک لە هۆیەکانی بەردەوامی ئێتنۆسێنتەریزم ئەوەیە کە پێویستە کۆمەڵگا راستیی شێوەی رەفتارەکانی فێرە لاوەکان بکات و چەمکێک لە بەهایان بۆ بخاتەڕوو. لەو حاڵەتەدا ئەگەر شێوەی رەفتارەکانی ژیان لەم کۆمەڵگایەدا دروست بن، ناچار وادەردەکەوێت کە رێبازەکانی تر هەڵەبن. ئاراستە ئێتنۆسێنتەریزم لە زۆر لە حاڵەتەکاندا بوونەتە بنچینەی رەفتارە توندوتیژ ئامێزەکان، «سامنێر» لەو بڕوایەدایە کە تاکەکانی ناوگرووپ تایبەتمەندی لەو جۆرەیان هەیە:

١- پەیوەندیی تاکەکان بە شێوەیەکی گشتی پشت بە ئاشتەوایی و ئارامی دەبەستێت.

٢- هەموو تاکەکان روحییەتی هاوکاری و یارمەتیدانی ئەوانی تریان هەیە.

٣- هاوکاری هاوبەش لە نێوان تاکەکاندا هەیە.

لەبەرامبەر ئەمەدا «سامنێر» بڕوای بەجۆرە دژایەتییەک هەیە سەبارەت بەو کەسانەی کە حاڵەتی دەرەوەی گرووپیان هەیە. لەم بوارەدا ئەو باس لە دەمارگیرییە نەژادی و ناکۆکییەکانیان دەکات، کە لە هەموو بارێکدا لە ئاست گرووپەکاندا

سەرتاپاگیر نییە.

لە رووی زانستییەوە ئێتنۆسێنتەریزم بەرەو تەحریف دەچێت، لە هەندێک حاڵەتدا لەوانەیە بە دادوەریی تاک لایەنە و لە کۆتاییشدا هەڵەی گەورەی کۆتایی بێت. ئێتنۆسێنتەریزمی چینایەتی پروپاگەندە بۆ ئەو بەهایانەی پەیوەستن بە چینێکی تایبەتی کۆمەڵایەتییەوە (لە زۆربەی بارەکاندا چینی زاڵ) دەکات گرووپسێنتەریزمی هەروەها پیشەیی یان رۆشنبیرانە بەهایەکی جیهانی بە ئاراستەو بەرژەوەندییەکان گرووپێکی پیشەیی یاخود رۆشنبیری دەبەخشێت. ئەزموونی شەڕی ناوخۆییە چەندین ساڵە لە دەیەی ۱۹۹۰ لە ئەفغانستان، یوگسلافیای جاران و هەندێک ناوچەی تر دیمەنگەلێکی دەردناکی ئێتنۆسێنتەریزم لە گۆڕەپانی سیاسیی جیهاندا نیشان دەدات.

بە سەرنجدان لەو گرنگییەی کە چەمکی میللەت (Ethnocity) بە درێژایی دەیەی ئەم دواییە لە ئاستی جیهانیدا وەریگرتووە (بە پێچەوانەی ئەوەی لە چەند دەیەی پێشتر تەسەور دەکرا) پسپۆرەکانی لە سێ ئاستی تاکەکەسی یاخود بچووک، گرووپی یاخود لاوەکی و کۆمەڵگایی یاخود گەورە لێی دەکۆڵنەوە.[۱۰۳ / ۱۸-۲۵].

**هاوبەندیی گرووپی**

لە باسی لە تایبەتمەندییەکانی گرووپە بچووکەکان، چەمکی «هاوبەندیی گرووپی» (Cohesion) لەو لایەنانە بوو کە بایەخی پێدەدرا. ئەم پەیڤە لە زانستی فیزیاوە وەرگیراوەو بە مانای هێزێک دێن کە کۆی مولولەکانی جەستەیەک رادەگرێت.

واتا خوازراوەکەی لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا بریتییە لە پەیوەندی یاخود هێزی بەیەکەوە بەستنی تاکەکان لەناو گرووپێکدا. لەلایەکەوە چەمکێکی بێ کاریگەرییەو لە توانای دایە هۆکارە تاکەکەسی و دەستەجەمعییەکان بگرێتەوە، و لەلایەکی ترەوە ئەم پەیڤە توانای پەسەندکردنی روانگە ئەزموونییەکانی هەیەو لەم رووەوە لەگەڵ بەکارهێنانی گشت ئەو چەمکانەی کە پەیوەندییان بەفیزیاوە هەیە وەک گوشار، پاڵەپەستۆ، و قەبارە دەتوانین سوودی لێ وەربگرین [۹۵/ ۲٤-۲٦].

لەگەڵ ئەوەی کە چەند پێناسەیەک بۆ هاوبەندیی گرووپی کراون لە هەندێک

باردا جیاوازە، لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەی ئەوانەی ئەو پێناسانەیان پێشکەش کردوون لەسەر ئەو خاڵە کۆکن کە مەبەست لە هاوبەندیی گرووپی تۆڕی ئەو پەیوەندییانەیە کە ئامانجیان پاراستنی پەیوەندیی ئەندامەکانی گرووپە بە مەبەستی ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئەو هێزانەی کە بەشبەشکەرن. لە هەمان کاتدا بۆچوونی هاوبەشەکان نێوان لێکۆڵەران لەسەر ئەم خاڵە، واتە ئەو شتەی کە هەندێ جار ناکۆکیی لەسەر هەیە، ئەوەیە کە هەندێک پشت بە لایەنەکانی ئەرکی کۆنترۆڵی گرووپ، نۆرمەگرووپییەکان و مەیل بۆ یەکێتی دەبەستن. هەندێکی تر زیاتر سەرنج دەدەنە هەست و سۆزە دەستە جەمعییەکان، و دروستبوونی هەستی هاوبەشی «ئێمە» لە نێوان ئەندامەکانی گرووپدا. هاوبەندیی گرووپی و ئەو ڕەفتارانەی لێیەوە سەرهەڵدەدەن لەژێر کاریگەری ئەو هۆکارانەدان کە گرنگترینیان بریتین لە:

١- هۆکارە کولتوورییەکان (خاڵە کولتوورییە هاوبەشەکان).

٢- ڕەهەندەکانی گرووپ (ژمارەی تاکەکان و تۆڕی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان).

٣- هۆکارە ئابوورییەکان (پێویستییەکانی مرۆڤ هۆکاری سەرەکین لە بەرقەرارکردنی پەیوەندییەکان لەگەڵ ئەوانی تردا).

٤- تەبایی گرووپ (کە کاریگەرییەکی بەرچاوی هەیە لەسەر پەیوەستەیی تاکەکان).

یەکێک لە مەسەلە گرنگەکان لە هەر گرووپێکدا پەیوەندیی نێوان تاکەکانیەتی، پێکگەیشتن تەنیا لە زمانی وتوێژو جۆرەها هۆکاری بیستن و بینین کە بۆ گواستنەوەی پەیامەکان سوودیان لێ وەردەگیرێت، کورت ناکرێتەوە. تەنانەت ئەگەر ئەو حاڵەتە گرنگیش بێت. پێکگەیشتن پەیوەندی بە ناسینی گرووپ و پەیوەندیی نێوان تاکەکانیشەوە هەیە. پێویستە هەموو گرووپێک بۆ ئەندامەکانی هۆکارگەلێک ئامادە بکات تاکو بتوانن زانیاریی لە نێوان خۆیاندا بگۆڕنەوە. دەزانین کە میتودی جۆراوجۆر بۆ ڕێکخستنی پرۆسەی پێگەیاندن هەن و بە زەروورەت هەموو ئەم شێوازانە کاریگەرییەکیان نییە لەسەر کاری گرووپی و پەیوەندی نێوان ئەندامەکانی. پێگەیاندن کاریگەری لە ڕادەی ڕازیبوونی تاک لە گرووپدا زیاد دەکات و توانای ئەوەی پێدەدات کە بە ئارامی ئەو شتەی کە دەیەوێت دەرببڕێت و پەرچەکردارەکەی لەوانی ترەوە ببینێت. بە سەنتەرکردنی گەیاندنەکان سەرنجی تاکەکان بۆ بابەتێکی دیاریکراو ڕادەکێشێت و حاڵەتی سەنتەری بە هەوڵە گرووپییەکان دەبەخشێت و بەر بە پەراگەندەبوونیان دەگرێت [٢٠٢/ ١٤٤].

یەکێتی و گونجانی گرووپێک بە رادەیەکی زۆر پەیوەستە بە فراوانی، جۆراوجۆری، و چۆنایەتی سۆزاویبوونی پەیوەندییە رووبەڕووەکانی نێوان ئەندامەکانی. تا رادەیەک سروشتییە کە خێزانێک، گرووپێکی لاوان، کۆمەڵەیەکی قوتابییان، یاخود گرووپێکی ئایینی یەکێتی و تەباییەکی زۆری هەبێت، چۆنکە چەندین بایەخپێدان و ئارەزووی هاوبەش بە یەکتریان دەبەستنەوە. ئەوان لەگەڵ یەکتر پەیوەندیی کۆمەڵایەتی جۆراوجۆریان هەیەو چۆنایەتی سۆزاوی پەیوەندییە رووبەڕووەکانیان دەکەونە ئاستێکی بالاتر لە وەفاداری و تامەزرۆیی پەرۆشی. لە کۆمەڵگا تەقلیدییەکاندا پەیوەندی رووبەڕووانەی تاکەکان گەشەیان سەندووە، بەبێ ئەوەی بۆ ئەم کارە بەرنامەڕێژییەکی تایبەتی کرابێت. هۆیەکە ئەوەیە کە تاکەکان لە چوارچێوەی پەیوەندییە خێزانی یاخود ئێتنییەکاندا کە هەموو ئەزموونە کۆمەڵایەتییەکانیان دەگرنەوە، دێنە دنیاوە. بەڵام لە پەیوەندییە پسپۆری و گرێبەستییەکانی جیهانی نوێداو یەکێتی نێوان تاکەکان زیاتر لە ڕێگای هەوڵە هۆشیارەکانەوە دەپارێزرێت.

بە شێوەیەکی گشتی وا دێتە بەرچاو کە یەکێتیی سۆزاوی و ئەخلاقی لەناو چالاکییە گرووپییەکاندا ئەوەندە بەهێزبێت کە:

١- تاکەکان هەست بکەن پاراستنی گرووپ گرنگە بۆ خۆشگوزەرانیان.

٢- هەموو کەسێک وا هەست بکات لە گەیشتن بە ئامانجەکان لەگەڵ ئەوانی تر بەشدارە.

٣- پەیوەندیی نێوان تاکەکان ئەوەندە دڵسۆزانەو تاکەکەسی بێت کە وشەی دۆستانەو هاندەرانە لە نێوان تاکەکاندا ئاڵوگۆڕ بکرێن.

٤- گەیشتن بە ئامانجەکانی گرووپ هێندە بە ئاسانی مومکین نەبێت و بە کردەوە پێویستی بە هەوڵە بەشداری ئامێزەکانی تاکەکان بێت.

٥- ئارەزووی هاوبەشی تاکەکان لە ڕێگەی پەیوەندی هەبوون بە شێوەیەکی تایبەتی مۆسیقا، ریتواڵ و سرووت، ناوە تایبەتییەکان، ناونیشانەکان، ئاماژەکان، دروشم و نیشانەکانی حاڵەتی سیمبولی بەخۆیانەوە بگرن.

٦- تاکەکان بەهۆی ئاگاداری لە نەریتی لەخۆبایی ئامێزانەی سەرکەوتنە گرووپییەکان ئاگاداربن لە گرنگی و باشتری گرووپی خۆیان.

ئەم هۆکارانە بە شێوەیەکی سروشتی لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکان و هەروەها لەو گرووپانەدا کە بە درێژایی مێژوو پەرەیان سەندووە هەن، بەڵام لەو ڕێکخراوانەدا کە

رادەی دەستکردیبوونیان زیاترە، سەرکردەکان لە بیری ئەوەدان کە چۆن دەکرێ پەرە بە رادەی وەفاداری لە ناخی ئەندامەکانی گرووپدا بدەن.

### دینامیکییەتی گرووپ

«کرت لوین» ئەو کەسەیە کە چەمکی دینامیکییەتی گرووپ «Group Dynam-ics»ی هێناوەتە ئاراوە. ئەم زاراوەیە بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٩٤٤ لە یەکێک لە وتارەکانیدا لە بارەی پەیوەندی نێوان تیۆرو پراکتیک لە سۆسیۆسایکۆلۆجیدا دەرکەوت. دینامیکییەتی گرووپ بەواتا فراوانەکەی کۆی ئەو رەگەزو پرسانەیە کە لە ژیانی گرووپەکاندا، و بە تایبەتی گرووپە «رووبەرووەکان» (Face to Face)دا باسیان لێوە دەکرێت، واتە ئەو تاکانەی کە پەیوەندیگەلێکیان لە جۆری وابەستەیی یاخود پەیوەندییە رووبەڕوو کۆمەڵایەتییەکاندا، بەلای کەمەوە بە شێوەیەکی مەعنەوی هەنە [ ٩٥/ ١٣]. لەم بارەدا، جگە لە رەهەندەکانی گرووپ، یاخود بوونی پەیوەندییە رووبەڕووەکان، دەتوانین چەند بوارێکی سەرەکی پەیوەندی بە رێکخستنی کۆمەڵایەتی، پەیوەندی بە نۆرمە پەسەندکراوەکان، یاخود بە ئامانجە دەستەجەمعییەکانەوە دیاربکەین.

ماوەیەکی زۆر پسپۆران لە هەوڵی ئەوەدابوون کە بسەلمێنن گرووپ بوونێکی واقعی هەیەو تەنیا کۆمەڵە تاکێک نییە. بەو پێیە سەرنجدان لە هۆکارە تایبەتییەکان کە کاریگەرن لەسەر ئەرکی گرووپەکان دیاردەیەکی نوێیە. هۆکارێک کە زەرورەتی لێکۆڵینەوە لە گرووپەکانی زیاد لە جاران خستۆتەڕوو. داواکاری زۆربەی رێکخراوەکانە بە مەبەستی چارەکردنی مەسەلەکانیان. رێکخراوە حکوومی و تایبەتییەکان کە حەزدەکەن کارمەندەکانیان کاراتر بکەن تاکو باشتر پێویستییەکانی خەڵک جێبەجێ بکەن. هێزە عەسکەرییەکان بە مەبەستی گەیشتن بەو جۆرە رێکخراوە کە بتوانێت زیاترین رادەی سوود لە هێزی مرۆیی وەرگرێت بە بەردەوامی سەرلەنوێ لە رێبازی خۆیان دەڕواننەوە. کارگەکانی بەرهەمهێنان بەردەوام بەدوای ئەو زانیارییانەدان کە بە لەبەرچاوگرتنیان بتوانن گوژمەکانیان کەم بکەنەوەو زۆرترین رادەی کارایی بەدەست بهێنن.

توێژینەوەکانی «کرت لوین» دەتوانێت بەڵگەیەکی دیاربێت لە بەکارهێنانی دینامیکییەتی گرووپ لە سیاسەتی راپەڕاندندا. ئامانجی ئەم لێکۆڵەرە ئەوە بوو کە بزانێت بە چ شێوەیەک خەڵک هانبدات بۆ پەسەندکردنی ئەو شتانەی کە پەسەندیان

ناکەن. لەوکاتەی کە لە ئەمریکا گۆشت کەم بوو (دەیەی سییەکانی ئەم سەدەیە) حکوومەت بۆ قەرەبووکردنەوەی کەمی گۆشت، گۆشتێکی تایبەتی خستەڕوو، بەڵام خەڵکی لەبەر ئەوەی ئاشنا نەبوون پێی، وادیاربوو کە نەدەخورا، و لە ئەنجامدا ئامادە نەبوون بیخۆن. لەم هەلومەرجەدا «لوین» دەستی کرد بە ئەزموونی سەرنج راکێش کە لەو کاتەوە تاکو ئێستا زۆر لە پسپۆران پشتیان پێ بەستووە. لە سەرەتای کارەکەیدا هەوڵیدا بە پێشکەشکردنی سیمینارو نووسینی وتارە جیاوازەکان ژنەکانی ماڵەوە هانبدات کە بۆ ئامادەکردنی خواردن سوود لە گۆشتی نوێ وەرگرن. بەڵام تۆژینەوەکانی دەریانخست کە ئەو دوو ڕێوشوێنەی ئەو بەکاری هێناون (سیمینارو نووسین) نەیانتوانیوە کار لە بیروڕاو هەست و سۆزی موخاتەبەکانی بکەن و ناچاریان بکەن بۆ سوود وەرگرتن لە گۆشتی نوێ. لەم کاتەدا «لوین» میتودێکی تری هەڵبژارد و پرۆگرامێکی ڕێکخست کە داوا لە کابانووەکان بکات پێکەوە لەناو گرووپدا لە بابەتەکە بکۆڵنەوەو لەبارەی بەکارهێنانی گۆشتی نوێ و سوودو زیانەکانی گفتوگۆ بکەن. بە ئەنجامدانی ئەم کارە، بەو ئەنجامە گەیشت کە زۆربەی ئەو کەسانەی لە دانیشتنەکاندا بەشدارییان کردبوو گۆشتی نوێیان بەکارهێنابوو لە ڕاستیدا گەیشتبوونە ئەو بڕوایەی کە شایانی سوود لێ وەرگرتنە. کاتێک تاکەکان لەیەکتر خڕدەبوونەوەو لەبارەی بابەتەکە دەدوان سەرنجیان لەم حاڵە دەدا کە ئەوانی تریش حەز دەکەن سوود لە گۆشتی نوێ وەرگرن [١٠٤/ ١٨٥-١٨٦].

کاتێک گرووپ وەکو ناوەندێکی پەیوەندییە ڕووبەڕووە کۆمەڵایەتییەکان لە ئارادابێت دەتوانێت بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ پشت بە ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی ببەستێت یاخود هۆیەکی پەیوەندی بێت بە مەبەستی هێنانەدی ئامانجێک یاخود پرۆگرامێکی تایبەتی. لە حاڵەتی یەکەمدا پێویستە ئەو گرووپە بە ڕێکخستوو (منظم) بزانین و لە حاڵەتی دووەمدا خۆبەخۆ (تلقائی). ئەو ڕێسایانەی کە بە شێوەیەکی دیار یاخود نادیار لەلایەن تاکەکانی گرووپێکەوە جێ بەجێ دەکرێن، لەوانەیە لەپێش دروستبوونی گرووپدا بوونیان هەبێت یاخود بە تەریبی لەگەڵ دروستبوونی ژیانی گرووپی لە ڕێی تاکەکانییەوە بە قۆناغی جێ بەجێ کردن بگەن. بۆیە بەپێی حاڵەتەکەی بە گرووپی ڕەسمی یاخود نارەسمی ناودەنێین.

گرووپ دەشێ لەلایەن تاکەکانەوە وەکو ئامانجێک یاخود ئامرازێک سەیر بکرێت. کاتێک کە گرووپ کۆمەڵێکی پێکەوە بەستراو پێکدەهێنێت، ئەندامەکانی

له پەیوەندییان بە گرووپەوە حاڵەتێکی گونجاویان هەیە، و هۆکارە سۆزاوییەکان کاریگەرییان لەسەر پەیوەندییەکانیان هەیەو ئەو کاتەی باس لە مەسەلەی ئەنجامی کردەیی دەکرێت یاخود پێویست دەکات کە بڕیارێک وەربگرێت، ئەندامەکان دێنە ناو کایەی بڕیاردان و گرووپ لایەنێکی کردەیی بەخۆیەوە دەگرێت، کە دەتوانین لەم حاڵەتەدا بە گرووپی کار ناوی بنێین. بەڵام پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە ئەم رووخسارانەی جیاوازیش هێندە بنەبڕنین. بۆ نموونە گرووپێکی کار کە حاڵەتێکی دامەزراوی و رێکخراوی وەرگرتووە، لەهەمان کاتدا دەتوانێت ناوەندێک بێت بۆ بەرقەرارکردنی پەیوەندییە نارەسمییەکانی نێوان تاکەکان. تەنانەت لە هەندێک حاڵەتدا لەوانەیە گرووپێکی بە رێکەوت بتوانێت بە شێوەیەکی تەواو بنەبڕ رێکبخرێت، پەیوەندی تاکەکان تیایدا زۆر نزیک بن و ئەندامەکانی بەدوای ئامانجەکانی وەک دەسەڵات یاخود سەرکەوتندا بگەڕێن[ ٩٥/ ٤١ ].

لەوانەیە گرووپ بکەوێتە ژێر دەسەڵاتی کەسێک یاخود دووکەس یاخود پشت ئەستوور بێت بە بەشداری هەموو تاکەکان. رەنگە سەرکردایەتی دیموکراتی یاخود دەسەڵاتخواز هەروەها سەقامگیر یاخود ناسەقامگیر بێت. لەوانەیە گرووپ هۆکاری سوودمەندی و چالاکی یاخود لەکارخەرەوەی بێت، کەش و هەوای گرووپ دەشێ زۆر ئارام و دۆستانە یاخود پەشۆکاوو پڕ لە دوژمنایەتی بێت. لەوانەیە گرووپ شوێنێک بێت بۆ خستنەڕووی روانگە نوێیەکان سەبارەت بە مەسەلەکان یاخود چالاکییەکانی پشت ئەستووربن بە شێوازە کۆن و نەریتییەکان، کە هەڵبەت ئەم نموونانەو هەندێک جۆری تر بە زۆری بینراون. پرسیارێک کە لێرەدا دەکرێت ئەوەیە کە چ هۆکارێک حاڵەتەکانی ژیانی گرووپی دێنێتە ئاراوەو بە چ شێوەیەک دەتوانین ئەم هۆکارانە کۆنترۆڵ بکەین.

### رەفتاری گرووپی

دەزانین بەشێوەیەکی گشتی هەرگرووپێکی کۆمەڵایەتی جۆرە رەفتارێکی کۆمەڵایەتی هەیە، گرنگترین شێوەی چالاکییەکان و رەفتارە گرووپییەکان بریتین لە:

١- هاوکاری، و مەبەست لێی یەکخستنی هەوڵی تاکەکانە بۆ ئامانجێک یاخود ئامانجگەلێکی هاوبەش.

٢- وەکیەکبوون، کە ماناکەی وەرگرتنی ئەخلاق و رەفتارو دابونەریتێکی

تایبەتییە.
٣- رکابەری ،کە مەبەست گەیشتنە بە ئامانجێک کە ئەوانی تریش بایەخی پێدەدەن.
٤- کێشمەکێش، کە تیایدا دژایەتیی توند لەگەڵ ئەوانی تر دەبینرێت.

بێگومانە ناتوانین هەموو رەفتارەکان بەپێی ئەم پۆلینەی سەرەوە لەیەکتر جیابکەینەوە، چونکە گرووپەکان دەتوانن خاوەنی پێکهاتەیەک بن لە رەفتارە جۆراوجۆرەکان کە بە تەواوی لەیەکتر جیاناکرێنەوە [ ٥٢/ ٦٠ ].

چۆنایەتی پەیوەندییە گرووپییەکان لە کۆمەڵگا پیشەسازییەکاندا رەوشێکی تەواو جیاواز لەوەی لە کۆمەڵگا لادێیەکاندا هەیە. لە کۆمەڵگایەکدا کە پیشەسازی پێشکەوتووەو جۆراوجۆریی پیشەیی هەیە، دابەشکردنی کار زیاد دەکات پسپۆریی دێنێتە کایەوە.

ئەم پسپۆرییە بەدوای خۆیدا جۆراوجۆری هزرو بیر دێنێتە ئاراوە، و ناهاوشێوەیی هزری تا رادەیەک دەبێتە هۆی سەربەخۆیی هزری. بەم شێوەیە بە گشتی بوار بۆ سەرهەڵدانی هزرە تاکەکەسییەکان و لە کۆتایشدا تاکرەوی زیاتر گونجاو دەبێت.

جێگەی سەرسوڕمان نییە کە لەو بارەدا رادەی گەرم و گوڕی و دڵسۆزیی نێوان تاکەکان کەمبێتەوە. لەو ناوچانەدا کە تەکنەلۆجیا تا رادەیەکی باش پێشکەوتووە جۆرە هەستێکی تاکایەتی و دوورەپەرێزی زاڵە بەسەر کۆمەڵگادا.

لێکۆڵینەوەکانی «ئەمیل دورکهایم» لە بواری خۆکوژی لە فەرەنسادا دەریانخست کە لە کۆمەڵگا پیشەسازییەکاندا خۆکوژی زیاترە وەک لە کۆمەڵگا کشتوکاڵییەکان و رادەکەی لە نێوان زگورتی «رەبەن»یەکاندا زیاترە وەک لە نێو خواناسەکاندا. پانتایی پەیوەندییە گرووپییەکان پەیوەندیی بە خۆکوژییەوە هەیە. لە شارەکان و ناوچە پیشەسازییەکاندا هەستی تاکایەتی و دوورەپەرێزی، جیاوازی بیروباوەڕو دژایەتی لەگەڵ ئەوانی تر کێشەی دیکەی لێدەکەوێتەوە، و زیادبوونی خۆکوژی لەم ناوچانەدا پەیوەندی بەم هۆکارانەوە هەیە. لە کۆمەڵگا لادێیەکاندا لەبەر سنووردارییی بواری چالاکییە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان ژمارەی کارەکان لە لادێکان کەمترەو بێگومان جۆراوجۆریی پسپۆریی لە ئارادا نییەو بواری هزری تاکەکان لە فەزایەکی سنووردارتردا دەخولێتەوە. ئەم شتە دەبێتە هۆی دروستبوونی لێکچوونی هزرو بیر لە نێوان خەڵکداو ئەم لێکچوونە سەرهەڵدانی جیاوازی

بیروڕاکان کەمتر دەکاتەوە. لە ئەنجامی ئەم بارودۆخ و تێکەوتنی هۆکارەکانی تر گەرم و گوڕی و دڵسۆزیی تاکەکان زیاترەو بۆیە دانیشتوانی گوندێک بە چاوپۆشی لە کۆمەڵێک جیاوازی ئێتنیکی یاخود ئابووری چاوەڕوانکراو هەستی دڵسۆزی و یەکرەنگی زیاتر دەکەن. لادێنشینەکان بە گشتی ئەندامن لە گرووپە سەرەتاییەکاندا گومانی تێدانییە هۆکارەکانی تری وەک تایبەتمەندییە کولتوورییەکان، داب و نەریت، پێشینە مێژووییەکان، توانا کۆمەڵایەتییەکان و لە کۆتاییدا بارودۆخە ئابوورییەکانیش بەشدارن.

ڕەفتارە گرووپییەکان لە چوارچێوەی شێوازە کولتوورییەکانی هەر کۆمەڵگایەکدا دێنە ئاراوەو شێوەیان دەگۆڕێت، و کولتووری هەر کۆمەڵگایەک ڕەفتارە گرووپییەکان لە سنوورگەلێکدا سنووردار دەکات، و ڕێگە بە ئەندامان دەدات کە لە ژێر کاریگەری بارودۆخی گشتی کۆمەڵگاو پێکهاتەی گرووپیدا ڕەفتاری تایبەتی بنوێنن. ڕەفتاری بە کۆمەڵ ئەو جۆرە ڕەفتارە کۆمەڵایەتییانەی مرۆڤ دەگرێتەوە کە لەبەر کاریگەری دیاردە یاخود پاڵنەری تایبەتی لە گرووپەکاندا دروست دەبێت. لەوانەیە ئەم ڕەفتارە بگوازرێتەوە بۆ ئەوانی تریش. لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا کارە گرووپییەکان هێندە جۆراوجۆرنین و هاوکارییەکان بە گشتی خۆبەخۆ و بە شێوەیەکی نا ئیرادیانە شێوە وەردەگرن. لە کۆمەڵگای پیشەسازیدا هەرچەندە کە هاوکارییەکان بەرژەوەندیخوازانەو ئیرادین، بەڵام هۆشیارانەن.

## سۆسیۆمەتری

سۆسیۆمەتری (Sociometry) بەدوای دوو ئامانجی جیاواز دا دەگەڕێت. لەلایەکەوە ئامانجی پێوانی پەیوەندیی تاکەکانە لەناو گرووپێکدا (کە پێکهاتەی پەیوەندییە تاکەکەسییەکانی دێنێتە ئاراوە)، و لەلایەکی ترەوە ئامانجەکەی دەستکردنە بە تاقیکردنەوەو دروستکردنی گۆڕان لەناو گرووپدا.

سۆسیۆمەتری بە لێکۆڵینەوەکانی دەروونپزیشک و کۆمەڵناسی ئەمریکی، واتە «مۆرێنۆ» (J. Moreno) کە سەرەتا قوتابیی فرۆید بوو، هاتەکایەوە. ئامانجی «مۆرێنۆ» لە داهێنانی ئەم میتۆدە دەرخستنی پەیوەندییەکانی وەکو یەکێتی، هاوکاری، کێشمەکێش، ڕکابەری، دژایەتی و دیاردە پێکچووەکان لە گرووپدا بوو. ئەو تاکەکانی ناو گرووپەکانی بە شێوەی «ئەتۆمە کۆمەڵایەتییەکان» لەبەرچاو

دەگرتن و لەو بڕوایەدا بوو کە لە نێوان ئەو کەسانەی کە دەکەونە ناو گرووپێکی تایبەتییەوە ئەو پەیوەندییانەی لە رووی رێکەوتن یاخود دژایەتی و شێوەکانی تر هەیە کە دەتوانین بە میتۆدەکانی سۆسیۆمەتری لەم پەیوەندییانە بکۆڵینەوە.

لە سۆسیۆمەتردا مەسەلەی هەڵبژاردن لە نێوان تاکەکانی گرووپەکان و شێوەی پەیوەندییەکانیان گرنگییەکی تایبەتی هەیە. بۆ نموونە کاتێک داوا لە کرێکارانی رێکخراوێک بکەین و بڵێین: حەز دەکەن لەگەڵ چ کەسانێک لە ژوورێکدا کار بکەن، حەز لە چ کەسانێک دەکەن، و... لە پاش خستنەڕووی ئەم پرسانە دەتوانین پەیوەندی تاکەکان لەم گرووپانەدا بە شێوەی هێڵکاری وێنە بکێشین و دیاربکەین کە ئەندامەکانی گرووپ لە رووی خۆشویستن یاخود بێزارییەوە چ رەوشێکیان هەیە، سەرکردایەتی لە نێوان ئەندامەکانی ئەم گرووپەدا بە چ شێوەیەکە، سەرکردەکان کامانەن و چ کەسانێک. [ ١٠٥/٢١٣-٢١٧ ].

بە کردەوە ئەزموونەکانی سۆسیۆمەتری لە تاقیکردنەوە جیاناکرێنەوە. لە ئەزموونی هەڵبژاردنی تاکەکەسیدا داوا لە ئەندامەکانی گرووپێکی تایبەتی (قوتابخانە، کارگە، یەکەی سەربازی و...) دەکرێت کە بەپێی ڕێزکردنی باشتری ئەو تاکانە دەستنیشان بکەن کە حەزدەکەن بەشدارییان لەگەڵ بکەن بۆ ئەنجامدانی چالاکییەکی دیاریکراو (کار، یاری، پێکەوە ژیان و...). بەم شێوەیە حاڵەتی وەک هەڵبژاردنە رووبەڕوو یاخود یەک لایەنییەکان، رەتکردنەوە، و خۆ دوورگرتن لە هەڵبژاردن دەردەکەون و دەتوانین پەیوەندییە رووبەڕووەکان لەسەر «سۆسیۆگرافی» نیشان بدەین. هەروەها دەتوانین ئەم تاقیکردنەوەیە بۆ دەستنیشانکردنی سەرۆکی گرووپێک، دیارکردنی پێگەی کۆمەڵایەتی تاکەکان، یاخود بوارەکانی تر بەکاربهێنین. لە وڵاتە پیشەسازییەکاندا بەکارهێنانی میتۆدەکانی سۆسیۆمەتری لە: پیشەسازی، سوپا، بازرگانی و کاسبی، و پەروەردەو فێرکردن زیاد بەکاردەهێنرێن [ ٤٠/ ١٦٨-١٦٩].

ئەنجامەکانی توێژینەوەی گرووپ بە یارمەتی هەندێک نیشانەی گرێبەستەیی بە شێوەی هێڵکاری دەردەکەون. بۆ نموونە هەڵبژاردنی تاکەکان لەلایەن یەکترەوە لەناو گرووپێکدا دەتوانین بە شێوەی هێڵکاری بەرجەستە بکەین. ئەندامەکانی گرووپ بە ژمارە لەناو بازنەکاندا دەستنیشان کراون و پەیوەندییەکانیان (بەرامبەر یاخود یەک لایەنە) بە شێوەی (          ) پیشان دراون [٤٣/ ٤٢٢-٤٢٣].

**سۆسیۆگرافێکی گریمانەیی**

سۆسیۆگرافەکە پیشان دەدات کە تاکی ژمارە (١) لە گرووپدا سەرکردەیە، چونکە زیاتر لەوانی تر هەڵبژێردراوە. بەهەمان شێوە کەسی ژمارە (٦) سەرکردەی دووەمە لە گرووپدا، کەسی ژمارە (٢) شوێنگەیەکی تایبەتی هەیە، چونکە لە رێی سەرکردەوە (کەسی ژمارە١) هەڵبژێردراوە، بەڵام تەنیا لە رێی ئەوەوە پەیام و زانیارییەکان دەتوانن لە گرووپدا بسوڕێنەوەو بگەن بەسەرکردە بەبێ ئەوەی کەسی ژمارە (٢) لێیان ئاگاداربێت، بۆ خۆیان پەیوەندییەکی دوو نەفەری تایبەتییان پێکهێناوە. کەسەکانی ژمارە «١٠، ١١، ١٢، ١٣» گرووپێکی لاوەکی تایبەتییان بەخۆوە هەیە. کەسی ژمارە (١٦) حاڵەتێکی تەواو تاکانەی هەیە.

رێکخستنی هەڵبژاردنیش لەناو گرووپدا گرنگییەکی زۆری هەیە. هەڵبژاردنی یەکەم گرنگییەکەی وەکو هەڵبژاردنی کۆتایی نییە. بەم شێوەیە هەڵبژاردن لەلایەن سەرکردەوە لەگەڵ هەڵبژاردن لەلایەن کەسێکی گۆشەگیرەوە بەراورد ناکرێت [٤٣ /٤٢٢-٤٢٣].

**سۆسیۆگرافی پەیوندی هەندێک لەسەرکردە سیاسییەکان بە ماوەی دوو هەفتە لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکاندا (١٩٦٠) [١٨].**

ئەو سۆسیۆگرافەی کە لەم بەشەدا دەبینرێت لەسەر بنچینەی چاوپێکەوتنی سەرانی وڵاتەکان لە کاتی بەستنی دانیشتنە هاوبەشەکانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان و ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی لە شوێنەکانی دانیشتن (هوتێلەکان)و نووسینگەی نوێنەرایەتییەکانیان وێنە کراوە. ئەم سۆسیۆگرافە ڕۆژنامەی ئەمریکی «نیویورک تایمز» لە ٢ی ئوکتوبەری ١٩٦٠ بڵاوی کردەوە [١٨/ ١٠٢-١١٨].

بەکارهێنانێکی تر کە «مورێنۆ» لە سۆسیۆمەتری لەبەرچاوی گرتبوو «نمایشی دەروونی» (Psychodrama) یاخود «نمایشی کۆمەڵایەتی» (Sociodrama) بوو. سەرەتا هزری ورووژاندنی گرووپ و گۆڕینی، لەلایەن «مورێنۆ»و قوتابییەکانی بەکارهێنانێکی جیاوازی هەیە. بە بڕوای ئەو ئەم میتۆدە وادەکات کە

دژایەتییەکانی خێزانی، گرفتەکانی خوێندن، کێشەی کارگەکان و تەنانەت ئەو گرفتانەی لە دژایەتییە چینایەتییەکانەوە سەرهەڵدەدەن چارەسەر بکرێن. ئەو هۆکارە چارەسەرییانەی کە سۆسیۆمەتری پێشنیاریان دەکات «نمایشی دەروونی» و «نمایشی کۆمەڵایەتی»یە. بەم شێوەیە لە هەندێک حاڵەتدا سوود لە ژوورە تایبەتییەکان وەردەگیرێت کە تەنیا لە دەرەوەڕا دەتوانن ناوەوەیان ببینن و لە توانای بینەراندا دەبێت کە پەیوەندی رووبەڕووانەی تاکەکان ببینن. لەم حاڵەتانەدا بێگومان چەند گرفتێک هەیە کە پێویستە چارە بکرێن. لەلایەکەوە گرووپەکان کەوتوونەتە ژێر کاریگەری ئەو رێکخراوەی پێیان بەخشرایەو لەلایەکی ترەوە کاریگەرن بە پێشینەی کولتووریی ئەندامەکانییان.

لە «نمایشی دەروونی» دا جێبەجێکردنی رواڵەتەکانی ژیانی دەروونی ئەو توانایە بە تاک دەبەخشێت کە حەزە تایبەتییەکانی خۆی دەربخات و ئەمەش لەبەر رۆڵ بینی هەلومەرجی تاکەکەسییە. داوا لە تاک دەکرێت کە لە ئەرکێکی خەیاڵیدا رۆڵی واقعی خۆی لە بەرامبەر بینەردا بگێرێت، نمایشی کۆمەڵایەتی کە لە شێوەی کاردا ساز دەکرێت، بە بۆچوونی «مورێنۆ» دەتوانێت جۆرە کۆمەڵایەتییە جیاوازەکان وەک بەڕێوەبەران، کارمەندان و کڕیاران یاخود راوێژکاران بگرێتەخۆو وێنەیەکی واقعی لە پێکهاتەی کۆمەڵایەتی ئەو دژایەتییانەی لێیەوە سەرهەڵدەدەن بداتە دەست. مەبەست لەم هۆشیارکردنەوە بە کۆمەڵە چارەکردنی گرێ کۆمەڵایەتییەکانە.

### کورتەی بەش

١- تاکەکان لەبەر ئەوەی لە کۆمەڵگادا دەژین لەژێر کاریگەریی نۆرمە گرووپییەکاندان.

٢- سەرنجدان لە دیاردەی گرووپ بە درێژایی مێژووی بیرکردنەوە مرۆییەکان رابردوویەکی دوور درێژی هەیە، بەڵام لێکۆڵینەوە لە رەفتارە گرووپییەکان بەشێوەیەکی ئەزموون لە سەرەتای سەدەی بیستەم دەستی پێکردووە.

٣- «سرۆکین» ئەو هۆکارانە دیاریدەکات کە کاردەکەنە سەر تاک بۆ بە ئەندامبوون لە گرووپێکدا.

٤- گرووپی کۆمەڵایەتی بریتییە لە کۆمەڵە تاکەکەسێک کە پەیوەندییان لە نێواندا هەبێت، و هێزێک بەیەکتریان ببەستێتەوە.

٥- دەتوانین گرووپە کۆمەڵایەتییەکان لەلایەنی ئامانج، پێکهاتەی گرووپی،

بارودۆخی دەروونی، رەفتارە گرووپییەکان، گەڕان و بەشداریکردنەوە لێیان بکۆڵینەوە.

٦- گرنگترین پێوەرەکانی پۆلێن کردنی چینە کۆمەڵایەتییەکان بریتین لە: رەهەندەکانی گرووپ، ئیمکانی ئەندامبوون لە گرووپ، پلەی رێکخستن، ئەرک، و رادەی دڵسۆزی.

٧- گرووپە سەرەتاییەکان خاوەنی چەند خەسڵەتێکی هاوبەشن وەک: وەفاداری، پەیوەندییە رووبەڕووەکان، هاوکاریی نزیکی نێوان تاکەکان، پەیوەندییە برادەرییەکان و کەمی ژمارەی تاکەکان.

٨- رەهەندەکانی گرووپ کاریگەرییەکی زۆریان لەسەر فرەیی و شێوەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان هەیە.

٩- یەکێک لە تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی گرووپە برادەرییەکان یەکسانیی تاکەکانە لە رووی تەمەن و ئەرکی کۆمەڵایەتییەوە.

١٠- گرووپە سەرەتاییەکان لەوانەیە رۆڵی نێوانگرییان لە ئەستۆدا بێت.

١١- لە گرووپەکانی وەک خێزان، هاوسێیەتی، گرووپی منداڵە هاوگەمەکان (گرووپە سەرەتاییەکان) مەعریفەی سەرەتایی مرۆڤ لە ژیانی مرۆییەوە شێوە وەردەگرێت.

١٢- لە گرووپە لاوەکییەکان پیوەندیی تاکەکان گرێبەندیین و کەمتر پشت بە هەست و سۆز دەبەستن.

١٣- لە هەموو بارەکاندا ناتوانین گرووپە لاوەکییەکان بە ئاسانی لە گرووپە سەرەتاییەکان جیابکەینەوە. سەرەڕای ئەوە گرووپە لاوەکییەکان لەوانەیە بەدیهێنەری چەند جۆرێکی گرووپ بن.

١٤- رەفتارە تاکەکەسییەکان لەوانەیە لەو نموونانە سەرهەڵدەن کە گرووپەکان بایەخیان پێدەدەن کە [ئەگەر] تاک ئەندامیش نەبێت، تیایاندا، بەڵام وەکو مەرجێک وایە بۆی.

١٥- گرنگی گرووپە ژێدەرەکان زیاتر لە رووی ئیلقاکردنی هوشیاری، ئاراستە، و رەفتارەکان بۆ تاکەکان سەردەکەوێت.

١٦- گرووپەکانی گوشار ئەو گرووپانەن کە رێکخراون و ئەندامەکانیان هەوڵدەدەن نفووزیان لەسەر هەموو رێکخراوەکانی تردا هەبێت و مەبەستیانە ئەو رێکخراوانە ناچاربکەن بۆ وەرگرتنی چەند کارسازییەک کە گونجاون لەگەڵ

حەزەکانیان.

١٧- ئامانجگەلێکی وەک بەرگریکردن لە مافەکانی مرۆڤ، ئەخلاق، ئایین، ئایدۆلۆجی دەتوانن پاساوی بوونی گرووپەکانی گوشاربن. ئەم گرووپانە جۆریان زۆرە.

١٨- گرووپەکانی گوشار لەوانەیە خاوەنی دوو ئامانجی «پاراستن» و «گەشەسەندن و بڵاوکردنەوە» بن.

١٩- چەکی سەرەکی گرووپەکانی گوشار «باوەڕپێهێنان»ە.

٢٠- گرووپە نهێنییەکان ئەرکگەلێکی شاراوەیان هەیەو بە زۆری لە پەراوێزی ڕێکخراوە ڕەسمییەکاندا چالاکی دەنوێنن.

٢١- کۆمەڵەکان لە جۆری گرووپە ڕێکخراوەکانن کە بە مەبەستی ئەنجامدانی ئامانجە تایبەتییەکان هاتوونەتە ئاراوە. پەیوەندی تاکەکان لەم گرووپانەدا کاتی و ڕەسمین.

٢٢- لە گردبوونەوەدا پەیوەندیی نیوان تاکەکان، سست، نابەردەوام، پەشۆکاو، و بە زۆری ڕێکنەخراون.

٢٣- گردبوونەوە چەند جۆرێکی هەیە، وەک: ڕێکەوتانە، گرێبەندی، ئامانجدار، هەنگاونەر.

٢٤- هاوبەندیی گرووپی کۆی ئەو هێزانە دەگرێتەوە کە پەیوەندی لە نێوان تاکەکاندا بەرقەرار دەکەن و دەکەونە ژێر کاریگەری هۆکارە کولتووری، ئابووری، ڕەهەندەکانی گرووپ و گونجانی گرووپی.

٢٥- ئەو تاکەی ئەندامە لە گرووپێکدا، سەبارەت بەو گرووپە حاڵەتی ناو گرووپی هەیە، و لە بەرامبەردا گرووپەکانی تر کە تاک تیایاندا ئەندام نییە، بۆ ئەو وەک دەرەوەی گرووپ وان.

٢٦- لە حاڵەتی ناوگرووپدا لەوانەیە جیاوازیی کولتووری لە نێوان ئەندامەکاندا هەبێت.

٢٧- زۆربەی گرووپەکان شێوەی ژیانی خۆیان (شێوازە نەتەوەییەکان) وەک نموونەیەک بۆ داوەری و هەڵسەنگاندنی هەموو گرووپەکانی تر لەقەڵەم دەدەن و ئەمە حاڵەتێکە کە بە نەتەوەتەوەری (گرووپ تەوەری) ناو دەنێن.

٢٨- ئێتنۆسێنتەریزم لە رووی ناوگرووپی و دەرەوەی گرووپیدا هەڵوێست گەلێکی تایبەتی هەیە.

٢٩- دینامیکییەتی گرووپی ئەو چەمکەیە کە دوورکەوتنەوەو پەیوەستەیی بەرامبەری پەیوەندییە دەروونی - کۆمەڵایەتییەکانی نێوان ئەندامەکانی گرووپ دەردەبڕن. تۆژینەوەی سیستماتیکی ئەو پەیوەندییانە بە دینامیکییەتی گرووپ ناو دەبەن.

٣٠- هاوکاری، وەکیەکبوون، ململانێ و کێشمەکێش لە گرنگترین شێوەکانی رەفتاری گرووپین.

٣١- چۆنایەتی و قووڵێ پەیوەندییە گرووپییەکان لە کۆمەڵگا تەقلیدی و پیشەسازییەکاندا جیاوازە.

٣٢- رەفتارە گرووپییەکان لە چوارچێوەی نموونە کولتوورییەکانی هەر کۆمەڵگایەکدا شێوە وەردەگرن و دەگۆڕێن.

٣٣- لە سۆسیۆمەتریدا پەیوەندیی بەرامبەری تاکەکان (هاوکاری، کێشمەکێش، ململانێ و دژایەتی) پێوانە دەکرێ.

٣٤- لە سۆسیۆمەتریدا تاکەکان وەکو ئەتۆمی کۆمەڵایەتین و پەیوەندیی نێوانیان دەکرێ لەسەر سۆسیۆگراف وێنە بکەین.

## چەمکی دامەزراوەی کۆمەڵایەتی

دامەزراوە(Institution) سیستمێک لەرێکخراو، بەها، شێوازە نەتەوەییەکان، دابونەریت و یاساکان دەگرێتەوە کە رۆڵەکەی جێگیرکردنی رەفتارە گونجاوەکانە بۆ راپەڕاندنی ئەرکە سەرەکییەکان لەکۆمەڵگایەکدا. ئەوەی کەگرنگە لە دامەزراوەیەکدا، رێکخستنی رەفتار یاخود شێوازەکانی ئەنجامدانی ئەو چالاکییانەیە کە لە پەیوەندیدا لەگەڵ پێویستییە گرنگەکان دەخرێنە ڕوو. پێکهاتە (بنیە)ی کۆمەڵایەتی یەکێکە لە لایەنە گرنگەکان لە تۆژینەوەی هەر دامەزراوەیەکی کۆمەڵایەتیدا و ئەم چەمکە سیستمی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، ئەرکە بەرامبەرەکان لە رۆڵە کۆمەڵایەتییەکاندا، و چاوەڕوانییەکان لە ئاستی کۆمەڵگادا و لە پەیوەندیدا بە پێویستییەکی دیاریکراوەوە دەگرێتە خۆی.

چەمکی دامەزراوەی کۆمەڵایەتی حاڵەتێکی ئەبستراکتی هەیە و جۆرە پرۆسەیەکە یاخود شێوەیەکی رێکخراوە کە لە یەکەم روانیندا لایەنی بابەتی نییە. بۆ نموونە خێزان دامەزراوەیەکە (وەک کۆمەڵەیەک بەها، پرۆسە، پەیوەندیی هاوبەش) کە نابینرێ، هەر چەندە دەزانین کەوا خێزانێکی دیاری کراو (گرووپێکی مرۆیی) دەتوانێت بوونی هەبێت. دامەزراوەکان بەهۆی رێکخستنی تاکەکان لە گرووپە کۆمەڵایەتییەکاندا خۆیان بەدەردەخەن. لەگەڵ ئەوەی کە گرووپە کۆمەڵایەتییەکان دەستیان هەیە لە دروستکردنی ئەو بەهایانەی کە پەیوەندییان بەدامەزراوەیەکی کۆمەڵایەتییەوە هەیە، بەڵام ئەو وێنەیەی کە دەیخەنەڕوو پیشان نادات.

### ئەرکی هەندێک لە دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان[٨/ ١٠]

| | |
|---|---|
| پەیوەستەیی یاخود جیاکردنەوەی نەوەکان | خێزان |
| دەرفەت یاخود بێبەشکردن | فێرکردن |
| یەکسانی یاخود چەوساندنەوە | ئابووری |
| دیموکراسی یاخود رێکخراوی گەورەی عەسکەری | سیاسەت |

رێکەوتنێکی رێژەیی لە نێوان کۆمەڵناساندا هەیە لەو خاڵەدا کە پێویستییە سەرەکییەکانی مرۆڤ لە چوارچێوەی دامەزراوەکاندا کامانەن، و لەسەر ئەم بنچینەیە دامەزراوە سەرەکییە کۆمەڵایەتییەکان بریتین لە: پەروەردەو فێرکردن، ئایین، خێزان، حکوومەت و ئابووری، و لەم نێوەشدا لەبەشەکانی دواتردا دامەزراوەی خێزان

بەشێوەیەکی سەرپێی دەخەینە بەرباس و لێکۆڵینەوە [٢١٢/٦٧].

لە بەرهەمەکانی «دورکایم»ی کۆمەڵناسی فەرەنسیدا دووبارە رووبەڕووی ئەم بابەتە دەبینەوە کە کۆمەڵناسی لەبنەڕەتدا زانستی دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکانە، بەڵام پێویستە سەرنجمان دابێت، کە چەمکی دامەزراوە لەلای دورکایم ئەو هۆکارەیە کە بابەتییەتی دیاردەی کۆمەڵایەتی لە بەرامبەر ئەنگێزە جیاوازە تاکەکەسییەکاندا زامن دەکات [٤٣٢/١٠٦].

هیچ دامەزراوەیەک لە بۆشاییدا لەدایک نابێت. لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا، خێزان (ولەوانەیە کلان-Clan-) بەزۆری تاکە دامەزراوەی کۆمەڵایەتییە کە بوونی هەیە. کار لە رێگەی خێزانەوە رێکدەخرێت، منداڵان بەهۆی ئەندامەکانی خێزانەوە وانەیان پێ دەوترێت، کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی لەرێگەی خێزانەوە پیادەدەکرێت و تەنانەت جەنگەکانیش بەزۆری رووخسارێکی خێزانیان هەیە. لەوانەیە لە کۆمەڵگایەکی سەرەتاییدا دامەزراوەیەکی تری کۆمەڵایەتی پێویست نەبێت. بە ئاڵۆزبوونی هەلومەرجە کولتوورییەکان، کۆمەڵگا گەشەدەسەنێت ئەو ئەرکانە سەرهەڵدەدەن کە چیتر مومکین نییە بەهۆی خێزانەوە ئەنجام بدرێن. بازرگانی کردن، لەگەڵ هۆزەکانی تر دەبێتە هۆی هاتنە ئارای بازرگانە پیشەییەکان، و ئەوان ئەم ئەرکە بەرەبەرە نەک بەشێوەی یەکێک لە ئەرکە بنچینەییەکانی خێزان، بەڵکو وەک «تاک» ئەنجام دەدەن. بە دابەشکردنی بەرەبەرەی کار، لێهاتوویە پیشەییەکان حاڵەتی پسپۆری وەردەگرن، و رێکخستن و کۆنترۆڵی زۆربەی چالاکییە پیشەییەکان لە توانای خێزان دەردەچن و دەگوازرێنەوە بۆ دوکان و فەرمانگە.... بەم شێوەیە هەموو دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان پەرەدەسەنن(٧/٢١١-٢١٥).

هەرکاتێک بمانەوێت پێناسەیەکی رێکوپێک لەمەڕ دامەزراوە بدەینە دەست، دەتوانین بڵێین دامەزراوە سیستمێکی رێکخراوە لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان کە هەندێک لە بەهاو پرۆسە هاوبەشەکان دەگرێتەوەو بۆ وەڵامدانەوەی هەندێک لەپێویستییە بنچینەییەکانی کۆمەڵگا هاتووتە ئاراوە. لەم پێناسەیەدا، بەها هاوبەشەکان بە بەشداریکردن لە هزرو ئامانجەکاندا لە پەیوەندیدایە. پرۆسە هاوبەشەکان، نموونە رەفتارییە ستانداردەکانن کە گرووپ بەدوایانەوەیە. سیستمی پەیوەندییەکانیش بریتییە لەتۆڕی ئەو رۆڵ و پێگانەی کە لە رێگەیانەوە رەفتار شێوە وەردەگرێت. بۆ نموونە خێزان خاوەنی کۆمەڵە بەهایەکی هاوبەشە (لەمەڕ خۆشەویستی و پەیوەندی، منداڵان، ژیانی خێزانی)، و خاوەنی کۆمەڵە پرۆسەیەکی

هاوبەشە( خوازبێنی، چاودێری کردنی منداڵان، چالاکییە هەنووکەییەکانی خێزان) و لەکۆتایشدا تۆڕێکە لەپێگەو ڕۆڵەکان(مێرد، ژن، منداڵ، گەنج، دەسگیران) کە سیستمی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان (کە لەڕێگەیەوە ژیانی خێزانی شێوە وەردەگرێت) پێک دەهێنن(٧/ ٢١١-٢١٥).

چەمکی دامەزراوە لە پەیوەندیدایە لەگەڵ دوو چەمکی تر واتە پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی. لەکاتێکدا کە مەبەست لە ڕێکخراوەکان، ئەو سیستمە کۆمەڵایەتییانەن پشتیان بە چەند ئامانجێکی پێناسەکراو بەستووە، و مەبەست لە پێکهاتە، سیستمێکی کۆمەڵایەتی گونجاوە کە پرۆسە کۆمەڵایەتییەکان لەسەر بنچینەکەی شێوە وەردەگرن، چەمکی دامەزراوە پەیوەستە بە شێوە یاخود هەلومەرجی ڕەفتار لە چەند حاڵەتێکی جۆراوجۆردا. بەدەستەواژەیەکی تر، دامەزراوە، هونەرو شێوازی ئەنجامدانی هەندێ شتە [٤٣٢/١٠٦]. دوو چەمکی دامەزراوەو کۆمەڵە(جمعیە) جیاوازن لە یەکترو لەهەمان کاتدا پەیوەستن بەیەکەوە، بەڵام دامەزراوە کۆمەڵە پەیوەندییەک و سیستمێکی ڕەفتارەکانە، و ئەمیش پێویستی بە بوونی تاکەکان هەیە.

هەرچەندە کە دامەزراوە لە نۆرم و پەیوەندییەکان پێکهاتووە، بەڵام ئەوانە تاکەکانن کە پەیوەندییەکان دروست دەکەن و بە نۆرماڵی کاردەکەن. خەڵکی خۆیان لە چوارچێوەی گرووپەکاندا ڕێکدەخەن و کۆمەڵەکان دەهێننە ئاراوە. کەواتە هەر دامەزراوەیەک چەند ڕێکخراوو کۆمەڵەیەکی لە دەوروبەری خۆی هەیە کە ڕەفتارە دامەزراوەییەکان ڕێنمایی دەکەن. مەبەستمان لە ڕەفتارە دامەزراوەییەکان پراکتیزەکردنی فۆرم و بەهاکانە. لە دامەزراوەی سیاسیدا دەتوانین بە دوای حزبە سیاسییەکان،سەندیکا پیشەییەکانی باجدەران، گرووپەکانی گوشار، یەکێتییە فەرمانبەری و کرێکارییەکان و ... دا بگەڕێین. چەمکەکانی دامەزراوە و کۆمەڵە و ڕێکخراو زۆر پەیوەستن بەیەکەوە، بەڵام نابێت تێکەڵ بەیەکتریان بکەین [٧/ ٢١١-٢١٥].

### ڕۆڵی تاکەکەسی و ڕەفتاری دامەزراوەیی

ڕۆڵی دامەزراوەیی کۆمەڵەیەکە لەچاوەڕوانییە ڕەفتارییەکان کە هەڵی هێندە بە دەرکەوتنی حەزومەیلە تاکەکەسییەکان نابەخشێت. بۆ نموونە هەموو دادوەرەکان لەو کاتەی کە لە دادگادان چەند ڕەفتارێکیان هەیە کە بەگشتی جیاوازن لەو ڕەفتارانەی

لە کاتەکانی تردا ئەنجامیان دەدەن. ئەرک و جیاوگی تاکەکان لەژێر نفووزی تەواوی ڕۆڵە دامەزراوییەکەیاندایە و هەروەها لەوانەیە لادان لەم ڕۆڵانە هەندێک کات مەترسیداربێت بۆ تاک. تەنانەت سەرۆک کۆمارو سیاسەتمەدارانیش کە وەکو دیار زۆر بەهێزن، لەراستیدا لە ئازادی کارەکانیاندا ڕووبەڕووی گەلێک سنوورداری (لەهەندێک حاڵەتدا زۆر توند) دەبنەوە. هەر کاتێک نەیانتوانی بەپێی ئەو چاوەڕوانیانەی کە لە ڕۆڵەکانیان دەکرێن کاربکەن ئەوا بەرادەیەکی زۆر نفووزی خۆیان لەدەست دەدەن [٢١٥/٧].

دەتوانین نموونەیەکی سەرنج ڕاکێش لە بەجێگیر مانەوەی ڕۆڵە دامەزراوەییەکانی وڵاتی ئینگلتەرا بدەینە دەست، لەپرۆسەی گواستنەوەی موڵکداری کانگاکانی ڕەژووی بەردی لە کەرتی تایبەتییەوە بۆ حکوومەت. لە قۆناغی موڵکداری تایبەتیدا، کرێکارەکانی کانگا لەژێر سەرپەرشتی بەڕێوەبەرێکدا بوون کە وەکو کرێکارێک لەلایەنی سەرمایەدارە خاوەندارەکانی کانگاوە لەوێ ئامادە بوو. بەڕێوەبەر لە ڕۆڵی خۆیدا بەدوای ئەوەوە بوو کە زۆرترین بەرهەم بەکەمترین گوژمەی مومکین بەدەست بهێنێت. کاتێک کانگاکان کەوتنە دەست حکوومەت هەندێک لەکرێکارانی کانگا لەو هزرەدا بوون کە ئەم گواستنەوەیە بەمانای کۆتایی هاتنی قۆناغی حکوومەتی یاساکان و بڕیارە ماندووکەرەکانە. لە هەلومەرجی نوێشدا بەڕێوەبەر بەهەمان شێوە بەردەوام بوو لە کارەکەیدا و خەریکی سەرپەرشتی کردن بوو لە کانگادا. لەگەڵ ئەوەی لەم قۆناغەدا وەکو فەرمانبەرێکی حکوومەت کاری دەکرد، بەڵام بەهەمان شێوە لەهەوڵی ئەوەدا بوو کە بتوانێت لە کانگای حکوومی (خۆماڵی) بوونیدا زیاترین ڕادەی ڕەژووی بەردین بەکەمترین گوژمەی مومکین بەدەست بهێنێت. وێڕای ئەوەی کە خاوەن و لە هەندێک کاتدا ستافی کانگاکان گۆڕابوون، بەڵام سیستمی ڕۆڵەکان کە لە وەڵامی پێویستییە دامەزراوییەکاندا گەشەی سەندبوو تارادەیەک بەهەمان شێوە مایەوە.

بێگومان ئەوە ڕاستە کە جیاوازییە تاکەکەسییەکان لەڕووی کەسایەتییەوە تارادەیەک کاریگەرن لەسەر ڕەفتاری دامەزراوەیی. لەوانەیە سەرکارێک مۆن و یەکی تر ڕووخۆش بێت، ڕەنگە مامۆستاییێک قوتابییان لە پۆلدا بخاتە حاڵ و جەزبە و ئەوی تر توانای ئەو کارەی نەبێت. بەڵام گۆڕەپانی ئەم گۆڕانکارییانە لە ئاستی تاکەکەسیدا سنووردارەو لە بنەڕەتدا دەکەوێتە ژێر کاریگەری زەروورەتەکانی ڕۆڵ. ئەو دژایەتییانەی کە لە دامەزراوەیەکدا دروست دەبن،هەندێک کات لە

گیروگرفتەکانی کەسایەتییەوە سەر هەڵدەدەن، بەڵام زۆربەی کاتەکان ئەم دژایەتییانە لە گیروگرفتی رۆڵە دامەزراوییەکانەوە سەرهەڵدەدەن. لەوانەیە سەرکار و پشکێنەری کار لەگەڵ یەکتر بکەونە گێرەو کێشەوە، چونکە سەرکار ناچارە کارێک بکات کە بەرهەمهێنان بەردەوامی بە پرۆسەی خۆی بدات و لەلایەکی ترەوە لەوانەیە پشکێنەری کاریش هەندێک کەم وکوڕی لەکارەکەدا ببینێت کە پێویستە نەمێنن، لە کۆمپانیایەکی بازرگانیدا لەوانەیە فرۆشیار نارەحەت بێت لەوەی کە بەڕێوەبەری فرۆشتن بە قست کەل وپەلەکان نەفرۆشێت. لەوانەیە ئەو مامۆستایەی کە دەیەوێت ئەو ڕەوتانەی کە دژی سیستمی فەرمانڕەوان لە ژینگەی زانکۆدا باو بکات، تووشی رووبەڕووبوونەوە بێت لەگەڵ راگری کۆلیج یاخود سەرۆکی زانکۆ،چونکە نایانەوێت لەلایەن کاربەدەستەکانی وڵاتەوە رەخنەیان لێ بگیرێت. زۆربەی ئەو رووبەڕووبوونەوانە لەدەروونی پەیوەندییەکانی نێوان رۆڵەکانی دامەزراوەیەکدان ولێی جیانابنەوە[٧/ ٢١٥-٢٢١].

**توژینەوە لەچەند دامەزراوەیەکی کۆمەلایەتی لەڕووی ئەرک، پێگە، دامەزراوە ناسەرەکی و رووکارە دەرەکییەکانەوە(٤٣٢/١٠٦)**

| دامەزراوە | ئەرکەکان | پێگەکان | دامەزراوە ناسەرەکییەکان | رووکارە دەرەکییەکان |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| خێزان | منداڵبوون<br>بەکۆمەلایەتی بوونی سەرەتایی<br>هەست کردن بەناسنامە | باوک<br>دایک<br>منداڵ | دەستگیرانی<br>هاوسەرێتی<br>میرات | خانوو و موبلمان<br>پارەوپول<br>ئەلقەی هاوسەرێتی |
| ئابووری | بەرهەمهێنانی کاڵاکان<br>قازانج<br>دابەشکردنی کار | کارمەند<br>کرێکار<br>بەکاربەر | بازار<br>دراو<br>ئیعتیبار | کارگە<br>بانک<br>نیشانەی بازرگانی |
| حکوومەت | یەکێتی نەتەوەیی<br>سیاسەتی گشتی<br>یاساکان | هاوڵاتی<br>سیاسەتمەدار<br>دەنگدەر | دەوڵەت<br>حزب<br>هەڵبژاردن | شەقام<br>ئاڵا<br>یاساکان |
| ئایین | باوەڕ<br>ئارامی زەین<br>روحییەتی هاوکاری | روحانی<br>قەشە<br>راهیبە(رەبەن) | دەستە<br>نوێژی هەینی<br>ئەوقاف | مزگەوت<br>کەنیسە<br>مەزار |
| پەروەردە وفێرکردن | فێربوون<br>بەکۆمەلایەتی بوون<br>زانین(مەعریفە) | مامۆستا<br>قوتابی<br>راگری کۆلیج | ئەنجوومەنی کۆلیج<br>خشتەی وانەکان<br>بلاوکراوەکان | دبلۆم<br>کۆلیج<br>کتێب |

بەسەرنج دان لەزەرووورەتی ئەنجام وەرگرتن لەو خاڵانەی کە لە سەرەوە ئاماژەیان پێکرا، دەتوانین تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان بەراقەی خوارەوە کورت بکەینەوە:

١- دامەزراوە جێگیرو پایەدارە، و هەر لە کاتی دروستبوونەوە پلەیەکی لە بەردەوامی هەیە.

٢-لەبەرئەوەی کە دامەزراوەکان تاڕادەیەک هەمیشەیین، زۆربەی جاران گۆڕانەکانیان بەرەبەرەو لەسەرخۆن و خۆراگرییان بە بەراورد لەگەڵ گرووپە کۆمەڵایەتییەکان زیاترە لە بەرامبەر گۆڕانکارییەکانی سەردەم. لەگەڵ ئەوەی گۆڕان لەبنچینەدا کێشەیەک نییە، بەڵام لەوکاتەی کە چوارچێوەی گشتی دامەزراوەی کۆمەڵایەتی دەکەوێتە ژێر پرسیارەوە، بەزۆری وەک کێشە دەردەکەوێت. زۆربەی دامەزراوەکان گەلێک کۆنن و لەئەنجامدا باری پێداگرتن لەسەر دابونەریت و بیرو باوەڕە کۆنەکان و لەهەمان کاتدا ئەوانەی جێگەی سەرنج و بایەخن، لەئەستۆ دەگرن. هەوڵدان بۆ گۆڕینی ئەم دامەزراوانە بەزۆری هاوکات دەبێت لەگەڵ گومان و دوودڵی، ئاگاداری، و راگەیاندنی مەترسی.

٣- دامەزراوەکان بەگشتی پلانیان بۆ دانەڕێژراوە، بەڵام وەک وەڵامدەری هەندێ لە پێویستییە بنچینەییەکان کاردەکەن.

٤- دامەزراوەکان خاوەنی چەند سیمبولێکن کە بۆ پاراستن و وەفاداری و پەیوەستەیی ئەندامەکانیان بەکاردێن( وەک ئاڵای وڵاتێک یاخود نیشانەی خاچ بۆ مەسیحییەکان).

٥-دامەزراوەکان خاوەنی یاسا، دیسپلین، نۆرمی رەفتارەکانن کە لە رێگەیانەوە گێڕانی رۆڵەکان و رەفتاری ئەندامان دەست نیشان دەکرێن (وەک سوێندخواردنی پزیشکەکان، سوێندی وەفاداری ئەندامانی پەرلەمان، دیسپلینە ئەخلاقییەکان لە زانست و پەروەردەو فێرکردندا).

٦- دامەزراوەکان خاوەنی پلەی جیاوازن لەپێکهاتە. دەتوانین دامەزراوەکان دابەش بکەین بۆ پێکهاتە رەق و زبرەکان، یاخود ئەوانەی سست و قابیلی گۆڕانن. لەحاڵەتی یەکەمدا نۆرمەکان دیارو ئاشکران لەکاتێکدا کە لە حاڵەتی دووەمدا ئیمکانی ئازادی کاری تاکە کەسی زیاترە. سوپا یاخود حکوومەتێکی بەهێزو چەقبەستوو نموونەی ئەو دامەزراوەن کە پێکهاتەکەی رەق و زبرە. لەبەرامبەر

ئەوەشدا دەتوانین خێزانێکی چینی ناوەند کە لە ئەورووپای رۆژئاوا نیشتەجێیە وەک دامەزراوەیەک لەبەرچاو بگرین کە پێکهاتەیەکی سستی هەیە.

پەیوەندی نێوان رۆشنبیرو سیاسەتمەداران، یەکێکە لە گیروگرفتەکانی کاری دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان. لەکاتێکدا کە کاری رۆشنبیران گەڕانە بەدوای بنەما ئەقلانی و رێنمایییە زانستییەکاندا، و ئەوان هەندێ کات دەست دەکەن بە رەخنەگرتن و کەم و کورتییەکان دەخەنەڕوو، رۆڵی سیاسەتمەداران چالاکی نواندنە لە بواری رێکخستن و بەڕێوەبردنی دامەزراوەیەک، تاکو ئەو دامەزراوەیە بتوانێت ئەرکەکانی خۆی ئەنجام بدات. یەکێک لە شێوازەکانی گێڕانی رۆڵی ناوبراو ئەوەیە کە بەشێوەیەکی بنەبڕ، ئایدیۆلۆجیاو بڕیارو پرەنسیپەکانی دامەزراوە بە قۆناغی جێ بەجێ کردن بگەینێت. بەزۆری لێرەدا جیاوازی نێوان ئەو رۆشنبیرانەی کە لە هەوڵی گۆڕینی دامەزراوەو یاساکاندان، و ئەو سیاسەتمەدارانەی کە هەوڵدەدەن لەرێگەی هەماهەنگ کردنی پێکهاتە(ترکیب)ی هەیی (موجود) لەکارایی دامەزراوەکە زیاد بکەن، دەست پێدەکات.

٧- دامەزراوەکان لەکارەکانیاندا دەروەستن (ملتزم) بە ئەرکی جۆراوجۆر، و وەڵامی پێویستییە هاوبەشەکانی کۆمەڵە کەسانێک دەدەنەوە. ئەم ئەرکانە دابەشی سەر دوو دەستەی دیارو نادیار دەبن:

أ- ئەرکە دیارەکان ئەو چەند ئامانجانەی دامەزراوەیەکن کە راشکاوانە ناسراون و رێکەوتنێک لەبارەیانەوە هەیە، بۆ نموونە یەکێک لەئەرکەکانی پەروەردەو فێرکردن ئەوەیە کە خەڵکی فێر بکات، چۆن بیر بکەنەوە، یاخود فێرە کارە تایبەتییەکانیان بکەن.

ب- ئەرکە نادیارەکان بریتین لەو کۆمەڵە ئەنجامەی ئەرکە دامەزراوییەکان کە نەناسراون یاخود چاوەڕوانیان لێناکرێت. بۆ نموونە یەکێک لە ئەنجامەکانی گەشەسەندنی سیستمی زانکۆ لەساڵەکانی دواییدا فێرکردنی چالاکی سیاسی یاخود خەباتگێڕییە لە کایەی کێشە کۆمەڵایەتی، سیاسی یاخود ئابوورییەکاندا، کە بەزۆری لە ریزی ئەرکە سەرەکییەکانی دامەزراوە دانانرێن.

دەتوانین هەندێک لە رەگەزو چالاکییەکانی دامەزراوەکان بە«خراپی ئەرکەکان» (الاختلال الوظيفي)(Dysfunction) ناو ببەین کە دەبنە رێگر لە بەرامبەر بەدی هاتنی ئەو ئامانجانەی کە دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان خەباتیان لەپێناو دا دەکەن. بۆ نموومە حکوومەتێک لەرێگەی رێکخراوە ئیدارییەکەیەوە بۆ ئەوە سەقامگیر بووە

کە وەڵامی پێویستی ئەو تاکانە بداتەوە کە وابەستەن پێیەوە. بەڵام لەحاڵەتێکدا کە حکوومەت جەوهەرێکی دەسەڵاتخواز، توندوتیژ و نەگۆڕی هەبێت، بەکردەوە رێگایەکی گرتۆتەبەر کە بەرەو پشتگوێ خستنی پێویستییەکانی زۆرینە دەچێت. لەهەر دامەزراوەیەکدا هەندێک لە«خراپی ئەرکەکان» هەن، بەڵام زۆری کاریگەرییان لە پەیوەندیدا لەگەڵ لایەنە وەزیفەییەکانی دامەزراوەدا جیاواز دەبێت.

لەوانەیە دامەزراوەیەک چەند ئەرکێکی جیاجیای هەبێت. بۆ نموونە لە سیستمێکی سەرمایەداری ئازاددا، ئابووری دەروەستە بە هەندێک کاروباری وەک دەستەبەرکردنی کاڵا بۆ خەڵکی، سوود گەیاندن بە بازرگانان، هێنانەدی و دروستکردنی توانا تاکە کەسییەکان لەرێگەی کارەوە. هەروەها لەوانەیە ژمارەی ئەرکەکانی دامەزراوەیەک ناجێگیربێت یاخود دوو یان چەند ئەرکێکی لە دژایەتیدا بن لەگەڵ یەکتری، بۆ نموونە بۆی هەیە لەخوێندنی باڵادا یەکێک لە ئامانجە دیارەکانی سیستمی زانکۆیی کە خوێندن و فێرکردنی قوتابییانە لەگەڵ حەزی مامۆستا لە ئەنجامدانی چالاکییە لێکۆڵینەوەییەکان لە دژایەتیدا بێت.

لەوانەیە ئەرکەکانی دامەزراوەیەک لە کۆمەڵگایەکدا لەپەیوەندیدا بە بەشە جیاجیاکانی ئەو جیاوازبن، بۆ نموونە زۆربەی سیستمە ئابوورییە نوێیەکان ئەو کەرەستەو هۆکارانە دەستەبەر دەکەن کە خەڵکی پێویستیان پێیە، بەڵام لە هەمان کاتدا، تاکەکان کاڵاکان بەڕادەی جیاواز وەردەگرن. رەنگە گەشەسەندنی بەرهەمهێنانی خاوی نەتەوەیی هیچ کاریگەرییەکی نەبێت لەسەر ژیانی گرووپێک لەنیشتەجێییەکانی گەڕەکێکی هەژار نشین.

رەنگە ئەرکەکانی دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان بەنێو یەکدا چوونیان لەگەڵ یەکتر هەبێت و ببێتە هۆی هاتنەدی وابەستەیی بەرامبەرو پارێزگاریی هاوبەش. بۆ نموونە لەو کاتەی کە ئایین بە مەبەستی پاراستنی خێزان کاربکات، لەتوانای خێزانیش دایە هۆکارێک بێت بۆ مەبەستی پارێزگاری کردن لە ئایین.

دەتوانین لەهەر دامەزراوەیەکی کۆمەڵایەتیدا دوو ئەرکی ئاشکرا جیابکەینەوە:

یەکەم: هەر دامەزراوەیەک کۆمەڵە ئامانجێکی هەیە.

دووەم: هەموو دامەزراوەیەک لەپێناو مانەوەو گەیشتن بەئامانجەکانی، هەروەها بە مەبەستی پاراستن، گونجانی لەگەڵ ژینگەی دەوروبەری خۆیدا چالاکە. لەم رێگەیەوە مانەوەی دامەزراوە زامن دەبێت.

٨- دامەزراوە کۆمەڵایەتییە جیاجیاکان لە سیستمێک لە وابەستەیی دەروونی

بەرامبەردا پێکەوە بەستراون. بۆ نموونە ڕێژەی هاوسەری و سەقامگیری ژیانی خێزانی کاریگەری لەسەر گەشەسەندنی دانیشتوان بەجێ دەهێڵێت و گەشەسەندنی دانیشتوانیش کاریگەری دەبێت بەسەر پێویستییەکانی پەروەردەو فێرکردن و ئابوورییەوە. لەلایەکی ترەوە ڕەوشی ئابووری و ژمارەی تاکەکان لەژێر سەرپەرشتی ڕێکخراوە پەروەردەییەکان دیار دەکات کە چ کەسێک لە چ تەمەنێکدا هاوسەر هەڵبژێرێت. لەگەڵ ئەمەشدا هەموو دامەزراوێک لە هەوڵی ئەوەدایە کە سەربەخۆیی کارەکەی بپارێزێت و نفووزەکەی لەسەر هەموو زمینە دامەزراوییەکان زیاد بکات [١٠/١٥٨-١٥٩].

## ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی چییە؟

چەمکی «ڕێکخراو» (Organization) لەکۆمەڵناسیدا ڕووبەڕووی دوو گرفتی سەرەکی دەبێتەوە. یەکەم ئەم چەمکە لە زانستەکانی تریشدا (ئەندازیاری، ئابووری کۆمەڵایەتی، کارگێڕی) بەکاردەهێنرێت. گرفتەکەی دی لەبەوردی بەکارنەهێنانی لە کایەی زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا سەرهەڵدەدات. یەکەمین بەکارهێنانی کۆمەڵناسییانەی ڕێکخراو لە نووسینەکانی «هێربەرت سپنسەر»دا دەبینین، کە بێگومان ئەویش بە چەمکی «سیستم» (نظم) کاریگەر بوو کە «ئۆگست کۆنت» خستبوویە ڕوو. بەبڕوای سپنسەر لەتوانای لەیەکتر خڕبوونەوەی سادەی تاکەکان دا نییە کۆمەڵگا بهێنێتە ئاراوە. بۆ ئەوەی کۆمەڵگا دروست ببێت زەرووریە کە کۆبوونەوەی تاکەکان لەهەمان کاتدا ببێتە هۆی زیادبوونی هاوکاری نێوانیان، و بوونی ڕێکخراو مەرجی زەرووری دروست بوونی هاوکارییە. ئەو ئاماژە بەوە دەکات کە ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی یان لەهاوکاری بەرێکەوت و پشت ئەستوور بە زەروورەتە هەنوکەییەکان سەر هەڵدەدات و هیچ جۆرە مەبەستێکی پێناسەکراوی نییە، یاخود پشت بە مەبەست و ئەنجامە دیارو دەستنیشانکراوەکان دەبەستێت، کە بۆ نموونە لەوانەیە بۆ هەموو خەڵکی (لەڕێگەی ڕێکخراوی حکوومی) بەدوای ئامانجە ڕوون و ئاشکراکاندا بچێت، ئەنترۆپۆلۆجی کۆمەڵایەتی چەمکی ڕێکخراو لەپەیڤی «پێکهاتە»دا کورت دەکاتەوە کە لەگەڵ دیدگای کۆمەڵناساندا ناگونجێت [١٠٧/١٧٧].

بەپێی تیۆرە کۆمەڵناسییەکان، ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی دیاردە پێکهاتە(ستراکچەر)یی و کولتوورییەکان (هەردوو) دەگرێتەوە. ڕێکخراوی

کۆمەڵایەتی بریتییە لە کۆمەڵێک یاخود پێکهاتە (ترکیب)یەک لە ڕەگەزە جیاوازەکان (بۆ نموونە تاک، یاخود گرووپ)،کە بوون یاخود جۆرە یەکێتییەکی قابیلی دەستنیشانکردن و زانینی هەیەو خاوەنی خەسڵەتی ڕەگەزە بەدی هێنەرەکانیەتی. لەگەڵ ئەوەی کە ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی دەتوانێت حاڵەتێکی گۆڕاوی هەبێت، بەڵام جەوهەرەکەی پێویست دەکات کە جێگیرو نەگۆڕ بێت.

پێویستە خەسڵەتە تایبەتییەکانی ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی لەپەیڤی «ڕێکخراو» لە چەمکی گشتیدا جیابکەینەوە. وشەی «ڕێکخراو» بەتەنیا پیشاندەری ئەرک و یەکە پێکهاتەییەکان، دروستبوونیان، و یاساکانی دەرکەوتنیانە. ڕێکخراو بەو چەمکە هێندە فرەوانەوە حاڵەتێکی بەتەواوی سەربەخۆ نییە لە ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی، بەڵکو ڕەهەندە تیۆرییەکانی فرەوانترن، و ڕووخسارێکی دیاریکراوتری هەیە. ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی هەموو لایەنە کۆمەڵایەتییەکان دەگرێتەوە، لەوانیش ئەرک یاخود ڕەهەندە پێکهاتەییەکان.

کۆمەڵناسان بەگشتی چەمکی ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی بەباشتر دەزانن لە پێکهاتەی کۆمەڵایەتی. ئەوان لەو بڕوایەدان کە زاراوەی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی زۆر ورد نییە و هەمیشە مایەی ناکۆکی ئەو تیۆرانە بووە کە بەتەواوی دژی یەکترن. «جۆرج گوروڤیج» لەو بڕوایەدایە کە ڕێکخراوەکان لە حوکمی پلە جیاوازەکانی ڕاستی کۆمەڵایەتیدان، بەشێوەیەک کە گرووپ و کۆمەڵگا گەورەکان (وەک هۆزو نەتەوەکان) هیچ کاتێک بەتەواوی شێوەی دەرەکی وەرناگرن و بەبێ ئەوەی بەمانای تایبەتی وشە «ڕێکخراو»بن بەشێوەیەکی تەواو«پێکهاتەوەرگرتوون». پێکهاتە چەند جارێک زیاتر لەڕێکخراو ناسکترو ناجێگیرترەو بوونی پێکهاتەی دیاریکراو لەهەموو ڕێکخراوێکدا شتێکی نکوڵی لێ نەکراوە. ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی بەزۆری بووەتە بابەتی دوو جۆرە لێکۆڵینەوەی ماهییەت جیاواز. دەستەیەکی ئەم لێکۆڵینەوانە لە زەمینەی پۆلێن کردنی ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییەکان لەسەر بنەمای جۆرە جیاوازەکانی ئەنجامیان وەرگرتووە و لە دەستەکەی تردا ڕوانگەی بنچینەیی ئەرکی ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییەکان بووە[ ١٣/٧٤-١٤ ].

زۆربەی تیۆریستەکان بەدوای پاساوێکدا دەگەڕان بۆ دروست بوونی ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی لەسەر بنەمای حاڵەتی بێ ڕێکخراوەیی(کە لە زۆربەی حاڵەتەکاندا گرووپە پەراگەندە مرۆییەکان یاخود حاڵەتەکانی بێ نەزمی و بەرەڵایی هەندێک لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکان گریمانە کراون). «دورکایم»، وەک ڕەگەزی سەرەتایی ناوی

گرووپە مرۆییەکان دەبات، کەبە فراوانبوون و بوون بەپاشکۆی رەگەزە هاوشێوەکانیان یەکەمین کۆمەڵگا سادەکان بهێننە ئاراوە. بۆ نموونە کاتێک کە دوو «کلان» هۆزێک پێکبهێنن و لەبەر کاریگەری ئەو یەکێتییە بتوانن حاڵەتێکی هەماهەنگ و تەواوکەر بهێننە ئاراوە[ ٧٤/١٣-٨٤].

**رێکخراوە رەسمی و نارەسمییەکان**

رێکخراوە رەسمییەکان جۆرێکی رێکخراوە کۆمەڵایەتییەکانن لەچەمکی گشتیدا، و هەروەها بینیمان کە رێکخراوی کۆمەڵایەتی وەک تۆرێکی پەیوەندی نێوان تاک و گرووپەکانە کە بە کۆمەڵگایان دەبەستێتەوە. رێکخراوی رەسمی تەنیا جۆرێکی رێکخراوی کۆمەڵایەتییە هەروەها رێکخراوە رەسمییەکان لە گرووپە بچووکەکان (وەک گرووپە برادەرییەکان یاخود گرووپەکانی کار)وهەروەها لە دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکانیش جیاوازن.

گرووپی برادەری جۆرێکە لە رێکخراوی نارەسمی کە بەشێوەی رێکەوت دروست دەبێت و ئەرکەکەی وابەستە نییە بە یاسای دیاریکراوەوە و بەشێوەیەکی نادیار بەدوای هەندێک لە ئامانجە برادەرییەکانەوەیە. رێکخراوی رەسمی بەشێوەیەکی ئیرادی دروست دەبێت یاخود بەدوای چەند ئامانجێکی پێناسەکراو و دیاریکراوەوەیە. هەروەها رێکخراوە نارەسمییەکانیش گرووپی رێکخراون(منظم). هەموو گرووپە مرۆییەکان پێکهاتەیان هەیە، بەڵام پێکهاتەیەکی رەسمییان نییە. ئەم رێکخراوانە خاوەنی رابەروپەیرەون، هەروەها رێبازو قەدەغەکاریگەلێکیشیان تیادا هەیە، بەڵام، یاسا، ناونیشان و پایەکان نووسراو و تۆمارکراونین. بەزۆری رێکخراوە نارەسمییەکان هەمان گرووپە یەکەمینەکانن لەکاتێکدا رێکخراوە رەسمییەکان لەجۆری گرووپە ناسەرەکییەکانن، رێکخراوە رەسمییەکان وەک هەموو گرووپە ناسەرەکییەکان دابەشدەکرێن، بەڵام لەهەمان کاتدا دەتوانن لە دەروونی خۆیاندا گرووپە یەکەمینەکان یاخود کۆڕو کۆمەڵە برادەرییەکان لەخۆ بگرن. رێکخراوە رەسمییەکان ئەو کاتە سەرهەڵدەدەن کە گرووپێک هێندە فراوان دەبێت کە چیتر ناتوانێت کاروبارەکانی بەشێوەیەکی نارەسمی رێکبخات.

رێکخراوە رەسمییەکان لەو رووەوە لە دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان جیاوازن کە رێکخراوە کۆمەڵایەتییەکان وەک چەند کۆمەڵەیەکن لە تاکەکان لەکاتێکدا دامەزراوەکان لە حوکمی چەند سیستمگەلێک نۆرم و بەهاکاندان. رێکخراوی

ڕەسمی هۆکارێکە بۆ ڕێکخستنی ئەو چالاکییانەی پەیوەستن بە دامەزراوەیەکی کۆمەڵایەتی. دامەزراوەی پەروەردەو فێرکردن لەتوانای دایە چەند کۆمەڵەیەکی وەکو نووسەران، کۆمەڵەی دەستەی زانستی زانکۆکان، کۆمەڵەی دایک و باوک و ڕاهێنەران، یەکێتی قوتابخانە تایبەتییەکان، شێوەی جیاجیای تر لە گرووپ و دامەزراوەکان، (بەتایبەتی لە کۆمەڵگا پیشەسازییەکاندا) بگرێتەوە. ڕێکخراوە ڕەسمییەکان پێکهاتەیەکیان هەیە کە لەڕێگەیەوە زۆر لە ڕەفتارە دامەزراوییەکان لایەنی زانستی بەخۆوە دەگرن.

ڕێکخراوی ڕەسمی خاوەنی هەلومەرجی ئەندامەتی و بڕیاری تایبەتییە کە جیایدەکاتەوە لەبەشەکەی تری کۆمەڵگا (بقیة المجتمع)، بەڵام لە پەیوەندی بەرامبەر و بەردەوامدایە لەگەڵ بەشەکەی تری کۆمەڵگا. چالاکییەکانی ڕێکخراوە ڕەسمییەکان داینەمۆی دۆزینەوەی وەڵامن لە کۆمەڵگادا، کە ئەم وەڵامە خۆی بۆ ڕێکخراوی ڕەسمی دەگەڕێتەوە و ئەرکەکەی دەگۆڕێت. بۆ نموونە بەرهەمهێنەرانی ئۆتمبیل زۆر کار دەکەنە سەر ژینگەی کۆمەڵگایەک و لە بەرامبەریش گوشارە گشتییەکان دەتوانن ببنە هۆی سەرهەڵدانی چەند گۆڕانکارییەک (هەندێ جار ناخۆش) بۆ پیشەسازی ئۆتمبیل. ئەو ئۆتمبیلانەی کە جێگەی پەسەندی گشت خەڵک نەبن و لەگەڵ هەلومەرجەکان گونجاو نەبن دەچنە لاوە. لەوڵاتەکانی وەک ئەمەریکا لەبەر هۆیە جیاوازەکان (لەوانیش بەرزبوونی نرخی نەوت) ئۆتمبیلە زەبەلاحەکان لەساڵەکانی دواییدا بەرەبەرە کەم دەبن و جۆری ئۆتمبیلە بچووکترەکان، بەگوێرەی داواکاری بەکاربەران، جێگەیان دەگرنەوە. سەرەڕای ئەوەش ئەو گۆڕانکارییانەی کە گوژمەی گەورەیان پێوستە بەسەر پیشەسازی ئۆتمبیلدا سەپێنراون لە بواری زیاد بوونی ئاسایش و کەمکردنی پیسبوونی هەوا لەگەڵ ئەوەی ڕێکخراوی ڕەسمی یەکەیەکی بەشی (جزئی) سەربەخۆیە بەڵام لەپەیوەندی بەرامبەردایە لەگەڵ بەشەکەی تری کۆمەڵگا [٦٧/ ٢١١-٢١٤].

«تالکوت پارسونز» چوار جۆری تایبەتی ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییەکان لەیەکتر جیادەکاتەوە. کە بریتین لە: بەرهەمهێنانی ئابووری، دەسەڵاتی سیاسی، یەکدەستەیی کۆمەڵایەتی، وپاراستن و پارێزگاریکردنی سیمبولەکان. دامەزراوەکانی بەرهەمهێنانی ئابووری چەند چالاکییەکیان لە ئەستۆیە کە لە نرخی بەرهەمەکان زیاد دەکەن و چەند خزمەتگوزارییەک پێشکەش دەکەن (سەندیکاکان، هەرەوەزییەکان) ڕێکخراوەکانی دەسەڵاتی سیاسی ئەوانەن کە نفووزیان لەسەر پێ

سپاردن(تفویض)، و ئەرکی دەسەڵاتی سیاسی (حزبە سیاسییەکان گرووپە گوشارییە ڕێکخراوەکان-المنظمة-)هەیە. ڕێکخراوەکانی یەکدەستەیی کۆمەڵایەتی لە هەوڵی پاراستنی سیستم و دەسەڵاتی کۆمەڵگادان بەهۆی چارەسەر کردنی دژایەتییەکان (هەندێ لە دادگاکان، کۆمەڵە چەکدارییە ئەخلاقییەکان). ڕێکخراوەکانی پاراستنی سیمبولەکان ئەوانەن کە کەناڵەکانی گواستنەوەی کولتووری دەخەنە ڕوو و کارەکەیان دەبێتە مایەی ئەوەی سیمبولە کولتوورییەکان لەنەوەیەکەوە بگوازرێنەوە بۆ نەوەیەکی تر (وەک قوتابخانە، مزگەوت).

## پێکهاتەی ڕێکخراویی

بەپێی پێناسە، ڕێکخراوەکان پێکهاتەیان هەیە و پێکهاتەی ڕێکخراو کۆمەڵەیەکی هاوسەنگە لە نۆرم، چاوەڕوانی، بنەماو شێوازە نووسراو و نەنووسراوەکان یاخود ڕەسمی و نارەسمییەکان. پێکهاتەی پرسنەلێ (شەخسی) تۆڕێکە لە تاکە کەس، ڕۆڵ، پێگەکان کە لە ڕێگەیانەوە چالاکییەکانی ڕێکخراو بەقۆناغی جێبەجێ کردن دەگەن.

هەندێ ڕێکخراو پێکهاتەیان زۆر پتەوە، بەو شێوەیەی کە دەسەڵات زۆر چەقبەستوو، و شێوازەکان ستانداردن و ئیختیاری کاری گرووپ یاخود تاکەکان زۆر سنووردارە. ئەو ڕێکخراوانەی کە پێکهاتەیان زۆر پتەو نییە کەمتر حاڵەتی چەقبەستوویان هەیەو ئازادی کاری زیاتر دەدەن بە تاکەکان. لە ڕێکخراوەکانی جۆری یەکەمدا ڕۆڵەکان بەوردی پێناسەکراون، وتەنانەت لە ڕووبەڕوو بوونەوەدا لەگەڵ بارودۆخە زۆر تایبەتییەکان بڕیاری تایبەتی هەن، لەکاتێکدا کە لە جۆری دووەمی ڕێکخراوەکان (کە پێکهاتەیەکی پتەویان نییە) ڕۆڵەکان کەمتر پێناسەکراون و دەتوانین لەڕێگەی تاک یاخود گرووپەکانەوە بیانگونجێنین لەگەڵ هەلومەرجە گۆڕاوەکان. ڕێکخراوە عەسکەری و حکوومییەکان بەزۆری لە جۆری ئەو ڕێکخراوانەن کە پێکهاتەیان پتەوە و هەر ڕۆڵ و پێگەیەک تیایاندا بەوردی پێناسە کراوە و سیمبولەکانی ئەرکی ڕێکخراوی دیارن. دەتوانین ڕێکخراوە بازرگانییەکان بخەینە نێو گرووپی ئەو ڕێکخراوانەی کە پێکهاتەیان زۆر پتەو نییە. بەڕێوەبەرە جیاوازەکانی یەکەیەکی بازرگانی بەزۆری ئەو ئازادییەیان هەیە کە پرۆگرامی لەپێوەندیدا لەگەڵ ڕەوش و هەلومەرجە هەنووکەییەکان ڕێکبخەن. لەئایینی مەسیحیدا ڕووبەڕووی هەردوو جۆری سیستمی ڕێکخراوەیی دەبینەوە. کەنیسەی

کاسۆلیکی ڕێکخراوێکی زۆر پتەوی هەیە کە تیایدا دەسەلاتێکی ناوەندی بەهێز هەیە، ڕێکخراوەکەی فرەوانەو بڕیارو شێوازەکانی زۆر دیاریکراون. لەبەرامبەریشدا کەنیسەیەکی پرۆتستانت و پێکهاتەیەکی زۆر پتەوی نییە. کۆمۆنیست و سۆشیالیستەکان وێرای ئەوەی هەردووکیان ئایدۆلۆجیاکەیان لەسەر بناغەی نووسینەکانی «کارل مارکس» دادەنێن، بەلام حزبە کۆمۆنیستەکان پشت ئەستوورن بەڕێکخراوێک کە پێکهاتەکەی پتەوە، لەکاتێکدا کە حزبە سوشیالیستەکان لە هەلومەرجی پشت ئەستوور بە پێکهاتەی ناپتەو چالاکی دەنوێنن، واتە شتێکی بەشێوەی کەنیسەی پرۆتستان[ ٢٠/١٥٢-١٥٤ ].

لە وەلامی ئەو پرسیارەدا کە کارایی کام لەو دوو جۆرە ڕێکخراوانەی سەرەوە زیاتر، پێویستە بلێین ئەمە پەیوەندی بە فرەوانی ڕێکخراوەکەو جەوهەری چالاکییەکانیەوە هەیە، سوپایەکی گەورە پێویستە تارادەیەک ڕێکخراوێکی پتەوی هەبێت و لەکاتێکدا یەکەیەکی بچووکی عەسکەری دەتوانێت ڕێکخراوێکی نیمچە پتەوی هەبێت. لەهەندێ بارودۆخدا ڕەنگە پێکهاتەی ناپتەوی گرووپە پارتیزانەکان ئەنجامەکانیان کاریگەرترین لەکارەکانی سوپایەک. ئەو ڕێکخراوەی پێکهاتەکەی ناپتەوە دەتوانێت بەوەوە بنازێت کە کارەکانی پشت بەئازادی، نەرمی، و بەرپرسیارەتی تاکەکەسی دەبەستن. بەلام لەهەمان کاتدا لەو بارەیەوە ڕەخنە لەو جۆرە ڕێکخراوانە دەگیرێت کە دەستەویەخەن لەگەڵ ناجێگیری، نەبوونی حەتمییەت، و لادانە ئایدیۆلۆجییەکان. ئەو ڕێکخراوەی کە پێکهاتەکەی پتەوە بەوەوە دەنازێت کە بەردەوامی و جێگیری ئایدیۆلۆجی هەیە و بەشەکانی بەتەواوی گونجاون لەگەڵ یەکتر. لەبەرامبەردا ئەو ڕێکخراوە لەو لایەنەوە دەکەوێتە بەر ڕەخنە کە دوگماگەرا، نەگۆڕ، و لائوبالییە (بێ بایەخە) سەبارەت بەکێشەکان، چونکە ئەو یەکانەی وابەستەن پێیەوە تاڕادەیەکی زۆر دوورن لە «ڕێکخراوی ناوەندی».

#### پێکهاتە ڕەسمی و نارەسمییەکان

لە ڕێکخراوێکدا کە پێکهاتەیەکی پتەو هەبێت، هێلکاری ڕێکخراوەیی، پلەو پایەو ئەرکە تەواوەکانی هەر گرووپێکی هێزی مرۆیی پیشاندەدات و هەر ئەندامێکی تازە هاتوو زوو فێر دەبێت کە پێویستە لەڕێگەی «کەناڵەکانەوە» هەنگاو بنێت. ئەو بەردەوام دەگەڕێتەوە بۆ بەرپرسی پەیوەندیدار یاخود سەرپەرشت، بەبێ ئەوەی کە بۆ کاروبارە هەنووکەییەکان بۆ تاکەکانی سەرەوە بگەڕێتەوە.

لەماوەیەکی کورتدا هەر کارمەندێکی وشیار تێدەگات کە هێڵکاری ڕێکخراوەیی بەڕاستی کاری ڕێکخراو پیشان نادات. ئەو درک بەو خاڵە دەکات کە هەندێک کات بەرپرسی بەشێک یاخود سکرتێرێک زیاتر دەستی لەبڕیارداندا هەیە تاکو بەڕێوەبەرێکی پلە بەرز. ئەگەر ئەو کارمەندە ماوەیەکی تر لە ڕێکخراودا بمێنێتەوە تێدەگات کە جۆرێک لە هێڵکاری ڕێکخراوی«سێبەر» هەیە کە لە هەر یەکێکیاندا پێکهاتە (ترکیب)کەی جیاوازەو حاڵەتێکی ڕەسمی و تۆمارکراوی نییە، و بۆ ئەوەی درێژە بە چالاکییە سەرکەوتووانەکەی بدات پێویستە بیناسێت. ئەم هێڵکاری «سێبەر»ە بریتییە لەپێرستی ئەو تاکانەی کە خاوەن نفووزن. هەندێ کات ئەم تاکانە ئەوانەن کە ناویان لە هێڵکاری ڕێکخراوەیی ڕەسمیدا هەیە و هەندێ کاتیش وانییە. تاکێک کە بتوانێت سیمبولی ڕاستەقینەی دەسەڵات بناسێت دەتوانێت لەرێکخراودا بەرێکەوتن و گونجان بگات، و لەکاتێکدا کە کەسێکی تر کە تەنیا پشتی بە هێڵکاری ڕەسمی ڕێکخراوەیی بەستبێت بۆی هەیە دواکەوتن و بێ بەشبوونەکان تاقی بکاتەوە (٢٠/١٥٣-١٥٥)

بێگومان لەم باسەدا پێویستە جیاوازییەکی ورد لەنێوان دووچەمکی «پایە»و «نفووز»دا بکەین. دەسەڵات مافێکی ڕەسمییە کە دەبێتە هۆی وەرگرتن و ڕاپەڕاندنی بڕیار لەکاتێکدا نفووز دەسەڵاتی کارتێکردنە لەسەر ئەوانی ترو مومکینە هەندێ جار هەبوونی پایە بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە پێویست نەبێت.پایە لەپێگە سەرهەڵدەدات لەکاتێکدا کە نفووز لەبنەچەدا پشت بە خەسڵەتە کەسییەکان و هۆکارەکانی تر دەبەستێت. پایە پشت بەو پێگەیە دەبەستێت کە تاکەکان هەیانەو و لەبەرامبەریشدا نفووز لەو ڕێزگرتنە سەرهەڵدەدات کە لە کەس دەنرێت. مامۆستایەکی زانکۆ ئەو هێزەی پایەی هەیە کە ئەرکی ماڵەوە بەقوتابییان بدات و لە کۆتایی وانەکەدا نمرەیان پێبدات و دواجاریش نمرەی دەرچوون ببەخشێت. بەڵام نفووزەکەی لەسەر قوتابییان دەکرێ کەم یاخود زۆر بێت و پەیوەستە بە ئەوەوە کە قوتابییان چ هەستێکیان هەیە لەبەرامبەر ئەو. سەرپەرشتیارێک کە جێگەی ڕێزو دەستخۆشییە لە ڕێکخراوێکدا خاوەنی پایەو نفووزە لەکاتێکدا سەرپەرشتیارێکی نەخوازراو پایەی هەیە بەڵام نفووزێکی هێندەی نییە. لەلایەکی ترەوە کارمەندێکی سادەی لێهاتوو و خۆشەویست لەوانەیە نفووزێکی زۆری هەبێت هەرچەند پایەیەکی وەهای لەرێکخراودا نەبێت.

پێکهاتەی نارەسمی هەر ڕێکخراوێک دەرەنجامی دووهۆکارە: یەکەم جیاوازی

تاکەکان لەرووی کەسایەتی، پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، و هەلومەرجەکان و دووەم، ئەو راستییەی کە هیچ سیستمێکی رۆڵەکان لە رووبەڕووبوونەوەدا لەگەڵ هەموو پێویستییەکانی رێکخراو بەتەواوی سەرکەوتوو نییە. لەوانەیە کەسێک بۆ ئەنجامدانی کارەکان بەباشتر بزانێت کە رووبکاتە ئەو دیو کەناڵە ئاساییەکان و هاوکاری لەپێکهاتەی نارەسمی رێکخراو وەرگرێت. بێگومان دەزانین کە هەندێ کات ئەم پرۆسەیە مەترسیدارەو پێویستە لێزانانە سوودی لێوەربگیرێت تاکو ئەنجامی کارەکە لەنێو نەچێت. سەرەڕای مەترسییەکانی، دەزانین کە ئەم شێوەیەی کار لە جیهاندا زۆر سەرتاپاگیرە. بەبێ سوود وەرگرتن لە پێکهاتەو پرۆسە نارەسمییەکان زۆربەی کارەکان بەخێرایی و بە کارایی پێویست شێوە وەرناگرن.

بەبێ ناسینی پێکهاتەی نارەسمی رێکخراوێک، ناتوانین ئەرکە راستەقینەکەی درک بکەین. دەتوانین لە رێکخراوێکدا ئەو کەسانە بدۆزینەوە کە لەتوانایاندایە کارەکان لەدەرەوەی کەناڵە ئاساییەکان بەئەنجام بگەیەنین و پاراستنی ئەو کەسانە بەکارێکی بەنرخ دەبینرێت. هەروەها لەوانەیە لە رێکخراوێکدا برادەرو خزمانی کاربەدەستە پایەبەرزەکانیش کاربکەن، کە بەزۆری نفووزیان لەسەر ئەوان هەیە. لەتەک ئەم تاکانەدا لەوانەیە کارمەندی ئاساییش هەبن کە ببنە جێگەی رێزو دەستخۆشی هەموان، و بەرپرسەکانی رێکخراویش لە هەندێ حاڵەتدا بە پێویست ببینن کە لەمەڕ کێشەکان پرسیان پێ بکەن. لەبەرامبەر ئەوەشدا رەنگە کەسێک هێندە بێزراو بێت کە بەرپرسەکانی رێکخراو هەست بکەن کە پێویستە خۆیان دووربگرن لە هەر جۆرە پشتیوانیەکی. ئەو پەیوەندییانەی کە لە نێوان کەسایەتییەکانی لەجۆری سەرو و خوارووودا دروست دەبن کاریگەرییەکی زۆریان هەیە لەسەر ئەو بڕیارانەی کە کاربەدەستانی سەروو وەردەگرن و هەروەها ئەو راڤەو دەربڕینانەی کە لەمەڕ ئەوبڕیارانەوە دەکرێن (١٠٧/٥-١٠٩). پێویستە زیاد بکەین کە لەو بابەتانەی کە لەماوەی دوو دەیەی کۆتاییدا بوونەتە جێگەی سەرنج و بایەخپێدان لەجیهانی پیشەسازیدا، کولتووره لەرێکخراوەکاندا (لەوانیش رێکخراوەکانی بەرهەمهێنان یاخود دام و دەزگا حکوومییەکان) کە سەرنجی تایبەتی لەچەمکەکانی وەک تایبەتمەندییە تاکەکەسییەکان، پەیوەندی نێوان تاکەکان، پەیوەندییە نێو گرووپی و دەرەوەی گرووپییەکان بە رێکخراوەوە دەوروبەر دەدات [١٠٨/١١].

**جەوهەری بیروکراسی**

لەوکاتەی مرۆڤ بەدرێژایی ژیانی دەستی بەئەنجامدانی ئەو پلانانە کرد کەپێویستیان بەرێکخستنی چالاکی مرۆیی بوو لەکایەکانی دەرەوەی ئەوەی کە خێزان یاخود «کلان» دەیتوانی فراهەم بکات، سەرەتا بیروکراتەکان دەرکەوتن. هەندێک لەلێکۆڵەران وەک«ڤیتفوگل» لەو بڕوایەدان کە لەوانەیە ئاودێری لەچاخی کۆن وپلانەکانی کۆنترۆڵکردنی لافاوەکان سەرەتا زەروورەتی دابەشبوونی کاری رێکوپێک و رێکخراویان خستبێتە ڕوو[ ٣/١٠٩]. بەڵام لەسەردەمی نوێدا بیروکراسی (Bureaucracy) بە جۆرە پلەو پایە (هیراکییەت)یەکی رێکخراوەیی پێناسە دەکەن کە بەمەبەستی هەماهەنگکردنی ئەو هەنگاوە تاکەکەسییانەی کە لە رێکخراوێکی گەورەدا دەنرێن هاتووتە ئاراوە. بە ئیلهام لە نووسینەکانی «ماکس ڤیبەر» دەکرێ بیروکراسی بەخاوەنی چوار خەسڵەتی خوارەوە دابنێین:

١- پسپۆڕی، ،مەبەست سپاردنی هەرکارێکە بەپسپۆڕێک.

٢- دامەزراندن لەسەر بنچینەی شایستەیی و لێهاتوویی پیشەیی، کە زامنی هێزی مرۆیی شایستە دەکات.

٣- رەسمییەت و ناکەسی بوون. مەبەست راپەڕاندنی پرۆسەکانە بەشێوەیەکی بێلایەنانە.

٤- زنجیرەی رێساکان کە دەسەڵاتی هەموو کەسێک دیاردەکات.

«ماکس ڤیبەر» لەو بڕوایە دایە کە لە روانگەی کۆمەڵناسییەوە ئەوەی کەپێویستە لە رێکخراوێکدا بایەخێکی تایبەتی پێبدرێت شەرعیەتی «دەسەڵات»ەو سێ جۆری تایبەتی لەدەسەڵات و لەکۆتاییشدا سێ جۆرە شەرعییەتی رێکخراوەیی دەستنیشان دەکات کە بریتین لە: پیرۆزمەندانە، تەقلیدی، و ئەقڵانی. لەم سێ جۆرەی «دەسەڵات»دا شێوەی جیاوازی «گوێڕایەڵی» سەرهەڵدەدەن[ ٤١/١٠٩].

بیروکراسی بەشێوەیەکی نکۆڵی لێنەکراو لەهەموو رێکخراوە گەورەکاندا گەشە دەسەنێت، رێکخراوەکانی وەک وەزارەت، زانکۆ، کۆمەڵە گەورەکان و هەروەها دامەزراوە بازرگانییە گەورەکان[ ١٤٢/٤٥]. بۆ نموونە، گریمان بازاڕگایەک سێ کارمەندی هەبێت، ئەوان دەتوانن بەپێی بابەت و بەشێوەیەکی ناڕەسمی کارەکە لەنێوان خۆیاندا دابەش بکەن. لەم بازاڕگایەدا هەموو کەسێک دەتوانێت دەرگای قەفەسێک بکاتەوە کە پێویستییەکانی نووسینی (قەڵەم، دەفتەر، کاغەز...) تێدانەو ئەوەی کە پێویستی پێیە هەڵگرێت. گریمان ژمارەی ئەوانەی لەم بازاڕگایەدا

کاردەکەن لەبەر فرەوانبوونی بگاتە ۳۰۰۰ کەس. لەم حالەتەدا دروست کردنی سیستمێکی دابەشبوونی کارو دەسەلات کە کاروبارەکان لە ئەستۆ بگرێت دەبێتە زەروورەت. کۆمەڵە پرۆگرامێکی رەسمی دێنە ئاراوە کە پێویستییەکانی نووسین بەشێوەیەکی رێکوپێک بخەنە شوێنی خۆیان و هاوکات لەگەڵ ئەوە سیستمی جەردکردنی مومتەلەکات و کۆنترۆڵ دەخاتە روو تا ئەو کەلوپەلانە لەکۆگادا کۆبنەوە و بەر بە فیرۆ چوونیان بگیرێت. کەواتە بیروکراسی بەلایەنی کەمەوە سێ ریشەی هەیە کەبریتین لە :کارایی، هاوشێوەیی و، پێشگرتن لە گەندەڵی[ ۱۱۰/ ۱۱۶-۱۲۱].

سەرەڕای هۆکارە ناوبراوەکان، زۆری ئاڵۆزی رێکخراوە نوێیەکان لەوانەیە ببێتە هۆی زۆربوونی کارمەندی ئیدارەکان. ئەو لێکۆڵینەوانەی لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەنجام دراون پیشاندەدەن کە بەڕادەی زۆر بوونی ژمارەی پسپۆڕەکان لەرێکخراوەکاندا، ژمارەی سەرپەرشتیارانیش زیاد دەبێت. هەڵبەت ئەم زیاد بوونە لە کۆنترۆڵکردنی کارە هەنووکەییەکان سەرهەڵنادات. بەڵکو وەلامی زەروورەتێکە لە بواری هەماهەنگی هۆشیارییە تەکنیکییەکاندا دەخرێتەڕوو. کارمەندی پسپۆڕ لەوانەیە حەزی لەوە بێت کە ئەرکەکانی بەبێ سەرپەرشتی بەردەوامی بەڕێوەبەر ئەنجام بدات، بەلام هەماهەنگی کاری ئەم پسپۆرە لەگەڵ ئەوانی تر پێویستی بە پرۆسەیەکی ئاڵۆزە کە بەناچاری لەرێگەی پەیوەندی بەردەوام و بەهۆی بیروکراتەکان شێوە وەردەگرێت[ /۱۱/۴۲-۴۵]. بەم پێیەش بیروکراتەکان هەمیشە خۆشەویست نین. هەندێک خەڵک راست یاخود هەڵە خۆیان بەکرێکاری بەرهەمهێن دەزانن و بەچاوی گومان و دوودڵییەوە لەبیروکراتەکان دەڕوانن و لەو بڕوایەدان کە بیروکراتەکان هیچ کارێکی واقعی ئەنجام نادەن، بەڵکو تەنیا کاری ئەوانی تر رێکدەخەن و ریکۆرد و کۆنترۆڵ دەکەن.

لەحالەتێکدا کە بیروکراتەکان کارەکانی حکومەتیان لەئاستێکی سنووردراردا لە میسری کۆن، رۆمان و چیندا رێنمایی دەکردن. گەشەسەندنی خێراو نوێی حالەتی کارمەندی حکوومەتی سەردەمەکەمان بەرهەمی دووهۆکارە: زۆربوونی ئەرکەکانی حکوومەت و گەشەسەندنی تێگەیەکی نوێ لەمەڕ جەوهەری حکوومەت. حکوومەت چیدی شتێک نییە کە لە خاوەنداریتی فەرمانڕەوایەکی میراتی یاخود سیاسەتمەدارێکی سەرکەوتوودا بێت، بەڵکو حکوومەت لەسەردەمەکەماندا گۆڕاوە بۆ خزمەتکاری خەڵکی. هەر لەم لایەنەوەیە کە حکوومەتەکانی ئەمڕۆ هەندێک

ئەرکیان پەسەند کردوون کە لە رابردوودا ئەنجامیان نەدەدان. ئەمرۆ کارمەندانی حکوومەت چیتر وەک دەروێشی وەفادارنین چونکە داوای مافە راستەقینەکانیان دەکەن، لەلایەکی ترەوە زەروورەت پێویست دەکات سیستمێک بێتە ئاراوە کە مافی ئەو کەسانەیان پێبدەن کە ئەرکەکانیان بەشێوەیەکی بێلایەنانەو لەسەر بناغەی لێهاتوویی ئەنجامدەدەن. بۆ ئامادەکردنی ئەو کارمەندانەیە کە یاسای بەکارهێنانی کارمەندە حکوومییەکان هەوڵی پێناسەکردنی تایبەتمەندییە پیشەییەکان، ڕاڤەی ئەرکەکان، ئیختیارات و ماف و تایبەتمەندییەکانیان دەدات. کارمەندی حکوومی بەشێوەیەکی ئاسایی دەست دەکات بەبڕیار وەرگرتن، وئەم کارە نەک لەبەر بەخێر هاتنی بەڕێوەبەر یاخود حاکمە سیاسیەکان ئەنجامدەدات، و نە لەپێناو رازیکردنی حەزەکانی خۆی، بەڵکو بڕیاردانەکانی ئەو پشت ئەستوورن بە بنەما دیاریکراوەکان. مووچەی کارمەندی حکومەتیش لەسەر توانای کارمەندەکەی لەکۆکردنەوەی باج و کرێیەکان دیاری دەکرێت و نە لەسەر بنچینەی سەخاوەت و دەستکراوەیی حکوومەت، بەڵکو موچە لەسەر بنچینەی پلەو پایەی پیشەیی دەدرێت. زۆربەی جاران کارکردنی کارمەندی حکوومەت بۆ هەمیشەییەو دەتوانێت لەسەر بنچینەی ساڵەکانی خزمەت یاخود زیاد بوونی ئاستی زانستی وهۆشیاری پێشەوە بچێت. دەرکردنیشی بەزۆری رەنگە لەبەر هۆکارەکانی وەک هەڵەی کار، دواکەوتن یاخود نەمانی کارایی بێت. سیستمی کارمەندی حکوومەت بەمەبەستی دروستکردن و پاراستنی هاوشێوەیی کارگێڕییە لەبارەی ئەو کارمەندانەی کە هەریەکێکیان شارەزاییەکی تایبەتی هەیە بۆ کارێکی دیاریکراو. لەگەڵ ئەوەی ئەو راستییە بۆوەتە هۆی سەرهەڵدانی رەخنەی زۆر، لە هەمان کاتدا چەند سەرکەوتنێکیشی هەیە لەگەیشتن بەئامانجەکانی [ ١١/ ٤٢-٤٥ ].

**ڕۆڵی بیروکراسی**

بۆچی رێکخراوەکان لەرووی پانتایی و ژمارەوە گەشەدەسەنن؟ لەوانەیە وەلامێکی سادە ئەوەبێت کە رێکخراوەکان جۆرێکن لە داهێنانە کۆمەلایەتییەکان وەکو دابەشکردنی کار لەکارگەیەکدا. سیستمی دابەشکردنی کار ئەوە مومکین دەکات کە لە یەکەیەکی بەرهەمهێناندا بەکاراییەکی زیاترو بەرهەمهێنان بەگوژمەیەکی کەمتر بگەین. جگە لەم شێوەیە ئێمە سیستمێکمان هەیە کە هەر کرێکارێک هەموو بەرهەمەکەی بەخۆی بەرهەم بهێنێت، ئەوشتەی کە ئەمرۆ مومکین

نییە تەسەور بکرێت. لەوانەیە لەسەردەمی ئێمەدا کەسێک نەبێت کە بتوانێت ئۆتمبێل لەسەرەتاوە تا کۆتایی دروست بکات، چونکە هەر هەنگاوێکی ئەم بەرهەمهێنانە بۆ پرۆسەگەلێکی پسپۆری بچووکتر دەشکێتەوە کە لەم بوارانەدا ئیمکانی ئەوەی تاکەکان خێراتر بتوانن ببنە پسپۆر زیاترە. ئەگەر هەموو هەنگاوەکان کە بۆ دروست کردنی ئۆتمبێلێک پێویستن دابەشی سەر ئەرکە بچوکترەکان بکەین، تاکە جیاوازەکان دەتوانن بەئاستێکی بەرزتر لە پسپۆڕێتی بگەن و کارگەش دەتوانێت بە دامەزراندنی مەکینەی ئامێرە پسپۆرییەکان سوود لەوکرێکارانە وەرگرێت کە لە ئاستێکی نزمتردان لەپسپۆری بۆ زۆربەی کارەکانی. ئەمە هەمان ئەو کارەیە کە بیروکراسی دەتوانێت ئەنجامی بدات. لەسەر ئەم بنچینەیە دەتوانین بۆ کارە کارەباییەکان سوود لە پسپۆری کارەباو، پارە لە بانک و بروانامەی لێخورین لە بەڕێوەبەرایەتی هاتوچۆ وەرگرین، و... کەسانێک بە خوێندنێکی کەمتر دەتوانن فێرە کارگەلێک بن و باشترو خێراتر ئەنجامیان بدەن. کارایی سیستمی نوێی فەرمانڕەوا لەسەر جیهان زیاتر لەبەر ئەوەیە کە پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکەی هۆکارو رەگەزەکان بەشێوەیەکی بەسوودتر بەکاریان دەهێنێت،نەک ئەوەی کە تەنیا ماف و تاتیبەتمەندییە زیاترەکان بەو تاکانە دەبەخشێت کە زیاتر لێهاتوون[٦٧/ ٢١٤].

هەموو ئەرک و چالاکییە جۆراوجۆرو جیاوازەکانی جیهانی هاوچەرخ پێویستیان بە رێکخستن و بەڕێوەبەرایەتی هەیە، بێگومان ئەمەش پێویستی بەگوژمەیە، بەڵام ئەگەر بیروکراسی پرۆسەیەکی لۆجیکی هەبێت، گوژمە بەسەر هەموو ئەرک و یەکە بەرهەمهێنەرەکان دابەشدەکرێت و کاڵاو خزمەتگوزارییەکان بەنرخێکی کەم تەواو دەبن. بەپێچەوانەوە لەو حاڵەتانەدا کە رۆڵ و ئەرکەکان زۆر تایبەتی و تاکەکەسی بن (بۆ نموونە هەر کاتێک کەسێک ویستی خواردنێک بەشێوەو چۆنایەتی تایبەتی و بەپێی سەلیقەی خۆی دروست بکات) ئەوا رێکخراوەکان کاراییان نییە[٥٧/ ٢٥٣-٢٥٥].

لەبەر ئەو ماهییەتە تایبەتییەی کە رێکخراوە گەورەکان هەیانە ئەوا پێویستیان بە سەرمایەگوزاری لەلایەنی بەرنامەڕێژی، زامنکردنی هێزە مرۆییەکان، هەماهەنگی،دروستکردنی ئاپارتمانەکان و ئامادە باشییەکان هەیە. لەئەنجامدا، ئەم رێکخراوانە لەو کۆمەڵگایانەدا گەشە دەسەنن کە سەرمایەی پێویستیان بۆ فەراهەمکردن و دروستکردنی ئەو هۆکارو رەگەزانەیان هەبێت. لە هەلومەرجی

سەرمایەگوزاری و کۆبوونەوەی سەرچاوەکاندایە کە دەتوانێت بەرخوردار بێت لە لێهاتوویی پسپۆڕی، ڕێکخستن، و تەنانەت داهێنانەکان.

بەهەمان شێوە بیروکراسی لەحاڵەتێکدا کە لەگەڵ پێویستی، هەلومەرج، و ئەو ئەرکانەی کە پێویستن بۆی نەگونجێت، لەتوانای دایە گیروگرفت و کەموکورتییە هەییە (موجود)کانی کۆمەڵگا زیاد بکات. لە زۆر لە وڵاتە گەشە سەندوو کاندا بیروکراسی لەبەر ئەوەی دەهێنرێت (استراد) و بێ ریشەیە هەمیشە کەتو تە بەر رەخنەی زۆرەوە. سەرەڕای ئەوەی لەسەرەوە هات لەو هەلومەرجانەدا کە پێکهاتەی ئیداری کۆمەڵگا ڕووبەڕووی «بێ نەزمی» دەبێتەوە، هەروەها دیسپلین، شێوازو قالبە رەفتارییە فەرمانڕەواکان لەسەر بیروکراسیش گۆڕانیان بەسەردابێت. تاکەکانیش ئەوە بەسوودتر دەزانن کە لەجیاتی هەڵسوکەوت کردن لەسەر بنچینەی «نۆرمەکان» لەسەر بنچینەی «فرتوفێڵ» و پەیوەندییەکان بجووڵێنەوە. لەکتێبی یادگاری تەمەندا دەخوێنینەوەکە [١٤٤-١٤٣/١١٢]: «لەکۆتاییەکانی ئۆکتۆبەری ١٩١٧ لە لەندەن ڕۆژێکیان بەروخسەت وەرگرتن گەیشتم بەخزمەتی ناسر ئەلملیک... پرسی کاتێک خوێندنی خۆت لە پاریس تەواوکردو گەڕایەوە ئێران چ دەکەی؟ وەڵامم داوە بڕوانامەی خوێندنم پێشکەش بە وەزیری کولتوور دەکەم تاکو کارێکی گونجاوم بداتێ. فەرمووی ئەگەر وابکەی چاوچنۆکەکان هەڵدەستن بەخراپەکاری و دوژمنایەتی کردنت، دەبنە کۆسپ لەبەرامبەر خزمەت و پێشکەوتنەکەت. پێویستە سەرەتا خۆت بێ زانست و زانیاری دەربخەی و کاتێک دامەزرای لەنێو کارەکەتدا سوود لەزانیارییەکانت وەرگری».

**بەڕێوەبردن لە دوورەوە**

بەدرێژایی چەند ساڵی ڕابردوو بۆ جیاکردنەوەی هۆکارە (وسائل) نوێیەکان کە بۆ سوود وەرگرتن یاخود ڕێنمایی کردن لەدوورەوە هاتونەتە ئاراوە چەند چەمکێکی نوێ سەریان هەڵداوە لەوانیش زامنکردنی ئاسایش لەدوورەوە، چاودێری کردن لە دوورەوە، چاودێری کردنی هونەری مەرکەزی، و یاخود بەڕێوەبردن لە دوورەوە.

لەلایەنی زمانەوانییەوە «بەڕێوەبردن لەدوورەوە» (Telegestion) کۆی ئەو کۆمەڵە خزمەتگوزارییە بەڕێوەبەرایەتییانە دەگرێتەوە کە لە ڕێگەی دوورەوە زامن دەکرێن، بەڕێوەبەری بەرنامە دەتوانێت بەسوود وەرگرتن لەکۆمپیوتەر لەڕێگەی دوورەوە هەڵسێت بە فەرمانکردن، کۆنترۆڵ کردن، پێوانەکردن، ڕێکخستن، یاخود

چاودێری کـردنی دەزگـا هونەرییەکـان. بەڕێوەبردن لەڕێگەی دوورەوە ئەوە مـومکین دەکات کە زانیارییە جۆراوجۆرەکان لەخاڵە جیاوازەکان وەرگرێت و بەپێی زەروورەت گـۆڕانکاری پێویست لەم زانیـارییـانەدا بکات. بەرپرسەکـانی ڕێنمـایی کـردنی ئەم سیستـمە لە خـاڵەکان یاخود پایە تایبەتییـەکاندا دەتوانن لەکاتێکدا کە مومکین نەبێت لەڕێگەی دوورەوە هەنگاو بنێن دەتوانـن مەئموری خۆیان بنێرنە ئەو شوێنە. ئەم جـۆرەی بەڕێوەبردن کـە لە سـەرەتادا لەو بوارانەی کـە بەتەواوی هونـەرین وەک ڕووناککردنی فـەزای شـارەکـان، دابەشکردنـی ئاوی خـواردنەوە، ڕێکخـستـنی سیستمەکانی گەرماو سەرما، گواستنەوەی وزەی کارەبا، و ... دەستی پێکرد. ئەمڕۆ بەشـێکی بەرچاوی کـەرتە بەڕێوەبردنەکـانی لەبەشی خـزمـەتگوزارییـەکـانیش گرتووتەوە. لەو بەشانەی کە زیاتر لەهەموویان کەوتوونەتە ژێر کاریگەری ئەم پرۆسە نوێیە، خزمەتگوزارییە بازرگانییەکانن بەتایبەتی کاروبارەکانی داواکاری، کڕین، دابەشکردن، و فرۆشتن. ئەم سیسـتـمە نوێیە ئەنجامدانی چالاکییە ئیدارییەکانی لەمـاوەی کـاژێرە ئیـدارییـەکـانی تێـپەڕاندووە، بەشـێـوەیەک کە بەرەبەرە زۆربەی چالاکـییـەکـان لەمـاوەی ٢٤ کـاتژمـێـردا مـومکیـنن. لەلایەکی ترەوە بڵاوبوونەوەی زانستەکانی کۆمپیوتەرو ئاسانی پرۆسەی گەیشتنی هەمووان پێی، ئەنجامدانی ئەم خزمەتگوزارییانەی بەڕێژەیەکی زیاد لەجاران لە دەسـتی پسـپۆرو تەکنیسـینەکـان دەرهێناوەو کـردوونی بە «جـەمـاوەری» [ ١٣-٣/٢١١ ]. دەتوانین لە داهاتوویەکی نزیکدا چاوەڕوانی سەرهەڵدانی «بەڕێوەبەرایەتییە بێ سنوورەکان» بکەین.

### بەڕێوەبردن و حکومەتی ڕاپەڕێنەران

تاکو پێش سەدەی نۆزدەیەم لەزۆربەی وڵاتەکان زۆربەی گرووپەکان لەژێر نفووزی ڕابەرێکی بەهێـزدا ڕێکخـرابوون و باوەڕی باو ئەوەبوو کـە چەند تاکـێکی ئاقڵ و بەئەزموون و باشتریش ئەگەر لەخانەدانەکانبن، دەتوانن باشتر لە جەماوەری خەڵک کۆمەڵگا بەڕێوە ببەن. سەدەی نۆزدەیەم شایەدی سەرهەڵدانی ئەو گرووپ و کۆمەڵە جۆراوجۆرانە بوو کە باوەڕیان بە پرەنسیپێکی جیاواز هەبوو و ئەویش ئەوەبوو کە کـۆنتـرۆڵی دیموکـراتی لەسـەر بڕیاری کـاربەدەسـتـان کـارێکی زەروورییـە، هەروەها تەنانەت ئەو کـۆمەڵانەی کـە لایەنگری دیموکـراسین لەو بڕوایەدابوون کـە کـۆنتـرۆڵی ڕێکخـراوەکـان پێـویسـتـە لەدەسـتی چەنـد کـەسـێک لەرابەرەکـان دابێت. ئەم ڕەوتە زۆربەی جـاران بەم شـێـوەیە لایەنی پراکـتـیکی پەیدا کـرد کـە یاخـود گـرووپێـک لە

کاربەدەستە تینوویەکانی دەسەلات بەشێوەیەکی لێزانانە هەڵساون بە تەحریفکردنی ئامانجە دیموکراتییەکانی گرووپ و دەسەلاتیان گرتووتە دەست یاخود ئەوەی بەو شێوەیە پاساو دەهێننەوە کە تاکە ئاساییەکان هێشتا نەیانتوانیوە خوێندن و ئەزموونی کافی بۆ بەڕێوەبردنی ڕێکخراو بەشێوەیەکی دیموکراتی بەدەست بهێنن.

پێش چەند دەیەیەک زانای کۆمەڵناسی ئەورووپی «رابرت مایکلز»(R. Mickels) بابەتی مانەوەی ئاراستە دەسەلاتخوازەکان لەناو حزبی سوشیال دیموکراتی ئەلمانیا دا واتە ئەو ڕێکخراوەی کە خۆی بە دوژمنی هەموو هێزە دیکتاتۆرەکان دادەنا کۆڵییەوە. گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە باڵادەستی گرووپێکی بچووکی رابەران نە پەیوەستە بەپێنەگەیشتوویی ئەندامان و نەدەسەلاتخوازی رابەران بەڵکو زیاد لەهەر شتێک ئەنجامی چەند سیمبولێکە کە لە هەموو ڕێکخراوێکدا هەن. لەم بارەیەوە دەنووسێت:«ئەوە ڕێکخراوە کە باڵادەستی هەڵبژێردراوان لەسەر ئەوانەی هەڵدەبژێرن دەهێنێتە ئاراوە، کە پارێزەران بەسەر موەکیلەکان باڵادەست دەکات و نوێنەرانیش لەسەر دەنگدەران. ڕێکخراو واتە حکوومەتی تاکی راپەڕێنەر» ، وئەو ئەم دیاردەیە بە یاسای ئاسنینی حکوومەتی راپەڕێنەران ناو دەنێت.

حکوومەتی راپەڕێنەران لە هەموو ڕێکخراوە ڕەسمییەکاندا بەچاوپۆشی لەرادەی فراوانییان گەشە دەسەنێت. تەنانەت لەڕێکخراوە زۆر بچووکەکانیشدا ئەم ئاراستەیە دەخرێتە روو کە بەڕێوەبردن لە گرووپێکی کەم و بچووک پێک بێت. حکوومەتی راپەڕێنەران راستەوخۆ لە سیمبولی بەشداری ئەندامە ئاساییەکانی گرووپ سەرچاوە دەگرێت. ئەم ئەندامانە بەزۆری بە نارێکوپێکی بەشداری لەدانیشتنەکاندا دەکەن و لەهەندێک حاڵەتدا هەندێکیان قەتاوقەت بەشداری ناکەن. ئاگادارییان لەمەڕ مەسەلەکانی ڕێکخراو یاخود گرووپ لاوازە، وئیمکانی ئەوەی کە بتوانن لەگەڵ ئەندامانی تر یەکگرن و کۆنترۆڵی واقعی کاری دامەزراوە بکەن، کەمە. لە بارودۆخی وادا چەند کەسێک لەو ئەندامانەی قابیلیەتیان هەیە و بیانەوێت کات وسەرنجی خۆیان لەسەر ئەو ئەرکانە دەربڕن کە پێیان راسپێردراون دەتوانن بەئاسانی کۆنترۆڵ بگرنە دەست. ئەوان بەزۆر ئەو دەسەلاتە لەوانی تر وەرناگرن بەڵکو بەهۆی تاکەکانی ترەوە کە نایانەوێت خۆیان بخەنە نێو سەر ئێشەوە دەخرێتە بەر دەستیان.

لەڕێکخراوە گەورە ڕەسمییەکاندا، زەروورەتی بیروکراتییەتی ڕێکخراو، هەلی ئایدیالی بۆ گەشەسەندنی حکوومەتی راپەڕێنەران دەرەخسێنێت. هیچ ڕێکخراوێکی

گەورە ناتوانێت بەبێ بیروکراسی کاربکات. بیروکراتەکان ئەو کەسانەن کە زانیاری زۆریان هەیە لەبارەی ڕێکخراو، سوود لە ئیمتیازی ناونیشان و مانشێتەکان وەردەگرن، پێشینەی چالاکییەکان و پێرستی ناوی ئەندامانی ڕێکخراویان لەبەر دەستە، بودجە، سەرمایە یاخود مافی ئەندامێتی (لەکۆمەڵەکاندا) لە کۆنترۆڵی ئەوان دایە. شۆڕشی سەرکەوتووانەی ئەندامەکان بەزۆری کاتێک ڕوودەدات کە درزێک بکەوێتە نێوان بەڕێوەبەرە ڕاپەڕێنەرەکان و پشتیوانی ئەندامانی بەدواوە بێت. ئەو شەپۆلەی دژایەتی یاخود شۆڕش، ڕاپەڕێنەرە نوێیەکان لە ڕێکخراودا جێگیردەکات، کە زۆربەی جاران لەماوەیەکی درێژدا لەوانەیە بەشێوەی دەستەی پێشتر کار بکەن. ئەو پرسیارەی لەوانەیە لێرەدا بێتە پێش ئەوەیە کە ئایا ئەمە بەزەرورەت یەکێکە لە ڕاستییەکانی هەموو ڕێکخراوێک یاخود ئەوەی کە تەنیا سیمبولێکە و ڕێکخراوێک دەتوانێت پەیڕەوی بکات. حکوومەتی ڕاپەڕێنەران بەزۆری لەکەمتەرخەمی ئەندامان سەرهەڵدەدات، کە ئیمکان دەڕەخسێنن دەسەڵات بکەوێتە دەست ئەو کەسانەی کە بیانەوێت کات و توانای خۆیان لەڕێکخراودا بەکارببەن[٦٧/ ٢١٢-٢١٤].

پێویستە لەم باسەدا بەبیر بهێنینەوە کە لەوڵاتە گەشەسندووەکاندا، یەکێک لەو ئاراستانەی کە دیارە خەریکبوونی تەکنوکراتەکانە بەچەندین کاری جیاوازەوە لەیەک کاتدا، ئەو دیاردەیەی کە سەرەڕای چەند هەموارکردنێکی جیاواز هێشتا بێ ئاکام ماوەتەوە، و هەڵبەت ئەمە کێشەیەکی نوێ نییە.

### تەکنوکراسی و تەکنوکراتەکان

وشەی «تەکنوکراسی» (Technocracy) یاخود «هونەری سالاری» یەکەمین جار لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو لە دەوروبەری ساڵەکانی ١٩٣٠ بە هۆی گرووپێک لە پسپۆرە هونەرییەکان و ئابووریزانان کە ڕابەرایەتییان لە ئەستۆی «هوارد سکۆت» (H. Scott) بوو بەکارهێنرا. ئەم گرووپە کە خۆیان بەلایەنگری کۆمەڵناسی بەناوبانگ «ڤێبلن» (T. Veblen) دادەنا کە خوازیاری گرتنە دەستی بەڕێوەبەرایەتی ئابووری ئەمریکا بوو تاکو بتوانێت لە داهاتوودا بەر بە قەیرانە ئابوورییەکان (وەک قەیرانی ئابووری ساڵی ١٩٢٩) بگرێت. بە بڕوای ئەوان پێویست بوو دەسەڵاتی سیاسی لە دەستی سیاسەتمەدارو بازرگانەکان دەربێنرێت و بکەوێتە دەست ئابووریزان و ئەوانەی ئەهلی زانستن، چونکە تەنیا لە توانای

ئەواندایە کە کۆمەڵگا بەپێی زەروورەتەکانی گەشەسەندنی تەکنەلۆجی بەڕێوە ببەن و ئابووری کۆمەڵگاش بەپێی توانا زانستییەکانیان ڕێکبخەن. ئەم هزرو بیرانە بوونە هۆی ئەوەی کە چەمکی «تەکنۆکراسی» باو ببێت [ ٤٠/١٨٤-١٨٥ ].
کاتێک ئەم چەمکە یەکەم جار لە کۆمەڵناسیدا بەکارهێنرا، یەکەم تارادەیەک دیقـەتی وردیی خـۆی لەلایەنی پێناسـەوە لە دەست داو دووەم، بەکـار هێنانێکی کینایییانەو رەخنەگرانەی بە خۆوەگرت. لە کۆمەڵناسیی ئەمڕۆدا بە کەسانێک دەڵێن تەکنوکرات کە خاوەنی زانیارییە هونەری، زانستی یاخود ئیدارییەکانن و لەبەر ئەو شوێنگەیەی کە هەیانە سەلاحییەتی دەسەڵاتی بڕیارە گرنگەکانیان هەیە، و ئەم هێزە جۆرە دەسەڵاتێکی سیاسیشیان پێدەبەخشێت. مەیلی ئەم گرووپە زیاتر ئەوەیە کە شوێنی سیاسەتمەدارە پیشـەییە کۆنەکان لە حکوومەتداو هەروەها جێگەی خاوەن دامەزراوە بەرهەمهێنەکان لە کارگەکاندا تایبەت بکەن بە خۆیانەوە. ئەو هۆکارەی کە ئەم پێشەوەچوونەیان بە پێشکەش پێدەبەخشێت سەلاحییەتی هونەری زانستیی ئەوانە.
کۆمەڵناسان لەبارەی پێگە کۆمەڵایەتییەکانی تەکنوکراتەکان تەبانین. «بورنهام» لە کتێبی «سەردەمی بەڕێوەبەران» دا ئەو حاڵەتە دەخاتەڕوو کە شۆڕشی کۆمەڵگای پیشەسازیی نوێ بێگومان بەرەو «شۆڕشێک لە بەڕێوەبەرایەتیدا» دەچێت، واتە دەسـەڵات وەرگـرتنی پسـپـۆرانی هونەری و بەڕێوەبەرەکـان لە قـاڵبی «چینی بەڕێوەبەران»دا. لەلایەکی ترەوە «جۆرج گورڤیچ» (G. Gurvich) لە باسەکەیدا لە «بەپیشەسازیبوون و تەکنوکراسی» ئاماژەی بەوە کردووە کە ئەوان (تەکنوکراتەکان) بەرەبەرە چینێکی کۆمەڵایەتی خودموختار دێننە ئاراوە. «میترانی» (N. Mitrani) لەو بڕوایەدایە کەتەکنوکراتەکان چینێکی کۆمەڵایەتی نین، بەڵکو کەمایەتییەکی نێو نەتەوەیین.
ئەم ڕوانگانە بە هەر شێوەیەک بن، تەکنوکراسی جۆرە «حکوومەتێکی هونەرە»کە هەوڵدەدات سەربەخۆیی خۆی بەدەست بهێنێت. لە وڵاتە سۆشیالیستیەکانی جاران (بێگومـان پێش ئەو گـۆڕانکارییـانەی سـاڵی ١٩٩٠ بەدواوە روویان)دا تەکنوکـراتەکـان لەگـەڵ سـیـاسـەتمەدارەکـانی حکوومـەتی ناوەندی و لە وڵاتە سەرمایەدارییەکاندا لەتەک دەسەڵاتە ئابوورییەکاندا قۆناغگەلێکی پڕ پێکدادان و دژایەتییان بڕیون. لە وڵاتە گەشەسەندووەکاندا گرفتی تەکنوکراتەکان لە پێکهاتەی تەقلیدی کۆمەڵایەتی ئەو کۆمەڵگایانەو بوونی گرووپە تەقلیدییە دەسەڵاتدارەکان

سەرهەڵدەدات کە دژی هەر جۆرە گۆڕانێکن. لەگەڵ ئەمەشدا لە هەموو خاڵەکانی جیهاندا تەکنوکراتەکان لە بەڕێوەبەرە پایەبەرزە حکوومی یاخود پیشەسازییەکان (حکوومی یاخود تایبەتی) پێکهاتوون و ئەم گرووپە بە زۆری پۆستە بەڕێوەبەرایەتییەکانیان داگیرکردووە [ ٤٠/١٨٤-١٨٥].

هەر چەندە تەکنوکراتەکان بایەخێکی هێندە بە «ئایدیالیستەکان»، «ڕۆشنبیران» و بەشێوەیەکی گشتی ڕەخنەگرەکان نادەن، و لە راستیدا کاری خۆیان دەکەن، بەڵام پێویستە بەبیر بهێنینەوە کە تەکنوکراسی بە تایبەتی لە چەند دەیەی کۆتاییدا ڕووبەڕووی ڕەخنەی زۆر بووتەوە. لیبراڵەکان ڕەخنە لە تەکنوکراتەکان دەگرن و بە «کارمەندی نابەرپرسیار»یان ناودەنێن، ئەو کارمەندانەی کە لە راستی دابڕاون و خاوەنی ئاراستە خەیاڵی و ئەبستراکتییەکانن. لە کۆتایشدا لەلایەکی ترەوە «مارکسیستەکان» بە «نۆکەرانی سەرمایە»یان ناودەنێن.

**کۆمەڵە خۆبەخشەکان**

کۆمەڵەکان (Association) ئەو گرووپانەن کە لە کۆبوونەوەی چەند تاکێک و بەمەبەستی ئانجامدانی ئەو مەبەستانە دروست دەبن کە تاڕادەیەک دیاریکراون، و تاکەکان بۆ رازیکردنی حەزە کۆمەڵایەتییەکانیان دەبن بە ئەندامیان. دەتوانین کۆمەڵە زانستی و پسپۆرییەکان لە بوارە جیاوازەکاندا، یانەکان، ڕێکخراوە خەیری و خۆبەخشەکان، و هەندێک لە ڕێکخراوە بازرگانییەکان بە کۆمەڵە ناوزەد بکەین. لە ڕیزی ڕێکخراوە ناحکوومییەکان (NGO) (واتە: نۆن گۆڤەرمێنت ئۆرگانیزەیشن) دا دادەنێین.

هەر تاکەکەسێک لە دیدگای پەیوەندییە گرووپییەکاندا لەوانەیە سێ حاڵەتی جیاواز وەرگرێت. لە گرووپی یەکەمدا لە پەیوەندییەکی نزیکدایە لەگەڵ ئەوانی تر، لە گرووپی ناسەرەکی (ثانوی)دا پەیوەندییەکانی لە چوارچێوەی ڕێکخراوبەندییەکی تایبەتیدا ڕێکدەخرێن، بەڵام پەیوەندییەکانی لە کۆمەڵەدا ڕێکەوت و تێپەڕن. لە وڵاتە پیشەسازییەکاندا ئەو جیاوازییەی کە لە نێوان هاوسێیەتی شوێنی و هاوسێیەتی کۆمەڵایەتیدا هەیە، لە ڕاستیدا جیاوازییەکە لە جەوهەری جیاوازی گرووپی کۆمەڵایەتی لەگەڵ گرووپی ناسەرەکیدا سەرهەڵدەدات. لە حاڵەتی یەکەم (هاوسێیەتی شوێنی)دا تاکەکان بەدەگمەن یەکتر دەناسن وپەیوەندییەکانیان لاوازن، لە حاڵەتی دووەم (هاوسێیەتی کۆمەڵایەتی)دا تاکەکان هەوڵدەدەن جۆرە

ژیانێکی دەستەجەمعی بهێننە ئاراوە [٣٣/١١٣].

ئەم کۆمەڵانە جۆرێکی رێکخراوە رەسمییەکانن کە تیایاندا هەموو یاخود زۆربەی تاکەکان بەشێوەیەکی ئازادو کاتی کاردەکەن، و تەنیا هەندێ کات دەتوانین گرووپێکی تاکەکان لە نێو ئەم کۆمەڵانەدا بدۆزینەوە کە راپەڕاندنی کارە هەنووکەیی و رۆژانەییەکانیان لە ئەستۆیە. زۆربەی جۆرەکانی رێکخراوە خۆبەخشەکان لە ئاستی ناوخۆیی، نەتەوەیی، یاخود نێو نەتەوەییدا لە بوارە جیاوازەکانی وەک کۆمەڵە ئایینییەکان، کۆمەڵە زانستییەکان، یانە خۆشگوزەرانییەکان، یانە سینەماییەکان، و کۆمەڵە خۆجێییەکاندا چالاکی دەنوێنن و خاوەنی بەرپرسە خۆبەخشەکان، پرۆگرام، و بڕیار و شێوازەکانن، کە زۆربەی جاران توانای گۆڕانی زۆریان هەیە و هەندێک جار فەرامۆش دەکرێن یاخود پشت گوێ دەخرێن. لەو رێکخراوانەدا لایەنە نارەسمییەکان بەڕادەیەکی زۆر سێبەر لە رێکخراوی رەسمی دەکەن. هەروەها کاتێک ژمارەی ئەندامەکان تا ڕادەیەک کەم بێت و گونجانێکی گشتی لە زەمینەی ئامانجە سەرەتاییەکاندا هەبێت، ئەرکە نارەسمییەکان کارایییەکی زۆریان هەیە. لەم حاڵەتەدا، ئەو ئەرکانەی کە تاکەکان حەزیان لێدەکەن، بەکەمترین رادەی گرفتە ئیدارییەکان شێوە وەرگرن. کاتێک ژمارەی ئەندامەکان زۆربێت یاخود لە رووی جوگرافییەوە زۆر پەراگەندەبن، و بەتایبەتی ئەو کاتەی کە ئامانجەکان و پرۆگرامەکان جۆراوجۆربن، سروشتییە کە ئەو رێکخراوەی رەسمیترو وشکترە گەشە دەسەنێت. ئەوکاتەی کە کۆمەڵە فرەوان بێت و ئەندامەکانی لە ناوچە جیاوازەکانی وڵاتێکدا یاخود جیهاندا پەراگەندەبن، پێویست دەکات کە ستافی هەمیشەیی لە شێوەی بیروکراسییەتێکدا چالاک بێت تا کاروبارە هەنووکەییەکان راپەڕێنێت و گرووپێکی هەڵبژێردراویش لە بەڕێوەبەران هەڵسێت بەدەستنیشانکردنی پرۆگرامی گشتیی. لە زۆر لە حاڵەتەکاندا ئەرکی ئەندامەکانی دەستەیەکی بەڕێوەبەری ئەم رێکخراوانە بەکردەوە سنووردار دەبن بەوەوە کە ئەو پرۆگرامانەی بەهۆی ئەندامە پسپۆرو هەمیشەییەکان دیاری دەکرێن پشتگیریان لێ بکەن. لە حاڵەتێکدا کە وەکو دیارە ئەوان کۆنترۆڵکردنی رێکخراوو ئەندامەکانیان لە ئەستۆدایە، بەڵام بەکردەوە کۆنترۆڵی واقیعی لە ئەستۆی گرووپێکی بەڕێوەبەرو ئەو پسپۆرانە دایە کە لەم رێکخراوانەدا کاردەکەن [٧/٢٠٢-٢٠٦].

دەتوانین کۆمەڵەکان لەرووی دیسپلینەکانی: بوونی ئامانجە دیاریکراوەکان، نۆرمە تایبەتییەکان، پرۆگرام، سیستمی دەسەڵات، ئەندام وەرگری، بوونی

مـومـتـەلەكـات و دەزگـاكـان، نـاو، ئارم و هەمـوو نیشـانە دەشـتنیـشـانكەرەكـان، لە گرووپ و وێكخراوە نارەسمییەكان جیابكەینەوە.

### كۆمەڵەو كۆمەڵگا

كار لە كۆمەڵەكاندا جەوهەرێكی خۆبەخشانەی هەیە، و خۆبەخش ئەو كەسەیە كە ئازادانە خۆی دەروەست دەبینێت بۆ راپەڕاندنی ئەو كاروبارو خزمەتگوزارییانەی لە ژێر رابەرایەتی كەسێكی تردا رێنمایی دەكرێن. بۆ ئەم هەنگاو نانە كرێ وەرناگرێت، لەلایەنی یاساییەوە مـولزەم نیـیـە، كـارو هەنـگاونانـەكـان لە دەرەوەی كـاتەكـانی پیـشـەیی و خـێـزانی ئەنجـامـدەدات. خـۆبەخش مـایەی سـەرەكی كـۆمـەڵەیەو بەبێ ئامادەبوون و خزمەتگوزارییەكانی ئەوان كـۆمەڵە ئامادەییەكی راستەقینەو گـونجاوی نییە. دەتوانین چالاكی كۆمەڵەكان لەلایەنی جیاوازەوە پۆلین بكەین و لە دیدگایەكی زۆر گشـتـیـدا گـرووپە سـەرەكـیـیەكـانی ئـەم كـۆمـەڵانە لەرووی بابەتییـەوە بریتین لە: زانستی، فێركردنی، پزیشكی، خێزانی، گرووپە تەمەنی و رەگەزییەكان، ئابووری (ئیـشكردن، بەرهەمهـێنان، بەكـاربردن، دابەشكردن)، خـۆشگوزەرانی، گـوزاری، و وەرزشی [١١٤/٩٩-١٠١].

كۆمەڵگا نوێیەكان بەرادەیەكی زۆر شایەدی دروستبوونی كۆمەڵە جیاوازەكانن و ئامارەكـان لە زۆربەی وڵاتەكـاندا زیاد بوونی بێ پێشینەیان پیشـاندەدەن، هەروەها هەر چەندە لە هەندێ حاڵەتدا بەتایبەتیش لە وڵاتە گەشەسەندووەكاندا بوونی ئەوان لایەنێكی «وێنەیی»و بە دەربڕینێكی باوتر «تـەنیـا لـەسـەر كـاغـەزەكـان» هەن و ژیانیـان لە بوونی چەند تاكـێـك وەك ئەندام یاخـود دەسـتـەی بەڕێوەبەرایەتیـدا كورتدەكرێنەوە. لەو وڵاتانەدا كە «كاری گرووپی» زەحمەتە، كۆمەڵەكانیش ناتوانن زۆر چالاك بن، مەگەر لە هەلومەرجی تایبەتیدا [٦/٢٣٧-٢٣٨].

بێگومان بە شێوەی هەمـوو گرووپبەندییە كۆمەڵایەتییەكان، كۆمەڵەكانیش بێ لە پێنەگـەیشتن و كـەمـوكـوڕی یاخـود لاسـاری نین و لە پەیوەندیدا لەگـەڵ ئەوان مـەسـەلەكـانی وەكـو سـازشكاری، گـرووپچـیـەتی، خـراپ بەكـارهێنانی دەسـەڵات، هەلپەرێسی، گەندەلی دارایی.... دەخرێنە روو.

كـۆمـەڵەكـان لەگـەڵ كـۆمـەڵگا دەگـۆڕێن و تارادەیەك لە زۆربەی وڵاتەكـاندا بە درێژایی سـەدەی بیسـتـەم (بەتایبـەتی لە وڵاتە پێشكەوتووە پیشـەسـازییـەكـان) جـۆراوجـۆری و گـەشـەسـەندنی زۆریان بە خـۆوە بینیـوە و ژمـارەیەكـیـان هەر چەند

کەسیش بن لە ئاستی نێونەتەوەییدا کار دەکەن، لە وڵاتە جیاوازەکان ئەندام وەردەگرن، ژمارەی ستافە ئیشکەرەکان تیایاندا رووەوزیاد بوونە. کۆمەڵەکان پەیوەندی زۆریان هەیە بە حکوومەتەکانەوەو، حکوومەتەکان یارمەتی مادی و مەعنەوییان پێدەبەخشن و هەندێک جاریش سوودیان لێ وەردەگرن بەمەبەستی بەرەوپێش بردنی ئامانجەکانیان [٥/١١٤].

بەزۆری حکوومەتەکان لەبەر ئەوە نیگەرانن لە کۆمەڵەکان، چونکە کۆنترۆڵێکی زۆریان لەسەر کارەکانیان نییە. دەتوانین ریشە مێژووییەکانی ئەم ناکۆکییە لە ئەورووپاو شارستانییەتەکانی یۆنان و رۆمانی دێریندا ببینن [٢١/١١٤].

کۆمەڵەکان بەلەبەرچاوگرتنی ئەو جۆراوجۆرییە زۆرەی کە هەیانە، ئەو تاکانە لەیەکتر کۆدەکەنەوە کە هەنگاونانیان بەشێوەیەکی دەستەجەمعی هەڵبژاردووە. کۆمەڵەکان دەتوانن لەگەڵ هەموو کایەو ژینگە کۆمەڵایەتییەکان لەپەیوەندیدا بن. کۆمەڵەکان بە درێژایی مێژوو لە حووکمی جۆرە هەنگاونانێکی دەستەجەمعیدان کە لە پەراوێزی دامەزراوە رەسمی یاخود حکوومییەکاندا لە فەزایەکدا کە تاڕادەیەک ئازادترە کاریان کردووە، لەوانەشە لەبەر ئەو هۆیە بێت کە جار بەجار زۆر لە بەرپرسە حکوومییەکان لە ناوچە جیاوازەکانی جیهانداو لەسەردەمە جیاجیاکاندا بەگومان و دوودڵییەوە لە هەندێکیانیان روانیوەو هەوڵیانداوە لەکاریان بخەن [٥/١١٤].

**ئەرکی کۆمەڵەکان**

دەتوانین بەڕاقەی خوارەوە ئەرکە سەرەکی و لە هەمان کاتدا زۆر جۆراوجۆرەکان (لەلایەنی جەوهەر)ی کۆمەڵە خۆبەخشەکان کورت بکەینەوە [٧/٢٠٣-٢٠٦].

١-گۆڕەپانی دەرخستنی بوونی حەزە تاکەکەسییەکان. یەکێک لە هۆیە سەرەکییەکانی حەزکردن لە کۆمەڵە خۆبەخشەکان لەو قابلیەتەدا شاراوەیە کە هۆکارەکانی رازیکردنی حەزەکانی گرووپێکی تاکەکان فەراهەم بکەن، تەنانەت ئەگەر حەزەکانیان لەگەڵ هەموو کۆمەڵگاش هاوبەش نەبن. چەند کەسێک کە حەزیان لە یاری تۆپی پێیە لەوانەیە یانەیەک لەسەر ئاستی وڵات بهێننە ئاراوە، تەنانەت ئەگەر هەڵسوکەوتی کاربەدەستە حکوومییەکان لەشارەکەشیاندا سەبارەت بەو مەسەلەیە زۆر ساردو بێ بایەخ بێت و ئامادەنەبن تەحەمووڵی گۆژمەیەک بکەن لەم رێگەیەدا. رەنگە چەند کەسێکی تر لەیەکتر کۆببنەوە بۆکۆمەککردن بەوانەی کە پێویستییان هەیەو کۆمەڵێکی خەیری بهێننە ئاراوە و ئەوانەی تەبان لەگەڵ ئەو کارە

له گۆشەو قوژبنەکانی ولاتدا خڕبکەنەوە. جۆراوجۆری کۆمەڵە خۆبەخشەکان دەتوانێت جۆرێک لە فرەکولتووری بهێنێتە ئاراوە کەتیایدا بتوانن سەلیقە جیاوازەکان لە کۆمەڵگایەکدا بخرێنەڕوو و تەحەمول بکرێن. ئامانجی ئەو کۆمەڵانە هەر چییەک بێت گرنگییەکەیان لەوەدایە کە ئیمکانی ئەوە بەکەمایەتییەکی خەڵکی دەدات کە چالاکییەکیان هەبێت بەمەبەستی بەدی هێنانی ئامانجەکانیان. بەبێ ئەوەی بەهۆی زۆرینەیەکی دژ یاخود بێ موبالات بخرێنە لاوە.

٢- کایەی ئەزموونی بەرنامە کۆمەلایەتییەکان. کۆمەڵە خۆبەخشەکان دەتوانن گەشە بەبەرنامەیەک بدەن و بەهاکەی پیشان بدەن، و ئەو هەلومەرجانە فەراهەم بکەن کە لە کۆتاییدا کاربەدەستە ناوخۆیی یاخود حکوومییەکان بەڕێوەبردنی کاروبارەکانیان لە ئەستۆبگرن. بەرنامەی تەندروستی و ڕێکخستنەکانی خێزانی لە زۆر لە ولاتەکانی جیهاندا سەرەتا لە ڕێگەی چەند تاکێک و لە چوارچێوەی کۆمەڵە خۆبەشەکاندا دەستیان بەچالاکی کرد، ئەمڕۆ حکوومەتەکان بەلای کەمەوە قەبوولی بەشێکی گوژمەکانی ئەو کۆمەلانەیان کردووە و دەستیان بە چالاکییە جۆراوجۆرەکانی دیکەش کردووە لە بوارە ناوبراوەکاندا.

زۆر لە چالاکییە خۆشگوزەرانییەکانی کۆمەڵگا نوێیەکان لەو کۆمەلانەدا هاتنە ئاراوە کەسەرەتا هەستیان بە زەروورەتە کۆمەلایەتییەکەیان کرد، هەروەها دەستیان بە بەرنامەکە کرد، و هەڵسان بەفێرکردنی خەڵکی، تاکو ئەو رادەیەی کە حکوومەتەکان بەرپرسیارەتییان لە زەمینە ناوبراوەکاندا پەسەندکرد. بۆ نموونە لە ئێراندا، چەند ماوەیەک پێش ئەوەی حکوومەت بەرپرسیارەتی کاروباری کەم ئەندامەکان لە رووی دەرمان، فێرکردن، پیشە، و لە ئەستۆبگرێت گرووپە جیاوازەکان لە ژێر ناوی وەکو کۆمەڵەکانی پارێزگاریکردن لە نابیناکان، گوێ گرانەکان، ئیفلیجەکان، کەڕولاڵەکان هاتبوونە ئاراوە.

٣- کەناڵی ئەنجامدانی چالاکییە کۆمەلایەتییە سوودمەندەکان. کۆمەڵە خۆبەخشەکان ئیمکانی ئەوە بەتاکەکان دەدەن کە بەشدارییان لە بڕیاردانە سەرەکییە کۆمەلایەتییەکاندا هەبێت. زۆر لە پسپۆران لەو بڕوایەدان کە ئەمە یەکێکە لە رەهەندە گرنگەکانی پرۆسەی بەدیموکراتی بوونی کۆمەڵگا. ئەم ڕێکخراوانە سێ رۆڵی سەرەکییان هەیە لەم بوارانەدا بەمەبەستی پارێزگاریکردن لە دیموکراسی سیاسی لە ولاتەکاندا کە بریتین لە:

أ- دابەشکردنی دەسەلات لە زەمینەی ژیانی کۆمەلایەتیدا لە نێوان گرووپەکانی

بەشی زۆری خەڵکی، لە جیاتی تایبەتکردنی بە دەزگایەکی ئیداری مەرکەزییەوە.

ب- دروستکردنی هەستی رازیبوون لە پرۆسەی بەدیموکراتی بوونی کۆمەڵگا، چونکە ئیمکان بەتاکە ئاساییەکان دەدات بۆ ئەوەی لە ڕێگەی پەیوەندی راستەوخۆ بەکاروبارەکانەوە ببینن کە تا چ رادەیەک ئەنجامدانی هەنگاونانە جۆراوجۆرەکان رووبەڕووی سنووردراری و گرفتەکان دەبێتەوە، لە جیاتی ئەوەی کە تاکە[illegible]ان زۆر دوور لە مەسەلەکان راوەستن و کاروبارەکان بۆ ئەوان حاڵەتی ناتاک[illegible]ەسی و ناقابیلی تێگەیشتنی بۆ ئەوان وەرگرن.

ج- ئامادەکردنی میکانیزمێکی کۆمەڵایەتی پێویست بۆ بەرقەرار کردنی گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییە بەردەوامەکان.

**کورتەی بەش**

١- دامەزراوەی کۆمەڵایەتی سیستمێکی ڕێکخراوە لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان کە وەڵامی پێویستییەکانی کۆمەڵگا دەداتەوە.

٢- گرنگترین دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان بریتین لە: پەروەردەو فێرکردن، ئایین،خێزان، حکوومەت و ئابووری.

٣- لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا رۆڵی هەموو دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان لە خێزاندا کورت دەبێتەوە.

٤- دەتوانین دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان لە رووی ئەرک، پێگە، دامەزراوە لاوەکییەکان و رووکارە دەرەکییەکانەوە بخەینە بەر لێکۆڵینەوەوە.

٥- دامەزراوەی کۆمەڵایەتی لە پەیوەندیدایە لەگەڵ دوو چەمکی پێکهاتەو ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی.

٦- کۆمەڵەکان بەشێکن لە دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان.

٧- رۆڵە دامەزراوییەکان کاریگەرییەکی زۆریان لەسەر رەفتارە تاکەکەسییەکان هەیە.

٨- دامەزراوە دیاردەیەکی جێگیرو بەردەوامە گۆڕانکارییەکانی بەزۆری بەرەبەرەن.

٩- دامەزراوەکان لەپێشدا پلانیان بۆ دانارێژرێت.

١٠- دامەزراوەکان خاوەنی سیمبول و یاسا رەسمی و رەفتارییەکانن.

١١- دامەزراوەکان خاوەنی پلەی جیاوازن لە پێکهاتە.

١٢- دامەزراوەکان خاوەنی ئەرکە دیارو نادیارەکانن و ئەم ئەرکانە جۆراوجۆرن.

١٣- دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان پەیوەندییان بەیەکەوە هەیە.
١٤- ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی کۆمەڵە ڕەگەزێکی جیاوازە کە بوونێکی قابیلی دەستنیشانکردنی هەیە و خاوەنی خەسڵەتی تایبەتییە.
١٥- دامەزراوە ڕەسمییەکان جۆرێکی ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییەکانن.
١٦- دامەزراوەکان جۆرێکی داهێنانە کۆمەڵایەتییەکانن و لەسەر بنچینەی دابەشکردنی کار شێوە وەردەگرن.
١٧- دەتوانین دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان بۆ دوو گرووپی ڕەسمی و ناڕەسمی دابەش بکەین کە لە ڕووی پێکهاتەو دروستبوونی پەیوەندی نێوان ئەندامەکان لە یەکتر جیاوازن.
١٨- ڕێکخراوەکان چەند هۆکارێکن بۆ بەدیهێنانی ئەو چالاکییانەی کە پەیوەستن بە دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان.
١٩- «پارسونز» ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییەکان بۆ چوار گرووپی: بەرهەمهێنانی ئابووری، دەسەڵاتی سیاسی، هاوشێوەیی کۆمەڵایەتی و پارێزگاریکردن و پاراستنی سیمبولەکان پۆلین دەکات.
٢٠- بونیادی ڕێکخراوەیی ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییەکان لە ڕووی ئاستی پتەوییەوە پانتاییەکی فراوانیان هەیە.
٢١- پێکهاتە ڕەسمی و ناڕەسمییەکان کاریگەر دەبن لەسەر ئەرکی ڕێکخراوەکان.
٢٢- پێویستە لە ڕێکخراوەکاندا جیاوازی لە نێوان دوو چەمکی «پایە» و «نفووز» دا بکەین.
٢٣- پێکهاتەی ناڕەسمی دەکەوێتە ژێر کاریگەری دوو فاکتەر: جیاوازییە تاکەکەسییەکان لە ڕووی کەسایەتییەوە، و هەروەها بێ توانایی ڕۆڵە ڕێکخراوەییەکان لە وەڵامدانەوەی پێویستییە ڕێکخراوەییەکان.
٢٤- کولتووری ڕێکخراوەیی لەو چەمکە نوێیانەیە کە کاروبارو دیاردەکانی وەکو تایبەتمەندییە تاکەکەسییەکان پەیوەندی نێوان تاکەکان، پەیوەندی ناو گرووپی و دەرەوەی گرووپی و ژینگە دەخەنە بەر لێکۆڵینەوە.
٢٥- ڕێکخستنی چالاکییە مرۆییەکان ئەو هۆکارەیە کە بیروکراسی دەهێنێتە ئاراوە.
٢٦- خەسڵەتە سەرەکییەکانی بیروکراسی بریتین لە: پسپۆڕی، دامەزراندن لەسەر بنچینەی شایستەیی، ڕەسمییەت و ناکەسی بوون، و بوونی زنجیرەی ڕیساکان.

٢٧- «ماكس ڤێبەر» سێ جۆری تایبەتی شەرعیەتی ڕێکخراوەیی لەیەکتر جیادەکاتەوە کە بریتین لە پیرۆزمەندانە، تەقلیدی، و ئەقلانی.

٢٨- گەشەسەندنی بیروکراسی لە پەیوەندیدایە لەگەڵ ڕەهەندەکانی ڕێکخراو و ئەرکەکانی.

٢٩- لە جاران زیاتر بەگومانەوە لە بیروکراسی دەڕوانرێت،

٣٠- پەسەندکردنی بەرپرسیاریەتییە نوێکان، پەرەی بەبیروکراسی داوە لەسەر ئاستی حکوومەتدا.

٣١- سەرمایە گوزاری پێویستی گەشەسەندنی بیروکراسییە.

٣٢- سوود وەرگرتن لە کۆمپیوتەر لە کۆمەڵگا نوێیەکاندا دیاردەی «بەڕێوەبەرایەتی لە دوورەوە»ی لە جاران زیاتر کردووە بە عەمەلی.

٣٣- لە تایبەتمەندییە نوێیەکانی دیاردەی «بە ڕێوەبەرایەتی لە دوورەوە» چالاکییەکەیەتی لە کەرتی خزمەتگوزارییەکاندا.

٢٤- واپێدەچێت حکوومەتی ڕاپەڕێنەران لە ڕاستییە نکۆڵی لێنەکراوەکان بێت لە ڕێکخراوە گەورەکاندا.

٣٥- تەکنوکراسی حکوومەتی خاوەن زانست و هونەرەکانە لەسەر ڕێکخراوە ئابووری و سیاسییەکانی کۆمەڵگا.

٣٦- کۆمەڵناسان تەبانین لەمەڕ پێگەی کۆمەڵایەتی تەکنوکراتەکان.

٣٧- چالاکی تاکەکان لە کۆمەڵە خۆبەخشەکاندا حاڵەتێکی ئازادو کاتی هەیە.

٣٨- سەرەکیترین ئەرکەکانی کۆمەڵە خۆبەخشەکان بریتین لە: گۆڕەپانی دەرخستنی بوونی حەزە تاکەکەسییەکان، ئەزموونکردنی بەرنامە کۆمەڵایەتییەکان، کەناڵی ئەنجامدانی چالاکییە سوودمەندەکان.

٣٩- خۆبەخش هۆکاری سەرەکییە لە دروستبوونی کۆمەڵەدا.

٤٠- لەوانەیە لە هەمان کاتدا حکوومەتەکان یارمەتی کۆمەڵەکان بدەن، هەروەها لە هەندێک حاڵەتدا هەست بەنیگەرانی دەکەن لە بوونیان.

## پێشەکی

لە ناو جیاوکە (امتیاز) کۆمەڵایەتییە زۆرەکانی ناو کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا پێدەچێت سێ جیاوکی زۆر گرنگ هەبێت، کە بریتین لە: داهات، دەسەڵات و متمانەی کۆمەڵایەتی. تارادەیەک لە هەموو جیهاندا زیاتر ئەوە بەهەند وەردەگیرێ کەکەسێک دەوڵەمەند بێ نەک هەژار، دەسەڵاتداربێت نەک بێ دەسەڵات، بە ئیعتیبارو بەرێز بێت نەک بێ ئیعتیبار و بێ رێز. هەرچەندە ناتوانین بە وردی بڵێین کە ماناو نێوەرۆکی ئەم چەمکانە چییەو کام یەک لەم جیاوکانە گرنگی زیاتری هەیە، بەڵام دەتوانین بڵێین کە ئەم جیاوکانە بەیەکسانی لە نێوان هەمواندا دابەش نەکراون، هەر لەم رووەوە بەردەوام گوتراوەو دەگوترێت.

- بۆچی نایەکسانی لە کۆمەڵگا هاوچەرخەکاندا زیادی کردووە؟
- بۆچی چینایەتیی کۆمەڵایەتی لە هەندێک کۆمەڵگادا توندوتیژترە؟
- بۆچی نایەکسانییەکی زۆر تەنانەت لەو کۆمەڵگایانەشدا کە خۆیان بە «بێ چین» ناو دەبەن بەرچاو دەکەوێت؟

رەنگە هەر لەم رەهەندەوە و لەسەر ئەو مەسەلانە بووە چەندین ساڵ پێش ئێستا عارف و شاعیر «باباتاهیری عوریان» (سەدەی پێنجی کۆچی) لە یەکێ لە چوارینە دڵگرەکانیدا دەڵێ:

**ئەگەر دەستم بگا بە چەرخی گەردوون     تا لێی بپرسم ئەوە چۆنەو ئەمەش چۆن**
**یەکێک پێی دەدەی سەد نازو نیعمەت     یەکێکیش نانی جۆی تێکەڵە بەخوێن**

بەدرێژایی هەزاران ساڵ خەونی زۆربەی گەورە پیاوانی مێژوو ئەوەبووە کە مرۆڤەکان بتوانن بەیەکسانی بژین، چینی کۆمەڵایەتی لێکیان جیانەکاتەوە، دووربن لە لووتبەرزی بەهۆی سەروەت و سامانیان، بەدووربن لە ئەشکەنجەی دەستی هەژاری، بۆچی ئەم خەونانە تەنانەت لەو دەوڵەتانەشدا کە بناغەی ئایدیۆلۆژییەکەیان لەسەر یەکسانی دامەزراندووە، بەدی نەهاتووە؟ تەنها لە چەند کۆمەڵگایەکی سەرەتاییدا کە پشتیان بەراووشکارو کۆکردنەوەی خۆراک بەستووە، دەرکەوتووە کە مرۆڤەکان لە حاڵەتێکی تارادەیەک یەکسانیدا پێکەوە ژیاون. هەرچەندە لە هەندێک کۆمەڵگای هاوچەرخدا هەژاری کەم بۆتەوە، بەڵام لە هەمان کاتدا لەو کۆمەڵگانەشدا جیاوازی نێوان دەوڵەمەندان لەگەڵ هەندێک گرووپی

دیکەدا بەڕادەیەکە هەست و بزاوتی کۆمەڵایەتی و سیاسی یەکسانیخوازانە دێنێتەکایەوە. تەنانەت لە کۆمەڵگا کۆمۆنیستییە تەقلیدییەکانیشدا، کە فەلسەفەی بوونیان لەسەر بێ چینی دامەزراوە، بەردەوام چینی نوێ لەسەر بناغەی دەسەڵات و جیاوکی کۆمەڵایەتی - ئابووری دەرکەوتووە[٨/ ١٦١].

ڕاستییەکەی نایەکسانی نێوان مرۆڤەکانی حاشا هەڵنەگرە. ئێمە دەزانین دەشێ کە خەڵکی لەڕووی جەستەییەوە بەهێز یان لاواز، جوان یان ناشرین، هۆشیار یان ناهۆشیار بن (٤٣/ ٤٥٤).

## توێژ بەندیی کۆمەڵایەتی

کاتێک کۆمەڵناسەکان باس لە توێژبەندکردنی کۆمەڵایەتی (Social Stratification) دەکەن، مەبەستیان ئەوەیە ئەو خاڵە روون بکەنەوە، کە هەندێک کەس لە چەند شوێنگەیەکدان کە بە بەرزترو زیاترو.. هتد لە قەڵەم دەدرێن و هەندێکی دیکەش لە شوێنگەیەکی پێچەوانەدان. دیارە ئەم تێڕوانینە بەو مانایە نییە بۆ نموونە کەسانێک کە لە شوێنگەیەکی بەرزتردان لە خودی خۆیاندا باشتر بن لەو کەسانەی کە لەشوێنگەی نزمتردان و بەپێچەوانەشەوە. با سەیری پۆلێکی خوێندن بکەین ئەگەر پێوانەی باڵای کەسەکان وەکو پێوەرێک لەبەرچاو بگرین تارادەیەک شتێکی سادەیە کە قوتابییەکان لەسێ گرووپدا توێژبەند دەکرێن (باڵا بەرز، مام ناوەندی، کورتەباڵا). هەروەها دەتوانین هەریەک لەم گرووپانەش لەڕووی رەگەزەوە بۆ دوو دەستە دابەش بکەین، بەڵام ئەم جیاوازییانە لە بنەڕەتدا سیمایەکی جەستەییان هەیە نەک کۆمەڵایەتی. ئێمە لە کۆمەڵناسیدا کەسەکان نەک تەنها لەڕووی جەستەییەوە بەڵکو لەڕووی کۆمەڵایەتیشەوە دەیانکەین بە دەستە دەستە. لەو رووەوە کە هەر گرووپ و دەستەیەک لەڕووی هۆشیاریی، تێڕوانین، تایبەتمەندی و رەفتارە کۆمەڵایەتییەکانیانەوە لەگەڵ گرووپەکانی تردا جیاوازییان هەیە.

ئێمە دەزانین کە هەندێ کەس لە خانووی گەورەو خۆشدا دەژین و هەندێکی دیکە لە خانووی بچووک و نالەباردا. هەروەها دەزانین کە لە زۆربەی کۆمەڵگا هەنووکەییەکاندا گەلێک جیاوازی کۆمەڵایەتی و ئابووری لە نێوان تاکەکاندا هەیە، لە کاتێکدا ئەوە لەبیر دەکەین کە هەلومەرجی ئابووری تاکەکەسان لە هیرارکیەتی کۆمەڵایەتیدا کاریگەرییەکی زۆری لەسەر گشت رەهەندەکانی ژیانمان هەیە[١٦٢/ ٨] دەتوانین چەند پێوەرێکی جۆراوجۆر هەڵبژێرین بۆ توێژ بەندکردنی کۆمەڵایەتی،

ئەگەر بمانەوێ جیاوازییەکان لێکدی جیا بکەینەوە، دەبێ بزانین کە بوونی هەر جۆرێک لە توێژ بەندیی کۆمەڵایەتی ئەوە پیشاندەدات کە جۆرێک لە نایەکسانی لە نێوان خەڵکدا هەیە. هەندێک کەس لەچاو کەسانی تر جیاوکی زیاتریان هەیە. باوترین پێودانگ کە وەکو پێوەری توێژبەندکردن بەکار دەهێنرێن بریتین لە: نەژاد، رەگەز، چین و ئێمە لەم نێوەدا «چین» دەکەینە بابەتی لێکۆڵینەوەمان [٢/١٠٩].

زێدەڕۆیی تێدا نییە ئەگەر بڵێین خەسڵەتە هاوبەشەکانی نێوان سەرجەم کۆمەڵگا مرۆییەکان گەلێک زۆرنین و دەبێ بڵێین کە توێژبەندکردنی کۆمەڵایەتی یەکێکە لەو رەهەندانە. لە سەردەمانێکی زۆرکۆنەوە لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا مرۆڤەکان بەهۆی سێ خاسیەتی سەرەکییەوە واتە (رەگەز، تەمەن، گرووپی خزمایەتی) لە یەکتری جیادەکرانەوە. دیارە بەوە باشتر یان خەراپتر نابێت کەکەسێک سەربەم خێزانە بێت یان بەو خێزانە، یان لە جیاتی پیاو ژن بێت، سەرەنجام ئەو نایەکسانییانەی کە لە دابەشکاری نایەکسانەکانی پاداشت و جیاوکە کۆمەڵایەتییە ماناداره‌کانەوە سەرچاوە دەگرن پێیان دەگوترێت «توێژ بەندکردنی کۆمەڵایەتی» توێژ بەندکردن لەراستیدا شێوەیەکە بۆ پلە بەندکردنی مرۆڤەکان. مانای توێژبەندکردن ئەوەیە کە گرووپێک «چەند تایبەتمەندییەک یان چەند شتێکی بایەخدار»ی هەیەو گرووپێکی دیکە نییەتی یا کەمترە لەلای [٨/ ١٦٢-١٦٣].

**هەندێک پێوەرو تایبەتمەندی پێودانگەکانی توێژبەندکردنی کۆمەڵایەتی**

| جۆری پێوەر | پێوەر | سیما جیاکەرەوەکانی |
| --- | --- | --- |
| کۆمەڵایەتی - ئابووری | سامان | ململانێی دەوڵەمەندان و هەژاران |
| کۆمەڵایەتی - ئابووری | کۆمەڵایەتی | مێملانێی نێوان رۆشنبیران و کرێکاران |
| کۆمەڵایەتی - کولتووری | ئاستی خوێندن | ململانێی نێوان خوێندەوارانی سەرەتایی و ناوەندی و باڵا |
| کۆمەڵایەتی - دیمۆگرافی | تەمەن | جیاوازی نێوان گەنج و گەورەو بەساڵاچوو. |
| کۆمەڵایەتی - دیمۆگرافی | رەگەز | جیاوازی نێوان ژن و پیاو |
| کۆمەڵایەتی - بایۆلۆژی | نەژاد | جیاوازییەکانی نێوان نەژادەکان |

### چەمكی چینی كۆمەڵایەتی

بە لەبەرچاوگرتنی ئەو چەند خاڵەی كە لەباسی توێژبەندكردنی كۆمەڵایەتیدا ئاماژەمان پێكرد، دەبینین یەكێك لە گرنگترین پێودانگەكانی توێژبەندكردنی كۆمەڵایەتی «چین»ە و دەتوانین چینی كۆمەڵایەتی بەوە دابنێین كە گرووپێك لە كەسەكان چەند پێگەیەكی كۆمەڵایەتی تارادەیەك هاوشێوەیان هەیەو لەڕووی چەند هۆكارێك وەك جیاوكە خێزانییەكان و هەلومەرجی «پیشەیی - خوێندن - داهات»ەوە تارادەیەك لەگەڵ یەكدیدا یەكسانن ئەوەی كە ئەم پێناسەیە لەبەرچاویدەگرێت كۆمەڵێك پلەوپایەیە لە روانگەی توێژبەندكردنی كۆمەڵایەتییەوە.

ئاشكرایە كە چینی كۆمەڵایەتی لەژێر كاریگەری چەند هۆكارێكی جیاوازەوە دیاریدەكرێت و دەناسرێتەوە و لە كۆمەڵگا هاوچەرخەكاندا گرنگترین هۆكارەكانی دەستنیشانكردنی چینی كۆمەڵایەتی بەشێوەیەكی گشتی دەتوانین بەم شێوەی خوارەوە كورتی بكەینەوە.

١- سامان و داهات.
٢- ئاست و شێوازی فێركردن.
٣- كارو شوێنگەی پیشەیی.
٤- خێزان و گرووپی خزمایەتی.
٥- دەستەڵات و دەستڕۆیشتنی كۆمەڵایەتی و سیاسی.

دیارە دەبێ ئاماژە بەوە بكەین كە یەكەم: ماناو گرنگی ئەم هۆكارانە لە كۆمەڵگا جیاجیاكاندا جیاوازە، دووەم: رادەی كاریگەری ئەم هۆكارانە بەسەر یەكدییەوە چەندین رەنگ و شێوەی هەیە.

**چەند رێگایەكی جیاواز بۆ هەڵسەنگاندنی چینی كۆمەڵایەتی [٢٠/٢٢٣]**

| رێباز | جیاوكەكان | رەخنەكان |
|---|---|---|
| خودی (ذاتی) | زۆرسادە. دەكرێ لەیەك پرسیاردا بكرێت. لەبەرچاوگرتنی چین وەكو یەك دەستە | جیاوازی چەمكی چین بەلای كەسەكانەوە<br>زۆربەی خەڵك چینی ناوەڕاست هەڵدەبژێرن |

| | | |
|---|---|---|
| بابەتی (موضوعي) | سادە - لە ڕێگەی توێژینەوە بەئەنجام دەگات<br>بەکارهێنانی چەند گۆڕاوێک بۆ ناسینەوە | خەڵکی زۆر حەز بەم بەشە ناکەن |
| ناوونازناوی خەڵکی | لە دەستەو کۆمەڵی بچووکدا بەکاردەهێنرێت.<br>لەبەرچاوگرتنی چین وەک دەستەیەکی کۆمەڵایەتی | لە نموونەی گەورە گەورەدا بەکارنایەت<br>بەستراوەتەوە بەبیروبۆچوونی ناو خەڵک |

بەگوێرەی ڕێبازی «بابەتی» چینی کۆمەڵایەتی لەسەر بناغەی چەند تایبەتمەندییەک دەستنیشان دەکرێت ئەم تایبەتمەندییانە هەرچەندە کە لەهەموو بوارێکدا وەک یەک نین، بەڵام بەگشتی بریتین لە: داهات، سامان، هەلومەرجی خۆشگوزەرانی، ئاستی خوێندن، کار، متمانەی کۆمەڵایەتی. لە هەندێک حاڵەتدا توێژەران چەند خەسڵەتێکی دیکەش وەکو (تۆڕی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و شوێنی نیشتەجێبوونیش) دەخەنە پاڵیانەوە. شێوازی کارەکە بەگشتی بەم جۆرەیە، سەرەتا ئەم هۆکارانە پێناسە دەکرێن و پاشان بۆ هەریەکێکیان چەند نمرەیەک دادەنرێت لە شێوەی جیاوکێک، بەکۆکردنەوەی ئەم نمرانەو هەندێ جاریش بەبەکارهێنانی لێکدانیش لەم ژمێرکارییەدا، ئەوکاتە پێگەی چینایەتی هەرکەسێک کە توێژینەوەمان لەسەر کردووە ڕیزبەندی دەکرێت و لە چەند گرووپێکدا دادەنرێت. ئەو گرووپانەش پێیان دەگوترێت «چین» لەبەرئەوەی دەستنیشانکردنی هەندێک لەو پێوەرانە زەحمەتە، هەندێ جار کار وەک پێوەرێکی بنەڕەتی بەکاردەهێنرێت. سەرەڕای ئاڵۆزییەکان، کار ئەو جیاوکەی هەیە کە تارادەیەک بە ئاسانی دەتوانرێ دیاری بکرێت و پەیوەندیشی بەداهات و خوێندنەوە هەیە (بەلایەنی کەمەوە لە هەندێ وڵاتدا). هەرچەند (ماکس ڤێبەر) پێگەی چینە کۆمەڵایەتییەکان لە ڕێگای پێوەرەکانی «سامان و دەسەڵات و ڕێزەوە» تاووتوێ دەکات.

لێکۆڵینەوە لە چینی کۆمەڵایەتی تەنها لە لێکۆڵینەوەی ئاستی خوێندن، داهات، سامان و شتی تردا کورت ناکرێتەوە. چەمکی چین لەوە بەرفراوانترە، چین شتێکە پێی دەگوترێ «هۆشیاری چینایەتی» و ئەو مەیل و هەستانە لە خۆی

دەگرێت کە کەسەکان سەبارەت بە وابەستەیی چینایەتی خۆیان لە کۆمەڵگادا هەیانە. هەندێ جار هۆشیاری چینایەتی وەک رووکاری خودی چین لە قەڵەمدراوە، چونکە پێوانە کردنی زەحمەتەو ناکرێت بەشێوازی «بابەتی» تەواو کاری لەسەر بکرێت [١١٦/ ١١٦-١١٨].

کۆمەڵناسان لە هەڵسەنگاندنی چینی کۆمەڵایەتیدا سوود لە دوو بۆچوون وەردەگرن [١١٥/٢٧٤]. لە لایەکەوە هەندێکیان (بۆ نموونە مارکس و دارندۆرف) چەند چینێکی کۆمەڵایەتی زۆر جیاوازیان جیاکردۆتەوەو هەوڵیان داوە ئەو گرووپە لاوەکییە جیاجیایانەی کە بایەخپێدان و شێوازی جیاجیای ژیانیان هەیە بناسێنن (لە دیدی پەیڕەوانی رێبازی ململانێوە (صراعی) ئەم چینانە لەگەڵ یەکدیدا لە دژایەتیدان). لەلایەکی تریشەوە هەندێک لە کۆمەڵناسان (بۆ نموونە پارسۆنز) بەو ئەنجامە گەیشتوون کە لە هەر کۆمەڵگایەکدا خەڵکی هەمیشە لە خوارەوە بۆ سەرەوە ریزبەندی کراون ئەم کۆمەڵناسانە دەستەواژەی (پێگەی کۆمەڵایەتی - ئابووری) بەکاردەهێنن.

دەتوانین سیستەمەکانی چینە کۆمەڵایەتییەکان لە جیهاندا بکەین بەدوو بەشی سەرەکییەوە: (چینە کراوەکان و چینە داخراوەکان). سیستەمی چینایەتی کراوە بەجۆرێکی سیستەمی چینایەتی نموونەیی دەژمێردرێت کە تیایدا بزاوتی چینایەتی لە چینێکەوە بۆ چینێکی دیکە رێگای پێدراوەو لە بارە.

هەرچەندە ئامانجی ئەم سیستەمە یەکسانی تەواوی دەرفەتەکانە بۆ هەمووان، بەڵام بەقەد ئەوەی بیرۆکەیەکی خەیاڵییە کەمتر واقیعییە [٨/ ١٦٢-١٦٣].

### گۆڕانی چینە کۆمەڵایەتییەکان بەدرێژایی مێژوو

بەدرێژایی مێژووی جیهان نایەکسانی شێوازی جیاوازی بەخۆوە بینیوە، بەڵام یەکەمین و سادەترین و رەنگە کەمترین شێوەی نایەکسانی لەسەردەمەکانی رابردوو لەو کۆمەڵگایە بێ چینانەدا دۆزراوەتەوە کە شێوەی ژیانیان بە راوکردن و خۆراک کۆکردنەوە بەندبووە. رەنگە لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا چینایەتی (لانی کەم بەو مانایەی ئێستا) بوونی نەبووبێ. چونکە ئەو پێگە کۆمەڵایەتی و ئابوورییە تایبەتییانەی کە جیاوکی تایبەتی دەدەن بە خەڵک بوونیان نەبووە [٦٧/ ٢٦٩-٢٧٢].

لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا - دیارە تەنها لە هەندێکیاندا- لەکاتێکدا کە

ئاستی بەرهەمهێنان بەرادەیەک کەم بوو کە جگە لەو خۆراکەی بۆ ژیانی کەسەکان پێویست بوو، هیچ بەرهەمێکی زیادە نەدەمایەوە بوارێکی ئەوتۆش لە ئارادا نەبوو بۆ سەرهەڵدانی جیاوازی چینایەتی. لە کۆمەڵگا کشتوکاڵییە کۆنەکاندا (بەبەراورد لەگەڵ ئەو کۆمەڵگایانەدا کە تەنها بەکۆکردنەوەی خۆراک خەریک بوون بەردەوام چینی کۆمەڵایەتی دەردەکەوتن. لە شارستانییەتە دێرینەکاندا چەند چینێکی دیاریکراو هەبوو لەوانە:

سەربازەکان، ئایینییەکان، دەسەڵاتدارانی دەوڵەت، کۆیلەو بیانییەکان. چاوخشاندنێکی گشتی بەپرۆسەی پێشکەوتن لە کۆمەڵگا سادەو بەرچنەکانەوە بۆ کۆمەڵگای کشتوکاڵی و قۆناغە بەراییەکانی ژیاری شارنشینیدا دەمانگەیەنێتە ئەو راستییەی کە بەردەوام پەیوەندییەکی ئومێدکوژ هەبووە لە نێوان «پێشکەوتن» و «هەژاری»دا.

زۆربەی سیستەمە مێژووییەکان توێژبەندکردنێکی کۆمەڵایەتی زۆر وشک و دەقبەستوویان هەبووەو تەنها ژمارەیەک کۆمەڵگا بزاوتی چینایەتیان تاقیکردۆتەوە. لەم رووەوە «ڤیلفێردو پارێتو» کۆمەڵناسی ئیتاڵیایی بەو ئەنجامە گەیشتووە کە بەردەوام کۆمەڵگاکان رووبەرووی حاڵەتی «سووڕی بژاردەکان» (دورة النخبة) بوونەتەوە چ لە رێگەی سەرنگونکردن یان هەڵمەتەوە یاخود لە رێگەی گۆڕانکارییە سروشتییەکانی ناوەوەی ئەو کۆمەڵگایەوە. بەبڕوای پارێتو کەسەکان لە کۆمەڵگادا بۆ دوو چین دابەش دەبن: چینی سەرەوە کە بژاردەو گەورەکانی کۆمەڵگان، ئەم چینە ژمارەیەکی کەمی خەڵک لە خۆی دەگرێت و، چینی خوارەوە کە زۆرینەی خەڵکی زەحمەتکێشی کۆمەڵگا لە خۆی دەگرێت. ئەو کەسانەی کە لە چینی خوارەوەن چەند خاسیەتێکی بەرزیان تێدایە دەتوانن بچنە چینی سەرەوەو ئەو کەسانەی کە لە چینی سەرەوەدان و بەجۆرێک تووشی داڕوخان دەبن، دادەبەزنە خوارەوە. ئەم کارە دەبێتە هۆی گۆڕانکاری، ئەو گۆڕانکارییەی «پارێتو» پێی دەڵێ (گوێزانەوەی هەڵبژاردەکان) وەرچەرخانی بژاردەکان ئەنجامگیرییەکەی پارێتو ئەوەیە کە کەسە زیرەکەکان (رێوییەکان) بەرە بەرە جێگەی قارەمانانی راستەقینە (شێرەکان) دەگرنەوەو ئەمانەش شێرانی دیکە جێگایان دەگرنەوە. دیارە (پارێتو) تێڕوانینێکی بژاردەگەرانەی (نخبوي) هەبوو و گرنگییەکی زیادەڕۆیانەی بەنمایشی شێرو رێوی دەدا.

لە قۆناغی دەرەبەگایەتیدا - سەدەکانی ناوەڕاست لە ئەوروپا - پاشاو

خانەدانەکان دەیانتوانی کەسانێک لە خوارترین پایەی کۆمەڵایەتییەوە هەڵکێشن بەرەو پێگەی سەرووتر. هەر چینێک لە ژیانی کۆمەڵایەتی وڵاتدا رۆڵێکی تایبەتی خۆی هەبوو. ئەرستۆکراتییەت لەسەری بوو کە بەرگری لە هەمووان بکات، کاری کەشیشەکان دوعا کردن بوو بۆ هەمووان، هەروەها کاری ئەوانی تر ئەوەبوو کە خۆراک بۆ هەمووان ئامادە بکەن. ئەمە پێکهاتەی بەشێکی سیستمی دەرەبەگایەتی بوو. هەر کە ئەم رژێمەش رووی لە رووخان کرد ئەم پێکهاتە چینایەتییەش لەناوچوو. تا ماوەیەکی زۆریش لە سوید هەر چوار چینی خانەدان، کەشیشان، هاووڵاتیان، گوندنشینان، هەرمانەوە، بەڵام لە بەشێکی زۆری ئەوروپادا چەندین ساڵ پێشتر ئەم چینانە لەنێو چووبوون.

لە مێژووی بەلعەمیدا لەوەسفی پاشا (جەمشید)دا گوتراوە کە خەڵکی کردووە بەچوار دەستەوە: جوتیاران، پیشەکاران، بەڕێوەبەرە زاناکان و لەشکرییەکان. هەروەها وای داناوە کە ئەم گرووپانە جگە لە کاری خۆیان نابێ هیچ کارێکی تر بکەن [١١٧/ ١٠]. سیستمی چینایەتی کۆن دەسەڵاتی لە کۆمەڵگادا دابەشکردو سنووری بۆ توانستی تاکەکان دادەنا بۆ گۆڕینی پێگەکەیان. شوێنگەو دەسەڵات و پێگەی کۆمەڵایەتی هەر لە کاتی لەدایکبوونەوە دەدرا بەکەسەکان. ژمارەی ئەو کەسانە زۆر کەم بوو کە دەیانتوانی شوێنگەی خۆیان بەهەوڵی تاکەکەسیی خۆیان بەرزبکەنەوە. تەنها چەند کەسێکی زۆرکەم ئەویش بەماوەیەکی دوورودرێژ ئینجا دەیانتوانی بەهۆی پاشاوە بگەن بەپلەی خانەدانی. زۆرینەی خەڵکی دەبوایە بەپێگەی خۆیان رازیبن. بۆ یادەوەری سەردەمی رژێمی چینایەتی دەتوانین باسی دابەشکردنی ئەنجوومەنی وڵاتی ئینگلیز بکەین بۆ دوو ئەنجوومەنی خانەدان (لۆردەکان)و ئەنجوومەنی گشتی (عموم) [١١٨/ ١٥].

### سیستمی کاست

بەدرێژایی چەندین ساڵ سیستمێکی توێژبەندی کۆمەڵایەتی لە هیندستاندا لەکاردابوو بەجۆرێکی زۆر جیاواز لە پێکهاتەی چینایەتی سەرجەم وڵاتانی تر، کە پێیان دەگوت سیستمی (کاست – Caste). لەم سیستمەدا هەر هیندۆسێک پەیوەندیی بەیەکێ لە چوار کاستە بنەڕەتییەکەوە هەبوو یاخود بێ چین پیس بوو. چوار کاستە (تایەفە) سەرەکییەکەی هیندستان بریتین لە «براهمانەکان» (تایەفەی کاهینان)، و «کشاتریا» (جەنگاوەرەکان) و «وسیا» (کاسبکاران و پیشەکاران) و

«سودرا» (خزمەتکاران). کاست لە هیندستاندا لەگەڵ سەرکەوتنی ئاریاییەکان نزیکی ساڵی (١٤٠٠ پ. ز) سەپێنرا یان، لانی کەم ئەوکاتە برەوی پێدرایەوە. هەروەها سیستمی کاست پەیوەندی بەچەند هەلومەرجێکەوە هەبوو وەک، گۆشکران بەهەستی نایەکسانی، فێرکردنی رۆڵە نایەکسانەکان. گەشەکردنی چەمکەکانی باشتربوون و خراپتربوون (ببووە حاڵەتێکی خودیی لەلای مرۆڤەکان). بەگوێرەی ئەم سیستمە بەرزبوونەوەی رۆحیی بەسترابۆوە بەوەی کەسەکە بۆ خۆی لەتایەفەیەکدا بژێت کە لە سەرەتاوە بۆی دەستنیشان کراوە [٨/ ١٦٦-١٦٧].

هەرکەسێک لە کاتی لە دایکبوونیدا پێگەی کۆمەڵایەتی و دەسەڵاتی پێدەدرێت. «کاست» حاڵەتێکی بۆ ماوەیی هەبوو و پێشکەوتن لە ژیاندا سنووردار بوو. لە سیستمی کاستدا بەهۆی کارەوە پێشکەوتن مسۆگەر نەدەبوو هەروەها زۆر زەحمەت بوو کەسێک بتوانێت لەگەڵ کەسێکی تر کە لە کاستێکی دیکەدابوو ژن و ژنخوازی بکات [٢/٢١٢-٩].

کۆمەڵگای هیندی لەرابردوودا حاڵەتی «ژنخوازی خۆیەخۆیی» هەبوو واتە مرۆڤ تەنها دەیتوانی لەگەڵ کەسێکی دیکە لە تایەفەکەی خۆیدا هاوسەری بکات. سیستمی کاست لەلایەن ئایینی هیندۆسییەوە پشتیوانی لێدەکرا، کولتووری پشتبەستوو بەئایینی هیندۆسی چەند رێسایەکی دانابوو کە پەیوەندی نێوان تایەفە جیاجیاکانی سنووردار کردبوو. ئەم رێسا ئایینیانە پەیوەندیی کۆمەڵایەتی ئاساییشی وەکو هاوسەرێتی حسێب دەکرد. براهمیەک واتە ئەندامی بەرزترین تایەفە لەسەری بوو کە هیچ جۆرە پەیوەندییەک لەگەڵ کەسێکی تایەفەی «پیس»دا پەیدا نەکات، لەسەری بوو کە لەگەڵ «پیسێک» لەسەر مێزێک دانەنیشێت، لەیەک قاپدا لەگەڵیدا نان نەخوات. تەنانەت سێبەریشی بەری نەکەوێت. هەرکاتێکیش براهمیەک ناچاربێت لەگەڵ کەسێکی تایەفەی خوارتر پەیوەندی ببەستێت بەگوێرەی سرووتە کۆنەکانی خۆی دەشووشت و بەم کارەش دەگوترا «غوسڵ»یان خۆپاککردنەوە[١٨/١٨-١٩] لەگەڵ ئەوەشدا کە یاسا نوێیەکانی هیندستان مافی دەنگدان و خوێندنی بەهەمووان داوە، بەڵام هێشتا نایەکسانی کۆمەڵایەتی بەکردەوە بوونی هەیەو لە رێگەی گەلێک رێسای ئەخلاقی و هەروەها نیگەرانی کەسەکان «لە پیسبوونی رۆح»ەوە برەوی پێدەدرێت. لەم ساڵانەی دواییدا هیندستان هەوڵیدا کە لانی کەم نادادگەرانەترین رووکارەکانی «کاست» لە ناوببات. «مەهاتما گاندی» بە پیسەکانی دەگوت خەڵکی خوا ئێستا کە لەمرۆشدا زۆرێک لەو مافانەی کە لە

رابردوودا نەیانبوو پێیان دراوە. سەرەڕای هەموو هەوڵەکان ئەم سیستەمە لە بارێکی نارەسمیدا هێشتا بوونی هەیە. ژمارەی تایەفە لاوەکییەکان نزیکەی «٢٥٠٠» تایەفەیە کە بەزۆری لەسەر بنەمای شوێنگەی کارکردن دامەزراون و ڕووبەڕووی چەندین ئاستەنگی ڕێساکانی «ژنخوازیی دەرەکی»و دابڕان لە یەکتری و گوێڕایەڵی ڕێسا ئایینییە تایبەتییەکانی سیستمی «کاست» دەبنەوە. کەسی هیندۆسی لەو باوەڕەدایە کە بەملکەچبوون ئەم سیستەمە سەر لەنوێ لە دایکبوونی خۆی لەژیانی دواییدا لە کاستێکی بەرزتردا مسۆگەر دەکات [١١٨/ ٣٢٢-٣٢٥].

بینیمان کە «کاست» سیستمێکی داخراوی چینە کۆمەڵایەتییەکانە کە ڕێ لەهەموو جووڵەیەک دەگرێت بەرەو بەرزبوونەوەی کۆمەڵایەتی. لەگەڵ ئەوەشدا کە پێشینەی «کاست» لە جیهاندا دەگمەنە، بەڵام پەیوەستیش نییە بە هیندستانەوە. هەندێک لە خاسیەتەکانی کاست لە سیلان و بۆرما و هەندێک ناوچەی ئەندۆنیزیاو سەرجەم ئەو شوێنانەی کە پەیوەندییان لەگەڵ شارستانییەتی هینیدیدا هەبووە بەرچاو کەوتووە. هەروەها کاست لە چەند ناوچەیەکی زۆر دووری هیندستان بڵاوبووە. نموونەیەکی کاست لە ئەفریقیادا لەناو هۆزەکانی (بەهیما - Bahima) کە کاریان شوانی بووە، بەرچاوکەوتووە یان میللەتانی (بیرۆ - Bairu) کە باخدارییان دەکرد، بەرچاو کەوتووە. میللەتی (حامی تیک بەهیما - Hamitic Bahima) لەلای باکووری ئەفریقاو باکووری ئەسیوپیاشەوە هێرشی کردە سەر میللەتی (بانتۆ - Bantu) کە ناویان بە (بیرو) بردوون و بەسەریاندا زاڵبوون. تایبەتمەندییەکانی کاست لەم گرووپانەدا بریتیبوون لە: جیاوازی کارەکان، قەدەغەی ژنخوازی لەگەڵیاندا، باجدانی بیرۆییەکان، لە دەستدانی خزمەت و وەزیفەو مافی هەڵگرتنی چەک لەلایەن بیرۆییەکانەوەو لەهیچ فەرمانگەیەکی حکوومەتیشدا کاریان نەدەکرد. لێرەشدا ئەگەری بوونی هەرجۆرە یەکسانییەکی کۆمەڵایەتی بەو جۆرەی کە لە «کاست»دایە بەمانا تەقلیدییەکەی لە ئارادایە هەروەها لەم سیستەمەدا کاستی کۆیلەبەدەکانیش لە ئارادایە کە پێگەکەیان بۆماوەییەو ناتوانن هیچ بزاوتێک بکەن [١٦٦/٨-١٦٧].

### کۆیلایەتی

یەکێک لە توندترین شێوە کۆنەکانی نایەکسانیی کۆمەڵایەتیی تاکەکان یان گرووپەکان «کۆیلایەتی»بووە. لەرووی چینایەتییەوە خاسیەتی تایبەتی ئەم سیستەمە

ئەوەیە کە کۆیلەکان موڵکی کەسانی دیکەن. کۆیلەکان لەڕووی یاساییەوە لەریزی ماڵ و سامان حیساب دەکرێن، وەک موڵکایەتی کەلوپەل و شتومەک و ئاژەڵی ماڵی. کۆیلایەتی چەندین جۆرو شێوەی هەبووە. لە یۆنانی کۆندا سەرچاوەی سەرەکی بەکۆیلەکردن جەنگ و بەسەردادان بووە. هەرچەندە پێگەکانی کۆیلەیی بەدرێژایی چەندین نەوە بەمیرات ماوەتەوە، بەڵام مەرج نەبووە کە هەمیشە ئەم رەهەندە بەرچاوبکەوێت. دەکرا پێگەی کۆیلەیی بەهۆی سەرکەوتنی گرووپێک بەسەر گرووپێکی دیکەدا بەهەوڵێکی درێژخایەن بگۆڕێت. لەراستیدا هەموو کەسێک دەیتوانی ماوەیەک کۆیلەو ماوەیەکیش ئازاد بێت و ئەوەی کە ئەم حاڵەتەی دەستنیشان دەکرد هەلومەرجی مێژوویی بوو. لە هەمان کاتدا لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو ئەمریکای لاتینیدا بەپێچەوانەی ئەم حاڵەتەش بەرچاودەکەوت، واتە رێگری یاسایی و نەژادی هاتە پێش تا رێگا لە ئازادی کۆیلەکان بگرێت [٢٠/ ٢٠٩-٢١٠]. لە هەموو جێگایەکی دنیاو لە هەموو سەردەمێکدا رژێمی کۆیلایەتی بۆ جێگیربوونی سیستمی خۆی ناچاربووە فشاری زۆر پیادە بکات بۆ پاراستنی جیاوکەکانی و هێشتنەوەی موڵکایەتی کۆیلەکان، هەروەها یاخیبوونی کۆیلەکانیش لە درێژایی مێژوودا هەر هەبووە.[٣٨/٢٠٦]

«نچکینا» و نووسەرەکانی تری «کورتە مێژووی جیهان» لەوەسفی شێوازێکی بەدەستکەوتن و فرۆشتنی کۆیلەکان لە ئەسینای کۆندا دەڵێن: «دزەکانی دەریا زۆربەی کۆیلەکانیان دەستگیر دەکرد پاشان لە بازاڕی کۆیلە فرۆشتندا (کە نزیکەی لەسەرجەم شارەکانی دەوڵەتە شاری ئەسینادا هەبووە) دەیانفرۆشتن. هەندێجار کۆیلەکانیان دەخستە هەراجەوەو وەک ئاژەڵی ماڵی هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا دەکردن، ناچاربوون خۆیان رووت بکەنەوە، ددانەکانیان پیشانی خەڵکی بدرێت بۆ ئەوەی کڕیار بیانبینێ، دەبوایە بەدەوری خۆیاندا بسووڕێنەوە. نرخی کۆیلەکان جیاوازبوو: کۆیلەی ناشارەزایان بەنرخێکی هەرزان دەفرۆشت، کۆیلەی پیشەکار و شارەزا (وەکو وەستای زرێ دروستکردن) هەروەها ئەو کۆیلانەی خوێندبوویان (وەکو مامۆستاو پزیشکان) بەنرخێکی گران دەفرۆشت [٧١/٣٣].

«کورفکین» لە «مێژووی دنیای کۆندا» لەکاتی وەسفکردنی هەلومەرجی کۆمەلایەتی میسری کۆن بەم جۆرە باس لە پێگەی «کۆیلەکان» دەکات [٧٢/١١٩]: «ریش سپی و رابەرەکان خاوەنی کۆیلەکان بوون، واتە بەکۆیلەدار دەژمێردران. ئەمانە بۆ خۆیان لە مەزراکاندا کاریان نەدەکرد. رەوشی کۆیلەدارەکان

لەسەرجەم خەڵکی دیکەی میسر جیابوو. جلوبەرگیان لە قوماشی کەتانی نەرم بوو، خەنجەری مسیان لەبەر پشتێ دەخست کە دەسکەکەی بەزێر رازابۆوە، بازنەی زێڕیان لە دەست و ملوانکەیان لەمل بوو». هەمان نووسەر «کورفکین» بەم جۆرە باس لەلایەنێکی ژیانی کۆیلەکان دەکات: «رۆمەکان بۆ رابواردن و سەرگەرمکردنی خۆیان کۆیلەکانیان ناچاردەکرد پێکەوە لەگەڵ ئاژەڵاندا زۆرانبازی و ململانێ بکەن. ئەم کۆیلانە پێیان دەگوترا «گلادیاتور» رۆمەکان ئەوانیان فێری بەکارهێنانی چەک دەکرد مەیدانێکیان دروست کردبوو بۆ پێشبڕکێی گلادیاتۆری کە ناوی «ئامفی تیاترۆ» بوو وەک سێرکەکانی ئەمڕۆ[ ٥٦/١٢٠ ] لە بارەی کارکردنی کۆیلەکانەوە کۆرفکین دەڵێ [ ١٢/ ١٠١-١٠٢ ] : «ئەنجامدانی ئەو کارانەی کە زۆر زەحمەت بوون لە ئەستۆی کۆیلەکان بوو. یۆنانییە ئازادەکان، تەنانەت هەژارەکانیشیان بۆ کارە قورسەکانی وەک: کاری بەردکێشی بەکارنەدەهێنا. کۆیلەکان بەردە کانزاییەکان و مەرمەڕیان دەردەهێنا. لەو کانگا زیویانەدا کە هی دەوڵەتی ئەسینا بوون هەزاران کۆیلە سەرقاڵی کارکردن بوون... تەنها بەهۆی هەڕەشەو سزادانەوە بوو کە سەرکارەکان کۆیلەکانیان ناچار دەکرد بۆ کارکردن. بەردەوام لەکاتی کارکردندا چەند چاودێرێک ئاگایان لە کۆیلەکان دەبوو، ئەگەر کۆیلەیەک سستی کردبا لە کارکردن تەنانەت بۆ هەناسە هەڵکێشانێکیش چاودێرەکان ئەوەندەیان قامچی لە پشتی دەدا تاماوەیەک لە هۆش خۆی دەچوو». لە هەمان کاتدا مێژوونووسان چەندین شایەتی باسدەکەن سەبارەت بەشۆڕشی کۆیلەکان لەبەرامبەر رژێمی کۆیلایەتیدا. لە رۆمانی کۆندا ساڵی «٧١»ی. پ. ز، دوایین شۆڕشی کۆیلان لەلایەن «سپارتاکۆس» دژی «کراسوس» بەرپابوو. لەوسەردەمەدا دروشمی سپارتاکۆس ئەوەبوو «بەزامی شمشێر بمرین باشترە لە برسیەتی»[ ٧١/١٢٠ ].

لە وڵاتی ئێرانیشدا کڕین و فرۆشتنی کۆیلە پێشینەیەکی کۆنی هەیە. لەسەردەمی «ئەشکانی»دا وەک مێژوونووسەکان دەڵێن لە «میزوپۆتامیا»دا کۆیلایەتی هەبووە کە پێیان دەگوترا «بەندەک». ئەم کۆیلانە تەنها دەیەک یان چواریەکی بەرهەمی کاری خۆیان وەردەگرتەوەو خاوەن کۆیلە دەیتوانی بەدیاری بیان بەخشێت یان بیانکات بەبارمتە. خاوەن کۆیلەکانی بۆ کارکردن دەناردە لای کەسانی دیکەو خۆشی کرێیەکەیان وەردەگرت [ ١٩/١١٧ ].

یەکێ لەنووسەرانی ئێرانی کۆن لە ساڵی « ٨٣٠»ی کۆچیدا لە بارەی رەسمی کڕینی (غولام و کەنیز)ەوە دەنووسێت: «وریابە؟ کڕینی ئادەمیزاد زەحمەتە، زۆر

کەس پێی وایە کە کۆیلە کڕین و لێزانینەکەی بەشێکە لە بازرگانی، بەڵام نەخێر، بەڵکو فەلسەفەیە. زۆر کۆیلە هەیە بەڕواڵەت چاک و دیارە، بەڵام وەختێ بە وریاییەوە دەڕوانییە ناوەڕۆکی خەراپ دەردەچێت... [٥٦٩/١٢٢].

### مارکس، مارکسیزم و چینی کۆمەڵایەتی

لەگەڵ ئەوەشدا کە بەگشتی وای بۆ دەچن «مارکس» یەکەمین کەس بووە باسی مەسەلەی ململانێی چینایەتی کردووەو وەک پێشڕەوی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی بەرەو کۆمەڵگای بێ چین لە قەڵەم دەدرێت، بەڵام دەبێ جەخت لەسەر ئەوە بکەین بەدرێژایی مێژوو گەلێک زۆربوون ئەو کەسانەی کە ئارەزووی کۆتاییهێنان بەجیاوازی چینایەتییان هەبووە [١٢٣/٨-١١].

لە روانگەی مارکسەوە چینە کۆمەڵایەتییەکان بەدەر لەویستی دەوڵەت و مرۆڤەکان دروست دەبن. لە بارەی ئاستی پەرەسەندنەوە، دابەشبوونی کار لە کۆمەڵگا سەرهەڵدەدات و پەیوەندیی بەڕێوەبەرایەتی و پیادەکردن، وەکو دابەشبوونی نایەکسانی بەرهەم و دەستکەوتەکانی کار دێنێتەکایەوە. ئەم حاڵەتە کاتێک پەیدا دەبێت کە دەستەیەک لە کۆمەڵگای مرۆیی بتوانن زیادەی بەرهەم (زیادەی بەرهەم لە تێچوونی) بەدەست بێنن. لەدیدی مارکسەوە ململانێ بەمەبەستی زیادەی بەرهەم هێنان سەرچاوەی دابەشبوونی چینەکانە. بەکورتی هۆکارەکانی وەک پەیوەندییەکانی کار، موڵکایەتی، دەسەڵات، ئیعتیباری کۆمەڵایەتی دەبن بەهۆی توێژبەندکردنی کۆمەڵایەتی [٤٠/٦٤]. مارکس لەو باوەڕەدابوو کە چینی کۆمەڵایەتی لەسەر رێکخستنی بەرهەمهێنان بنیاتنراوە. سیستمی ئابووری سەرمایەداری دەسەڵاتی دا بەوکەسانەی کە ماڵ و سامانیان لەبەر دەستدابوو. ئەمانە خاوەنی هۆیەکانی بەرهەمهێنان بوون و سوودیان لە مانە وەردەگرت. لە بەرامبەردا ئەم کەسانەی کە ماڵ و سامانیان نەبوو هەروەها دەسەڵاتیشیان نەبوو، لەم حاڵەتەدا کرێکار تەنها دەیتوانی هێزی کاری خۆی بەسەرمایەدار بفرۆشێت. بەبڕوای مارکس ئەم دوو گرووپە بەردەوام لەگەڵ یەکدیدا لە ململانێدا بوون. مارکس لەڕێی لێکۆڵینەوەی مێژووییەوە بەو ئەنجامە گەیشت کە ئەم جۆرە ململانێیە حاشا هەڵنەگرەو سەرەنجام سەردەکێشێ بۆ شۆڕش و گەڕانەوە بۆ دیموکراسییەتی راستەقینە. لە روانگەی مارکسەوە سیستمی چینایەتی ئەنجامی راستەوخۆی دابەشبوونی کارە. ئەو سیستمەی کە کرێکاری بێبەش کرد لە

بەرهەمی کارەکەی و کردی بەکۆیلەی حەقدەست. سیستمی بەرهەمهێنانی پیشەسازی کرێکاری کرد بەبوونەوەرێکی بێ دەسەڵات. لە بەرامبەردا دەسەڵات کەوتە دەستی ساماندارەکان واتە ئەو کەسانەی کە دەوڵەتیان پێکهێنا. هەلومەرجی ژیانی کرێکارانی ئەوروپی (بەتایبەتی بەریتانی) لە.نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەمدا پشتیوانی لە تیۆرەکەی مارکس دەکرد. مارکس پێشبینی ئەوەی کرد کە شۆڕش شتێکی حەتمییەو خەڵکی لە بەرامبەر زۆردارەکان هەر رادەپەڕن. سامانی کۆمەڵگا دەگرنە دەست و بۆ سوودی گشتی دووبارە دابەش دەکەنەوە [١٧/١٨].
لە نامەی «مانیفێست»دا هاتووە «سەرتاپای کۆمەڵگا لە جاران زیاتر دابەش دەبێ بۆ دوو ئۆردووگای گەورەی دژبەیەک، بۆ دوو چینی گەورە کە راستەوخۆ دەکەونە بەرامبەر یەکتری ئەمانیش، بۆرژوازی و پرولیتاریان. لەسەپانەکانی سەدەکانی ناوەڕاست خەڵکی ئازادی یەکەمین شارەکان پەیدابوون. لەم جۆرە شارنشینە ئازادانەش یەکەمین رەگەزەکانی بۆرژوازی گەشەیان کرد» (١٢٤/ ٣٦-٣٧).
مارکس لە توێژینەوەکەی خۆی لە مەڕ شێوازی بەرهەمهێنانی ئاسیایی گەیشتنە ئەو ئەنجامەی لەو وڵاتانەدا کە دابینکردنی وزە سروشتییەکان (ئاو) بەڕێژەیەکی فراوان گرنگییەکی زۆری هەبوو چینی بەڕێوەبەر یان دەزگای بەڕێوەبردن گۆڕا بۆ خاوەنی ئەسڵیی زەوی. لە کۆمەڵگای کۆندا شێوازی بەرهەمهێنانی کۆیلایەتی زاڵ بوو کە ئەویش ئەنجامی شەڕوشۆڕو خۆسەپاندن بوو. لە شێوازی بەرهەمهێنانی دەرەبەگایەتیدا چینێکی فەرمانڕەوا پێدەگات کە لەپلەو پایەی سەربازییەوە سەرهەڵدەدات، ئەویش خانەدانییە (ئەرستۆکراتی). لەمەڕ بۆرژوازییەتەوە خاوەندارێتی سەرمایە لە شێوازی بەرهەمهێنانی سەرمایەداریدا دەبێتە هۆی ئەوەی کە دەسەڵاتدارانی ئابووری رۆڵی بەڕێوەبەرێتی وەدەست بێنن، بەگوێرەی تێڕوانینی مارکسی «پرۆلیتاریا» دوایین چین دەبێ کە هەژموونی ئابووری و سیاسی هەڵدەگرێ. دابەشبوونی چینەکان کە خۆی بەرەنجامی بەرهەمهێنانی ناتەواوە لەگەڵ فراوانبوونی هێزەکانی بەرهەمهێناندا لەناو دەچێت. دیارە مارکس بوونی چینە ناوەندییەکانی وەکو (جووتیار، چینە ناوەندییەکانی شارنشین و لادێی و رۆشنبیران و پرۆلیتاریای لاوەکی) پەسەند کردووە.
لە روانگەی مارکسییە نوێیەکانەوە ئەو دەسەڵاتەی کە لە سەروەت و سامانەوە سەریهەڵداوە کاردەکاتە سەر چەند بوارێکی وەک پارتە سیاسییەکان، سەندیکاکان، گرووپەکانی فشار، ئەنجوومەنە پیشەییەکان، هۆیەکانی پێکگەیشتنی جەماوەری.

لەلایەکی ترەوە پێگەی کۆمەڵایەتی کەسەکانیش لەڕووی کار، شێوازی ژیان، کولتوور، خوێندن، هاوسەرێتی، بزاوتی کۆمەڵایەتی و رۆڵە بەدەستهاتووەکان دەکەونە ژێر دەسەڵاتی بونیادی چینایەتییەوە [١١٦/١١٦-١١٨].

**بەراوردکردنی تایبەتمەندییەکانی چینی کۆمەڵایەتی لە روانگەی مارکسەوە [١١٦/ ١١٦-١١٨]**

| پرولیتاریا | بورژوا |
|---|---|
| لە ژێر فەرمانڕەواییدایە | فەرمانڕەوایە |
| کۆیلەی کرێ | کڕیاری کار |
| نامۆیە بەخۆی | خاوەن و کۆنترۆلکەری ئامێرەکانی بەرهەمهێنان |
| موڵکدار نییە | خاوەندارە |
| فرۆشیاری هێزی کار | دەسەڵاتداری سیاسی |
| بێ دەسەڵات | دەسەڵاتدارو دەوڵەمەند |
| ئاراستەی بەرەو سۆشیالیزم | ئاراستەی بەرەو قازانج |
| وەبەرهێنراو | وەبەرهێن |

ململانێ

هۆشیاری چینایەتی

شەڕی چینایەتی

شۆڕش

روانگە مارکسیستییەکان لە بارەی چینی کۆمەڵایەتی لەلایەن کۆمەڵناسانی وەکو جۆرج گۆرڤیچ (G. Gurvitch) وریمۆن ئارۆن (R. Aron) کەوتوونەتە بەر رەخنەوە. ئەم دووانە لە بنەڕەتەوە پێناسەو دەستنیشانکردنی چینە کۆمەڵایەتییەکانیان لەسەر بناغەی پێوەرە ئابورییەکان رەت دەکردەوەو بۆ دەستنیشانکردنی چین هۆکاری کۆمەڵایەتی دەروونییان دەهێنایەوە.

گرووپێکی تر لە نەیارانی تیۆری «مارکس» پشت بەدەرکەوتنی چینە نوێیەکان دەبەستن. دیارە دەبێ ئەوەش بڵێین کە مارکسیستە توندڕەوەکانیش چەند

پێناسەیەکی بەرفراوانتریان بۆ چینی کرێکاران دەستنیشان کردووەو تیایدا کارمەندان، تەکنیکاران، کرێکارانی بواری خزمەتگوزاریشیان خستوونەتە پاڵیان [٤٠/ ٦٢-٦٧].

شۆڕشەکانی ولاتانی چین، کۆریا، جەزاییر، دەریانخست کە گوندنشینەکانیش یەکدەست لەگەڵ توێژەکانی ناوەڕاست و شارنشین ئەوانیش دەتوانن ئەو رۆڵە ببینن کە مارکس تەنها لە پرۆلیتاریادا دەیبینین. لەلایەکی ترەوە واقیعی کۆمەڵگا سەرمایەدارییە پیشەسازییەکانی ئەمرۆ ئاماژە بەوە دەکات کە لەم چەند ساڵەی دواییدا خودی بورژوازیی تەقلیدی لەلایەن دەستەیەکی ترەوە کە بەڕێوەبەرانن لە زۆر بواردا وەدەرنراون. «میلڤان جیلاس» بەو ئەنجامە گەیشتووە کە لەسەردەمی گەشانەوەی سۆشیالیزمدا ئەم چینە (بەڕێوەبەران) لە کۆمەڵگا سۆسیالیستییەکاندا هاوتای خۆیان پەیدا کردبوو، چونکە لەم ولاتانەدا پرولیتاریەکانیش کەوتبوونە ژێر نفووزی بیرۆکراتەکانەوە لە یەکێتی سۆڤیەتی جاراندا، ئەوانەی دەسەلاتی سیاسییان هەبوو لەسەرەوەی هیرارکیەتی چینایەتیی ئەو ولاتەدا بوون، پاشان سەرکردە سەربازییەکان، زانایان و رۆشنبیرانی سەر بەدەوڵەت و بەڕێوەبەران و رابەرانی کاروبارە تایبەتییەکان دەهاتن. لە قۆناغی دواتردا سەرکردەکان لە چەند ئاستێکی جیاجیادا گیرسانەوە، وەک «ئێخە سپییەکان، کرێکارە نیمچە شارەزاکان، هێزی کاری ناشارەزا» ئەم سیستمەش تارادەیەک هاوشێوەی ئەورووپای رۆژئاواو ئەمریکابوو. جوتیارەکان لە پایەیەکی خوارتری کرێکارەکانی پیشەسازی بوون. چینەکانی سەرەوە (لە ڕووی داهاتەوە) جیابوون لە خەڵکی ترو لە شوێنی دابڕاودا نیشتەجێ دەبوون، لەڕووی کۆمەلایەتییەوە تارادەیەک گۆشەگیربوون، حەزیان لە ژنخوازی خۆبەخۆیی بوو (ژنخوازی لە چینێک یان گرووپێکی تایبەت بەخۆ). هەروەها چینە بالاکان چەند جیاوکێکی تریان هەبوو وەکو لێبووردن یان کەمکردنەوەی باج لەسەریان، منداڵەکانیان لە قوتابخانە باشەکاندا دەیانخوێند. هەڵبەتە نایەکسانیی پێشوو کە لە سامانەوە سەری هەڵدەدا لەناو چووبوو و لەم رووەوە موڵکایەتی تایبەتی ماڵ و سامانی نەگوێزراوە (غیر منقول)، کارگەکان، کانگا و بانکەکان، لە ئارادا نەبوو، بەلام کاریگەری چینی کۆمەلایەتی لەڕووی ئەندازەی ماف و تایبەتمەندێتی، دەسەلات، ئیعتیباری کۆمەلایەتی هەر لە ئارادابوو [٨/ ١٧٤-١٧٥].

## کۆبەندی تیۆرەکان لە بارەی چینی کۆمەڵایەتییەوە

بەدرێژایی چەند سەدەیەک، بەردەوام گرووپێک روویان لەوەبووە کە چینی کۆمەڵایەتی وەک زەروورەتێک بۆ وەزیفەی کۆمەڵگا مرۆییەکان بخەنەڕوو. لە بەرامبەریشدا گرووپێکی دیکە هێرشیان دەکردە سەر نایەکسانی کۆمەڵایەتی وەک شتێکی بێکەڵک و شتێک کە پێویست نییە. بە تێڕوانینێکی کورتی رەفتاری مرۆڤەکان لەگەڵ یەکدیدا، بەو جۆرە کە لە هەندێک حاڵەتی توندڕەوانەی چینە کۆمەڵایەتییەکاندا وەکو «کاست» یان کۆیلەیی بەرچاو دەکەوێت، بۆمان دەردەکەوێت کە بۆچی زۆربەی بیریارانی پێشوو ئەمڕۆ بەم چەشنە هاودەردییە و هەندێ جاریش بەو زیادەرەوییە لەچینە کۆمەڵایەتییەکانیان روانیوە.

بەگوێرەی تیۆری «وەزیفی» کە لەلایەن «کینگرلی دەیڤیس» (K. Daivis) و «ویلبرت مور» (W. E. Moor) خراوەتەڕوو، هەر کۆمەڵگایەک بۆ مانەوەی خۆی دەبێ هەندێک لە پێویستییەکان تێر بکات. پێویستە چەند مامۆستایەکی هەبێت کە کاری بە کۆمەڵایەتیکردن لە ئەستۆبگرن، چەند واعیزێکی هەبێت کە تەبایی ئەخلاقی کۆمەڵگا دابین بکەن، چەند سیاسەتمەدارێکی هەبێت کۆمەڵگا بەڕێوەببەن، چەند ئەفسەرێکی هەبێت کاروباری بەرگریان لە ئەستۆدا بێت.. هتد. بە مەبەستی وەڵامدانەوەی ئەم پێویستییانە کۆمەڵگا نموونەیەک لە پاداشتەکان ئامادە دەکات تا بتوانێ ئەندامەکانی خۆی هان بدات بۆ بەجێگەیاندنی چەند کارو وەزیفەیەک. لەبەر ئەوەی هەندێک لە شوێنگەو پایەکان بۆ هێشتنەوەی کۆمەڵگا لەوانی تر گرنگی زیاترە هەروەها ئەو پاداشتانەش کە دەدرێت بەم پێگانە زیاترە تابتوانێ شیاوترین و لێهاتووترین ئەندامان رابکێشێت، لێرەوەیە کە نایەکسانی لە دابەشکردنی تواناکاندا دەردەکەوێت. لەمەوە لەزۆربەی وڵاتاندا مافی سەر کۆمارێک لە نوێنەرێکی ئەنجوومەن زیاترە چونکە وا پێدەچێ ئەو لەڕووی پاراستنی بەردەوامیی کارایی کۆمەڵگا گرنگییەکی زیاتری هەیە. بەچەندین بەڵگە کە لەبەردەست دایە ئاماژە بەوە دەکات کە تەنانەت لەو وڵاتانەشدا کە تیایدا بزاوتی کۆمەڵایەتی کارێکی ئاساییە توانای تاکەکان بۆ گەیشتن بەپێگە گرنگەکان وەکو یەک نییە. لە وڵاتانی وەک ئەمریکا ئەگەر رەش پێستێک یان سپی پێستێکی هەژار خاوەن تواناو ئامادەیی بەرچاویش بێت، یان هەر لە قۆناغی قوتابخانەدا پشتیوانییەکی ئەوتۆ ناکرێت یاخود پێی خۆشبێ یان نا کۆمەڵگا پەلکێشی دەکات بۆ کارکردن لە وەزیفەیەکی دیاریکراودا. لێرەوەیە کە توێژبەندیی کۆمەڵایەتی لە

بەرامبەر زۆرێک لە ئامادەییە شاراوەکانی خۆی ستەمکارە [٧٥/٥٢].

**چەند روانینێکی جیاجیا بۆ چینی کۆمەڵایەتی [١٧٠/٨]**

| ئەوانەی بە چینی کۆمەڵایەتی رازین دەڵێن: | رەخنەگرانی چینی کۆمەڵایەتی دەڵێن: |
| --- | --- |
| - سروشتی مرۆڤ پێویستی بەکۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی بەهێز هەیە | - سروشتی مرۆڤ چاکەو سیستمە کۆمەڵایەتییە هەڵەکان هۆکاری ئەو خراپەیەن |
| - سەقامگیری گرنگترە لە یەکسانی | - یەکسانی گرنگترە لە سەقامگیری |
| - هەموو سیستمێک لە بێ نەزمی باشترە | - بێ نەزمی باشترە لە سیستمی ناعادیل |
| - نایەکسانی لێهاتووییەکان دەبێتە هۆی نایەکسانی پاداشتەکان | - لێهاتووییەکان هێندەی یاساو پاداشتەکان نایەکسان نین |
| - پێگەی باشتر هەمیشە پاداشتی کاری زیاترە | - هەمیشە پێگەی بەرز ئەنجامی خۆسەپاندن، یان بۆ مانەوەیە |
| - نایەکسانی چینایەتی دەبێتە هۆی بەجووڵە خستنی کۆمەڵگاکان | - ئەو نایەکسانییە چینایەتییە کە هەیە زیاترە لەو ئەندازەیەی کۆمەڵگا پێویستی پێیەتی |

رەخنەگرانی چینی کۆمەڵایەتی، زیاتر نرخ بە «یەکسانی» دەدەن نەک «سەقامگیری». هەروەها ئەم دەستەیە پشتیوانیان لە چەند روانگەیەک لە بارەی تواناکانی مرۆڤ، کۆمەڵگا مرۆییەکان و سروشتی مرۆیی کردووە، ئەم روانگەیەش دژی روانگەی پارێزگارانە. روانگەی رەخنەگران بۆ سروشتی مرۆیی گەشبینانەیەو لەسەر ئەو باوەڕەیە کە تەنها یەک سیستمی کۆمەڵایەتی دروست یان دادگەرانە دەتوانێ مرۆڤ لە سووربوون لەسەر دەسەڵات و سامان دەرباز بکات. ئەم گرووپە هەمیشە کۆمەڵگا بە نادروست و نا دادگەرانە دەزانن و ئەمانە بەگشتی رابەرایەتی و پێگەی چینایەتی بەرز بەئەنجامی زاڵبوون لەسەر بناغەی باشتربوون دەزانن کە ئەویش پارێزراوەو دەپارێزرێت (واتە قۆرخکراوە بۆ کەسانێکی تایبەتی) و بەشێکی مەزنی ئەم پرۆسەیەش لە رێگەی میرات و بۆمانەوەو زۆرکاری دێتە ئاراوە. ئەم گرووپە پێیان وایە کە یاساکان حاڵەتێکی مۆنۆپۆلیان هەیەو بەقازانجی دەوڵەمەندانن. [٤٧/ ١٥٤-١٥٧].

گومانی تێدانییە کە ئەم رەخنەکارییە بەردەوامە لەنایەکسانییە کۆمەڵایەتییە

توندوتیژەکان بەرە بەرە بەرەو بەدیهێنانی چەند سیستمێکی کۆمەلایەتی هاوسەنگترچووە هەرچەندە کە لەهەندێک ولاتاندا هەژاری تا ئەندازەیەکی بەرچاو کەمبۆتەوە، بەلام هێشتاکە بۆشایی نێوان هەژارو دەولەمەند گەلێک زۆرە.

توێژینەوە فراوانەکانی «لوید وارنەر» (W. Loyd Warner) لەمەر چینە کۆمەلایەتییەکانی ئەمریکا لە دنیای هاوچەرخدا گرنگییەکی زۆریان هە . ئەو شەش جۆرە چینەی کە بەڕای ئەو ئێستا لە کۆمەلگا پیشەسازییەکان ا هەیە دەتوانین بەم جۆرە ریزیان بکەین. چینی سەری سەروو، سەرووی روو لە خوار، ناوەندی روو لە سەروو، ناوەندی روو لە خوار، خوارووی روو لەسەروو، خواری خوارەوە. چینی سەری سەرەوە ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە لەڕووی سامان و پێگەی خێزانییەوە لە ئاستێکی زۆر بەرزدان. چینی سەرووی روو لە خوار، ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە تازە بەتازە سامانیان بەدەست هێناوە. چینی ناوەندی روو لەسەروو گرووپی بازرگانان و پیشەکاران و شارەزایانی زانستی و هونەری دەگرێتەوە، کە بەگوێرەی ئەندازەی سەرکەوتنیان لە کارو کاسبی و زەمینەی لێهاتووییان رەنگە بکەونە پال چینی ناوەندی روو لە سەروو یان ناوەندی روو لە خواروو. چینی ناوەندی روو لەسەرووش دەستەیەکی زۆر لە کارمەندانی ئێخە سپی دەگرێتەوە. چینی خوارووی روو لەسەروو ئەو هەژارە بەڕێزانە دەگرێتەوە کە زیاتر لە بواری کەم دەرامەتدا کار دەکەن. چینی خواری خوارەوە ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە وارنەر گوتەنی زۆر کەس لە چینی ناوەندی بە (بێکارو تەمبەڵ) ناویان دەبەن [٨/ ١٧٥-١٧٦].

ئەمڕۆکە ئیدی ئەو تیۆرانەی مەیلی لەناوبردنی چینە کۆمەلایەتییەکانیان هەیە یان ئەو تیۆرە وەزیفییانەی کە لەسەر زەرورەتی چینەکان بنیاتنراون، هیچیان بەتەنیایی قەناعەت بەخش نین. ئەو بابەتەی کە ئێستاکە زیاتر لە ئارادایە ماهیەت و رادەی جیاوازیی چینی کۆمەلایەتییە نەک باسکردن لە بوون و نەبوونی. [٥٧/ ٣٣١-٣٣٨].

**چینی ناوەند**

لە ساڵەکانی ١٩٥٠ بەدواوە کۆمەلناسان پێگەی تایبەتی چینەکانی ناوەندییان لە دنیای نوێدا تاوتوێ و شیکردۆتەوە. «تالکۆت پارسۆنز»و دەستەیەکی دیکە لە کۆمەلناسانی ئەمریکا ئەم خاڵەیان هێنایە گۆڕێ کە زۆربوونی توێژە مووچە

وەرگرەکانی غەیرە کرێکارو کەمبوونەوەی ژمارەی مولّکدارە سەرمایەدارەکان لە دنیای هەنووکەییدا، بۆتە هۆی زیاتر وێکچوونی هەلومەرجە ئابووری و کۆمەلآیەتییەکان و جیاوازییەکانی نێوان گرووپە جیاجیاکان زیاتر بەرەنجامی هۆکاری دەسەلآت و جیاوکی کۆمەلآیەتی کارەکانە [ ٤٠/ ٦٢-٦٧].

«رایت میلز» (C. W. Mills)کۆمەلّناسیی ئەمریکایی لە کتێبی (چینی ناوەندی نوێ)دا بۆ یەکەمجار لە سالّی «١٩٥١»دا چەمکی «ئێخەی سپی» (White Collars)ی بۆ وەسفکردنی کارمەندان و کارمەندانی پایەبەرز لە بەرامبەر «ئێخە شینەکان»یان کرێکاراندا بەکارهێنا. میلز مەرجی زەرووری کۆمەلّگا شارنشینە نوێیەکان بەبوونی توێژێکی فراوانی کارمەندان و فرۆشیاران و راوێژکاران، سەرپەشتیارانی بەشەکانی فرۆشگاکان و سەرکاران و فێرکاران و کاربەدەستانی پۆلیس و خاوەن پیشە هاوشێوەکان دادەنێت، زیادبوونی ژمارەی «ئێخە سپیەکان» بەبۆچوونی ئەو بەلّگەیەکی رۆشنە بۆ رەتکرانەوەی تیۆرەکانی مارکس و لیبرالەکان. بوونی جەماوەرێکی فراوان لەم توێژە چینایەتییە نێوەنجیانەدا دابەشکردنی کۆمەلّگا بۆ دوو چینی مولّکدارو کرێکار رەتدەکاتەوە [ ١٢٥/ ٣٣-٣٦].

زیادبوونی ژمارەو جۆری کاری ئازاد بەشێوەیەکی زۆر بەرچاو ئاماژەیە بۆ چوونە ناو سەردەمی چینی ناوەند. میلز مامۆستایانی زانکۆو پزیشکان و پارێزەران دەخاتە ئەو ریزەوە (جگە لە نووسەران و هونەرمەندان)، چونکە پێی وایە ئەمانە لەبەرئەوەی وەکو چەند پسپۆرێک کە ئۆرگان و دەزگا زانستی و پزیشکی و دادوەرییەکان بەکاریان دێنن لەمەوە سەربەخۆیی خۆیان لەدەست داوە. ئەمرۆ خەلّکانی وەکو ئامارکاران و زانایانی کۆمەلّناسی و پەرستاران و نەخشەکێشەران بەهۆی ئەوەی کە خوێندنێکی زۆر تایبەتییان هەبووە لە خەلّکی تر جیا دەبنەوە نەک بەهۆی ئەوەی کە کولتوورێکی جیایان هەیە[ ٢٠/ ٦٢-٦٧].

«میلز» بەو ئەنجامەی دەگات کە بەدرێژایی سەدەی رابردوو دەرامەت و سامانی چینی ناوەند رووی لە کەمی بووە هەتا لە جەنگی دووەم جیهانی بەدواوە ئەم گرووپە تووشی بێکاری هاتن. ئەو جیاوازییەش کە ئەم گرووپانە هەیانبوو لەرووی کرێوە بەبەراورد لەگەلّ کرێکاران و تەنانەت هەندێک لە بەرێوەبەرانی یەکە بچووکەکان لەناوچووەو نەماوە. سەرەرای ئەو گۆرانکارییە نالەبارەی ئەم چینە تووشی بووە. «میلز» پێی وایە هێشتا کاری ئێخە سپییەکان بایەخێکی تایبەتی لە

خۆیدا پاراستووه، ئەویش رەنگدانەوەو نیشانەی دەرەکی ئەم گرووپەیە بەتایبەتی لەرووی جل پۆشین و شێوازی ژیان و ئاستی خوێندن و وابەستەیی نەتەوەییان (کە لە ئەمریکادا بەزۆری سپی پێستەکانن). ئەمەش بۆ خۆی جیاوازی نێوان پێگەی ئێخە سپییەکان و شوێنگەی راستەقینەیان لە هیرارکیەتی چینە کۆمەڵایەتییەکاندا، پاساودار دەکات. کەواتە پێگەی کۆمەڵایەتییە (نەک داهات) کە شوێنگەی ئێخەسپییەکان و پلەوپایەیان لە بونیادی کۆمەڵایەتیدا دیاری دەکات. «میلز» پێی وایە کە لەرووی دەستڕۆیشتنی کۆمەڵایەتییەوە ئێخە سپیەکان وەک «قارەمانە تێکشکاوەکان» حیساب دەکرێن و ناتوانن هیچ جۆرە فشارێک بخەنە سەر دەسەڵاتداران. بەگشتی ئەم چینە دەستەستانە لەبەرامبەر ئەو مەترسییانەی کە هەڕەشەیان لێدەکات. مەترسیی وەکو هەڵاوسان، بەرزبوونەوەی باجەکان، یان قەیران لە نموونە تەقلیدییەکانی ئەخلاقدا، کەپێشتر بایەخێکی تایبەتی بەمانە دەبەخشی [ ٤٠/ ٦٢-٦٧].

### هەژاران و هەژاریی

رەنگە بتوانین ئەو پێناسەی «هۆرتۆن» (P. Horton) پەسەند بکەین کە هەژاری هەلومەرجێکە تیایدا کەسەکان ئەوەندە پارەیان نییە کە لانی کەمی ستانداردی سەلامەتی و مانەوەی خۆیان (بەو ئەندازەی کە لە کۆمەڵگاداو لەلایەن زۆرینەی خەڵکی بەهەلومەرجێکی ئاسایی حیساب دەکرێت). «هۆرتۆن» بەتێڕوانینێکی تایبەتی دەڕوانێتە کۆمەڵگای ئەمریکی و بەو ئەنجامە دەگات کە هەژاران ئەو کەسانەن کە لە پەراوێزی کۆمەڵگادا دەژین و زۆربەیان تووشی چەند کێشەو دەردێکی کۆمەڵایەتی یان جەستەیی دەبنەوە. لەم وڵاتەدا وردترین پێوەری دەستنیشانکردنی هەژار بە «هێڵی هەژاری» (Poverty line) ناو دەبەن کە مانایەکی ئابووریی هەیە. بەم جۆرە لێکی دەداتەوە کە هەرکاتێک خێزانێکی چوار کەسی لە ساڵێکدا کەمتر لە ٩٢٨٧ دۆلار داهاتی بێت (ئەم ژمارەیە بۆ ساڵانی ١٩٨٢ بەسەرەوەیە) ئەوا ئەو خێزانە دەکەوێتە ژێر هێڵی هەژارییەوە. پێش ئەم پێوەرە لە ساڵی (١٩٦٠)ەوە پێوەرێکی تر بەکاردەهات کە (٣٠٠٠) دۆلاربوو.

هەژارەکان کێن؟ پێوانەکردنی هەژاریی کارێکی ئاڵۆزە. ئاشکرایە کە کرێکارێکی وەرزیی بێخانوو و خاوەن هەشت منداڵ، کە تووشی قەرزداری و بەدخۆراکی و نەخۆشی بووەو ئاستی داهاتی رۆژانەی زۆر نزم بێت، ئەوا ئەم

کرێکاره بەگوێرەی هەر پێناسەیەک بێ دەبێ ناوی بنێین «هەژار» ، بەڵام کێشەکە ئەوەیە کە هەموو خێزانە هەژارەکان لەم هەلومەرجە ئاشکرایەی هەژاریدا نین. جگە لەمە هەژاری تەنها لایەنی تاکەکەسی و خێزانی نییە بەڵکو دەشێ رەهەندی نەتەوەیی و نەژادی و کۆمەڵی و ناوچەیی و نەتەوەییشی هەبێت[ ٨/ ٢٦٥- ٢٦٦ ].

چەمکی هەژاری رێژەیی پشت بەوە دەبەستێت کە لەم جیهانەدا کە گۆڕانکارییەکان بەخێرایی تێدەپەڕن، ئەو شتانەی کە پێشتر لەولاتێکدا بەجوانکاری زیادە دادەنران ئەمڕۆکە لە هەمان ولاتدا رەنگە بەپێویستی (ضروريات) حیساب بکرێن. پێ بەپێی گۆڕانکاری لە چاوەڕوانییە کۆمەلایەتییەکانی تاکەکاندا «ستانداردەکانی ژیانیش» دەگۆڕێن. چەمکی هەژاریی رێژەیی بەزۆری لەو رووەوە گرنگی هەیە کە کۆی کولتووری ئەو کۆمەڵگایە لە بەرچاو دەگرێت کە هەژاریی تێدا هەیە. لەم روانگەیەوە کەسێک کە ئاستی ژیانی لە خوار ستانداردەکانی زۆرینەی تاکەکانی کۆمەڵگادا بێت ئەو کەسە لە هەژاری و نەداریدا دەژیت. بەگوێرەی بۆچوونی «پاوەر» (R. Power)و هاوکارەکانی لە بەریتانیا ، پێنج گرووپ تووشی دەردی هەژاری بوون کە بریتین لە: بێکارەکان، ئەو کەسانەی حەقدەستێکی زۆر کەمیان هەیە ، بەساڵا چووان، نەخۆش و دەردەدارەکان، ئەو خێزانانەی کە تەنها باوک یان دایکیان هەیە. دیارە «پاوەر» مەبەستی ئەوە نییە ئەو گرووپانەی کە باس کران لە بەریتانیا بەهەژار حیساب دەکرێن بەڵکو مەبەستی ئەوەیە کە ئەگەری ئەوە زۆرترە کە ئەمانە تووشی هەژاری بن [ ١١٦/ ٢٠-٢١ ].

چەمکی «بازنەی خەراپی هەژاری» پشت بەوە دەبەستێت کە هەرکاتێک هەژاری دەرکەوێت هەموو دەرگاکان دادەخرێن و بازنەیەکی بێکۆتایی نەهامەتییەکان پەیدا دەبێت کە دەرچوون لێی دژوارو زەحمەتە. هەر لایەنێکی گرنگی بازنەی ژیانی تاک بەستراوەتەوە بەلایەنەکانی دیکەی لەم جۆرەوە کە شوێنەوارە زیادەکانی هەژاریی پتەو بکات. ئەم شێوەی خوارەوە ئەو راستییە پیشان دەدات.

یەکەمین لێکۆڵینەوە کە تارادەیەک بەشێوازێکی زانستی لە بارەی هەژارییەوە لە جیهاندا ئەنجام درا، دوو لێکۆڵینەوە بوو لە دەوروبەری ساڵی ١٨٩٠دا لەلایەن «راونتری» (S. Rowntree) لە نیویۆرک و «بۆت» (C. Booth) لە لەندەن ئەنجام درا. (بۆت) بەو ئەنجامە گەیشت کە نزیکەی ٤٧ ٪ی دانیشتوانی لەندەن هەژار یان

زۆر هەژاربوون. «راونتر»یش لە نیۆیۆرکدا کەم تا زۆر بەهەمان ئەنجام گەیشت و لە هەمان کاتدا یەکەم کەس بوو کە هەوڵی دا هەژاری بەوردی پێناسە بکات.

## خولی پووچی هەژاری [۱۱۶/۲۰-۲۱]

راونتری هەردوو زاراوەی «هەژاریی بەرایی» (کەسانێک کە کەمترین خۆراکیان نەبوو) و «هەژاریی نێوەنجی» (ئەو کەسانەی کە دەیانتوانی خۆراکی خۆیان پەیدا بکەن، بەڵام حەزیان دەکرد پارەی خۆیان لە شتی دیکەدا سەرف بکەن) بەکارهێنا. ئامانجی ئەوەبوو کە جیاوازی دابنێت لە نێوان ئاستەکانی هەژاریدا. ئەمڕۆکە زاراوەی «هەژاریی رەها» بۆ وەسفکردنی هەلومەرجی ئەو کەسانە بەکاردێت کە لانی کەمی پێویستییەکانیان نییە یان لە تەنگانەدان.

ئەگەر بپرسین لانی کەمی پێویستییەکان چییە؟ گەلێک کەس یەکسەر وەڵام دەدەنەوەو دەڵێن بریتییە لە پێویستیی خۆراکی گونجاو، جلوبەرگ و شوێنی نیشتەجێبوونی گونجاو. رەنگە هەندێکی تر چەند شتێکی وەکو: دڵنیاکردنەوە لە مەترسییەکان و خزمەتگوزاری تەندروستی و دەرمانیش زیادبکەن. رەنگە ئەو

کەسانە کەمتر بن کە «توانایی خوێندن و نووسین» وەکو شارەزاییەکی کۆمەڵایەتی زەرووری بۆ ژیانی ناو کۆمەڵگا باس بکەن.

هەر چۆنێک بێت لەودیو ئەم تێڕوانینەوە ئەو دادوەرییە هەیە کە پێویستە سەرەکییەکانی هەمووان وەکو یەک نین، و لە راستیدا کۆمەڵێک پێویستی مرۆیی هاوبەش هەیە کە هەمووان دەبێ هەیان بێت. بە پێودانگی جیهانی و لە هەلومەرجی گۆڕانکاری خێرای هەموو پێوەرو بەهاکاندا دەسکەوتنی ئەم کۆمەڵە پێویستییانە پێدەچێ مەحاڵ بێ. تەنانەت پێویستییەکانی خۆراکیش لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە جیاوازە [١١٦/ ٢٠-٢١]

بەگشتی کۆمەڵناسان لەو باوەڕەدا نین کە لە بنەڕەتدا هەژاریی دەرەنجامی رەفتارە «کەسییەکان» بێت و کەسەکان وەکو تاک بەرپرسیاری هەژاریی خۆیان بن. هەرچەند ئێمە «خۆمان بەرپرسیارین لە رەفتارە کۆمەڵایەتییەکانی خۆمان، بەڵام کۆمەڵناسان لە هەوڵی ئەوەدان بیسەلمێنن کە لەودیو رەفتارو ئیدراکاتە کەسییەکاندا هێزە کۆمەڵایەتییە گشتییەکان هەن کە بەرپرسیارن لە بوونی هەژاریی «وەک دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی» [١١٦/ ٢٠-٢١].

لەسەردەمی رێنیسانس بەدواوە ئەو بیرۆکە قبوڵکرا کە هەژاریی بەرەنجامی سزا ئاسمانییەکان نییە (بەهۆی گوناهکارییەوە)، بەڵکو ئاسەواری داهاتی کەم و کێشە خێزانییەکان و باری نالەباری تەندروستی و نەبوونی و هۆکاری دیکەی لەم جۆرەوەیە. بەدرێژایی مێژوو هەمیشە کەسانێک هەبوون بە زەحمەت باوەڕیانکردووە کە هەژاریی راستەقینە لە کۆمەڵگادا هەیە.

ئەم بێباوەڕییەش رەنگە بەهۆی نزمی ئاستی هۆشیاری ئەوان بووە لە بەرامبەر باروزروفی کۆمەڵگادا. لێرەدا ئەو قسەیە دەهێنمەوە کە لە «ماری ئەنتوانێت»ەوە هاوسەری «لویسی شازدەهەم» دەیگێڕنەوە پاشای فەرەنسا، کاتێ بیستی خەڵکی لەکاتی نارەزایی دەربڕینیاندا هاواریان دەکرد (نانمان نییە) لە وەڵامیاندا گوتی «ئەی بۆ کێک ناخۆن»

لە هەندێ سەردەمی مێژوویی جیهاندا، هەژاری کۆمەڵاتی خەڵک بەهۆی کەمی بەرهەمهێنان و.. هتد راستییەکی حاشا هەڵنەگربوو، و هەندێ جار گەیشتوون بەو ئەنجامەی کە هەژاریی نەک تەنها راستییەکی خۆ لێبەدوور نەگیراوە بەڵکو دیاردەیەکی زەرووریشەو دەبێتە هۆی ئەوەی کە هەندێ کەس ناچاربن چەندین کاری ترسناک و نابەدڵ و ماندووکەر کە لە کۆمەڵگادا هەیە ئەنجام بدەن. دیارە کە رێژەی

ئەم کارانە لە کۆمەڵگاکانی ئێستادا کەمتر بۆتەوەو زۆربەی ئەو کارانە بەزۆری لە ڕێگای ئامێرەکانەوە ئەنجام دەدرێن [١٨٦/٨-١٨٧].

### چەمکی پێگەی کۆمەڵایەتی

پێگە، کۆمەڵێک ماف و ئەرک دەگرێتەوە کە دەربڕی شوێنگەی کەسێکە لە بەرامبەر کەسانی دیکەدا، جا ئەم پەیوەندییانە چ ئاسۆیی بن یان ستوونی، لەسەر بناغەی یەکسانی بن یان پلەو پایە، یان بەسترابنەوە بە بەرژەوەندی و ئیعتیباری کۆمەڵایەتی یان بۆ شانازی پێوەکردن بن [١٠٨/٢].

زۆربەی خەڵکی دەستەواژەی پێگە (Status) بۆ وەسفکردنی ئاستی ئیعتیباری کۆمەڵایەتی کەسێک بەکاردەهێنن. دیارە کۆمەڵناسانیش ئەم وشەیە بۆ شوێنگە (Position) لە کۆمەڵگادا بەکاردەهێنن. شوێنگەی ڕەسمی یان ناڕەسمی، ئۆرگانی یان نائۆرگانی و... هتد، ئەمانە هەموو چەند جۆرێکی پێگەی کۆمەڵایەتین. هیچ کەسێک تەنها پێگەیەکی نییە. ئێمە هەموومان لە یەک کاتدا چەند پێگەیەکمان هەیەو هەموو پێگەکانیش گرنگییەکی هاوشێوەیان نییە. بەهۆی سەرکەوتوویی زیاتری هەندێک پێگەوە بەپێگەی زاڵ دادەنرێن، چونکە حـــاڵـەتێکی دەستنیشانکەریان هەیە لەسەرجەم پێگەو شوێنگە کەسییەکان لە ژیانی مرۆڤدا. دەوڵەمەندبوون یان هەژاربوون چەند پێگەیەکی جیاجیا بۆ کەسێک دروست دەکات وەک: هاوسەر، برادەر، برا، دراوسێ و (چەندین پێگەی تر). بیستوومانە کە دەڵێن فلان کەس (کە بۆ نموونە دەوڵەمەندە یان فلان پایەی هەیە) برادەری منە یان خزمی منە. بەپێچەوانەوە پێگەکانی کەسانی هەژار یان نەناسراو و بێ پلەوپایەو.. هتد مرۆڤ شانازی بە هەبوونی پەیوەندی پێیانەوە ناکات. خەڵک تەنانەت ئەگەر پەیوەندییەکی نزیکیشی لەگەڵ کەسێکی لەم جۆرە هەبێ ڕەنگە لە بەرچاوی نەگرێت یان ڕەنگە نکۆڵی لێبکات.

یەکێک لە گرفتەکان لە لێکۆڵینەوەی چینی کۆمەڵایەتیدا لەمەڕ کار، داهات و فێرکردن، ئەوەیە کە هەندێ لەو هۆکارانەی کاریگەرییان هەیە بەردەوام لە بواری لێکۆڵینەوەدا دەمێننەوە، تەنانەت لەو کۆمەڵگایانەشدا کەلافی ئەوە لێدەدەن لەسەر بناغەی هەوڵ و بەدەسهاتەکانی کەسەکان حوکم دەدەن. بۆ نموونە زۆربەی ژنان ناتوانن ئەو جیاوکە بەرزە کۆمەڵایەتییانە بەدەست بێنن کە پیاوان هەیانە چونکە زەمینەی پێشکەوتن بۆ پیاوان لە زۆربەی بوارەکانی ئیشکردندا ئاسانترە.

ئەندامێکی نوێی دادگایەکیش پلەکەی لەگەڵ ئەندامە کۆنەکاندا بەراورد ناکرێت هەتا ئەگەر هەردووکیان هەمان پلەی خوێندنیان هەبێت (چونکە تارادەیەک هۆکاری تەمەنیش بۆ خۆی پێگەیەکی تایبەتی هەیە). دەرچوویەکی بەشی بازرگانی لە زانکۆ کە بیەوێ لە شارەکەی خۆیدا دەستبداتە بازرگانیکردن ئەگەر لە بنەماڵەیەکی بەناوبانگ و ناسراوی شاربێت بایەخێکی کۆمەڵایەتی حازر بەدەستی هەیە. ئەگەر وانەبێ دەبێ خۆی ناوبانگ بۆ خۆی پەیدا بکات [ ٤٥/ ٨١-٨٣].

## چین و پێگەی کۆمەڵایەتی

روانگەی مارکسیستی لەمەڕ چینە کۆمەڵایەتییەکان پشت ئەستوورە بە کارو پەیوەندی کار بەهۆیەکانی بەرهەمهێنانەوە. ئەمەش سیستمێکە دوو چینی کۆمەڵایەتی تێدایە. ئەم روانگەیە وەڵامێکی نییە بۆ ئەو پرسیارانەی کە خەڵکی چۆن دەڕوانە چینی کۆمەڵایەتی خۆیان؟ یان چۆن خەڵکی تر دەخەنە ناو نموونە چینایەتییەکانەوە. بۆ نموونە هەندێک کاری وەک شوفێری تراکتۆر، دارتاش، حەمباڵی رێگای ئاسن، شاگردی، چێشتخانە، شاگردی فیتەر چۆن پۆلین دەکرێن؟ ئایا ئەمانە هەموو چینی پرۆلیتاریا یان کرێکارن و لەمەوە دەکەونە یەک ئاست یاخود دەتوانین بڵێین کە پێگەی دارتاش بەرزترە لە شاگردی چێشتخانە یان بەپێچەوانەوە؟ چۆن دەتوانین بڕیار بدەین؟ ئاشکرایە ئەو نموونەیەی تەنها پشت بەکاری کەسەکە دەبەستێ نموونەیەکی تەواو نییە و ناشێ دەربڕی راستەقینەی جیاوازییە کۆمەڵایەتییەکان بێت. پێویستە چەند هۆکارێکی دیکەیش لە بەرچاو بگرین و لە راستیدا دەبێ شوێنگەی تاک لە کۆمەڵگادا لەبەر چاوبگرین. ئەگەر چینی کۆمەڵایەتی لەمەوە سەرچاوە بگرێت کە ئێمە چۆن پارە پەیدا دەکەین، ئاساییە کە پێگەی کۆمەڵایەتی بەستراوەتەوە بەوەی کە چۆن ئەو پارەیە خەرجدەکەین. واتای یەکەم بەندە بە بەرهەمهێنەرەوە، بەڵام واتای دووەم بەندە بە بەکاربەرەوە. ماکس ڤێبەر کە باس و خواسی چین و پێگەی هێناوەتە گۆڕێ «پێگە»ی وەکو جیاوکێکی کۆمەڵایەتی ناساندووە کە لە کۆمەڵگادا دەدرێت بەهەندێک شوێنگەو کۆمەڵگاش لە کۆمەڵە ئاستێک یان چەند پێگەیەک پێکدێت.

پێگەی چینایەتی هەرکەسێک بەستراوەتەوە بەچەند هۆکارێکەوە، ئاشکرایە کار زۆر گرنگە. لەم رووەوە پێگەی پزیشکێک لە کەناسێک بەرزترە، چونکە کارەکەیان جیاوازە. بەڵام لە هەمان کاتدا چەند هۆکارێکی تریش هەن کە لە پێگەی

چینایەتیدا لەبەر چاودەگیرێت وەک «خوێندن، ئاستی داهات، شێوازی ژیان، شێوازەکانی خەرجکردن»، گریمان دووکەس لە سەرەتای دەستپێکردنی کار واتە بەیانی زوو لە پاسێکدا لە سەریەک کورسی بە تەنیشت یەکەوە دادەنیشن. دەتوانین بزانین کە هەریەکیان لە زەینی خۆیدا رەنگە بۆچوونێکی هەبێ لەمەڕ پێگەی کۆمەڵایەتی تەنیشتەکەی، بەبێ ئەوەی ئەو دوو کەسە قسەیەک لەگەڵ یەکتردا بکەن.

هەرکاتێ لە شەقامدا کەسێکمان دی قات و پانتۆڵێکی لەبەردا بوو بۆینباخ و کراس و پێڵاوەکانیشی لەگەڵ قات و پانتۆڵەکەیدا تەواو گونجاوبوون بەتەنیشتیەوە کەسێکی دیکە دەڕوات کە جلێکی کۆنەی لەبەردایە لەگەڵ پێڵاوێکی بۆیە نەکراوو کراسێکی ئوتوونەکراو، لەگەڵ یەکەم روانیندا دوو پێگەی کۆمەڵایەتی جیاواز دەدەین بەم دوو کەسە. ئەم سیمبولە بەرچاوانە گرنگی خۆیان هەیە لەڕووی ئەوەی کە بتوانین کەسەکان لە شوێنی راستەقینەی خۆیاندا لەڕووی پێگەی کۆمەڵایەتییەوە دابنێین. ئاشکرایە کە مەبەستمان ئەوە نییە حوکمی ئەوە بدەین کەسێک لە کەسێکی دیکە باشترە یان خراپترە.

کۆمەڵناسی زانستێکە پێویستە بەدووربێت لە دادوەریکردنی بەها ئامێز. بێگومان ئەگەر ئەو دوو کەسەی باس کران ماوەیەک لەگەڵ یەکتریدا بدوێن رەنگە بگەن بەوەی کە لە بوارێکی تایبەتیدا هاوڕان یان هەمان مەیلیان هەیە بۆ چەند شتێکی وەکویەک، بەڵام بەزۆری ئەم گفتوگۆیەی ئەمانە هەرگیز ناگاتە رادەی «هاودڵی» و «هاوزمانی» درێژ خایەن و پەیوەندییەکەیان دەکەوێتە ژێر کاریگەری ئەو سیمبولە جیاوازانەی کە بۆ نموونە لەڕووی بەرگ و شێوازی قسەکردنەوە هەیانە [١٨/ ١٨].

لەکاتی باسکردنی پێگەی کۆمەڵایەتیدا ئەو پرسیارە دێتەگۆڕێ: لەدوو سیستمی کۆمەڵایەتی جیاوازدا چ جۆرە شوێنگەیەک بەهاوتای یەکدی حیساب دەکرێن؟ بۆ نموونە ئایا دەتوانین بڵێین کە نوێنەرێکی پەرلەمان هاوتای لۆردێکە؟ تەنانەت تاکەکەسێکیش دەتوانێت چەند پێگەیەکی ناجێگیری هەبێت. واتە لەلایەکەوە دەسەڵاتدارو ساماندار بێت و لە لایەکی ترەوە رەفتارەکانی هێندە دووربێت لەواقیعی باو، کە زۆرجار شایەنی قبوولکردن نەبێت. گەنجێک رەنگە لە تیپی تۆپی پێی قوتابخانە پێگەیەکی بەرزی هەبێت و کەچی لە بوارەکانی تردا بێ تواناو لێنەهاتوو بێت. کورتکردنەوەی چینی کۆمەڵایەتی (تەنیا) لە شوێنگەی

کاردا (لەگەڵ ئەوەشدا کە سوود بەخشە) بێ کەم و کوڕی نییە. هەرچەندە کار پێوەرێکی زۆر گرنگە لە دەستنیشانکردنی پێگەی چینایەتیدا، بەڵام تاکە پێوەریش نییە [٨/ ١٦٢-١٦٣].

## پۆلینکردنی پێگەکان

هەموو خەڵک تادوا ساتی ژیانیان کەم تا زۆر لە چوارچێوەیەکی رەفتاریی دیاریکراودا کاردەکەن. ئەم پێگانە بەدرێژایی ژیانی کەسەکە دەگۆڕێن و ئێمە هەموومان چەند پێگەیەکمان هەیەو دەبێت، لەوانە: ساوایی، منداڵی، لاوی، گەورەیی پێگەیشتوویی و بەساڵاچوون. هەروەها چەند پێگەیەکی خزمایەتیشمان هەیە وەک: کوڕ یان کچ، ژن یان مێرد، دایک یان باوک، مام یان ماموژن و ئاموزاو هاوشێوەکانی. ئەو پێگانەو هەروەها چەند پێگەیەکی هاوشێوەی ئەوانەش وەکو ژن یان مێردبوون ئەمانە چەند نموونەیەکی پێگەی پێ سپێردراون (Ascribed)، چونکە بەبێ هیچ هەوڵێکی بۆ بدەین وەدەستی دێنین. چەند جۆرێکی دیکەی پێگە هەیە وەکو پاشایەتی یان خانەدانی ئەمانیش حاڵەتی بەخشراویان هەیە، هەرچەندە چەند فێرکارییەکی تریش پەیوەندی بەمانەوە هەیە: فێربوونی نموونەکانی رەفتار، دابی تێکەڵاوی و.. هتد. هەموو ئەمانە لە ریزی پێویستییەکانی پێگەی کۆمەڵایەتی خانەدانی حیساب دەکرێن.

کاتێ کە باس لە پێگەی خانەدانی (ئەرستۆکراتی)یان پاشایەتی دەکەین ئەو چەمکەی بەکارمان هێناوە تارادەیەک لە چەمکی شوێنگەی تەمەن یان خزمایەتی جیایە. لە کۆندا تارادەیەک هەموو کەسێک دەیتوانی ژن بێت یان مێرد، بەڵام کۆمەڵگا تەنها بواری بە ژمارەیەکی کەم دەدا کە بچنە پاڵ پێڕی خانەدانەکانەوە. ئەمڕۆکە لەو کۆمەڵگایانەشدا کە ئەرستۆکراتییەتی تێدانییە چەند پێگەیەک هەیە کە کەم تا زۆر شوێنگەی کەسەکان لەژیاندا جیادەکاتەوە [١٦٣/٨]. لە کۆمەڵگاکانی ئەمڕۆدا نوێنەرێکی پەرلەمان پێگەیەکی بەرزی هەیە کاتێک کە ئێمە لە پێگەکەی رادەمێنین بەزۆری مەبەستمان پێگەی کاریەتی چونکە پێگەی کار بەزۆری تاکە پێگەیەکە کەسێک بەهۆیەوە پۆلین دەکرێت. وەک چۆن پاشا یان خانەدانێک لە رێگەی پێگە بۆماوەییەکەیەوە پۆلین دەکرا. شوێنگەی کار لە بەرامبەر پێگە پێسپێراوەکان (کەپێشتر باسکرا) دادەنرێت و ناودەبرێت بە «وەدەستهاتوو» (Achieved). تارادەیەک مانای پێگەی وەدەستهاتوو رۆشنەو

دەشێ جگە لە پێگەی کار چەند بەکارهێنانێکی تریشی هەبێت وەک: وەرزشکاری، هونەرمەندی، نووسەری. پێگەی وەدەستهاتوو بەرهەمی هەوڵی تاکەکەسین. ئەو پێگانەمان بۆیەدەست دەکەوێت چونکە لەو بوارەدا کارمان کردووە.

#### چەند نموونەیەک لە جۆرەکانی پێگەکان

| پێ سپێردراو | وەدەستهاتوو (وەرگیراو) |
|---|---|
| برا، خوشک | قوتابی زانکۆ، دەرچوو |
| کوڕ، کچ | برادەر، هاوکار |
| نێر، مێ | کارمەند، سەرۆک |

دیارە هێڵی جیاکەرەوەی نێوان پێگە پێ سپێردراوەکان و وەدەستهاتووەکان زۆر ئاشکراو دیار نییە. ڕەنگە کەسێک بەهۆی هۆشیاری کافی و توانای زۆری بۆ بیرهاتنەوەو لەبەرکردن بتوانێ ببێتە پزیشک (تێکەڵەیەک لە پێگە پێ سپێردراوو وەدەستهاتووەکان) یان لەلایەکەوە بوونی دایک و باوکێکی خوا پێداوو پایەبەرز و پەیوەندییە بەهێزو کاریگەرەکانیان (پێ سپێردراو)، لەلایەکی ترەوە خوێندنێکی لەبار (وەدەستهاتوو) کاریگەریان هەبێت لە بوونە پزیشکی ئەو کەسە. بەتەعبیرێکی تر لە هەندێ شوێنگەدا پێکهاتەیەکمان بەرچاو دەکەوێ لە پێگە پێ سپێردراوو وەدەستهاتووەکان[٣/٩٧].

#### پێگەو ڕۆڵی کۆمەڵایەتی

ئەگەر پێگە چەند شوێنگەیەکی تایبەتی بێت کە کەسێک لە کۆمەڵگا داگیری کردوون، ڕۆڵ ئەو ڕەفتارەیە کە لەو کەسە چاوەڕوان دەکرێت. ئاشکرایە هەموو ئەو کەسانەی کە شوێنگەی هاوشێوەیان هەیە بەیەک شێوە ڕۆڵەکانیان ناگێڕن، بەڵام لە کۆمەڵگایەک کە لەسەر «لێکجیاکردنەوە»ی کۆمەڵایەتی بنیاتنراوە جۆرێک لە هەماهەنگی کۆمەڵی لە بواری پێگەو ڕۆڵەکاندا هەیە. لەڕاستیدا ڕۆڵی کۆمەڵایەتی کۆمەڵێک چاوەڕوانییە، کە دەدرێنە پاڵ پێگەیەکی کۆمەڵایەتی تایبەتییەوە. کاتێ کە ئێمە پێگەیەکمان هەیە، ئەو ڕۆڵەش دەبینین کە بەو پێگەیەوە بەستراوەتەوە.

رۆڵ ئەم رەفتارەیە کە خەڵکی لێمان چاوەڕوانی دەکەن، چونکە ئێمە بەجێهێنانی ئەرکێکی تایبەتیمان لە ئەستۆدایە یاخود پێگەیەکی دیاریکراومان داگیرکردووە. هەندێک لە پێوەرەکانیش «Norm» پەیوەستن بە پێگەکانەوە یان لە گەڵیاندان. وەختێ کە رۆڵی «برا» یان «خوشک» دەبینین چاوەڕوانی ئەوەمان لێدەکرێت کە: میهرەبان، پارێزەر، هاورێ و بەئەمەک بین. لە رۆڵی مامۆستایەکدا چاوەڕوانی ئەوەمان لێدەکرێت کە بچینە پۆلەوەو بابەتی سەرنجڕاکێش و بەکەڵک باس بکەین، لە نمرە داناندا وردبین، لە هەموو کاتەکانی وانەکانماندا ئامادەبین، رێنومایی قوتابییان بکەین. بەجێگەیاندنی رۆڵە کۆمەڵایەتییەکان حاڵەتێکی هەیە وەک رۆڵبینین لەسەر شانۆی نمایشکردن (وەک شانۆگەری). ئەگەر بڕیاربێت رۆڵی «هاملێت» ببینین، ئاشکرایە کە بینەران چاوەڕوانی ئەوە ناکەن کە رۆڵی «رۆمیۆ» لە ئێمەوە ببینن، ئەمە شتێکە هەندێ جار لە ژیانی ئاساییدا بەرچاو دەکەوێت. [٣/ ٩٧].

**پەیوەندی نێوان لایەنە جۆراوجۆرەکانی رۆڵ [٢١/٢١٣]**

کەواتە رۆڵ چەمکێکی «پێوەرییە» لەسەر ئەو شتانە بنیاتنراوە کە لێمانەوە چاوەڕێ دەکرێت ئەنجامی بدەین، نەتەنها ئەوەی کە بەپێویست لەیەک کاتدا ئەنجامی دەدەین. کاتێ ئەو شتەی کە ئەنجامی دەدەین زۆر دوور بێ لەوەی کە خەڵکی چاوەڕوانی دەکەن لێمان، ئاساییە تووشی رەخنەو سەرزەنشت دەبینەوە، یان رەنگە رێنماییمان بکەن بەرەو رێگای راست، چونکە نەمانتوانیوە بەگوێرەی پێویست وەڵامی پێویستیی رۆڵەکانمان بدەینەوە. کۆمەڵناسان ئەو حاڵەتەی کە خەڵکی بەواقیعی لە شوێنگەو پێگەیەکی تایبەتیدا ئەنجامی دەدەن بە «کارپێکراو» ناوی دەبەن. ئەم چەمکە پشت بەو خاڵە دەبەستێ کە رەنگە ناتەباییەک لە نێوان ئەو چاوەڕوانییانەدا لە ئارادابێت کە شوێنگەکان لە ئێمەیان هەیەو ئەوەیش کە ئێمە لەژیانی واقیعی خۆمانا ئەنجامی دەدەین [٣/٩٨].

ئەوکاتە دژایەتیی رۆڵەکان دەردەکەوێت کە چەند چاوەڕوانییەکی زۆر لە دوو یان چەند شوێنگەیەکی کۆمەڵایەتی تاکەکەسێک بکرێت. ڕەنگە بەجێگەیاندنی چەند رۆڵێک کە پەیوەستن بەپێگەیەکەوە راستەوخۆ پێ بخاتە ئاقاری رۆڵێکی پەیوەست بەپێگەیەکی ترەوە. کەسێک کە سەرپەرشتیاری بەشێک بێت لە دەزگایەکدا رەنگە ناچاربێت کاتێ کە یەکێک لە هاورێکانی دوا دەکەوێت کە لە هەمان دەزگای ژێر چاودێری ئەودا کاردەکات، لێپرسینەوەی لەگەڵدا بکات و سەرزەنشت و سزای بدات یان تەنانەت لە دەزگاکەش دەری بکات. ئەو رۆڵەی کە لە برادەرێک چاوەڕێ دەکرێت. پشتیوانی برادەرەکانیەتی، رۆڵی سەرپەرشتیار پاراستنی سیستمی بەها پیشەییەکانە لەناو دەزگایەکدا. لە هەندێ حاڵەتدا لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا ناتوانرێت رێگری لە دژایەتی رۆڵەکان بکرێت و لە کاروباری رۆژانەدا حاڵەتی لەم شێوەیە بەرچاو دەکەوێت. هەندێ جار دژایەتی رۆڵەکان دەبێتە هۆی ئەوەی کە هەندێ کەس پەنا بۆکاری ترسناک ببەن [ ٢٠/ ١٢٧-١٢٨].

### چینی کۆمەڵایەتی وەک وردە کولتوورێک

لە چەند بەشێکی ئەم کتێبەدا ئاماژەمان بە جیاوازی چینە کۆمەڵایەتییەکان کرد لەڕووی فێرکردن، ئاراستە سیاسییەکان، ژیانی خێزانی و سەرجەم بوارەکانی تر، چونکە ناکرێ باسی خێزان، ئایین و دەوڵەت و مەسەلە نەتەوەیی و گرووپییەکان بکەین بەبێ ئەوەی ئاگامان لە جیاوازییە چینایەتییەکان بێت.

دەتوانین چینە کۆمەڵایەتییەکان وەک چەند وردە کولتوورێک سەیر بکەین کە لەڕووی بەهاو خاڵی سەرنج و چاوەڕوانییەکان لەگەڵ یەکتریدا جیاوازن. بەکۆمەڵایەتیبوونی منداڵان لە وردە کولتوورەکانی چینە کۆمەڵایەتییە جیاجیاکاندا لە رێگەی ئەزموونە جیاوازەکانیان و لەماڵ و کارلێکیان لەگەڵ کەسانی دیکەدا (لە بنەڕەتدا لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە هاوچینی خۆیانن) بەدی دێت. منداڵانی چینی خواروو زیاتر توشی سزای جەستەیی دەبنەوەو پێدەچێ لەم خێزانانەدا کەمتر جەخت بکرێت لەسەر فێرکردنی تاکەکەسی و بزاوتی ستوونی کۆمەڵایەتی بەبەراورد لەگەڵ چینە ناوەندییەکان. منداڵانی چینەکانی خواروو لەو خێزانانەدا دەژین کە بەگشتی رازیبوونی کۆمەڵایەتی لەنێو ئەندامەکانی و ئاراستەی فیکری پێشکەوتنخوازانەیان کەمترە. لەگەڵ ئەودا کە ئەمڕۆ منداڵانی چینەکانی خوارەوە زیاتر حەزیان لە خوێندنی باڵایە، بەڵام ئەو کەسانە بۆ گەیشتن بەم ئاستە لە خوێندن و فێربوون

تووشی گەلێک کۆسپ دەبنەوە [٧/٣٥٤-٣٥٦]. هەر چەندە چینی کۆمەڵایەتی کەسێک بەرزتربێت ئەگەری کوژرانی لەشەڕدا کەمترە، کەمتر دەگیرێت و کەمتر دادگایی دەکرێت و کەمتریش بەتۆمەتی تاوانەوە دەخرێتە ژێر چاودێرییەوە (دیارە بەو مانایە نییە کە کەسانی چینەکانی خوارەوە زیاتر تاوان ئەنجام دەدەن). لێکۆڵینەوەکانی وڵاتە پیشەسازییەکان نیشانی دەدەن کە بەگشتی هەر چەندە چینەکە بەرزتربێت مەیلی ئەندامبوون لە کۆمەڵە خۆبەخشەکاندا زیاترە، بەشداریکردن لە چالاکییە کۆمەڵایەتییەکاندا بەرفراوانترە، هەروەها مەیلی ئازادیخوازانەی کەسەکان لە بواری مافە مەدەنییەکاندا توندترە [١١/٥٥]

دەتوانین چەند بوارێکی تر بدۆزینەوە کە پێچەوانەی جیاوازییە چینایەتییەکانەو لەسەرووی هەموویانەوە چانسی مانەوەیە. ژمارەی منداڵانی هەژارەکان زیاترە لە چینەکانی ناوەندو باڵا. لەگەڵێک وڵاتی دواکەوتوودا (٢٥٪)ی حاڵەتەکانی مردن پەیوەندی بە منداڵانەوە هەیە. هەژاران لەو کۆمەڵانەی کە تیایدا دەژین و لە ناو ئەو ئۆرگانانەی کاری تێدا دەکەن لە کەسانی دیکە کەمتر دەستیان دەڕوات و کاریگەرییان کەمترە. لەڕووی ڕەزامەندی کارەوە جیاوازییەکە گەلێک زیاترە. لەکاتێکدا زۆربەی ئەو کەسانەی کاری تایبەتمەندییان هەیە ئەگەر پێویستیی ئابووریشیان بەکارکردن نەبێت هەر کاردەکەن. ئەم حەزە هەتا لەناو دەستەیەکی زۆر کەمی کرێکارە ناشارازەکانیشدا بەرچاو ناکەوێت. لە بواری چۆنێتی تێڕوانین بۆ سەرکەوتن، جیاوازی هەژارەکان لەگەڵ کەسانی چینی ناوەڕاست گەلێک زۆرە. زۆربەی کەسانی چینی ناوەڕاست پێیان وایە کە چانسی سەرکەوتنیان زیاترەو چۆنیەتی کار هۆکارێکی گرنگە بۆ سەرکەوتن.

### کولتووری هەژاری

لە جیهانی هاوچەرخدا پانتایی هەژاری هێندە بەرفراوان بووە، کە کار گەیشتۆتە ئەوەی کۆمەڵناسان قسە لە ئەگەری بوونی «کولتووری هەژاریی» بکەن. ئەم چەمکە لەسەر بناغەی لێکۆڵینەوەیەکی «ئۆسکار لویس - O. Lewis»هاتەگۆڕی کە لەنێو خەڵکێکی زۆر هەژار لە مەکسیک، پۆرتۆریکو، و نیویۆرک بە ئەنجام گەیاند. «لویس» بەو ئەنجامە گەیشت کە کەسانی زۆر هەژار ئەو بەهاو پێوەرانە پەرەپێدەدەن کە لەبنەڕەتدا لەو هەلومەرجی بێبەشی و نەدارییەی کە تیایدا دەژین سەرچاوەیان گرتووە. سەرەڕای ئەوە هەژارەکان شێوازی ژیانی خۆیان دەگوێزنەوە بۆ منداڵەکانیان

(کە ئەمەش رەگوریشەی بۆ کولتووری ئەشکەوت نشینی دەگەڕێتەوە). لەگەڵ ئەوەشدا کە منداڵان هان دەدرێن بۆ ئەوەی بخوێنن تاکو خۆیان لە فشارەکانی هەژاری دەرباز بکەن، بەڵام لەبارووزرووفێکی ئەوتۆدا گەورە دەبن کە نیشانەیەک لە ئارادا نییە بۆ عەقڵ و شارەزایی کۆمەڵایەتی بەڕادەیەک کە کۆمەڵگا بۆ سەرکەوتنی پێویستی پێیەتی. بەبڕوای لویس لە ژیانی کەسانی زۆر هەژاردا ئومێدو هیوایەک نییە. ژیانیان لەسەر گوزەراندنی رۆژ بە رۆژەو دەبێ لەرادەبەدەر هەوڵ بدەی بۆ مانەوەت. لە زۆر لایەنەوە کەسانی هەژار لە باقی کۆمەڵگا دابڕاون. [١١٦/ ١٦٦-١١٨]

دەبێ ئەوەش بلێین کە یەکەم جار زاراوەی «کولتووری هەژاریی» بۆ وەسفکردنی کەسانی زۆر هەژار بەکارهات کە بێکارن، و لە کاولەخانووەکانی ناوچە زۆر هەژارەکاندا دەژین. لویس کولتووری هەژاریی بەو حاڵەتە دەزانێ کە کەم و زۆر لە هەندێ باروزرووفی تایبەتیدا لەو کۆمەڵگایانەدا دێتە ئاراوە کە شارین یاخود تازە دەچنە ناو پرۆسەی بەپیشەسازیکردنەوە (تصنیع). ئەو باس لە کولتوورێک دەکات (لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا) کە تیایدا هەموو شتێک حاڵەتی دەستەجەمعی هەیە، رێژەی خواردنەوە زۆرە، کەسەکان زۆر بەخێرایی دەچنە دنیای سێکسەوەو ئاڕاستە زیاتر بەرەو خێزانی «دایک سالاری»یە. «ئەلیزابێس هیرزۆگ» (E. Herzog)ئەم چەمکەی لە ئەمریکادا خستە بەر توێژینەوەو گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە زۆر لەو خەسڵەتە دەروونییانەی دەدرێتە پاڵ هەژاران وەک چەند زەروورەتێکی هاوتان لە بەرامبەر هەژاریدا، نەک ئەوەی بتوانرێ بەچەند بەشێکی کولتوورێک حیساب بکرێن. بەبڕوای ئەو لەگەڵ ئەوەشدا کە رێژەی منداڵە ناشەرعییەکان لەنێو هەژارانی ئەمریکادا (لە بنەڕەتدا رەشەکان) زیاترە، بەڵام ئەم دیاردەیە لەڕووی کولتوورییەوە لەلایەن خۆیانەوە پشتیوانی لێناکرێت. دایکانی ئەو کیژە گەنجانە بەردەوام حەزدەکەن ئەم کارە سێکسییە بەر لەکاتی خۆی نەکرێت، و کچەکانیان بتوانن ژن و مێردایەتییەکی باش و سەرکەوتووانەیان هەبێت. بەهەمان شێوە لەگەڵ ئەوەشدا کە زۆربەی هەژاران لە خواردنەوەدا زیادەڕۆیی دەکەن، بەڵام راستییەکە ئەوەیە کە «سەرخۆشی» لەلایەن کۆمەڵگاوە پەسەند نییە. هەروەها «هیرزۆگ» ئاماژە بەوە دەکات کە زۆربەی ئەو خەسڵەتانەی کە دەدرێنە پاڵ کولتووری هەژاری دەرەنجامی بەد خۆراکی، دڵتەنگی، ماندوویی، بێئومێدی و لاوازی و بوونی کێشەیەکە لەڕووی کۆبوونەوەی هێزە فیکرییەکانە لە تاکدا. بەم

جۆرە سەرنەکەوتن لە خوێندنی منداڵان لە قوتابخانەدا حاڵەتێک نییە کە دایک و باوک پەسەندی بکەن، بەڵکو ئەم بارە لە هەلومەرجی ئامادەو هەییدا حاشا هەڵنەگرە.

«هیرزۆگ» و «لویس» هەردووکیان لەو خاڵەدا کۆکن کە بوونی خێزانی «دایک سالار» ئەنجامی هەژاریی بەربلاوەو تایبەت نییە بە رەشپێستە هەژارەکانەوە. لە هەندێک شوێنی جیهاندا کە بێکاری زۆرە پیاوە بەتەمەنەکان بەکردەوە ناتوانن ئەرکەکانی سەرۆک خێزانێک لە ئەستۆ بگرن. ئەم بابەتەش هەرگیز لایەنێکی نەژادیی نییە[٨/ ١٨٦-١٨٨].

**بزاوتی کۆمەڵایەتی**

ئەمرۆکە کۆمەڵناسان زیاتر خەریکی ناسینی ئەو هیرارکیەتە یان پەیژەیەکن لە پێگە کۆمەڵایەتییەکان کەکەسەکان لێیەوە سەردەکەون یان دێنە خوارەوە. شوێنگەی هەرکەسێک لەم پلیکانەی چین/ پێگەو لەرێگەی چەندین هۆکارەوە دەستنیشان دەکرێت و بزاوت لە نێوان چینەکاندا لە ئارادایە، ئەم بزاوتەش پێی دەوترێت «بزاوتی کۆمەڵایەتی» (social mobility).

دەزانین کە بزاوتی ستوونی چینایەتی بزاوتێکە بەرەو شوێنگەی باشتر. لەگەڵ ئەوەشدا هەر بزاوتێکی کارکردن مەرج نییە بەمانای گۆڕینی پێگەی چینایەتی ئەو کەسە بێت بەرەو سەر یان بەرەو خوارەوە. چەمکێکی تر لەم بوارە «بزاوتی وەچەکان» (Generational mobility)ـە کە بەمانای هەڵسەنگاندنی سەرکەوتوویی کەسێکە بە بەراورد لەگەڵ وەچەی باوانی. ئاشکرایە کەسەکان لە زنجیرەیەک پایەی بەدوای یەکدا هاتوون لەڕووی هەڵکشان و دابەزین لە شوێنگە کۆمەڵایەتییەکاندا. بەڵام مەسەلەکە ئەوەیە بزانین ئایا بزاوتی هەڵکشان لە کۆمەڵگادا زیاترە یان بزاوتی دابەزین و ئایا رێژەکەی بەو رادەیەیە کە لە رابردوودا هەبووە یان نا؟

پرۆسەی گشتی پێویستییەکانی کار لە کۆمەڵگا پیشەسازی و بەپیشەسازی بووەکاندا ئەوە پیشاندەدات کە بواری کارکردن بەزۆری لەو کارانەدا زیاترە کە کەسەکان تیایدا خاوەن شارەزایی و پلەی خوێندنی باڵان و ئەم داواکارییانەی کار، هەلومەرجی بزاوتی هەڵکشان لە کۆمەڵگا نوێیەکاندا دەڕەخسێنێ [٨١/١٢٦]. دیارە بیریارانی دنیای کۆن هەمیشە باوەڕیان بەم ئەنجامگیرییە نەبووە.

«ئەردەشیری بابەکان» دامەزرێنەری زنجیرەی ساسانی باوەڕی بە «ڕێکخستنی چینەکان» هەبووەو ئارەزووی گواستنەوەی کەسەکانی لە چینێکەوە بۆ چینێکی تر بە هۆکارێکی ترسناک دادەنا. ئەو پێی وابوو کە «خەڵکی لە حاڵێکەوە بۆ حاڵێکی تر دەبزوون ئەنجام بەوە دەگات کە هەرکەسەو بەدوای شتێک دەکەوێت کە شایەنی ئەو نییەو بەرزترە لە پایەو شوێنی خۆی، چونکە ئەگەر گەیشت بەو شتەی کە بەدوایدا دەگەڕێت شتی لەوە بەرزتر دەبینێت و حەزی لێدەکات، پاشان بەدوایاندا هەنگاو دەنێت، هەروەها ئاشکرایە کە لەناو خەڵکی ڕەشۆکیدا کەسانێک هەن کە لە پاشاکان نزیکترن تا خەڵکی تر. گواستنەوەی خەڵکی لە شوێنەکانیاندا دەبێتە هۆی ئەوەی ئەوانەی لە پلەی دوای پاشاکاندان تەماح لە پاشایەتی بکەن و ئەوانەی کە لەدوای ئەوانن حەزیان بچێتە شوێنەکەی ئەوانەوە» [١١٧/ ٢٤-٢٥].

کۆمەڵناسی ئینگلیزی «مایکل یۆنگ» (M. young) باس لە سیستمێکی چینایەتی زۆر کراوە دەکات و ناوی دەنێت «لێهاتوویی‌خوازی» (Meritocracy) بەپێی ئەو هەرکەسێک تەنها بەگوێرەی ئاستی لێهاتووی و شایستەیی خۆی (نەک هیچ شتێکی تر) پایەی خۆی لە کۆمەڵگادا بەرز دەکاتەوە [١٢٧/ ٢٠-٢٤].

سەرەڕای ئەوەی کە بزاوتی کۆمەڵایەتی لەو کۆمەڵگایانەی کە لەسەر بنچینەی «لێهاتوویی» دامەزراون زیاترە نەک لەوانەی کە لەسەر «ئەرستۆکراتی» دامەزراون، کەچی لە بارێکی ئاساییدا بەدەگمەن هەندێ کەس لەنەوەیەکدا دەتوانن لە ئاستی شرە پۆشییەوە بگەن بەئاستی دەوڵەمەندیی. لە ڕۆژئاوادا ڕۆیشتن بۆ کۆشکی سپی و کۆشکی ئەلیزاو خانووی ژمارە ١٠ لە Dwoning street و چەند شوێنێکی دیکەی لەم جۆرانە ڕەنگە تەنها خەونی هەندێک باوک بێت بۆ منداڵەکانی و شتێکە بەدەگمەن بەڕاست دەگەڕێت. زۆربەی خەڵکی کەم تا زۆر لەو چینەی کە تیایدا لە دایک بوون دەژین و بەزۆری لە پلەیەکی بەرزتر یان خوارتری پەیژەی پایەکۆمەڵایەتییەکاندا دەمێننەوەو لەبەرامبەریاندا سنوورێک هەیە کە تێپەڕاندنی ئەستەمە. بەرزبوونەوە یان کەوتنی پێگەی کۆمەڵایەتی تەنها پەیوەست نییە بەتاکەوە. لە هەندێ حاڵەتدا ڕەنگە سەرجەم ئەندامانی یەکێ یان چەند چینێک پێگەی خۆیان بگۆڕن. تەنانەت لە هەندێ حاڵەتدا ڕۆیشتنی چینە کرێکارییەکان بۆ نێوەندی چینەکانی ناوەڕاستی کۆمەڵگا بە «بەبورژوابوون» ناوبراوە [١٨/ ٢٢-٢٣].

بەگشتی بزاوتی ئیش وەک یەکێ لە سیما گرنگەکانی بزاوتی کۆمەڵایەتی

لەبەرچاو دەگیرێت. دەگونجێ بزاوتی کۆمەڵایەتی ستوونی یان ئاسۆیی بێت. مەبەست لە بزاوتی ئاسۆیی ئەو حاڵەتەیە کە تیایدا رەنگە شوێنگەی کەسێک بگۆڕێت بەبێ ئەوەی پایەکەی بگۆڕێت (وەک رۆیشتن لە کارێکەوە بۆ یەکێکی تر کە لەرووی چین و پێگەوە لە هەمان ئاستدابێت). دەشێ بزاوتی ستوونی دوولایەنی هەبێ: هەڵکشان و دابەزین. بزاوتی دابەزین وەختێکە کەسێک پێگەیەکی نزمتر لە پێگەکەی ئێستای دەستبکەوێ. هەندێ جار بزاوتی کۆمەڵایەتی پێویستی بە بزاوتی جوگرافیش دەبێت (بۆ دەست کەوتنی هەلی گونجاو کەسێک ناچاردەبێ لە شارو پارێزگایەکی دیکەدا نیشتەجێ بێت).

رێژەی بزاوتی کۆمەڵایەتی لە ولاتێکەوە بۆ ولاتێکی تر جیاوازە لەناو کۆمەڵگایەکدا (لەیەک کاتدا) جیاوازە (رێژەی بزاوتی کۆمەڵایەتی لە هەندێ شوێنی ولاتێک زۆرترە). هەروەها بەتێپەڕبوونی زەمەن ئەم بابەتە جیاوازی تێدەکەوێت. (لە دوای شۆڕشی پیشەسازی رێژەی بزاوتی کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگاکانی رۆژئاوادا زۆرتر بووە)[ ٥٢/ ٢٢-٢٣].

**چالاکییەکان، کارەکان و بزاوتی کۆمەڵایەتی (ئاسۆیی و ستوونی)**

| چینی کۆمەڵایەتی | | چالاکی لەبەشی داراییدا | چالاکی لە بەشی پیشەسازیدا | لە بەشی بارو گواستنەوەدا |
|---|---|---|---|---|
| سەروو | | ئەلف ← | ——————→ | ئەلف |
| | س ↑ | سەرۆکی بانک | ئەندازیاری میکانیکی | سەرۆکی هێڵی ئاسن |
| | | ژمێریاری باڵا | پسپۆڕی چاپ | فرۆکەوان |
| ناوەند | | ژمێریار | بەرگکەری کتێب (صحاف) | لێخوری شەمەندەفە |
| | | (راگوێزەر) | | کارمەندی پۆستە |
| خواروو | ↓ | پۆستەچی | ئاسنگەر | لێخوڕی پاس |
| | س | خزمەتکار | کرێکاری سادە | پۆستەچی |

س: بزاوتی ستوونی لە چینێکەوە بۆ چینێکی تر.

ئەلف: بزاوتی ئاسۆیی لە چالاکییەکەوە بۆ یەکێکی تر.

بەگشتی ئەو کەسەی کە بەشێوەیەکی سەرکەتووانە لە کاتێکی کورتدا لە یەکێ

له خــوارترین پایەکــانی کــۆمــەڵگادا ســەردەکــەوێ بۆ یەکــێک لە بەرزترین پایە کۆمەڵایەتییەکان بە مرۆڤێکی خۆشبەخت دادەنرێت، چونکە گەیشتووە بە خواستی خۆی. لەگەڵ ئەوەشدا رەنگە ئەم بۆچوونە حاڵەتێکی گشتیی هەبێ، بەڵام دەشێ ئەم بزاوتە چەند ئەنجامێکی دیکەشی لێبکەوێتەوە کە بریتین لە:

١- دەرکەوتنی قەیران لە رۆڵی کۆمەڵایەتیدا. دەگونجێ ئەم قەیرانە ئەنجامی بزاوتی بەهێزی کەسەکەو رۆیشتنی بێت لە چینێکەوە بۆ چینێکی تر. بۆ نموونە فرۆشیارێکی دەستگێڕ لە ناکاو کە دەگاتە وەزارەتێک، ئاساییە دەزانێ کە هێندە ئاگای لەو شتانە نییە کە لەو شوێنە تازەیەدا پێویستیەتی و ئەم مەسەلەیە رەنگە وای لێبکات تووڕەو پەشۆکاو دەربکەوێ.

٢- پچڕاندنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی پێشوو. ئەو کەسە ناچارە کە پەیوەندییەکانی پێشووی خۆی کەم بکاتەوە یان نەیانهێڵێت، خۆ رەنگە هەندێک لەو پەیوەندییانە زۆر توندو تۆڵ و پێوە بەندی و هۆگری نزیکی خۆیشی بێت.

٣- هەستکردن بەگوناه. هەرچەندە هەندێک کەس کە سەریش دەکەون هەستی لووتبەرزی و غـرووریان نییە، بەڵام ئەوانەی کە پێشتر لەریزی ئەو کەسە سەرکەوتووەدابوون کەچی ئێستاش لە هەمان پایەی پێشووی خۆیاندان. لەوانەیە بەم هۆیەوە، هەست بە تاوان بکەن کە نەیانتوانیوە سەربکەون، ئەمەش لە حاڵەتێکدا کە هەر کەس هەوڵبدات بتوانێت سەربکەوێت.

**هۆکارەکانی بزاوتی کۆمەڵایەتی**

کۆمەڵناس ئەمریکی «هۆرتۆن» (P. Horton) هۆکارەکانی بزاوتی کۆمەڵایەتی بۆ دوو دەستە دابەش دەکات:

١- بونیادی کە (پێکهاتەی کار، جیاوازی لە توانای، بونیادی ئابووری، پشتیوانی لە بزاوت و هەڵگرتنی بەربەستەکانی بەردەمی) دەگرێتەوە.

٢- فەردی (جیاوازی لە شارەزایی و لێهاتوویی، فێرکردن، دابونەریتی پیشەیی و شێوازی کارکردن، بەقوربانیکردنی بەرژەوەندی کاتی، بەخت). بەڵام لەبەرئەوەی ئەم دوو دەستە هۆکارە لێکدی جیا ناکرێنەوە، هۆرتۆن ئاماژە بەوە دەکات کە هەموو ئەم هۆکارانە بەجۆرێک پێکەوە پەیوەستن کە ناکرێ بەجیا رادەی کاریگەری هەر کامێکیان بزانین [ ٧/ ٣٧٣-٣٧٨]. لەگەڵ ئەوەشدا لە کۆی ئەو زانیارییانەی کە لەم بوارەدا گەڵاڵە بوون، دەتوانین بەم شێوەیەی خوارەوە باس لە چەند هۆکارێکی

بزاوتی کۆمەڵایەتی بکەین:

١- لەگەڵ گۆڕان لەدابەشبوونی کارو پێکهاتەی کاردا بزاوتی کۆمەڵایەتی زیاد دەکات. بەشێوەیەکی گشتی چەندەی کارەکان زیاتر دابەشبکرێن، بواری بزاوتی هەڵکشان زیاتر دەبێت، بەپێچەوانەوە کەمی چالاکی ئابووری دەبێتە هۆی زیاتربوونی بزاوتی بەرەو خوارەوە.

٢- دەشێ جیاوازی رادەی بەرهەم لە نێوان توێژە کۆمەڵایەتییە جیاجیاکاندا ببێتە هۆی ئاسانکردن یان وەستاندنی بزاوتی کۆمەڵایەتی. ئەگەر ژمارەی ئەو منداڵانە کەم بێت کە لەچینی باڵادا لە دایک دەبن، بەجۆرێک کە نەتوانن جێگای ئەندامانی خۆیان پڕ بکەنەوە، ئەوساکە هەلی زیاتر لەبار دەبێ بۆ سەرکەوتنی چینی خوارەوە (دیارە بەو مەرجەی کە رێژەی لە دایک بوون لەو چینەدا زیاتر بێت).

٣- پرۆسەی بەکۆمەڵایەتیبوونی ساوایەک لە توێژ یان چینی خۆیدا (بەجۆرێک کە بەگوێرەی پێگەی خێزانی هەڵدەسەنگێنرێت) دەشێ رێگربێت لەسەر رێگای بزاوتی کۆمەڵایەتی. کچێک یان کوڕێک، داهێنانەکان و بەهاو پێوەرە پێسپێراوەکانی چینە کۆمەڵایەتییەکەی خۆی فێردەبێت، هەرکاتێ پێگەیەک فەراهەم بێت بۆ بزاوتی هەڵکشان رەنگە تاک لە بەرامبەر ئەم چەشنە گۆڕانەدا بەرگری بکات، چونکە بۆ ئەو زەرووریە کە جارێ هەر گرێدراوی چینێک بێت. هەتا ئەو کاتەش کە ئەو کەسە تامەزرۆی جووڵەیەکی لەم جۆرە بێت لە زۆربارداً زەحمەتە بۆ ئەو کەسە کار بەشێوازی رەفتاری چینێکی باڵاتر بکات. هەروەها لە دایکبوون لە خێزانێکی سەر بەپێگەو چینێکی کۆمەڵایەتی باڵا دەشێ پێش بە بزاوتی دابەزین بگرێت، ئەمەش بەهۆی ئەو جیاوکانەی کە رەنگە لە سەروەت و ساماندا هەبن. بۆ کوڕێک کە شارەزاییەکی خوار ناوەندی هەبێ و سەر بەدایک و باوکێکی دەوڵەمەند بێت ئاسانتر دەبێ کە: بڕوات بۆ کۆلیژ، بەهۆی پەیوەندییەکانی باوکییەوە دەتوانێ خەریکی کارێکی لەباریش بێت، لانی کەم لەو چینەدا بمێنێتەوە کە باوکی تێدابووە. لە بەرامبەر ئەوەدا ئەم هەلە بۆ گەنجێکی وەکو خۆی کە سەر بەچینێکی خواروتربێت کەمتر دەڕەخسێ.

٤- ئەو گرووپە نەتەوەیی و ئایینییەی کە تاکەکەس بەندە پێیەوە، دەشێ کاریگەری زۆری بەسەر شانسی بزاوتی کۆمەڵایەتییەوە. هەبێت بەشێوەیەکی گشتی چەندەی گرووپێکی نەتەوەیی لە وڵاتێکدا گەورەتربێت ئەگەری بزاوتی هەڵکشانی ئەندامەکانی پتردەبێت. لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا دەسەڵاتی وەک

یەکبوونی پرۆتستانتەکان زیاترە لە غەیرە پرۆتستانتەکان، و رادەی بزاوتی هەڵکشانیشیان پترە. لە هەمان وڵاتدا هەر چەندە کە جوولەکەکان لەڕووی شێوازی ژیانیاندا لە خەڵکی دیکە جیاوازن، بەڵام بەهۆی ئەزموونی لە پێشینەیانەوە لە چەند بوارێکی وەک: کاروباری شاری و پیشەی تایبەتیدا بزاوتی هەڵکشانیان هەبووە. کاتێک جیاکاری لە دژی کۆمەڵێکی نەتەوەیی زیاتر و توندتربێت ئەوساکە هەوڵدان بۆ هەڵکشان لە پێگەی چینایەتیاندا زیاتر دەبێت.

٥- هەرکاتێ گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگایەکدا پتر بێت، رادەی بزاوتی کۆمەڵایەتیش پتر دەبێت. شۆڕشی پیشەسازی کە لەسەرەتادا بوو بەهۆی جێگۆڕکێیەکی بەرفراوانی مرۆڤەکان، چەندین پێگەی لە باریشی بۆ جێگرەوەی کارەکان هێنایە ئاراوە. لەگەڵ فراوانبوونی سنوورەکانی کۆمەڵگا (بەو جۆرەی کە لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا بەرچاو دەکەوێت) چەند بوارێکی نوێ هاتنە گۆڕێ بۆ کارو دواجاریش بزاوتی کۆمەڵایەتی. لەکاتی شەڕەکاندا بەهۆی کەمبوونەوەی هێزی مرۆیی بواری کارکردن لە یەکەی پیشەسازیدا زیاد دەکات. لەلایەکی ترەوە ناوبرە ئابوورییەکان دەبنە هۆی ئەوەی بە ملیۆنان کەس بێکاربن و لە ئەنجامدا بزاوتی دابەزین زیاد بکات. چەندین دیاردەی وەک خۆ پیشاندانی سیاسی و پشێوی لە ناوەندەکانی زانکۆدا، خۆ پیشاندانی ئازادیخوازانەو بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکانی مافی ئافرەتان، هەموو ئەمانە کاریگەری خۆیان بەسەر گۆڕانکارییەکانی ناو چینایەتی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگاکان هەیەو دەبێت.

٦- لە کاتێکدا کە تاکگەرایی و جیاوازی گرووپە کۆمەڵایەتییەکان لە ئارادا بێ و پەیوەندیش لە نێوان ئەمانەدا سنوودار بێت بزاوتی کۆمەڵایەتیش لە سنوورێکدا دەمێنێتەوە. بەبێ بوونی زانیاری لەمەڕ یەکدی نە جیاوازی لەڕاوبۆچوونەکاندا بەرجەستە دەبێت و نە لە چینەکانی خوارەوەشدا حەزی بەرەو ژیانی باشترو ئیمکاناتی باشتر پەیدا دەبێت. گەشەسەندنی فێرکردن و پەروەردەو بزاوتی جوگرافیایی، پەیوەندی نێوان چینەکان زیاد دەکات و دەبێتە هۆی لەناوچوونی سنوورەکانی نێوانیان.

٧- ئەگەر کۆمەڵگایەک پیشەسازی بێت، تارادەیەک ژمارەی ئەو پێگانەی کە تێیدایە زیاتر دەبێت، پێویستی کاری پسپۆڕی زیاتر دەبێت، لە کۆتاییشدا رادەی بزاوتی کۆمەڵایەتی لەو کۆمەڵگایەدا زیاتر دەبێت.

٨- هەرچەندە هەل و بواری فێرکردن زیاتر لەبار بێت، بزاوتی کۆمەڵایەتی

چینەکانی خوارەوەش پتر دەبێت. چونکە پەروەردەو فێرکردن یەکێکە لە هۆکارە گرنگەکانی هەڵکشانی پێگەو چینی کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگای نوێدا. دیارە ئەگەر سیستمی فێرکردن بەڕووی هەموو کەسێکدا بەتەواوی ئاوەڵانەبێت بەچاوپۆشین لە نەژاد، چین، ئایین و سەرجەم تایبەتمەندییەکانی دیکە، هەرگیز یەکسانی تەواو لەنێوان چینەکاندا لەڕووی بزاوتی کۆمەڵایەتییەوە پەیدا نابێت. بێگومان یەکێک لە بەڵگەکانی ئەمە ئەوەیە چەند هۆکارێکی تر دەستیان هەیە لە دیاریکردنی شوێنی تاک لە سیستمی توێژبەندیی کۆمەڵایەتی و بەتایبەتی هیرارکیەتی کۆمەڵایەتی.
یەکێک لە خاسییەتەکانی چینەکانی ناوەندو باڵا ئەوەیە کە چێژو خۆشیی کاتی بەقوربانی چێژو پاداشتی ئایندە دەکات، چونکەلە کۆتاییدا دەتوانێ زیاتر وەدەست بێنێت. کەسێکی چینی ناوەندو باڵا زۆر بەتامەزرۆییەوە کات و وزەو پارەی بۆچوونە زانکۆ خەرج دەکات، چونکە لەو باوەڕەدایە کە دواجار زیاتر سوودو کەڵکی لێوەردەگرێت. ئەم ڕەفتارە لەنێو چینەکانی خوارەوەدا کەمتر بەرچاو دەکەوێت چونکە هەلومەرجەکانی ژیانیان جێگیر نییەو دەوروبەر (لەرووی ئابوورییەوە) مسۆگەر نییەو لەوانەیە هۆکاری تریش لە ئارادا بێ. لە هەندێ باردا بەگوێرەی بیروباوەڕی کۆنەپارێزانەی باوان و تێگەیشتنی بەساڵاچووان و برادەرانەوە ڕەنگە کەسەکە لەو باوەڕەدا بێت کە هیچ ناکرێت لەم ژیانەدا بۆ پەرەپێدانی پێگەی خۆی و ڕەنگە سەیر نەبێ لاوێک لە چینی خوارەوە لەو باوەڕەدابێ کە خوێندنی زانکۆ جوانکاری و زیادە بێت و تەنیا تایبەت بە خەڵکی دەوڵەمەند بێت [ ٥٢/٨٣-٨٥ ].

**کورتەی بەش**

١- سێ جیاوکی گرنگ هەن لە کۆمەڵگاکانی مرۆڤایەتیدا: داهات، دەسەڵات و ئیعتیباری کۆمەڵایەتی.

٢- لە مێژووی فیکری مرۆییدا، یەکسانیخوازیی مرۆڤەکان مەسەلەیەکی لەمێژینەیە.

٣- باوترین پێوەرەکانی توێژبەندیی کۆمەڵایەتی بریتین لە نەژاد، ڕەگەز، چین.

٤- ئەو ناعەدالەتییەی کە لە دابەشکردنی نایەکسانی پاداشت و جیاوکە مانادارە کۆمەڵایەتییەکانەوە سەرهەڵدەدات پێی دەگوترێ توێژبەندیی کۆمەڵایەتی.

٥- چینی کۆمەڵایەتی کۆمەڵێک خەڵک لە خۆی دەگرێت کە لەڕووی جیاوکی خێزانی و پێگەی کۆمەڵایەتی و کارکردن، هەروەها هەلومەرجەکانی فێرکردنیشدا

تاڕادەیەک وەکو یەکن.
٦- چینی کۆمەڵایەتی یەکێکە لە پێوەرە گرنگەکانی توێژبەندیی کۆمەڵایەتی.
٧- گرنگترین هۆکارەکانی دیاریکردنی چینی کۆمەڵایەتی بریتین لە سامان، داهات، ئاست و جۆری فێرکردن، کارو پێگەی پیشەیی، خێزان و گرووپی خزمایەتی، دەسەڵات و هێزی سیاسی و کۆمەڵایەتی.
٨- سێ شێوازی تایبەتی نرخاندنی چینی کۆمەڵایەتی هەن: خودی، بابەتی، ناوو ناوبانگی ناو خەڵکی.
٩- چینی کۆمەڵایەتی لە ڕێگای چەند سیمایەکی دیاریکراوەوە هەڵدەسەنگێنرێت.
١٠- لە هەندێک کۆمەڵگای بەراییدا جیاوازییە چینایەتییەکان لە ئارادا نەبوون.
١١- لەسەردەمی سەدەکانی ناوەڕاستدا سیستمی چینە کۆمەڵایەتییەکان گرنگییەکی زۆری هەبووە.
١٢- «کاست» جۆرێکە لە چینی کۆمەڵایەتیی داخراو کە تیایدا چین حاڵەتێکی بەردەوام و «پێسپێردراو» وەردەگرێت.
١٣- سیستمی کاست تەنها لە وڵاتی هیندستاندا نییە.
١٤- کۆیلەیی یەکێکە لە توندترین شێوازەکانی نایەکسانی کۆمەڵایەتی.
١٥- لە دیدی مارکسەوە پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان و بەتایبەتی موڵکایەتی ئامێرەکانی بەرهەمهێنان هۆکاری بنەڕەتیی توێژبەندیی کۆمەڵایەتین.
١٦- لە کۆمەڵگا سۆشیالیستەکاندا سیستمی چینایەتی کەمتر پشتی بە سەروەت و سامان بەستووەو زیاتر لە (ماف و دەسەڵات و ئیعتیبارو جیاوکە کۆمەڵایەتییەکانەوە)سەرچاوەی گرتووە.
١٧- «کینگزلی دیڤیس» زەروورەتی ئەرکی چینە کۆمەڵایەتییەکانی خستە بەرباس.
١٨- ڕەخنەگرانی چینی کۆمەڵایەتی زیاتر باوەڕیان بەیەکسانی هەیە تا سەقامگیری.
١٩- «وارنەر» تیزێکی هێنایە گۆڕێ بۆ دابەشکردنی چینە کۆمەڵایەتییەکان بەسەر شەش دەستەدا.
٢٠- «رایت میلز» چەمکی «ئێخە سپییەکانی» هێنایە گۆڕێ.
٢١- پێناسە کردن و پێوانەکردنی هەژاری هەمیشە ئاسان نییە بەتایبەتی بەگوێرەی پێوەرێکی جیهانی.

٢٢- چەمکی «هەژاریی ڕێژەیی» ئەو بایەخەی هەیە کە هەلومەرجی کولتووری دەبەستێتەوە بەهەژارییەوە.
٢٣- «ڕاونتری» دوو جۆرە هەژاری لێک جیا کردەوە «سەرەتایی و ناوەندی».
٢٤- «پێگە» چەمکێکە شوێنگەی کەسێک لە سیستمێکی کۆمەڵایەتیدا دەستنیشان دەکات.
٢٥- کار تاکە سیمای دەستنیشانکردنی پێگەی کۆمەڵایەتی نییە.
٢٦- هەرکەسێک چەندین پێگەی کۆمەڵایەتی هەیە.
٢٧- هەموو پێگە کۆمەڵایەتییەکان گرنگی وەکو یەکیان نییە.
٢٨- پێگە «پێسپێردراوەکان» بە هەموو کەسێک دەدرێن.
٢٩- پێگە بەدەستهاتووەکان ئەو پێگانەن کە تاکەکان بەدەستیان دەهێنن.
٣٠- هەموو کاتێک ناتوانین بەتەواوی پێگەو «پێسپێردراوەکان» و «بەدەستهاتووەکان» لێک جیابکەینەوە.
٣١- ڕۆڵی کۆمەڵایەتی کۆمەڵێک چاوەڕوانی لە خۆی دەگرێت کە پەیوەندی لە پێگەیەکەوە هەیە.
٣٢- وەختێک «دژایەتی ڕۆڵەکان» دەردەکەوێت کە لە دوو یان چەند پێگەیەکی تایبەتییەوە چاوەڕوانی چەند ڕەفتارێکی جیاواز لە کەسێک بکرێت.
٣٣- هەموو ڕۆڵێکی کۆمەڵایەتی چەند بەهایەکی تایبەتی تێدایە.
٣٤- چینە کۆمەڵایەتییەکان دەتوانن چەند وردە کولتوورێکی تایبەتی دروست بکەن.
٣٥- دەشێ بزاوتی کۆمەڵایەتی بەشێوەی هەڵکشان و داکشان بێت.
٣٦- «مایکل یاونگ» لەو باوەڕەدایە کە بەرەبەرە کۆمەڵگا نوێیەکان بەرەو «لێهاتوویی سالاری» دەڕۆن.
٣٧- لە حاڵەتی بزاوتی ئاسۆیی کاردا، شوێنی تاک دەگۆڕێت بەبێ ئەوەی پایەکەی بگۆڕێت.
٣٨- بزاوتی کۆمەڵایەتی بەستراوەتەوە بەچەند هۆکارێکی وەک:
گۆڕان لە سیستمی دابەشکردنی کاردا، جیاوازی ڕادەی پرۆسەی پێگەیاندنی کۆمەڵایەتی، سەر بەنەتەوەو گرووپێک بوون، خێرایی گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکان، جودایی یان پێکەوە بەسترانی گرووپە کۆمەڵایەتییەکان، ڕادەی بەپیشەسازیکردن و هەروەها ڕەخسانی هەل و بواری خوێندن و فێربوون.

**کۆمەڵگای سەرەتایی: کۆکردنەوەی خۆراک و ڕاو**

کۆمەڵگای سەرەتایی بەدرێژایی مێژوو نەگۆڕو یەک شێوە نەبووەو، سەرەڕای جۆراوجۆرییەکەی لە ناوچە جیاوازەکانی جیهاندا بە قۆناغی جیا جیای گۆڕاندا تێپەڕیوە کە بە شێوەیەکی گشتی لە میوە رنی (کۆکردنەوەی خۆراک) دەست پێدەکات و پاشان قۆناغی راووشکار (دەستکاری کردنی سروشت) دەست پێدەکات. لە قۆناغەکانی دواتردا، واتە ئەو کاتەی مرۆڤ هەڵدەستێت بەماڵی کردنی ئاژەڵان، شوانکاری دەست پێدەکات، ئەو قۆناغەی کە دەتوانین بە سەرەتای سەرهەڵدانی کۆمەڵگا خێڵەکییە هاوچەرخەکان دابنێین. بەسەرنجدان لە ماهییەتی تاڕادەیەک جیاوازی کۆمەڵگا سەرەتاییەکان و گەشەسەندنیان بەدرێژایی مێژوو دەتوانین قۆناغەکانی گۆڕانیان لەم خشتەییەی خوارەوەدا کورت بکەینەوە [٤٧/١١٩].

| قۆناغی مێژوویی | شێوەی کۆمەڵگە | پیشەکان | ئامرازەکان |
|---|---|---|---|
| لەدەوروبەری پێش ١٠٠ هەزار ساڵ | مێگەلە مرۆییەکان | کۆکردنەوەی خۆراک- راو | گۆچان- بەردی - تاشراو |
| لەدەوروبەری پێش ٤٠-٢٠ هەزار ساڵ | خێزان و هۆز | + ماسیگرتن | +رمی برەر و داتاشەر |
| لەدەوروبەری پێش ١٣-٦ هەزار ساڵ | خێزان و هۆز | +کشتوکاڵ | + تیرو کەوان- تەور- بەلەم- قازمە |

بەپێی گێڕانەوەی شوێنەوارناسان مرۆڤە سەرەتاییەکان کە لە دەوروبەری ٦٠٠-٧٠٠ هەزار ساڵ پێش دەژیان لە هەندێک لایەنەوە وەک لێکچوونی رواڵەتێکی، شێوەی بەرێگادا رۆیشتن، ئەندام، توانای بەکارهێنانی دەستەکان، بەکارهێنانی دەنگ و زۆرێک لە تایبەتمەندییەکانی تر جیاوازبوون لە مرۆڤی ئێستا. ئەوان بەیارمەتی ئامرازەکانی وەک گۆچان، تەور، یاخود داردەست هەڵدەستان بە کۆکردنەوەی رەگی گیاکان، زیندەوەرەکان........ و هتد [٤٧/١١٩]. هەر لەسەردەمی مرۆڤە سەرەتاییەکانەوە تا ئێستا هەمیشە ئەو کۆمەڵانە هەبوونە کە ژیانی خۆیان بە هۆی میوەڕنی دەبردەسەر و ئەم گرووپانە هێشتا لە هەندێک لە

ناوچە دوورەکانی وەکو ئوستورالیا لە سەر ژیانی خۆیان بەردەوامن. وێڕای ئەوەی بەهۆی کاریگەری گرووپە جیاوازەکان و نفووزی پیشەسازی بەدرێژایی چەند سەد ساڵی دوایی زۆر لەم گرووپانە لەناو چوونە یاخود لەحاڵەتی لە ناو چووندان، بەڵام زانیاری تاڕادەیەک سەرتاپاگیر لەمەڕ زۆر لەم گرووپانە هەن. تاپێش سەد ساڵێک زۆر لەم کۆمەڵانە لە ئوستورالیا، باشووری رۆژ ئاواو ناوەڕاستی ئەفریقیا، باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیاو دوورگەکانی دەوروبەری و هەندێک ناوچەی تر دەژیان. بەپێی تۆژینەوەکانی ئەتنۆلۆگەکان لە دەوروبەری ساڵی ١٧٨٨ نزیکەی پێنج هەزار کۆمەڵگای سەرەتایی (ژیانی پشت ئەستوور بە راو و کۆکردنەوەی کەرەستە خۆراکییەکان) تەنیا لە ئوستورالیادا هەبوون و ژمارەی ئەم کۆمەڵانە لە ئەمریکای باکوور لەم رێژەیە زیاتر بوو [٥٩/١٤٧-١٤٩]. زۆر لەو دەرەنجامانەی کە لەبارەی کۆمەڵگا سەرەتاییەکانی چاخی کۆن بەدەست دێن پشت ئەستوورن بەو گریمانەیە کە ژیان لەو کۆمەڵگایانەدا بە پشت بەستن بە بەڵگە مێژووییەکان ناشێ زۆر جیاواز بێت لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکانی ئێستا.

کۆمەڵگا سەرەتاییەکانی ئێستا بەزۆری هەڵدەستن بە کۆکردنەوەی خۆراک، و دەست ناکەن بە ماڵی کردنی ئاژەڵ و گیاکان و رێژەی کاریگەر بوونیان بە کولتوورە نوێیەکان زۆر سنووردارە. گەلی «زێتا» (Zeta) لە بەرازیل رەشپێستەکانی هۆزی «سێمانگ» (Semang) لە نیمچە دوورگەی «مالی» ئەو گرووپانەن کە لە رێگەی کۆکردنەوەی میوەو تۆوەکان، هەڵکۆڵینی زەوی و کۆکردنەوەی رووەکە رەگدارەکان (شێلم، پەتاتە، ......)، کۆکردنەوەی سەدەفەکان، خواردنی زیندەوەران و هەندێک لە خشۆکە بچووکەکان و کرمەکان خۆراکی خۆیان بەدەست دەهێنن. ئەوان شوێنی نیشتەجێبوونی هەمیشەییان نییە، بەڵام هەندێ کات پەناگە بۆ خۆیان دروست دەکەن. لە ئەشکەوتەکاندا دەژین، یاخود کۆلیت لەلق و گەڵای دەرەختان و گەڵای دارخورما دروست دەکەن، رستن و چنین لەناویاندا باونییە، سوود لە قوڕی سوورکراوە و کانزا وەرناگرن و لە هاتوچۆیاندا بەلەمی زۆر بچووک لە پەراوێزی رووبارەکاندا بەکاردەهێنن. لەنێو ئەم میللەتانەدا جگە لە سەگ ئاژەڵێکی تری ماڵی نابینرێت. پێویستە ئەوەش بڵێین کەلەبەر کەمیی سەرچاوەکان لەهەر شوێنێکدا، میللەتانی «زێتا» و «سێمانگ» لەو گرووپانەدا دەژین کە ئەوپەڕی دەگەنە ٣٠ کەس و هەر گرووپێک بەپێی نەریت پارچە زەوییەکی هەیە فرەوانییەکەی لەدەوروبەری ٣٠کم٢. پەناگەی کاتی لە لق و گەڵای درەختەکان

دروست دەکەن و لەکاتی بەجێ هێشتنی شوێنەکە وەکو خۆی وازی لێدەهێنن.
تاکەکان هەر لەسەرەتاوە تاکۆتایی ژیانیان لە گرووپە بچووکەکەیاندا دەمێننەوەو تەنیا جاربەجار ئەندامی گرووپەکانی تر دەبینن [١٢٨/٣٤١-٣٤٤].
چالاکی ئابووری لە کۆمەڵگای سەرەتاییدا بەزۆری پێکهاتەیەکە لە جۆرەکانی کۆکردنەوەی کەرەستە خۆراکییەکان، راو، ماسیگرتن و کشتوکاڵ بەئەندازەیەکی سنووردار. لە نێوان ژینگەی سروشتی و ژمارەی ئەو مرۆڤانەی کەتیایدا دەژین هەمیشە هۆکاری سێیەم خۆی تێهەڵدەقورتێنێت و ئەویش پێکهاتەی کولتوورییە، بەڵام هەرچەندە کە تەکنەلۆجیا کارایییەکی کەمتری هەبێت، پەیوەستەیی پەیوەندی نێوان شوێنی نیشتەجێبوون و ژمارەی دانیشتووان زیاترە. وێڕای ئەم تێبینیانە نیگەرانیی سەرەکی ئەندامانی کۆمەڵگایەکی سەرەتایی لە ژیانی رۆژانەیدا بەدەست هێنانی خۆراکە. کاروبارەکانی وەکو دروستکردنی چەک و ئامادەکردنی خۆراک دوای چالاکیی ئابووری پلەدووی هەیە گرنگی ئەم شتە بەرادەیەکە کە کۆمەڵناسی ئەمریکی لێنسکی (Lenski) ژیانی بۆشمەن (Bushmen)ەکان لەچەند پەیڤێکدا کورت دەکاتەوە «بۆخۆراک» هەروەها لەو باوەڕە دایە کەبەشی هەرە زۆری هزرو بیرو رووئیاکانیشیان بەدەوری خۆراکدا دەخولێنەوە [٥٩/١٧٠].
لەمەڕ هۆزە عەرەبە بەدەوییەکان گوتراوە کە [١٢٩/٧٣-٧٤]: «عەرەبە بەدەوییەکان وشترو بزن و ئەسپیان بەخێودەکرد. ئەوان لە بیابانە داپۆشراوە بەگیا وشک و رووەکە دڕکاوییەکاندا بە دوای ئاژەڵەکانیاندا وێڵ بوون. وشتر هاوڕێی هەمیشەیی ژیانی سەخت و دژواری مرۆڤی بەدەوی بوو. مرۆڤی بەدەوی گۆشتی وشتر دەخوات، شیرەکەی دەدۆشێت، ئەو بەرگە دەپۆشێت کە لە مووی وشتر دروست دەکرێت و هەروەها رەشماڵەکەش کە دەیپارێزێت لە گەرمای هەتاوی سووتێنەر و بای ساردی زستان هەر لەمووی وشتر بوو. ئەوکاتەی کە بەدەوی هەوڵیدەدا شوێنەکەی بگۆڕێت و کۆچ بکات وشتر، کەشتییەکەی بیابان، رەشماڵ و شتەکانی هەڵدەگرتن».
هەر جۆرە خوێندنەوەیەکی بارودۆخی ئابووری کۆمەڵگا سەرەتاییەکان بێگومان بەڕادەیەکی زۆر سنووردارەدەبێت بەلێکۆڵینەوە لە رەوشی بەرهەمهێنان و بەکاربردنی کەرەستە خۆراکییەکان. هۆیەکە ئەوەیە کە لەم کۆمەڵانەدا: بەرهەمهێنانی خۆراک ئامانجی راستەوخۆی کۆمەڵگایە، بەکردەوە هۆکارە یارمەتیدەرەکانی وەک ناوەندەکانی کڕین و فرۆشتن و دواتر دراو رۆڵێکیان نییە، ئاراستە ئابوورییەکان

قەڵەمڕەوێکی سنوورداریان هەیە، ولە کۆتاییدا کۆکردنەوەی کەرەستە سنووردار دەبێت بە بەکاربردنەکەی وەک خۆراک لە ئێستاو داهاتوویەکی نزیکدا [١٣٠/٨٥-٩٠].

لە کۆمەڵگای سەرەتاییدا خێزان تەنیا شێوەی دەستنیشانکراوی ڕێکخراوی ئابوورییە. بێگومان لە چەند حاڵەتێکیشدا کۆکردنەوەی کەرەستە خۆراکییەکان یاخود ڕاو حاڵەتێکی دەستەجەمعیی هەیە. بەم پێیەش کەرەستەی خۆراکی لە نێوان ئەو کەسانەدا کە لەکارەدا بەشداربوونە دابەش دەکرێت. ڕاو لەو کاتەدا کەچەندین دەکەس بەشدارن تیایدا هۆکارێکی گرنگە بۆ لەیەکتر نزیک کردنەوەی ئەندامانی کۆمەڵگای سەرەتایی.

لە ڕاستیدا لەلایەنی ژیانییەوە هەر ناوچەیەک پشت بە خۆی دەبەستێت. لە هەندێک حاڵەتدا کاتێک ئەم گرووپانە لە پەیوەندیدادەبن لەگەڵ کۆمەڵگاکانی تر کە حاڵەتێکی پێشکەوتووتریان هەیە، دەست دەکەن بە گۆڕینەوە کە لە زۆر حاڵەتدا کەلوپەلە پێویست و جوانکارییەکانیش دەگرێتەوە. گۆڕینەوە لە نێوان خودی میللەتە سەرەتاییەکاندا بە زۆری ئەوشتانە دەگرێتەوە کە لە کۆمەڵێکدا زۆرن و لە کۆمەڵێکی دیکەدا کەم یاخود دەگمەنن. لە ڕابردوودا ئاڵوگۆڕی شتومەک لە نێوان میللەتە سەرەتاییەکان و کۆمەڵگا پێشکەوتووەکاندا زۆر بەکەمی ڕووی دەدا، بەڵام لەماوەی چەند دەیەیەکی ڕابردوودا ئەو گۆڕینەوانەی ئەنجامدران چەک و ئامرازە کانزاییەکانیشی گرتنەوە. ئەم پەیوەندییانە بە بەردەوامی بەرەو زیادبوون چوونەو قەبارەو گرنگیی شتومەکی هاتووەکان بۆ ئەم کۆمەڵگایانە بووەتە هۆی دروستبوونی جۆرە دوالیزمێک لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا [١٣٢/١٣٦-١٣٨].

لەگەڵ ئەوەی لە کۆمەڵگای سەرەتاییدا دابەشکردنی کار لە شێوەی کۆمەڵگا نوێیەکاندا نییە، بەڵام جۆرە دابەشکردنێکی کاری کاتی (لە جیاتی دابەشکردنی کاری هەمیشەیی لە کۆمەڵگای پیشەسازیدا) بەرچاودەکەوێت. بۆ نموونە زۆربەی ئەوکۆمەڵانە سەرۆک هۆزێک و «شامان» (Shaman)یێک یان چارەسەرکەرێک (کە ڕۆڵی پزیشک دەبینێت) هەن. بۆ نموونە لە نێو سوورپێستەکانی ئەمریکای باکوور و کەنەدا دا هەر هۆزێک «کاهین» یاخود «شامان»ێکی تایبەتی بۆ خۆی هەیەو هەندێ جار لە هۆزە گەورەکاندا خاوەنی خزمەتکاریشن. ئەوان لە هەمان کاتدا ڕۆڵی پزیشکی، جادووگەری، سەرپەرشتیکردنی داب و نەریتی ئایینی و لە زۆربەی حاڵەتەکاندا بەجارێک لە ئەستۆیاندان. کاتێک پێویست بە خزمەتگوزارییەکانی

«شامانەکان» هەبێت لەو بوارە پسپۆرییانەدا چالاکی دەنوێنن، بەڵام کاتێک ئەم کارانە ناکەن، ئەو چالاکییانە ئەنجامدەدەن کە هی هەمووانن (کۆکردنەوەی خۆراک......) . کارکردن لە چالاکییەکانی تری وەک هەندێک کاری دەستی سەرەتایی یاخود دروستکردنی ئامرازەکانی جەنگ و راویش لە جۆرەکانی کاری کاتی دەژمێردرێن. لە راستیدا لەگەڵ ئاڵۆزتر بوونی کۆمەڵگا ئەم پیشانە لە حاڵەتی کاتییەوە گۆڕان بۆ حاڵەتی هەمیشەیی [ ١٣١/١-٨ ].

لە نێو میللەتە سەرەتاییەکاندا، ئەو کۆمەڵە کەسانەی کە هەر لە بنەڕەتدا هەڵدەستن بە ماسیگرتن خەریکی جموجۆڵی بەردەوام بە دوای ئامادەکردنی خۆراکەوە نین بەڵکو بەهرەمەندن بە کەرەستەی خۆراکی تا رادەیەک دیاریکراو (ماسی). ئاستی کولتووریان و هەروەها کەڵەکەبوونی دانیشتووانیان لەو گرووپانە بەرزترە کە خەریکی راو کردنن. دەتوانین نموونەیەکی ئەم گرووپە لەو سوورپێستانە بدەینە دەست کە لە کەنارەکانی ئوقیانووسی ئارامدا (وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو کەنەدا) دەژین، وادەردەکەوێت کە کولتووری ئەم میللەتانە لە کولتووری زۆربەی نەتەوە سەرەتاییەکانی تر پێشکەوتووتر بووە، چونکە پێش هاتنی سپی پێستەکان بۆ ئەم ناوچانە ئەوان دەستیان کردبوو بە پێگەیاندنی رووەکەکان. هەندێک لەم هۆزانە چالاکی بازرگانیشیان دەنواند، بەو مانایەی کە ماسییان دەگۆڕینەوە بەمیوەی جۆراوجۆر کە لەلایەن هۆزە نزیکەکان کۆدەکرانەوە. شوێنی نیشتەجێبوونیان تارادەیەک جێگیر بوو و شتێک لە شێوەی گوند دروست ببوو.

کۆمەڵناسی فەرەنسی «جون کازەنۆڤ» (G. Cazaneuve) لە کتێبی «ئەنترۆپۆلۆجی» دا لە نێو ئاماژەکردنی بەیەکێک لەو نەریتانەی کە لە نێوان زۆربەی میللەتانی سەرەتاییدا باو بووە، واتە پۆتلاچ (Potlatch) دەنووسێت: «نەریتێکە کە تیایدا دیاری لە نێوان دوو خێزان یاخود کلان (Clan) یاخود سەرۆک هۆز دەگۆڕدرێنەوەو لەوانەیە لە جیاتی گۆڕینەوەی دیارییەکان، هەردوولا یاخود یەکێکیان هەڵسێت بە لەناوبردنی بەشێک لە داهاتەکەی (وەک سووتاندنی بەرهەمی کشتوکاڵی) تاکو پایەیەکی کۆمەڵایەتی بەرزتر بەدەست بهێنێت. ئەم رێوڕەسمانە بەزۆری لەسەر بناغەی کێبڕکێ ( منافسە)یە و بەرزبوونەوەی ئیعتیباری کۆمەڵایەتی، پاراستن یاخود لەدەستدانی پەیوەستە بە بەشداریکردن لەو رێوڕەسمانەداو کێبڕکێ لەگەڵ ئەوانی دیکەدا [١٣٣/ ١٨٠].

لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا رووبەڕووی جۆرێک لە جۆرەکانی وابەستەیی نێوان تاکەکان دەبینەوە کە لە رووی گرووپی خزمایەتییەوە بە خێزان دەچێت، بەڵام لە زۆر لایەنی ترەوە زۆر لێی جیاوازە. کلان (Clan) گرووپێکە کە لە یەک یاخود چەند «بنەماڵە» (Lineage) پێک هاتووەو ئەندامەکانی بەناچاری لە شوێنێک نیشتەجێ نین. ناوی کلان بە شێوەیەکی گشتی ناوی گیا، گیانەوەر یاخود شتێکە کەوەک سەرچاوە یاخود «باپیرە گەورە»ی کلان سەیر دەکرێت و بە هۆکاری یەکخستنی ئەندامانی کلان دەژمێردرێت، هەر چەند ناتوانن پەیوەندییەکی راستەوخۆ لە نێوان خۆیان و باپیرە گەورەیاندا بەرقەرار بکەن [٤٨/٦١].

دەتوانین «کلان» بەجۆرە گرووپێکی خزمایەتی تاکلایەن دابنێین. جیاوازییە سەرەکییەکەی لەگەڵ خێزان لەوەدایە کە خێزان حاڵەتێکی دوولایەنەی هەیە. کلان جۆرە خزمایەتییەکە تەنیا پشت بە باوک یاخود دایک (تەنیا یەکێکیان) دەبەستێت. هەر کاتێک هۆزێک لەسەر تەوەری کلانی دایکی وەستابێت، هەر منداڵێک بەچاوپۆشی لەرەگەز، بەیەکێک لە ئەندامانی کلان دەژمێردرێت، و هەمان رەوش لەبارەی باوکیشەوە هەیە. کلان تۆڕێکی جێگیرە، تەڵاق یاخود بەجێهێشتنی خێزان دەتوانێت ببێتە هۆی لێک هەڵوەشانی، لە کاتێکدا کە ئەو پەیوەندییەی کە لە کلانێکدا بەرقەرارە هەمیشەییە [١١٨/١١٧]. خزمایەتی لە کلانێکدا چەمکێکی تایبەتی هەیە. باپیرەگەورەکانی وەچەیەک وەک براو خوشک سەیردەکرێن، وبەپێی رێسای هاوسەرگری دەرەکی (زواج خارجي) پیاوێک دەتوانێت تەنیا یەک ژن بکاتە هاوسەری خۆی [١٣٠/٤٣٢-٤٣٣].

ژیان لە پێکهاتەو سیستمی کلانێکدا هاوکاتە لەگەڵ ئەو سروت و رێورەسمانەی کە هاوبەندیی کۆمەڵایەتی بەهێزدەکەن. هەر کلانێک بە زۆری ناوێک یاخود نیشانەیەکی هەیە، کە لە کلانەکانی تر جیای دەکاتەوە. ناوی کلانەکان بە زۆری لە ناو یان نیشانەی گیانلەبەران وەرگیراوە، بەڵام جاربەجار سوودی لە ناوی زیندەوەر، گیاو دیاردە سروشتییەکانی وەکو باران و هەورەکان بینیوە. ئەوەی ئەم کلانەیە پێی دەناسرێتەوە پێی دەگوترێت «تۆتەم». زۆربەی تۆتەمەکان ورچ، رێوی یاخود کەنغەرو جۆرە بەسوود یاخود ئەوانەی کە دەخورێن، بەڵام لەبەرئەوەی کە لەڕووی وابەستەیی وەچەییەوە، هەست بە بوونی پەیوەندییەک لە نێوان تاکەکانی کلان و باپیرە تۆتەمییەکەیان دەکرێت، لە زۆربەی حاڵەتەکاندا ئەندامەکانی کلان بەتەئکید

پێویستە خۆیان دوور بگرن لە خواردن یاخود ئازاردانی ئەو گیانەوەرانەی کە تۆتەمی کلانەکەیانە، چونکە بە تابۆ «Taboo» یاخود قەدەغە دادەنرێت [ ١٣١/١-٨].

لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا، ئینتیما بۆ کلان، گواستنەوەی ناو، میرات، ناوونیشان ومافە جیاوازەکانی تاکەکان دەستنیشان دەکات و ئەم گرووپانە بەپێی حاڵەتی خۆیان دەبنە باوکنەسەبی یاخود دایکنەسەبی واتە ئایا منداڵان پەیوەست بن بەکلانی دایک یاخود کلانی باوک [ ٤٩/٦٨-٦٩].

لەوەسفکردنی سوور پێستەکانی «چی پوا» (Chi Pewa)دا کە لە باکووری ڕۆژهەڵاتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەژیان، هاتووە کەئەوان تۆتەمەکانیان بە «دۆدام» (Dodaim) ناو دەبردن و هەر چەند خێزان بەدەستەیەکی تۆتەمی دەژمێردرا، کە بەناوی گیانەوەرێک کە پێیان دەگوت تۆتم، ناودەبرا، و نیشانەکەیان داتاشراوی لە هەمان گیانەوەربوو. زەواج لە نێوان ئەندامانی تۆتەمێک نەدەکرا [ ١٣٥/٤١٣-٤١٤].

«لوی شتراوس» پێی وایە تۆتەمیزم دروستکراوێکی زەینی مرۆییە بۆ وەڵامدانەوەی پێویستییەکی ئەقڵانی و دەڵێت: «تۆتەمیزم نموونەیەکی تایبەتییە لە هەندێ شێوەکی بیرکردنەوە. بێگومان هەستەکانیش ڕێیان تێدەکەوێت...... تۆتەمیزم پەیوەست نییە بەو قۆناغانەی دێرین یاخود دوورن لە ئێمەوە، چونکە؛ ناوەڕۆکەکەیان لە شوێنێکی ترەوە نەهاتووەو وێنەکەیان ڕەنگدانەوەی خودی ئێمەیە. چونکە ئەگەر ئەم خەیاڵپڵاوە ڕاستییەکیشی تێدا بێت، ئەم ڕاستییە لە دەرەوەی ئێمەوە نییە، لە دەروونی ئێمەدایە [ ١٥٠/ ٢٠٥].

## کۆچەری و ئابووری شوانکاریی

کۆچەری (Nomadism) شێوازی ژیانی ئەو مرۆڤانەیە کە بەزۆری لەناو ڕەشماڵان دەژین و لە گەڕان بە دوای لەوەڕگا بۆ گیانەوەرەکانیان لە ناوچەیەکەوە دەچن بۆ شوێنێکی تر. زۆر لە خێڵەکانیش لەگەڵ گۆڕانکارییە وەرزییەکاندا لە شوێنێکەوە دەچنە شوێنێکی ترو کۆچ دەکەن جموجۆڵی زۆربەی ئەم گرووپانە هێندە ڕێکوپێکە کە دەتوانیت ژیانیان بەپشت بەستن بە «ڕەوەندایەتی» (Transhumance) ناوبنێین، چونکە جموجۆڵی مرۆڤەکان لە ڕێگە تا ڕادەیەک جێگیرەکاندایە. هەروەها پەیڤی کۆچەری هەندێ جار لە بارەی ئەو کەسانەوەی کە شوێنێکی نیشتەجێبوون و کارێکی جێگیریان نییەو لەدەڤەرێکەوە دەچنە دەڤەرێکی

تر بەکاردەهێنرێت [ ١٣٠/١٥١ ]. هەروەها ناتوانین هەموو ئەو تاکانەی کە لە ڕەشماڵەکانیشدا دەژین بە کۆچەر ناوبنێین. لە هەندێک حاڵەتدا نەبوونی شوێنێکی حەوانەوەی جێگیردەبێتە هۆی ئەوەی ژمارەیەک لەوانەی لە پەراوێزی شارەکانن لەژێر ڕەشماڵاندا بژین. لە ئێران لە دەوروبەری هەندێک لە شارو گونددا هەندێک گرووپ دەژین کە بە «کولی» یاخود «غوربەتی» ناودەبرێن. جموجۆڵی ئەم گرووپانە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر بەندە بەبوونی کار (لە کشتوکاڵ یاخود خزمەتگوزارییەکان) [ ١٣٦/٣٣-٣٤ ].

بوونی ئابووریی شوانکاری هۆی سەرەکییە لە حەزکردن بەژیانی کۆچەری. شوانکاری، کە پشت بەماڵیکردنی ئەو گیانەوەرانە دەبەستێت کە گۆشتەکەیان دەخورێت، بەکردەوە ئەنجامی ئەو ئەزموونانەیە کە لەنێو میللەتە سەرەتاییەکاندا هاتبوونە کایەوە و پێویستە لە نێو ڕاوی گیاندارااندا بەدوای ڕەگوریشەکانیدا بگەڕێین. مرۆڤ پەیتا پەیتا بینی کە دەتوانێت گیانەوەر لە پاش ئابڵوقەدان و دەستەمۆکردن، ڕاو و پەروەردە بکات.

کۆمەڵگا مەڕدارەکانی ئێستا کۆمەڵگایەکن کە خۆیان گونجاندووە لەگەڵ هەلومەرجە تایبەتییەکانی ژینگە. لە ڕووی ئاستی هونەرییەوە ئەم کۆمەڵگایانە تا ڕادەیەک بە کۆمەڵگا کشتوکاڵییەکانی قۆناغە سەرەتاییەکان دەچن. لە قۆناغە سەرەتاییەکانی کشتوکاڵدا بەپلەی یەکەم گیانەوەران ماڵی دەبن و بەرەبەرە چاندنی هەندێک لە ڕووەک باو دەبێت. ئەم کۆمەڵگایانە نیشانەیەکی قۆناغی مەڕداریشیان تێدایە. هەڵبەت بەبێ ئەوەی کە بەپێویست ئەو قۆناغانەیان تێپەڕاندبێ.

سەرچاوەی سەرەکی ژیانی کۆمەڵگا مەڕدارەکان، بەخێوکردنی ئاژەڵە و پەیوەندییەک لە نێوان ژمارەی مەڕوماڵاتەکان و ژمارەی مرۆڤەکانی هەر کۆمەڵگایەکدا هەیە. بوونی مەڕوماڵات تەنیا سامان (ثروە) نییە، بەڵکو نیشانەی دەسەڵاتیشە. تەنیا پیاوێکی بەهێز یاخود سەرپەرشتیارێکی بەتوانای خێزان دەتوانێت بەم شێوەیە ئەو سەروەت و سامانە لەدەستی نەیارانی بپارێزێت. لە زۆربەی ئەم جۆرە کۆمەڵگایانەدا (بەتایبەتی لە قۆناغە پێشکەوتووەکانیاندا) نایەکسانی کۆمەڵایەتی بنەمایەکی کۆمەڵایەتیی باوە. بۆ نموونە کۆیلەداری بەشێوەی میرات لە کۆمەڵگا مەڕدارەکاندا زیاترە نەک کۆمەڵگا هاوشێوەکانی دیکەی. بێگومان هەموو جۆرەکانی نایەکسانی وەک نایەکسانی لە داهاتیشدا سەرتاپاگیرن [ ٥٩/١٨٠ ].

ئابووری شوانکاری شێوەیەکی تایبەتی ژیانی هێناوەتە ئاراوە. لە زۆربەی حاڵەتەکاندا دەسپێکردنەکەی هاوکاتە لەگەڵ ژیانی خێڵەکی. بەپێی زانیارییەکانی ئەتڵەسی نێو نەتەوەیی ئێتنۆگرافیا نزیکەی ٩٠٪ی کۆمەڵگا شوانکارییەکان حاڵەتێکی خێڵەکی یاخود نیمچە خێڵەکییان هەبووە. هەروەها مەڕداران لە هەندێک حاڵەتدا دەست دەکەن بەڕاو و کۆکردنەوەی کەرەسەتە خۆراکییەکان. بە شێوەیەکی مامناوەندی کۆمەڵەکانیان لە بچووکترین یەکەی خۆیاندا کەمێک لە کۆمەڵە ماسیگرەکان بچووکترن و چەند جارێکیش لە کۆمەڵگا سەرەتاییە کشتوکاڵییەکان بچووکترن. گرنگترین هۆی ئەم شتە ڕەوشی ژینگەییە. لەبەرچاوگرتنی لەسەرچاوە سنووردارەکانی زەوی، شوێنی ژیانیان لە ڕووی لەوەڕگای ئاژەڵەوە بەکردەوە نامومکینە. لە تایبەتمەندییەکانی تری ئەم کۆمەڵانە زاڵبوونی «باوکسالاری»یە کە بەرهەمی چەندین هۆکارە. ئەم کۆمەڵانە حاڵەتێکی بەجموجووڵ و بەزۆری شەڕخوازانەیان هەیە، کە پێویستی ژیانی شوانکارییە.

سوارچاکی و شەڕخوازی لەچالاکییە باوەکان، و لەهەمان کاتدا لە هۆکارە ڕێخۆشکەرەکانی هێزی سیاسی دەژمێردرێن. سەرەڕای ئەوە، چالاکیی سەرەکیی ئابووری لەم کۆمەڵانەدا لە ئەستۆی پیاوانە. لەم ڕووەوە، ئەم کۆمەڵانە جیاوازییەکی سەرەکییان هەیە لەگەڵ کۆمەڵگا کشتوکاڵییەکان، چونکە ژن لەو کۆمەڵگایانەی دواییدا ڕۆڵێکی سەرەکی دەگێڕێت لە کاروبارە کشتوکاڵییەکاندا.

تەوەری سەرەکی ژیانی کۆچەری لەوەڕگایە، و بارودۆخی لەوەڕگا، واتە پەیوەندیی نێوان ژمارەی ئاژەڵان و لەوەڕی هەیی لە لەوەڕگادا هۆکاری دیاریکەرە. لە هەندێک حاڵەتدا بارودۆخی لەوەڕگا زستانییەکان سنووردارترەو ئەم شتە دەبێتە هۆی ئەوەی کە ڕەوەندایەتی لە ئاستێکی فرەوانتردا شێوە وەرگرێت. کاتێک دووریی نێوان کوێستان و گەرمیان زۆر دەبێت، مرۆڤ و ئاژەڵ، هەردووکیان، ناچارن کۆچ بکەن [٤٢/١٣٧-٤٣]. بۆ نموونە لە ئێراندا بەختیارییەکان هەموو ساڵێک لە ناوەڕاستی مانگی ئەیلوول بەرەو گەرمیان دەکەونەڕێ.

کۆچەری لە زۆربەی ناوچەکانی ئاسیا (لەوانەش ئێران) و باکووری ئەفریقیا لە حاڵەتی گۆڕانی زۆردایە و دانیشتووانە کۆچەرەکان سەرەڕای زۆریی ڕێژەی منداڵبوونیان، بەڵام لە کەمبوونەوەدان. دانییێل بالان (D. Baland) لەوەسفکردنی کۆچەرە ئەفغانەکاندا دەنووسێت: «...... نیشانەی جۆرێک لە جۆرەکانی گۆڕانی گەڕانەوە بۆ دواوەیە لە کۆچەری شوانکاری بۆ کۆچەری کرێکاری کشتوکاڵی. وێڕای

ئەوەش شایانی باسە ئەم هەژاری و بێدەرەتانییە نەبۆتە هۆی راوەستانی کۆچ. ئێستا، ئەم کارە بە هۆی لۆری ئەنجامدەدرێت، کەسێک بە تەنیا کافییە تاکو لەم رێگە درێژە کۆنەدا لەگەڵ ئەم ئاژەڵانە دابێت کە لە خێزانەوە بۆیان ماونەتەوە.

## پێکهاتەی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای خێڵەکی

خێڵ یاخود هۆز (Tribe) بریتییە لە کۆمەڵێک مرۆڤ کە بەلای کەمەوە لە دوو یەکە یاخود بەش (دەستەبەندی لاوەکی لە ژێر ناوی وەک تایفە) پێک دێت کە بە زمانێک یاخود دیالێکتێکی تایبەتی دەدوێن، کولتوورێکی هاوبەشیان هەیە کە جیایان دەکاتەوە لەوانی تر، خاوەن یەکێتییەکی کۆمەڵایەتی تەبان، هەستی پەیوەستەیی (ولاء) دەستەجەمعییان هەیە، و لە کۆتاییشدا بەناوێکی هاوبەشی دیاریکراو بانگ دەکرێت یاخود خۆیان بەوناوە ناو دەبەن.

ئەوەی کە لە ئێراندا پێی دەگوترێ «دانیشتووانی عەشایری». جۆرێکە لە جۆرەکانی کۆچەری. سیستمی ژیانی عەشایری سیستمێکی «خێڵەکییە» واتە وابەستەیە بە تاکە گرووپێکی ئێتنی (میللی) پشت ئەستور بەپەیوەندییە ئێتنی خزمایەتییەکان، هەرچەندە ئەم پەیوەندییانە نزیک و هێندەش دیاریکراو نەبن. لە نێو عەشایرەکاندا بەپێچەوانەی لادێنشین و تەنانەت شارنشینان کە بەزۆری وەلائیان بە تاکە شوێنێک پێوەری ناسینی دەستەجەمعییانە، وەلاء بۆ گرووپی خزمایەتی و بنەماڵەو و نەسەب گرنگیی هەیە [١٢/١٣٨].

بەپێی پێناسەی ناوەندی ئاماری ئێران، بەخەڵکانێک دەگوترێت عەشیرەتە کۆچەرەکان کە بەلای کەمەوە سێ تایبەتمەندییان هەبێت: پێکهاتەی کۆمەڵایەتی هۆزایەتی - پشتبەستنی ژیانیان بەئاژەڵداری- شێوەی ژیانی شوانکاری یاخود کۆچ [٧/١٤٠].

بەپێ ئەم پێناسەیە لە ئێراندا ١٩٦ خێڵ و ٥٤٧ تایفەی سەربەخۆ هەن (لە ساڵی ١٩٨٤) کە لەسەرتاسەری ئێراندا پەرگەندەبووبن.

سەرەرای ئەوەی چەمکی «کۆمەڵگای عەشایری» چەند جیاوازییەکی لەگەڵ چەمکی «عەشیرەتە کۆچەرەکاندا» هەیە، «جەوادی سەفی نەژاد» لە توێژینەوەیەکدا لەبارەی «پێکهاتەی تەقلیدی لە عەشیرەتەکانی ئێراندا» ئەو تایبەتمەندییانەی خوارەوە بۆ ناساندنی «کۆمەڵگای عەشایری» دەستنیشان دەکات [٧١/١٣٩].

١- ئەندامێتی لە خێڵدا بەندە بە پەیوەندیی نەژادییەوە.

٢- سیستمی کۆمەڵایەتی خێڵ لەسەر بنچینەی سیستمی هۆزایەتی (خێڵ، تایفە، تیرە......) دامەزراوە.
٣- ئابووریی زاڵ تیایدا شێوەی ژیانی ئاژەڵداریی تەقلیدییە.
٤- شێوەی ژیانی کۆچەری یاخود نیمچە کۆچەرییە.[1]
٥- کولتوور، مێژوو، شێوەزار، و خاکیان هاوبەشن.
٦- هەستی ئینتما بۆ خێڵ و تایفە و تیرەو لقەکانی هەبێت تا ئاستی خێزان بەردەوام دەبێت.

هەموو کۆچەرەکان مەرج نییە سەرچاوەیەکی خێڵەکییان هەبێت، هەندێک لە گرووپە کۆچەرەکان وەکو ئەو خێزانانەی لەلادێیەک نیشتەجێن پێکەوە لە ناوچەیەکەوە کۆچ دەکەن بۆ ناوچەیەکی تر. لەم گرووپانەدا بەهۆی سنووردارپی بواری هەڵبژاردنی هاوسەر، زۆربەیان خزمی یەکترن، بەڵام سەرچاوەی خێڵەکییان هاوبەش نییە. زۆربەی جاران خێڵێک دابەش دەبێت بۆ چەند بەشێک. کە لە ئێراندا بە ریز لە گەورەیی و گرنگی رێژەییان بریتیین لە هۆز، تیرە، ئوردو. ئوردو بچووکترین یەکەی خێڵەو چەند خێزانێک دەگرێتەوەو سەرکردایەتییەکەی لە ئەستۆی ریشسپییەکاندایە. بە زۆری ئاغا بەرزترین پلەوپایەی هەیە لە خێڵدا. لە سەرووی هەریەکێک لەتایفەکانی کەسێک هەیە پێی دەگوترێت «کەلانتەر»، و بەڕێوەبەرایەتی هەر تیرەیەک لە ئەستۆی کەسێکدایە بەناوی کوێخا و دەکەونە خوارترین ریزی ریشسپییەکانەوە. هەڵبەت لە زۆربەی وڵاتەکاندا و لەوان ئێرانیش، لەو چەند سەدەیەی دواییدا دەسەڵاتی رابەریی خێڵەکان بە تایبەتی لە ئاستی باڵادا بەتوندی لە شوێنی خۆی لەق بووە.

دابەشکردنی خێڵەکان بەو شێوەیەی کە هات لەوانەیە هەمیشە لە نێو هەموو خێڵەکاندا بە تەواوی بەدی نەکرێت. دەشێ تایفە حاڵەتێکی تەواو سەربەخۆی هەبێت یاخود لە چەند حاڵەتێکدا دابەشکردنی لاوەکی تریش هەبن «هەندێ جار لە نێوان تیرەو ئوردو لە خێڵی قاشقاییدا بە تایبەتی لە تیرە گەورەکاندا، ئەو دابەشکردنانە هەن کە دەتوانین بە «خوارتیرە» یاخود «سەرووتیرە» ناوبنێین لەبەر هەمان هۆ هەندێک جار لە تیرەیەکدا چەند کوێخایەک هەن» [١٣٨/٣٩].

لەبارەی چۆنییەتی دروستبوونی تایفە و تیرە جیاوازەکانی خێڵێک، هەر چەندە کە بەڵگەی تەواومان لەبەر دەست نین، لەگەڵ ئەوەش وادەردەکەوێت کە ئەم شتە لە رێگەی بەشبەش کردنی گرووپێکی فرەوان بۆ چەند بەشێک و بەماوەی ساڵانێکی

درێژ شێوەی وەرگرتبێت. لەو کاتەی کە دانیشتووانی گرووپێک لە حاڵەتی سەرەتاییدا (کۆکردنەوەی خۆراک و راو) زۆر زیاد دەبن لە پەیوەندیدا لەگەڵ شوێنێکی دیاریکراو کە بۆ زامنکردنی خۆراک لەبەر دەستیانە تووشی گرفت دێن، ئەم گرووپە دابەش دەبێت بۆ دوو یاخود سێ گرووپی لاوەکی. هەڵبەت لەوانەیە ئەم بەشبەشبوونە لەبەر کۆمەڵە دژایەتی و ناکۆکییەکیش بێتە ئاراوە. گرووپێکی نوێ دروست دەبێت کە لە رووی کولتوورو زمانەوە لەگەڵ گرووپی یەکەم هاوبەشەو گرووپی نوێ بەزۆری لە شوێنێکی تا رادەیەک نزیک لە گرووپی یەکەم نیشتەجێ دەبێت. هەرکاتێک ئەم پرۆسەیە (بەشبەش بوون) چەند جارێک روو بدات، ئەنجامەکەی، دروستبوونی چەند گرووپێک دەبێت کە کولتوورو زمانی هاوبەشیان هەیەو خێڵ بەکردەوە دروست دەبێت، لەبەر کەلەپووری کولتووریی هاوبەش، ئەم گرووپانە (کەلە تایفەو تیرە پێکهاتوون) دەبنە خاوەنی ناسنامەی کولتووریی تایبەتی کە ئەوان (ئەندامانی خێڵ) لەوانی تر جیادەکاتەوە. بەم پێیەش خێڵ زیاتر یەکەیەکی کولتوورییە تاکو کۆمەڵایەتی. لە کۆمەڵگای خێڵەکیدا کەسایەتی تاکەکەس شوێنکەوتەی ئەو گرووپەیە کە تاک پەیوەستە پێیەوە و تاکەکان لەدەرەوەی خێڵەوە زیاتر بەناوی خێڵی خۆیان ناودەبرێن تا ناوی کەسییان.

### پێکهاتەی ئابووری خێڵەکانی ئێران

لە کۆمەڵگای خێڵەکی ئێراندا بەشی هەرە زۆری بەرهەم هەر لەلایەن بەرهەمهێنەرانەوە بەکاردەبرێت، یاخود ئەوەی کە دەکەوێتە بەردەستی گرووپە خزمایەتییەکان، و بەم پێیەش گۆڕینەوە یاخود فرۆشتن رۆڵێکی هێندەی نییە. لەم رووەوە کۆنترۆڵی هۆکارەکانی بەرهەمهێنان حاڵەتێکی پەراگەندەیی، ناوخۆیی، وخێزانیی هەیە. پێکهاتەی ئابووری کۆمەڵگا بە شێوەیەکە کە ئاراستەی گشتی هەوڵی بەرهەمهێنانی ئەو کالایانە دەدات کە دەشێ راستەوخۆ لە لایەن بەرهەمهێنەرەکانەوە بەکارببرێن [ ٣/١٤١ ]. لە قۆناغەکانی دواتردا سەرەڕای ئیمکانی زیاد بەرهەمهێنان بەمەبەستی فرۆشتن یاخود گۆڕینەوە، بەرهەمهێنانی هەندێک لە کالاکان، بەتایبەتی لە بواری کارەدەستییەکاندا، وەک رێگایەک بە مەبەستی بەهێز کردنی ئابووری ژیواری بایەخیان پێدەدرێت. بەرهەمهێنانی مافووری جۆراوجۆر لە نێو خێڵە ئێرانییەکاندا بەڵگەیەکە بۆ ئەم حاڵەتە [ ١٤٢/٩٢-١٠٨ ].

ئابووریی کۆمەڵگا خێڵەکییەکان لە ئێراندا- بەلانی کەم لە زۆربەی حاڵەتەکاندا بەپێچەوانەی هەندێ لە گرووپە خێڵەکییە گۆشەگیرەکانی ناوچەکانی دیکەی جیهان حاڵەتێکی داخراوی نییە. سەرەڕای ئەوەی کە خێڵەکان پێویستییان بەبەرهەمی لادێ و شارەکان هەبوو، و زەمینەی ئەم پێویستییان لەبەر پەیوەندی زیاتریان لە حاڵەتی زیاد بووندایە [١٤٣/ ١١٠-١١١]. خێڵەکان بەشێکی زۆری بەرهەمە شیرییەکانی وڵات بەرهەم دەهێنن و بە هۆی گۆڕینەوە یاخود فرۆشتن دەهێننە بازاڕەوە [١٣٦/١٨٢].

بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە ئابووری خێڵنشین حاڵەتی شوانکاری هەیە، ژیانەکەیان پشت ئەستوورە بە ئاژەڵداری و لەگەڵ گۆڕانی وەرزەکان بە دوای دۆزینەوەی لەوەڕگادان بۆ لەوەڕی ئاژەڵەکانیان (بەو شێوەیەی لەبەشی پێشتردا باس کرا). ئەو جیاوازییەی کە لە نێوان جموجۆڵە سەرەکییە شوێنییەکان (کوێستان و گەرمیان)ی ئەم گرووپە لەگەڵ هەموو کۆچەران (کە حاڵەتی خێڵییان نییە) هەیە زیاترە لەو لایەنەی کە بزاڤە گشتییەکانی خێڵ تابیعی سیستم و شێوازێکی تایبەتییە و بەهۆی سەرانی خێڵ رێک دەخرێت. پێش ئەوە بە زۆری کۆچ بە بڕیاری ئاغا ئەنجام دەدرا. بێگومان هۆکارە هەرێمییەکان (وەکو وشکەساڵی)یش دەیانتوانی کاتی جموجۆڵی خێڵ بۆ پێش یا دوا بخەن [١٤٩/ ٣١٥-٣١٨].

سیستمی چینایەتی کۆمەڵایەتی لە خێڵەکانی ئێراندا بە درێژایی چەند دەیەی کۆتایی تووشی گۆڕانکاریی زۆرهات و بەزەحمەت دەتوانین سیمایەکی جێگیریان لێ بدەینەدەست. لە رابردوویەکی نەهێندە دوور چەند هەلومەرجێکی جیاواز هەبووە و ئێستاش پاشماوەیان لە هەندێک لە ناوچەکانی وڵاتدا دەبینرێت. «عەبدوڵای ناسری» لەکتێبی «کولتووری خەڵکی بەلووچ» لەنێو بەلووچەکاندا بەلای کەمەوە ناوی چەند چینێک دەبات کە بریتین لە: پاشا، میر، خاوەن موڵک، سەرۆک، مامۆستا، چاوش، دەرزادە، چاکری، کە بێگومان بەوشێوەیەی کە ریزکراون، پایەی چینایەتییان دێتەخوارەوە. هەمان نووسەر لەوەسفکردنی چینی «دەرزادە»دا دەنووسێت: «چینی دەرزادە لە چینەکانی خوارەوەی کۆمەڵگای چینایەتی بەلووچە. پیاوەکانی ئەم چینە نۆکەرو ژنەکانیان کەنیزەن، و دەرزادە بەهەمان شێوە کە لە ناوی چینەکەیانەوە دیارە لە ماڵی خانی بەلووچدا لە دایک بوونە...... گەڕەکەکەیان جیایە...... هەروەها ئەم چینە هەڵدەستن بەکارە بێ نرخەکان» [١٤٦/ ٤٤].

سیستمی دابەشکردن لە خێڵێکدا

**خێڵەکانی ئێران**

ژیانی خێڵەکی (یاخود عەشایری) لە ئێراندا پێشینەیەکی درێژی هەیە، و رۆڵی سیاسی خێڵە کۆچەرەکان لە دروستکردنی حکوومەتەکانی ئەم وڵاتانەدا حاشا هەڵنەگرە و هەمیشە زۆربەی پاشاکان و کاربەدەستە حکوومییەکان پایەیەکی خێڵەکییان هەبووە، چونکە رەگەزە سەرەکییەکانی حکوومەت واتە دەسەڵاتی سیاسی، رێکخستنی هێزی عەسکەری هەمیشە لە نێو خێڵەکاندا هەن [١٣٧/ ٥٠-٧٦]. دەتوانین خێڵەکانی ئێران لە روانگەی زمان و پەراگەندەیی جۆگرافیاییەوە پۆلێن بکەین. بۆ نموونە لەلایەنی زمانەوە گرووپە سەرەکییەکانی خێڵەکانی ئێران بریتیین لە: تورکمان، تورک زمان، کورد، لور، عەرەب و بەلووچ [١٤٤/ ٧٠].

لەگەڵ ئەوەی کە ئەمڕۆ نیشتەجێکردن و دامەزراندنی خێڵەکان لەبەر سەختییەکانی ژیانی خێڵەکی و هۆکارەکانی تر بەشێوەیەکی بەرچاو زیاد بووە، بەڵام پێویستە سەرنج بدەین کە ئەو هەوڵانەی لە رابردوودا بەمەبەستی نیشتەجێکردنی خێڵەکان بە شێوەیەکی زۆرەملێ ئەنجام دەدران پاش ماوەیەک لە ناوچوون. لەم بارەیەوە «سکەندەری ئامانوڵڵاهی» دەنووسێت: «لەم بەروارەوە (ساڵی ١٩٤١) لە پڕێکا هەموو خێزانە نیشتەجێکراوەکان کەوتنە جموجۆڵ و

خانووەکانیان وێران کردن و بە تووڕەییەکی بێ پێشینە هەڵسان بە تۆڵە سەندنەوە لە هەرشتێک کە پەیوەست بوو بە ژیانی ئەو قۆناغە. کێڵگەکان تێکدران و دارو درەختی باخەکان هەڵکەندران و هەموو شوێنەوارەکانی قۆناغی نیشتەجێبوون لە ناو چوون و ژیانی عەشایری سەر لەنوێ دەستی پێ کردەوە [ ١٤٥/ ٨١].

«ئیرەج ئەفشار سیستانی» لە تۆژینەوە تێروتەسەلەکەیدا لەبارەی خێڵەکانی ئێران بەم شێوەیە باس لە هۆکارەکانی گۆڕانی هەلومەرجی خێڵەکان و «نارێکی» ژیانی خێڵەکی دەکات: پێکەوە نیشتەجێبوونی بەزۆرەملێ، گۆڕینی رەشماڵ، دانانی چەک، گۆڕینی جلوبەرگی نەریتی، گۆڕان لە رەوشی سیاسی، خۆتێهەڵقورتاندنی راستەوخۆی حکوومەت، دانانی بەرپرسانی عەسکەری، جێگیرکردنی خاوەندارێتی شارنشینەکان لەسەر زەوی کۆچەرەکان، دوورخستنی بە زۆرەملێ [١٤٧/٢٧-٢٨].

لەنێو زۆربەی خێڵەکاندا، بەپێی پێشینەی مێژوویی راو گرنگییەکی زۆری هەیە، و لەگەڵ ئەوەی لە رابردوویەکی زۆر دووردا یەکێک بووە لە شێوازەکانی زامنکردنی کەرەستەی خۆراکی، گرنگییە خۆراکییەکەی خۆی لەدەست داوەو چووەتە رێزی یەکێک لە ئیمتیازاتە کۆمەڵایەتییەکان. بۆ نموونە، لە تێبینییەکانی «بەهمەن بیگی» لە عەشیرەتەکانی فارسدا [١٤٨/٢٨-٤٩]. ئاماژە بەو خاڵە کراوە کە: «قەشقائییەکان راوکەری لێزان و چاپووکن راو بە جۆرە راهێنانێکی ئازایەتی و مێرانی دادەنێن، راو خۆشترین ماوەی کات بەسەربردنە بۆ زۆربەی تاکەکانی خێڵ...... راوکەری باش بەتایبەتی ئەو دەستەیەی کە بەسواری ئەسپ و لە حاڵەتی غارغارێندا نیشانەکانیان دەپێکن، خۆشەویستی و گرنگییەکی تایبەتییان لە نێو خەڵکیدا هەیە و لەبەرهەمان هۆ سەرانی خێڵ و هەرکەسێک کەپێی بکرێت هەوڵێکی زۆر دەدەن بۆ پەروەردەکردنی منداڵە تیر هاوێژو، راوکەرەکان چونکە سەرکەوتن لەم بوارەدا پەیوەندییەکی راستەوخۆی بەتواناو شیانەوە هەیە، تاکەکانی چینە باڵاکان راوکەری لێهاتووترن».

«محەمەد بەهمەنی بەهمەن بیگی» لەوەسفکردنی تایبەتمەندییە رەفتارییەکانی خێڵی قەشقاییدا، خەسڵەت و کەم و کورتییەکانیان بەم شێوەیە باس دەکات: «ئازایی، بێ باکی، داوێن پاکی و ناموسپەرستی، دزی و هەندێک جار بێ بەزەیی، یەکدەنگی و بەغیرەتی، گاڵتەجاڕی، لائوبالییەت و ئاسانگری و بایەخنەدان بەداهاتوو، ئامادەباشی و هۆشێکی لەڕادەبەدەر، خۆش بڕوایی، بێ سۆزی و مەیلی

راکردن لە سیستم و یاسا، سەخاوەت و کراوەیی، دەستپاکی و راستگۆیی، قسەهێنان و بردن» [٧٤/١٤٨]. بێگومان پێویستە ئەوەش بلێین کە باسکردنی ئەم تایبەتمەندییانە لەلایەن نووسەرەوە زیاتر لەسەر بنچینەی پێش بڕیار و ئەزموونی تاکەکەسی دامەزراوە نەک لێکۆڵینەوەی بابەتییانە، و هەروەها، لە ساتی نووسینی ئەم کتێبە (١٩٤٥)وە تائێستا هەلومەرجەکانی ژیان گۆڕاون.

**کورتەی بەش**

١- کۆمەڵگا سەرەتاییەکان ئێستاش لە هەندێ ناوچەی جیهاندا بەشێوەی گۆشەگیری یاخود نیمچە جێگیر درێژە بەژیانی خۆیان دەدەن.

٢- لە بنەڕەتدا چالاکی ئابووری لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا سنووردار دەبێت بە حاڵەتەکانی وەکو راو، کۆکردنەوەی کەرەستە خۆراکییەکان و ماسیگرتن.

٣- لەوانەیە ژیانی مرۆڤ لەکۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا لەپەیوەندیدابێت بەهەلومەرجە ژینگەییەکان بە شێوەی جێگیر، نیمچە جێگیر یاخود ناجێگیر.

٤- چالاکییەکانی رۆژانەی تاکەکان لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا لەچەند لایەنی وەکو گەڕان بەدوای خۆراک و کۆکردنەوەی، ئامادەکردنی خۆراک و دروستکردنی چەکدا کورت بکرێتەوە.

٥- لەبەر بوونی ئابووریی پشت بەخۆبەستوو، گۆڕینەوەو کڕین و فرۆشتن لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا نییە مەگەر لە چەند حاڵەتێکی کەمدا نەبێت.

٦- دابەشکردنی کارو پسپۆڕێتی لە کۆمەڵگای سەرەتاییدا حاڵەتێکی کاتی هەیە.

٧- نەریتی «پوتلاچ» کاریگەرییەکی زۆری هەیە لە زامنکردنی پایەی کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا.

٨- کلان جۆرێکی گرووپی خزمایەتییە کە ئەندامەکانی باپیرێکی هاوبەش و ئەفسانەیەکیان هەیە کە دەشێ رووەک، گیانەوەر، یاخود یەکێک لە دیاردە سروشتییەکان بێت.

٩- کۆچەرەکان ئەوکەسانەن کەشوێنێکی حەوانەوەی جێگیریان نییە، لەبەر هۆکارە جیاوازەکانی وەک لەوەڕی ئاژەڵان، کۆکردنەوەی کەرەستە خۆراکییەکان، راو و نێچیر شوێنی ژیانی خۆیان لە رێگایەکی دیاریکراو یاخود نادیاریکراودا دەگۆڕن.

١٠- رەگەزە سەرەکییەکانی ژیانی شوانکاری بریتین لە جێگۆڕکێ، مەڕومالات، و

لەوەڕگـا، کـە ئەم شـێـوازەی ژیان هاودەمـە لەگـەڵ سـەرهەڵدانـی سـیـسـتـمی باوکسالاری و روحییەتی شەڕخوازی.
١١- ژیانی شوانکاری کە جووتە لەگەڵ کۆچەری ئەنجامی تاقیکردنەوەکانی میللەتە سەرەتاییەکانە.
١٢- کۆچەرەکان بۆ دوو گرووپی سەرەکی ئاژەڵداران، و کۆکەرەوەکانی کە ستەی خۆراکی و راوکەرەکان دابەش دەبن.
١٣- نایەکسانی کۆمەڵایەتی لە ژیانی شوانکاریدا سەرتاپاگیرە.
١٤- ژیانی شوانکاری لەوانەیە حاڵەتی خێڵەکی یاخود نیمچە خێڵەکی هەبێت.
١٥- کۆچەری پشت ئەستوور بە مەڕداری بەزۆری حاڵەتێکی رێک و پێکی هەیە و گرووپە مرۆییەکان لە هاتووچوودان لەگەڵ ئاژەڵەکانیان لەمەودای نێوان کوێستان و گەرمیاندا.
١٦-عەشیرەتە کۆچەرەکان چەند خەسڵەتێکیان هەیە: پێکهاتەی کۆمەڵایەتی هۆزایەتی، پشت بەستنی ژیان بەئاژەڵداری، شێوەی ژیانی شوانکاری یاخود کۆچ.
١٧- خێڵ یەکەیەکی گونجاوی کۆمەڵایەتییە کە ناوێکی تایبەتی هەیەو ئەندامەکانی خاوەنی کولتوورێکی هاوبەشن.
١٨- هەموو کۆچەرەکان سەرچاوەیەکی خێڵەکییان نییەو ژیان لە خێڵەکاندا لەسەر تەوەری ئاژەڵداری دامەزراوە.
١٩- هەموو خێڵەکان تاسەر لە حاڵەتی کۆچەریدا نامێننەوەو لەوانەیە کاتێک بێت لە لادێکان یاخود شارۆچکەکاندا نیشتەجێ بن.
٢٠- لە کۆمەڵگای خێڵەکیدا زۆربەی ئەو کەرەستانەی کە بەرهەم دەهێنرێن لەلایەن بەرهەمهێنەرەکانەوە بەکاردەبرێن.
٢١- دابەشبوونە لاوەکییەکانی خێڵ بەپێی گرنگی بریتین لە تایفە، تیرە.
٢٢- دابەشبوونی هەر خێڵێک لەدوای زۆربوونی ئەندامانی دەبێت.
٢٣- دەتوانین خێڵەکانی ئێران لە رووی زمان و پەراگەندەیی جوگرافیایی پۆلێن بکەین.
٢٤- کۆمەڵگای خێڵەکی حاڵەتێکی «مەشاعییانە»ی هەیەو ناوی خێڵ وپلەوپایەی تاکەکانی هۆکارێکە کە جیاوکی کۆمەڵایەتییان پێدەبەخشێت.

### گوند لە ڕەوڕەوەی مێژوودا

لە بارەی سەرەتای کشتوکاڵ لە جیهاندا، کۆمەڵێک مێژوونووس لەو باوەڕەدان کە «کاتێک ژنان تۆوی ئەو ڕووەکانەیان کۆدەکردەوە کە بۆ خواردن دەست دەدەن دۆزینەوەیەکی سەرنج ڕاکێشیان کرد: ئەوان تێگەیشتن کە لە هەر تۆوێک کە دەکەوێتە سەر زەوییەکی نەرم گیایەک دەڕوێت کە ئەو گیایە خۆی چەند تۆوێکی تازەی تێدایە، کشتوکاڵ لێرەوە هاتە ئاراوە» [١١٩/ ٣٦].

نزیکەی دە هەزار ساڵ لەمەوپێش هەندێک لە خەڵکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست هەستیان بەوەکرد کە گژوگیاکان لە گەشەی تۆوەکانەوە بەرهەم دێن و ئەم دۆزینەوەیان لە بواری چارەسەری گرفتە هەمیشەییەکەی خۆیاندا (خۆراک) بەکارهێنا. لەوانەیە ئەوان هەرگیز بیریان لەوە نەکردبێتەوە کە ئەم دۆزینەوەیە چۆن بارودۆخی ژیانی مرۆڤ دەگۆڕێت.

ئەوان نەیاندەزانی کە دەبنە بونیادنەری شارە نوێیەکان و ئیمپراتۆریەتەکان و دواجار ژیارەکان. لەوانەیە ئێمەش هەرگیز بەوردی نەزانین چ هۆکارو بارودۆخێک ئەو میللەتانەی گەیاندە ئەو قۆناغە، چونکە ئەوکاتە هێشتا نووسین دانەهێنرابوو، هەروەها بەڵگە شوێنەوارناسییەکانیش لەم بارەیەوە هێندە ڕۆشنکەرەوە نین. وادێتە پێش چاو کە بە درێژایی ماوەیەکی زۆر زۆرێک لەو کۆمەڵانەی لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا ژیاون و لە ڕێگەی ڕاوکردن و کۆکردنەوەی خۆراکەوە ژیانیان بەسەر دەبرد خەریکی دروێنەکردنی هەندێک لە گژوگیا کێوییەکان بوون کە تۆوە نوێیەکان بەزۆری لەنێو ئەوانەدا دەرکەوتن.

ئەم کۆمەڵانە وردە وردە فێربوون کە تۆوی ئەم گژوگیایانە دەکرێت پاشەکەوت بکرێن، بەپێچەوانەی جۆرەکانی دیکەی خۆراکەوە (کە ئەوان هەیانبوو). ئەم خاڵەش دۆزینەوەیەکی گرنگ بوو. بەردەوامی ئەم دۆزینەوانە کە هاوکات بوو لەگەڵ ئەزموونی بەردەوامدا بووە هۆی پەیدابوونی کشتوکاڵ و سەقامگیربوونی ژیانی پشت بەستوو بەکشتوکاڵ و دواجاریش گوندنشینی. [١٥٣/ ٣٧-٤٠]

لە ژیاری سۆمەرییەکاندا هەریەکە لە گوندەکان جۆرێک لەسەرپەرشتیان هەبوو وەک سەرۆک، کاهین یان دانا (حکیم)، کە حوکمی سەرجەم خەڵکەکەیان دەکرد. هەندێک لەم کەسانە وردە وردە بەهێزبوون و یەکەمین کارێک کە ئەنجامیان دا کۆنترۆڵکردنی سوود وەرگرتن بوو لە ئاو و زەوییە کشتووکاڵییەکان. ئەو دەیتوانی ئەو کەسانەی کە دەستپێشخەری دەکەن لە سەرپێچیکردنی نەریتەکانی کۆمەڵگا لە

گوندەکەی دەربکات. کەسێکی لەم جۆرە چیدی لەلایەن یاساوە نەدەپارێزرا.

گوندەکەی دەربکات. کەسێکی لەم جۆرە چیدی لەلایەن یاساوە نەدەپارێزرا.
تاکو ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەم لە ئەورووپای خۆرئاوادا لەگەڵ ئەوەی لە زۆربەی وڵاتاندا زیاتر لە دوو لەسەر سێی دانیشتووانی لە گوندەکاندا نیشتەجێ بووبوون، گرووپە کۆمەڵایەتییەکانی گوند هێند هەمەچەشن نەبوون، و لە دوو گرووپی خێزان و کەنیسە پێکدەهاتن [ ١٤٤/ ٣٣]. لە قۆناغی سەدەکانی ناوەڕاستدا لە ئەورووپا سەرجەم جوتیاران بەئازادو نائازادەکانەوە (serf) لەو گوندانەدا نیشتەجێ بوون کە موڵکی خاوەن گوندەکان بوون. جوتیارە نائازادەکان، کە لەڕووی ژمارەوە چەند جارێک لە جوتیارە ئازادەکان زیاتربوون چەند ئەرکێکیان لەسەرشان بوو بەرامبەر بەخاوەن گوند، بەبێ پرسی ئەو هەقی بەجێهێشتنی گوندیان نەبوو، تەنانەت نەیاندەتوانی بەبێ پرسی ئەو هاوسەر بگرن. ئەم کۆمەڵە تەنانەت ئەگەر منداڵیشیان هەبووایە، سەرجەم موڵکەکەیان دوای مردنیان بۆ خاوەن گوندەکان دەبوو» [ ١٥٤/ ١١٦-١٢٠].

تاکو چەند ماوەیەک دواتریش، تەنانەت تاکو سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەیەمی زایینی لە هەندێک لە شوێنەکانی ئەورووپا شوێنەواری ڕەفتارەکانی قۆناغی سەدەکانی ناوەڕاست بەباشی هەستی پێدەکرا. لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەمدا وردە وردە کۆمەڵێک گۆڕانکاری سەرەکی (لەڕووی هونەری و کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی)یەوە لە کۆمەڵگای لادێی ئەورووپادا روویاندا. هەڵبەت سەرەتای ئەم گۆڕانکارییانە بە کۆتایی هاتنی قۆناغی سەدەکانی ناوەڕاست بەرەبەرە دەستیان پێکردبوو، بەڵام خێرایی گۆڕان لە کۆمەڵگای لادێیدا زۆرکەم بووە. لادێیی بە درێژایی ماوەیەکی زۆر ژیانێکی نەگۆڕو دیاریکراوی هەبوو. «شپنگلەر» بڕوای وابوو کە لادێیی، لە دنیایەکی دەرەوەی مێژوودا دەژیا [ ١٣/ ١٣٦-١٣٩].

«مارکس»و «ئەنگلز» لە نامەی مانیفێستدا دەنووسن «بۆرژوازی گوندی کرد بە شوێنکەوتەی سەروەری شار و شارە گەورەکانی هێنانە ئاراوە، ژمارەی دانیشتووانی شار بە بەراورد لەگەڵ لادێدا بە ڕادەیەکی زۆر زیاد کرد و بەم جۆرە بەشێکی گرنگی خەڵکی لە نەزانیی ژیانی لادێ هاتنە دەرەوە. بە هەمان شێوە کە گوندی کردە شوێنکەوتەی سەروەری شار، وڵاتە کێوی و نیمچە کێویەکانیشی وابەستەی وڵاتانی پێشکەوتوو کرد و میللەتە جوتیارەکانی وابەستەی میللەتە بۆرژواکان و

خۆرهەلاتی وابەستەی خۆرئاوا کرد» [١٢٤/ ٤١]. ئەم دوو نووسەرە، بۆرژوازی بە هۆکاری زۆرێک لە دیاردەکان دادەنێن وەک زێدەبوونی ژمارەی دانیشتووانی گوندەکان و گۆڕانیان بۆ ناوەندی شاری و ئازادبوونی خەڵکی لادێ لە نەزانین.

زانیارییە مێژووییەکان دەربارەی کۆمەڵگای لادێیی ئێران ئەوە پیشان دەدەن کە بەدرێژایی چەندەها ساڵ پەیوەندی جوتیارەکان لەگەڵ حکومەتدا لە دوو بابەتی سەرەکیدا کورت دەبوویەوە: بەسەربازکردنی لاوەکانی لادێ و وەرگرتنی باجەکان بەشێوەی جیاواز. بابەتی وەرگرتنی باجەکان هەمیشە هاوکات بووە لەگەڵ کۆمەڵێک کێشە بە هۆی سەرهەڵدانی شۆڕشەکان یان بۆ پێشگرتن لێیان. هەندێک جار کۆمەڵێک ریفۆرم لە سیستمی باجەکانی کۆمەڵگای لادێییدا ئەنجام دراوە. لە قۆناغی دەسەلاتی «قوباد» دانای داناکاندا، وەزیرەکان دەگەنە ئەو ئەنجامەی کە «چارەسەری ئەمە ئەوەیە کە هەموو زەوییەکانی مەملەکەت و رەزەکان بپێورێن، چەند جووت بوو، درەختە بەردارەکان بژمێرن، چەند بوون، دواجار بۆ هەر جووتێک زەوی و جووتێک رەز هەروەها بۆ هەر درەختێکی بەردار باجێک دیاری بکرێت: بۆ هەر جووتێک زەوی درهەمێک یان دوو یان سێ، کەم تا زۆر ئەوەندەی کە پێویست بکات بەگوێرەی بەرتەسکی زەوییەکە و نزیکی و دووری لەئاو...» [١٤٩/١٥١]. تەنگ و چەڵەمەی لادێییەکان لە وڵاتی ئێمەدا لەم بوارانەدا بەدرێژایی چەندین ساڵ بەردەوام بووە. چەند ساڵێک دواتر (کانت دوگوبینو) لەم بوارەدا دەنووسێت «لادێییەکان لە ژێرباری قورسی باجەکاندا، کاتێک نووکی چەقۆ دەگەیشتە سەر ئێسقانیان وازیان لە کێڵگە و ماڵی خۆیان دەهێنا و بە هیوای دەستکەوتنی بارودۆخێکی باشتر کۆچیان دەکردو حکومەتیش نەیدەتوانی رێگە بگرێت لە کۆچی دەستەجەمی لادێییەکان، چونکە ئەم کۆچکردنانە هەمیشە بەنهێنی و لە شەودا ئەنجام دەدران [١٥٢/ ١١].

لە لادێکانی ئێراندا نەریتی گەورەی موڵکدارێتی لە رابردوویەکی زۆر دوورەوە باوبووە. هەرچەند کە لە ئێراندا سیستەمێکی وەک «سەرانە» و بەشێوەی فیۆدالیزمی خۆرئاوایی باونەبووە، بەڵام لە هەمان کاتدا لادێییەکان لە زۆربەی قۆناغە مێژووییەکاندا تارادەیەک وابەستەبوون بە زەوییەوە، ناچار بوون کە باج بدەن، وەک سەرباز لە شەڕەکاندا بەشداریان دەکردو یاسا پارێزگاری لێنەدەکردن و لە زەوی موڵکدارەکاندا ناچار بوون بەلاش کار بکەن.. هتد [١٥٥/ ٥٧-٥٨].

## گوندنشینی چییه؟

بۆ ناسینێکی سەرپێیی کۆمەڵگای لادێیی، پێویستە یەکەم جار خەسڵەتە گشتییەکانی ئەم کۆمەڵگایە لەگەڵ تاوتوێ کردنی دەستەواژەی «لادێ»دا بهێنینە پێش چاوی خۆمان. سیفەتی لادێیی بە ناوچەیەک دەگوترێت کە لە ناو خەڵکیدا بە لادێ ناودەبرێت. ئەو وشەیەی کە بەدرێژایی مێژوو تەنانەت لە سەردەمی ئێمەشدا مانای جۆراوجۆری لێ وەرگیراوە. پێش هەرشتێک وشەی «لادێ» جۆرێکی تایبەت لە ژینگە دەردەبڕێت، واتە پارچە زەوییەک کە لەلایەن مرۆڤەوە چاندراوە و سوودی لێ وەردەگیرێت. بۆ بە لادێ ناسینی ناوچەیەک پێویستە چالاکی کشتوکاڵی لەو ناوچەیەدا هەبێت و شوێنەواری لەسەر رووی خاک دیار بێت. بۆیە بەزەوییە دەست لێنەدراو و نەچێنراوەکان ناوترێت لادێ [١٥٦/ ٤٧-٤٩].

«سندرسن» سۆسیۆلۆژیستی لادێیی، بەسەرنجدان لە کۆمەڵگای لادێیی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، ئەو ناوچانە بەکۆمەڵگای لادێیی دەزانێت کە دانیشتووانی لە کێڵگەی دوور لە یەکترو لە شوێنێکدا کە بەشێوەیەکی گشتی ناوچەی ئەنجامدانی چالاکییە کۆمەڵایەتی - ئابوورییە هاوبەشەکانیانە، نیشتەجێ بوونە، و پەیوەندی و وابەستەیی و دامەزراوەی هاوبەشیان هەیە [١٥٧/ ٢٣-٢٤]. ئەم پێناسەیە لەو راستییە دەڕوانێت کە هەرچەند خەڵکانی گوندێک لە یەکتر دوور بن و شوێنی نیشتەجێ بوونیان لەناو کێڵگە فراوانەکاندا بێت، لەگەڵ ئەوەشدا پەیوەندییەکی لانی کەم ئیداری دەیانبەستێت پێکەوە. گوندنشینە ئەمریکییەکان بە دەگمەن لە سەنتەری گونددا نیشتەجێن، ناوەندی گوند بەرپرسی ئەنجامدانی هەندێک رۆڵی بازرگانی و پیشەسازی و کۆمەڵایەتییە.

لەسەر بنەمای ئەو پێناسەیەی لەسەر ژمێرییەکاندا بەکارهێنراوە، لە پاکستان تەواوی ئەو ناوچانەی کە ژمارەی دانیشتووانیان لە ٥٠٠٠ کەس کەمتر نییە بەپێی بڕیاری پارێزگا بە شار دادەنرێن. لەم وڵاتەدا پارێزگار بەلەبەرچاوگرتنی کۆمەڵێک هەلومەرجی ناوچەیی بڕیاری کۆتایی دەدات. ئەم هەلومەرجانەش بریتین لە جادە و ئاسانکاری گشتی و خزمەتگوزاری تەندروستی و قوتابخانە و بنکەی پۆلیس و پۆستە و برەوی چالاکییە غەیرە کشتوکاڵییەکان. لە هەندێ باردا ئەگەر زۆربەی ئەم مەرجانە لە شوێنێکدا بەدیهاتن گەر ژمارەی دانیشتووانی لە ٥٠٠٠ کەسیش کەمتربێت ئەو ناوچەیە هەر بە شار ناو دەبرێت.

لە ئێراندا پێناسەی زۆرکراوە بۆ لادێ کە هەریەکە لە دیدگایەکی تایبەتییەوەیەو

زۆرجاریش لەگەڵ یەکتردا یەک ناگرنەوە. دوو مەرجی سەرەکی کە لە زۆربەی ئەم پێناسانەدا لەبەرچاو گیراوە ڕێژەیەکی دیاریکراوە لە دانیشتووان و خەریک بوونە بە پیشەی جوتیارییەوە. لە پێناسەی نوێی سەنتەری ئاماری ئێرانیشدا، کە دەیبینین ئەم دوو هۆکارە لەبەرچاونەگیراون. لە جێبەجێکردنی یاسای ریفۆرمی زەوی و زار (لە ساڵی ١٩٦٢ز)دا واهاتووە کە «لادێ بریتییە لەناوەندێکی دانیشتووان و شوێنی نیشتەجێ بوون و کاری هەرەوەزی خێزانەکانە، کە لە زەوییەکانیدا خەریکی کاری کشتوکاڵین و دەرامەتی زۆربەی تاکەکان لە ڕێگەی کشتوکاڵکردنەوە دابین بێت و بە شێوەیەکی ئاسایی لە ناوچەکەدا بە لادێ یان گوند بناسرێت». لەو پێناسەیەی سەرەوەدا پرەنسیپی لە بەرچاوگیراو «پیشەی جوتیاری» و «ناسرانە لەناوچەکە»دا و پرەنسیپی دانیشتووان بەشێوەیەکی دیار بوونی نییە.

**هۆکاری دانیشتووان:** لە گرنگترین پێودانگەکان لە دنیادا کە بۆ جیاکردنەوەی شار لە لادێ بەکاردەهێنرێن دوو خەسڵەتی سەرەکی ژمارە و چڕی دانیشتووانە. لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا لەسەر بنچینەی ڕێسای سەنتەری سەرژمێرییەکانی ئەمریکا هەر شوێنێک کە ژمارەی دانیشتووانی کەمتربێت لە ٢٥٠٠ کەس، بە لادێ ناودەبرێت. «سەنتەری ئاماری ئێران» تاکو سەرژمێری ساڵی ١٩٧٦ پێودانگی ئاماری بەکاردەهێنا بۆ دەستنیشانکردنی کۆمەڵگای لادێیی. بەو مانایەی کە ئەو ناوچانەی ژمارەی دانیشتووانیان لە ٥٠٠٠ کەس کەمتر بوو بە لادێ دادەنران. هەرچەندە ئەم دەزگایە لە ساڵی ١٩٧٦ بەدواوە سوودی لەم پێناسەیە وەرگرتووە، بەڵام ئەم سەنتەرە لە سەرژمێری ساڵی ١٩٨٦دا چاوی بە پێناسە کۆنەکەیدا خشاندەوە و لەکاتێکدا کە بەو شوێنانەی دەوت شار کە شارەوانیان هەبوو، لە پێناسەی ئاوەدانی «ناوچەی لادێیی»دا دەڵێت: «ئاوەدانی بەکۆمەڵەیەک یان شوێنێک یاخود چەند شوێن و زەوییەکی پێکەوە بەستراو (کشتوکاڵی و ناکشتوکاڵی) دەوترێت کە دەکەوێتە دەرەوەی سنووری شارەکان و سنوورێکی جێگیر یان عورفی سەربەخۆی هەیە. ئەگەر ئاوەدانی لەکاتی سەرژمێریدا شوێنی نیشتەجێ بوونی خێزانێک یان چەند خێزانێک بێت، ئەوا بە خودان دانیشتووان دادەنرێت ئەگەر نا بەبێ دانیشتووان لە قەڵەم دەدرێت» [١٥٨/ ٣].

لە هەندێ باردا پرەنسیپی ئامار بە شێوەیەکی تر دەخرێتەڕوو ئەویش چڕی دانیشتووانە (لە پەیوەندی لەگەڵ یەکەی رووبەردا) کە هەندێ جار لەگەڵ هۆکاری پیشەییدا تێکەڵاو دەبێت. شوێنێکی کۆبوونەوە کە چڕی دانیشتووانی لە ڕێژەیەکی

دیاریکراو کەمتر بێت بە لادێ دادەنرێت، هەڵبەت لەکاتێکدا کە پیشەی زۆرینەی خەڵک جوتیاری بێت [١٥٩/ ١-٣]. لە ژینگەی لادێدا زیاتر ناوچەی کشتوکاڵی دەبینرێت تا خانوو. ناوەڕۆکی جوگرافی ١٠ کیلۆمەتری چوارگۆشە لە شاردا جیاوازییەکی بنەڕەتی هەیە لەگەڵ ئەوەی لە لادێدا دەبینرێت. باڵادەستی کێڵگە، لادێ وەدی دەهێنێت و زاڵبوونی شوێنی نیشتەجێ بوون شار بەدی دەهێنێت. تەنانەت لە ئەوروپای خۆرئاواشدا کە لادێکان گەشەیەکی زۆریان کردووە بە دەگمەن چڕی دانیشتووان لە ناوچەیەکی لادێیدا لە ٣٠ یان ٤٠ کەس بۆ هەر کیلۆمەترێکی چوار گۆشە زیاترە. چڕی کەمتری دانیشتووان لەناوچە لادێیەکاندا تەنها لەڕووی چەندێتییەوە جێگەی سەرنج نییە، بەڵکو کاریگەری بنەڕەتی هەیە لەسەر بارودۆخی کۆمەڵگا. کاتێک چڕی دانیشتووان کەمە یەکێتی کۆمەڵایەتی زیاترە، نەناسراوبوون مومکین نییە، دابەشکردنی کار سادەترە، بزاوتی کۆمەڵایەتی کەمترە و هەروەها لادان (انحراف)ە کۆمەڵایەتییەکانیش ڕێژەیەکی کەمتریان هەیە.

**جۆری چالاکی:** هەموو جۆرە چالاکییە کشتوکاڵی و چالاکییە پەیوەندیدارەکان پێیەوە (ئاژەڵداری...هتد) کە لە لادێدا ئەنجام دەدرێن پێودانگێکی دیکەیە. بەڵام لێرەدا ئەم پرسیارە دێتە پێشەوە کە بۆ نموونە ئەو شوێنانەی تەنها لەڕووی دەرهێنانی کانزاوە گرنگیان هەیە ئایا دەکرێت بەشار دابنرێن. لەلایەکی دیکەوە لە شوێنێکدا کە لادێکانی دەوروبەری شار بەهێواشی دەگۆڕێن بۆ ناوچەگەلێک بۆ ڕاکێشانی پیشەسازی، چۆن دەتوانین متمانە بەم تایبەتمەندییە بکەین. نابێت ڕێژەی جوتیاران و ڕێژەی دانیشتووانی لادێ بە یەکێک دابنێین. ژینگەی لادێ لەتەک ژمارەی جوتیاراندا خەڵکانێکی دیکە لە نێو خۆیدا جێ دەکاتەوە وەک کرێکارانی کاری دەستی و فرۆشیاران و مامۆستایان و هەروەها ئەو پیشەوەرانەی کە بوون و نەبوونیان پەیوەندی بەگەشەی ئابووری کۆمەڵگای گوندەوە هەیە دەشێ کەسانێکیش لەلادێدا نیشتەجێ بن و شوێنی کارکردنیان لە یەکێک لە شارەکانی دەوروبەردا بێت.

لە وەڵامی ئەو پرسیارەی کە جوتیارێک چ چالاکیگەلێکی لە ئەستۆدایە، پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە لەهەلومەرجێکدا کە لادێ دەگاتە لایەنێکی کەم لە پێگەیشتن دەتوانین لەم پێنج گرووپەی خوارەوەدا پۆلین بکەین [١٥٩/ ١١].

١- پەیوەندی ڕاستەوخۆ لەگەڵ زەویدا لەڕووی بەرهەمهێنانی کشتوکاڵییەوە.

٢- بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی کێڵگە.

٣- دۆزینەوەی بازاڕو فرۆشتنی بەرهەمەکان.
٤- بەکارهێنانێکی سوودمەندانەی سەرمایە (پاشەکەوت).
٥- چالاکییە لاوەکییەکان (ئاژەڵداری و ماڵداری و ئاوەدانکردنەوەو...هتد).

بەم شێوەیە لە هەلومەرجێکدا کە لادێ لە بارودۆخێکی سەرەتایی گەشەی کۆمەڵایەتیدایە کار کۆمەڵێک خەسڵەتی تایبەتی هەیە کە بەتوندی وابەستەن بە دامەزراوەی خێزانەوە. تۆژینەوەکانی «ئەنستیتوی کار لە ئەفریقیا» لە لادێکانی ئەفریقیای رەشدا ئەوە پیشان دەدەن کە لە کۆمەڵگای لادێیی تەقلیدیدا لە زۆربەی حاڵەتەکاندا کاری کشتوکاڵی ئەم تایبەتمەندییانەی خوارەوەی هەیە [ ٥٩/ ١٩٤-١٩٧]:

١- کار لە پەیوەندی دایە لەگەڵ دامەزراوەی خێزان و تێیدا کار لەسەر بنەمای تەمەن و رەگەز دابەش دەکرێت.
٢- کار پەیوەندی بە سرووت (طقوس)ە ئایینییەکانەوە هەیە.
٣- کار لە جیاتی ئەوەی لەسەر بنەمای بەرژەوەندی ئابووری لەبەرچاو بگیرێت و هەڵسەنگێنرێت، زێتر لە پەیوەندیدا بەئابووری بژێوییەوە گرنگی پێدەدرێت.
٤- کار پێویستی بە پێشبینی و بەرنامەڕێژی نییە.
٥- کات رۆڵێکی ئەوتۆی نییە لە دیاریکردنی پێگەی چالاکییە وابەستەکان بە کارەوە، و بۆ زۆرێک لە ئەرکەکان کاتێکی دیاریکراو نییە.
٦- کارحاڵەتی پسپۆڕی نییە.
٧- بۆ پیاوان کار حاڵەتێکی بەردەوامی هەیە و ئەگەر بڕیاربێت کارێک ئەنجام بدەن ئەوا ئەو کارە بەبێ وەستان و بەردەوام ئەنجام دەدرێت.
٨- پیاوان بە دەگمەن بە تەنیا کار دەکەن و بەتایبەت لە هەندێک کاری وەک راووشکاردا تاکەکان بەشێوەی دەستەجەمی کاردەکەن.

**پێکهاتەو دامەزراوەی کۆمەڵگا:** یەکێک لەو پێودانگانەی کە بۆ جیاکردنەوەی دێ لە شار خراونەتەڕوو، هەمەچەشنی بارودۆخی کۆمەڵایەتی دانیشتووانی ناوچەیەک و ئاڵۆزی ژینگەی کۆمەڵایەتی لە دیدگای سۆسیۆلۆژییەوە لە بەرامبەر ئەو سادەییە ڕێژەییەی ژیانی لادێیە، هەرچەند کە زۆربەی دیدگاکان لەم بوارەدا زێتر پشت ئەستوور بوون بەتیۆر و داوەرییە نابابەتییەکان و پێوەری وردیان بەکارنەبردووە. یەکێک لە نیشانەکانی ئەم رێسایە بوونی ئامادەکاری و دامەزراوە جۆراوجۆرە کۆمەڵایەتییەکان و پێشکەش کردنی جۆرەها خزمەتگوزارییە لە شاردا.

هەرچەند کە جۆری خزمەتگوزاری یان چالاکییەکە کەمتر یان تایبەتی تر بێت بەشێوەیەکی ئاسایی پێویستە لە شارە گەورەکانی وڵاتێکدا بۆی بگەڕێین. هەروەک بوونی فرۆکەخانە گرنگەکان و ناوەندەکانی توێژینەوە و زانکۆیەکان و کار و پیشە تایبەتییەکان و کارخانە گرنگەکان و سینەما و شانۆ و نووسینگەی دامەزراوە بازرگانی و بانکییەکان و چاپ و بڵاوکراوە و نێردراوەکانی رادیۆ و تەلەفزیۆن و نەخۆشخانە گەورەکان و.. هتد.

لەم بوارەدا پێویستە ئەوەش زیاد بکەین کە «لمتون» لەو توێژەرانەیە کە هەوڵی داوە پێناسەیەکی گشتگیر بۆ لادێی ئێرانی بخاتەڕوو، لەم پێناسەیەشدا بونیاد و دامەزراوەی کۆمەڵگا دەکاتە پێوەری خۆی: بە بۆچوونی ئەو «لە کۆنترین زەمانەکانەوە لادێ یەکەیەکی ڕێکخراو بووە کە بنچینەی ژیانی کۆمەڵایەتی ئێرانی پێک دەهێناو ئەو شوێنە بوو کە تێیدا چەند گرووپێک لە خەڵک خۆیان بۆ هاوکاری ئابووری و سیاسی ڕێکدەخست و، لادێش بەوپێیەی کە یەکەیەکی ڕێکخراوە لە ژیانی لادێییدا لە تەواوی سەدەکانی ناوەڕاست و دواتریش تاکو ئەمڕۆکە بوونی هەبووە، ماڵێکی تاک تەنها کە لە لادێ جیابووبێتەوە هێشتا شتێکی ریزپەڕە وەک ڕێسایەکی گشتی نییە[ ١٥٥/ ٣٧].

**دەرەنجام**: دواجار خستنەڕووی پێناسەیەکی گشتگیرو لە هەمان کاتدا سوودمەند لە ئەنجامی توێژینەوە و کارە پراکتیکییەکانەوە تاکو ئێستاکەش وەک ئایدیالێک ماوەتەوە، هەرچەندە کە لە زۆربەی بارەکاندا ناسینی ناوچەیەک وەک لادێ جێگەی دوودڵی نییە. لەو هۆکارانەی کە دەستنیشانکردنی پرەنسیپە بنەبڕەکان بۆ ناسینی لادێ دژوار دەکەن سەرەڕای هەمەچەشنی شێوە و جۆری چالاکی، گۆڕانکارییە زۆر خێراکانی ژینگەی لادێیی، بەتایبەت لەم چەند دەیەی دواییدا. لەکاتی ئێستادا کۆمەڵگای لادێیی لە زۆر لە وڵاتەکانی دنیادا ڕووبەڕووی گۆڕانکاری خێراو قووڵ بۆتەوە، بەڵام پێش ئەم گۆڕانکارییانە ماوەیەکی دوور و درێژ ژیانی تەقلیدی زاڵ بوو بەسەر کۆمەڵگای لادێیی دنیادا و شوێنەوارەکانی تاکو چەند ماوەیەک لەمەوپێش هەر مابوونەوەو یەکێک لە تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی ئەم کۆمەڵگایەش وەستان (سکون) بوو.

هەرچەندە خستنەڕووی خاسیەتگەلێکی گشتی بۆ کۆمەڵگای لادێیی کارێکی زەحمەتە، بەڵام پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە زۆربەی لێکۆڵەران کۆمەڵگای لادێیی بە خاوەنی ئەم تایبەتمەندییانەی خوارەوە دەزانن. [ ١٦٠/ ١٧-٣٦].

١- بچووکی ڕەهەندەکانی کۆمەڵگا.
٢- کەمی چڕی دانیشتووان.
٣- پێکەوە گونجان و یەکدەستی ڕێژەیی دانیشتووان بە تایبەت لەڕووی دابەشکردنی کار و جیاوازی لە ڕۆڵە کۆمەڵایەتییەکاندا.
٤- جێگیری و بەرەنگاربوونەوەی گۆڕانکاری.
٥- دوورەپەرێزی کۆمەڵایەتی و جوگرافی.
٦- پشت بەستنی کۆمەڵگا بە خێزان و بونیادی خزمایەتی.

**پێکهاتەی ژیان - ژینگەی کۆمەڵگای لادێیی**

هۆکارە سروشتییەکان وەک هەلومەرجی جوگرافی لادێ: چیا، دەریا، بەرزایی، وەرزەکان، پلەی گەرمی، جۆری خاک و ڕادەی بەپیتی و هەروەها هۆکارە مرۆییەکانی وەک: چڕی پەیوەندییە مرۆییەکان و ماهیەتی کەم و زۆری خێزانیی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و پێکەوە گونجان یان هەمەچەشنییان، هەموویان بە قووڵی کاریگەرییان هەیە لەسەر ژیانی مرۆڤەکان. ژیانی کۆمەڵایەتی کە لەم بارودۆخەدا دەخرێتەڕوو ڕاستەوخۆ دەکەوێتە ژێر کاریگەری ژینگە جۆراوجۆرەکانەوە. لەسەر بنچینەی خەسڵەتی ژینگەیی، دەستە (فئات) مرۆییەکان لەڕووی بەها کۆمەڵایەتییەکان و شێوەی ژیان و شتی دیکەوە لێک جیادەکرێنەوە.

هەرچەندە کە لە شاریشدا وەکو لادێ هەست بە ئاووهەوا وەرزەکان دەکرێت لەگەڵ ئەمەشدا ژینگەی لادێ زیتر لە شار دانیشتووانی دەخاتە ژێر کاریگەری ئاووهەوا و دەرەنجامەکانی گۆڕانیان. دەکرێت بوترێت کە لادێیی لە ژێر کاریگەری سروشتدا ژیان بەسەر دەبات. لە ڕێگەی چڕبوونەوەی خانووەکان و کەڵەکەبوونی زۆریانەوە شار زیتر لە لادێ دەتوانێت پارێزگاری لە تاکەکانی بکات. چالاکی سەرەکی تاکی لادێیی، واتە کارکردن لە کێڵگەدا، ئەو ڕووبەڕووی توندوتیژی سروشت دەکاتەوە. کاتێک تاکەکان ڕووبەڕووی گۆڕانکاری ئاووهەوا ببنەوە و بەرگەی سەرما یان گەرمای زۆر بگرن و لەسەنگەری ڕووبەڕووبوونەوەدا بن لەگەڵ جۆرەها بای جیاوازدا، ئەم بارودۆخە لەڕووی جەستەیی و دەروونییەوە کاریگەری هەیە لەسەریان. ئایا ئەم هۆکارانە بەرگەگرتن و توانایەکی زیتر لەواندا بەدیناهێنێت؟ یان لە هەندێ حاڵەتدا هەستۆکی ئەوان زیاد ناکات؟

لەبەر ڕۆشنایی ژیان لە سروشتدا ژینگەی ژیان فراوانییەکی زیاتر بە خۆوە

دەبینێت. ژینگە لە رووەک و گیانلەبەران پێکدێت. جیاوازی نێوان چۆنیەتی شوێنی نیشتەجێ بوونی شاری لەگەڵ شوێنی نیشتەجێ بوونی لادێیی هەندێک جار دەگاتە دژایەتی، ژینگەی شاری (لە شارە گەشەسەندووەکاندا) لەگەڵ کەڵەکە بوونی زۆری یەکەکانی نیشتەجێ بوون (خانو و باڵەخانە) هیچ زیندەوەرێکی دیکەی تێدا نییە جگە لە مرۆڤ. خاک کە بەتەواوی داپۆشراوە بەکەرەستەی رەق بواری دەرکەوتنی گژوگیا نادات، سوود وەرگرتن لە دار و درەخت و دروستکردنی پارک لە شاردا بەردەوام بە شتێکی لاوەکی یان دەستکرد دادەنرێت، هەروەها لە بارەی ئاژەڵە ماڵییەکانەوە لە شاردا مەسەلەکە تارادەیەک هەر بەم جۆرەیە. [١٥٦/ ٤٧-٦٤].

پیشەسازی تارادەیەک لەناوچەیەکی تەسکتردا کۆبۆتەوەو لە بەرامبەریشدا کشتوکاڵکردن ناوچەیەکی زیاتر داگیر دەکات. بۆ ئامادەکردنی خەروارێک گەنم یان لەوەڕی چەند سەر مەڕێک لە پەیوەندی لەگەڵ ئاستی تەکنەلۆژیدا پێویست بە ناوچەیەکی دیاریکراو دەکات. لەلایەکی دیکەوە لە هەلومەرجی باودا جوتیار ناچارە کە لەناوچەی کارەکەیدا ژیان بەسەرببات و هەر پارچە زەوییەک تەنها توانای لە خۆگرتنی ژمارەیەکی دیاریکراوی هەیە. کەواتە کاریگەری سروشتیی کشتوکاڵ، بەتایبەتی بەشێوەی باو، پەراگەندە کردنی مرۆڤەکانە لەسەر رووی زەوی. هەڵبەت لەم بوارەدا هەندێک گریمانەی دیکەش مومکین دێنە پێش چاو. تەکنیکی نوێ دەتوانێت ناوچەی پێویست کەمبکاتەوە، یاخود پێشکەوتنی هۆکارەکانی گواستنەوە و گەیاندن، ئەگەری ژیانی بەرهەمهێنەرانی دانەوێڵە لە شار یان شارۆچکەکاندا فەراهەم بکات. لەناوچەی مەدیترانە، زۆرێک لە جوتیاران لە شارۆچکە یان شارە گەورەکاندا ژیان بەسەر دەبەن، بەڵام بەدرێژایی مێژوو لە ئەوروپا و ئەمریکا لادێییەکان لە بنەڕەتدا لە دێهاتەکاندا بڵاوبوونەتەوە.

سەرەنجام ئەوەی لە دنیای لادێدا، بە جۆرێک لە جۆرەکان تێبینی کراوە، خەڵکی زیاتر حەزیان لە پەرتەوازەییە تاکو کۆبۆنەوە. لە لادێدا لە ئەنجامی کاری مرۆییەوە، سروشت بە پەیوەندی لەگەڵ تەکنەلۆژیادا ماهیەتەکەی دەگۆڕێت. کەواتە سروشتی لادێ سروشتێکی «دروستکراو»ە، ئەم دیاردەیە لەڕووی مێژووییەوە لەگەڵ شوێنی سەرهەڵدانی کشتوکاڵدا پەیوەندی دروست دەکات، لە قۆناغی راوونێچیردا راوەماسی و بەرچتیان و پێویستییە خۆراکییە مرۆییەکان بەبێ دەستدان لە زەوی دابین دەکران. ئابووری شوانکارەیی سوودی لە لەوەڕگە سروشتییەکان وەردەگرت، بەڵام نەیدەخستە ژێر ئیرادە و کۆنترۆڵی خۆیەوە. لەو کاتەوەی کە لە قۆناغەکانی

پێش مێژوودا مرۆڤ بۆ مانەوەی لەسەر زەوی دەستی دایە چاندن و کشتوکاڵکردن، لە راستیدا یەکەمین شوێنەواری هێزی کاری خۆی لەسەر زەوی بەجێ هێشت.
لەلادێدا کە بەزۆری ناوچەکە بە بەرد و خشت و قیر دانەپۆشراوە، زەوی ئەگەری گەشەکردنی گژوگیا سروشتییەکان فەراهەم دەکات. لە هەندێ حاڵی تایبەتدا نەبێت واتە ناوچە زۆر سارد یان زۆرگەرمەکان زەوی زیندووە. لە باڵادەستی هەبوون کائینە زیندووەکان لە ژینگەی لادێییدا و نەبوونیان لە شاردا جیاوازییەکی بنەڕەتی بەدیدێت. لادێیی لە ژینگە سروشتییەکاندا ژیان بەسەر دەبات، لەکاتێکدا شاری لە نێو ئەو کۆشک و تەلارانەدا ژیان بەسەر دەبات کە خۆی دروستی کردوون. کەواتە تایبەتمەندێتی ژینگەیی لە هەردوو حاڵەتەکەدا یەکسان نییە. لەلادێدا تەواوی ئەوەی لە دەوروبەری تاکدایە بەردەوام لە حاڵەتی بزاوت و جووڵاندایە و ژیان مەیلی زۆربوون و زاوزێی هەیە و لە ناوچەکەدا بڵاوبۆتەوە.

### کاری کشتوکاڵی: بەخێوکردنی زیندەوەران

لە ئەنجامی بارودۆخی ژینگەییدا، بەرگری بێ وچان بۆ لادێیی لە بەرامبەر هێرشی هۆکارە سروشتییەکان لە ئارادایە کاتێک کێڵگە بە درێژایی چەند مانگی هاوین وازی لێبهێنرێت، کۆمەڵێک گژوگیای لێدەڕوێت کە دواتر ریشەکێشکردنیان کارێکی زەحمەتە. ژیانی لادێیی ململانێیەکی بەردەوام لەگەڵ گۆڕانکارییە سروشتییەکاندا بۆ دانیشتوانی دەهێنێتە ئاراوە، هەڵبەت لە کاتێکدا کە لادێیی بیەوێت زاڵبوونی خۆی بەسەر سروشتدا بپارێزێت. جوتیار زیاتر لە هەر لادێییەکی دیکە کاریگەر (متأثر) دەبێت بە ژینگەی سروشتی، چونکە لە هەر کەسێکی دیکە زیاتر رووبەڕووی ئەو بارودۆخە سروشتییانە دەبێتەوە کە سروشت دەیانهێنێتە ئاراوە، رەفتاری ئەو پەیوەندی هەیە بەو یاسا تایبەتییانەوە کە پەیوەندیدارن بە گەشەی سەرجەم گژوگیا و ئاژەڵەکان لە دەوروبەریدا، واتە ژیانی تایبەتی ئەو گژوگیایانەی دەیانچێنێت و ئەو ئاژەڵانەی بەخێویان دەکات، ئەم هۆکارانە چەند کاریگەرییەکیان هەیە لەسەر کارو شێوەی ژیانی لادێیی، کە گرنگترینیان بریتین لە [١٥٦/ ٦٧-٧٢]:

١- کار پەیوەستە بەجۆری گەشەی هەر جۆرە رووەکێک و ئاژەڵێک، گەشەی هەر ئاژەڵ یان رووەکێک پێویستی بە ماوەیەکە کە بە شێوەیەکی گشتی سروشت دیاریکردووە. لە بارەی رووەکەکانەوە جگە لە کات کە پێویستە بۆ گەشەی

هەریەکەیان، چاندن وابەستەی وەرزێکی دیاریکراوە کە بە پەیوەندی لەگەڵ ئاووهەوادا دەگۆڕێت. تەنانەت بۆ بەدیهێنانی گۆڕانێکی دەستکرد و دیاریکراو لە قۆناغەکانی گەشەدا، هێنانە ئارای ئاووهەوایەکی تایبەت پێویستە. دروستکردنی گۆڕان لە گەشەدا تەنها لە هەندێک جۆری رووەک و ئاژەڵدا مومکینەو ئەگەری کاریگەربوون سنوودار دەردەکەوێت.

٢- چاندن و ئاژەڵداری بەردەوام لەبەردەم مەترسی نەخۆشی و رووداوەکاندان، کە بەپەیوەندی لەگەڵ هەر ئاژەڵ یان گیایەکدا جیاوازە. ئەم جۆرە مەترسییانە بەردەوام لە زەینی لادێییەکاندا ئامادەن، لەوانەیە ئەنجامەکەی دروستبوونی جۆرێک لە دڵەڕاوکێ بێت، واتە مەسەلەیەک کە بۆ ئەو کەسانەی کە لەگەڵ شتە بێ گیانەکاندا سەروکاریان هەیە بوونی نییە. سەنعەتکارێک کە کاری لەگەڵ دار و تەختە و ئاسندایە ترسی لەم جۆرە مەسەلانە نییە. هەڵبەت ماددەی بێ گیانیش کە تارادەیەک نەگۆڕە بێگومان بە درێژایی کات دەکەوێتە ژێر کاریگەرییەوە، بەڵام رادەی کاریگەر بوونەکەی بە ئەندازەی بوونەوەری زیندوو نییە.

٣- بوونەوەری زیندوو هەندێک پەرچە کرداری فەردی هەیە کە نە بەتەواوی پێشبینی دەکرێن و نە دەتوانرێت بە تەواوی کۆنترۆڵ بکرێ. درەختێکی میوە کە دەیڕوێنین ئایا بەر دەگرێت؟ لە بارەی ئاوسی و سوود وەرگرتن لە جۆرە جیاوازەکانی ئاژەڵانیشەوە ئەم مەسەلەیە بوونی هەیە. پێویستە کاریگەری گۆڕانە کتوپڕییەکانی ئاووهەواش بۆ ئەم بارودۆخانە زیاد بکەین. کێ دەتوانێت گرەنتی ئەوە بدات کە گەنم نەرزێت یان بە هۆی بارانێکی کتوپڕو لافاو ئاساوە لەرەگ و ڕیشە دەرنایەت؟ جوتیار بە شێوەیەکی گشتی وەک سەنعەتکارێک و بە هەمان رادەی دڵنیایی (هەرچەندە کە پێشکەوتنی تەکنەلۆژی لە کشتوکاڵدا دەتوانێت بەڕادەیەکی زۆر ئەم مەترسییانە کەم بکاتەوە) ناتوانێت پێشوەخت ئەنجامەکانی کاری خۆی هەڵسەنگێنێت.

وادێتە پێش چاو کە لە شێوەی ژیانی کەسێکدا کە سەروکاری هەیە لەگەڵ بوونەوەرە زیندووەکاندا، بەکۆمەڵایەتی بوونێکی تایبەت لە ئارادا بێت کە لە وابەستەیی مرۆڤ و سروشتەوە سەرچاوە دەگرێت. نهێنییە شاراوەکانی ئەم سروشتە زۆرن و پێویستە تا ئەو شوێنەی کە مومکینە پێشبینی بکرێن. بەم پێیە سروشت لە هەمان کاتدا هاوکار و هاوبەشی یەکەم و هەروەها رەقیبێکی جیدییە لە ژیاندا و زاڵ بوون بەسەریدا کارێکی سەرەکییە، چونکە مەسەلەی مەرگ و ژیان لە ئارادایە.

له لادێکاندا هەموو شتێک بەدەوری ئەم تەوەرەدا دەخولێتەوە و ئەم ئاراستە وەرگرتنەی سەرەتا شێوە بە دیاردەکانی دیکە دەبەخشێت [١٥٦/ ٦٧-٧٢].

**سەرهەڵدانی لادێ و هۆکارە ژینگەیی - کۆمەڵایەتییەکان**

ئەو کۆمەڵە هۆکارەی کە رۆڵیان هەیە لە دەرکەوتن و پێکهاتنی کۆمەڵگای لادێیدا دەتوانین دابەشیان بکەین بۆ هۆکارەکانی ژینگەی سروشتی و هۆکارە کۆمەڵایەتی- کولتوورییەکان، و بەم شێوەیەی خوارەوە تاوتوێیان بکەین:

**١- هۆکارەکانی ژینگەی سروشتی.** خەسڵەتە جوگرافییەکان بە پلەی یەکەم دێن لە نێو ئەو هۆکارانەدا کە کاریگەرییان هەیە لەسەر کۆبونەوەی دانیشتووانی لادێ. هەندێک لەم هۆکارانە دەبنە هۆی جێگیربوونی مرۆڤ، وەک بوونی ئاو لە هەندێ ناوچەدا (لەوەرگە و دۆڵ لەناوچە وشکەکاندا) رادەی ئاوی بەردەست ژمارەی ئەو کەسانە دیاری دەکات کە دەتوان لە شوێنێکدا کۆببنەوەو سەرگەرمی کار بن. ئاو سەرەکیترین رۆڵی هەیە. بوونی ئاوی خواردنەوە، سوود وەرگرتن لەئاو لە کاری رۆژانەدا، ئاودانی کێڵگە و چاندنی گژوگیا پێویستەکان سوود وەرگرتن لەئاو بۆ بەرهەمهێنانی وزەی کارەبا، یاخود ئەو رۆڵەی کە دەتوانێت لە گواستنەوەو گەیاندندا هەیبێت لەو هۆکارە گرنگانەن.

رووکارەکانی ئاووهەوا وەک باوباران و پلەی گەرمی شێوە بە هەلومەرجی ناوچەیی و ژینگە دەبەخشن. باری زەوی بە هەمان شێوە لەڕووی بەرزی و نزمییەوە لە هۆکارە کاریگەرەکانە. کاتێک زەوی راستایی بێت بواری دروست بوونی ئەو گوندانەی کە خانووەکانی لەیەکتر نزیکن زیاترە لە گوندی پەراگەندە. لەلایەکی دیکەوە ناوچە شاخاوییەکان کۆمەڵ نەبوون لە نیشتەجێ بووندا ئاسان دەکات، چونکە شاخ و بەرزاییەکان نارێکن و ناچار خانووەکان لە یەکتری دوور دەکەونەوەو هەرچەندە ئەم نارێکیی زیاتر بێت رادەی پەراگەندەیی شوێنی نیشتەجێ بوونیش زیاتر دەبێت. دانیشتووان بە جێگیربوون لە دۆڵ یان دامێنی تەپۆڵکەکاندا، لە ژیان بەسەربردن لەناوچە نالەبارەکاندا هەڵدێن. زەویش لە هۆکارە گرنگەکانە: زەوییە چێنراوەکان و ئەوەی بۆ چاندن دەشێن و زەوییە نالەبارەکان بۆ کشتوکاڵ یان شێوەی خاوەنداریتی زەوی و پلەوپایەی وابەستە بەڕادەی موڵک و زەوی و زارەوە، و هەروەها بابەتە پەیوەندیدارەکانی دیکە بەزەوی و زارەوە بە هەمان شێوە کاریگەرییان هەیە لەسەر جێگیربوونی گوندەکان. جەنگەڵ و سەوزاییەکانیش چ لە

شێوەی پێشکەوتوویی کشتوکاڵی و چ لە شێوەی پێشنەکەوتوویدا لە هۆکارە کاریگەرەکانن.

هۆکارێکی دیکە پێکهاتەی خاکە کە بارودۆخێکی تایبەت لە جێگیربوونی مرۆڤەکان لە ناوچەیەکی دیاریکراوداو دەهێنێتە ئاراوە لەپەیوەندیدا بە نەرمی و رەقی خاکەکەوە مەسەلەکە جیاواز دەبێت. ئەو سەرچاوانەی کە لەژێر خاکدان بەردەکان، بەردی خەڵۆز و نەوت و.. هتد. بەپێی حاڵەت و چۆنیەتی بەرهەمهێنان دەتوانن بەشێوەیەکی گشتی شێوە بەناوچەکە ببەخشن.

**٢- هۆکارە کۆمەڵایەتی و کولتوورییەکان.** هۆکاری دانیشتووان دەتوانێت بەشێوەیەکی گشتی لادێ بخاتە ژێر کاریگەرییەوە. لە دایک بوونی زۆر زەمینە خۆش دەکات بۆ زۆر بوونی ژمارەی خانووەکان و لەوانەیە لە هەندێ حاڵەتدا بە گەورەبوونی شوێنی نیشتەجێ بوون یان پەراگەندەیی گوندەکە کۆتایی بێت. کاتێک دانیشتووان کەم دەبنەوە ژمارەی خانووەکانیش کەم دەبنەوە، تا ئەو رادەیەی کە هەندێک جار دەبێتە هۆی لەناوچوونی گوندە بچووکەکان.

لێکۆڵینەوەکانی ئەنترۆپۆلۆجیستەکان ئەوە پیشان دەدەن کە مرۆڤە سەرەتاییەکان لەسەر بنچینەی گرووپە خزمایەتییەکان و خێزانی گەورە یاخود کلان، ژیانی دەستەجەمعییان لەناوچەی دیاریکراودا دەست پێکرد و زەمینەی هاتنەئارای گوندی بەکۆمەڵیان هێنایە ئاراوە. ئەم شێوە ژیانە بە هۆی ململانێ نەتەوەییەکانەوە دواتر تا ماوەیەکی زۆر لەلایەن ئەوانی دیکەوە درێژەی پێدرا [ ١٦٠/ ١٧-٣٦].

**٣- رەوشی کشتوکاڵی.** سیستمی کشتوکاڵی گرنگییەکی زۆری هەیە لە بواری جێگیربوونی شوێنی نیشتەجێ بووندا. لە سیستمی بەرهەمهێنانی هاوبەشدا کێڵگەکان کراوەو پێکەوە بەستراون و گوند حاڵەتێکی بەکۆمەڵە بوونی هەیە. لە سیستمێکی دیکەدا کە تاکگەرایی لە بەرهەمهێناندا لە ئارادایە کێڵگەکان دیاریکراو و داخراون. چاندنی دانەوێڵە کە پێویستی بە چاودێری بەردەوام نییە زەمینە خۆشدەکات بۆ بە کۆمەڵ بوونی لادێکان، لەکاتێکدا کە ئاژەڵداری پێویستی بە لەوەڕگایە بۆ ئاژەڵەکان زێتر پێویستی بە پەراگەندەییە.

قۆناغە جیاوازەکانی گەشەی کشتوکاڵی کاریگەری هەیە لەسەر جێگیربوونی لادێکان. لە قۆناغی شوانکارەییدا کە چاندن و کشتوکاڵکردن لەژێر کاریگەری جموجۆڵی مرۆڤەکاندا بوو لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی دیکە، بایەخدان بە دروستکردنی خانوو و دامەزراوە ناوبراوەکانی دیکە نا بەردەوام و کاتی بووە.

له قۆناغی پێ سپاردنی زەوی بەتاکەکان بەشێوەی دەوری و کاتی، بونیادنانی خانووبەرە کاتی و کەم تەمەن بوو، لەبەرئەوەی جوتیار بە ئاسانی زەوییەکەی لەدەست دەدا و ناچار دەبوو روبکاتە ناوچەیەکی تر. لە قۆناغی خاوەنداریتی هەمیشەیی زەویدا بەردەوامییەکی زێتر لەرووی شوێنی نیشتەجێ بووندا دێتە ئاراوە لە بارەی ئەو گوندانەی کە خانووەکانی لە یەکتر نزیکن و چ لە بارەی ئەو گوندانەی ماڵەکانیانی پەراگەندەن، لە قۆناغی کشتوکاڵی پسپۆڕی و زانستیدا ئارەزووی وازهێنان لە ژیان بە شێوەی لادێیی و کۆمەڵی و رووکردنە پەراگەندەیی لەرووبەرێکی فراوانتردا دەبینرێت. بەڵگە نەویستە کە بارودۆخی ئابووری کشتوکاڵیش رۆڵێکی سەرەکی دەبینێت لەم نێوەندەدا، چاندنی قووڵ دەبێتە هۆی زیادبوونی خانووەکان، لەکاتێکدا چاندنی رووکەشی ئەنجامێکی پێچەوانەی دەبێت. لە ئەوروپای خۆرئاوادا جێگیربوونی هەندێ پیشەسازی ئاڵوگۆڕی کشتوکاڵی بوونە هۆی بەکۆمەڵ بوونی خانووەکان لە لادێکان، ئەو لادێیانەی ئەمڕۆکە حاڵەتێکی کرێکارییان هەیە.

پێدەچێت لە سیستمی فیۆدالیدا کە خانووبەرە دان بە رەعیەت لەناوچەیەکی سنوودارو کەڵەکەبوودا زێتر لەگەڵ بەرژەوەندی ئاغاکاندا یەکی گرتبێتەوە. هەڵبەت لە هەمان کاتدا کە زۆربوونی خەڵکی لەیەک گوندا لەڕووی کۆنترۆڵ و بەڕێوەبردنیانەوە سوودێکی هەبووە، بەڵام لەهەندێ حاڵەتیشدا پەراگەندەیی دانیشتوان لە بەرژەوەندیاندا بووە. دەتوانین هەست بەوە بکەین کە ژیانی دەستەجەمعی زێتر زەمینە فەراهەم دەکات بۆ بەرگریکردن لە هێرش و بەشێوەیەکی گشتی پارێزگاری بەکۆمەڵ لە بوارە جیاجیاکاندا.

٤- **هۆکارەکانی دیکە**. لە کۆمەڵگای لادێییدا هەندێ سەرچاوە و ئاسانکاری بۆ جێبەجێکردنی پێویستییە دیاریکراوەکان هاتوونەتە ئاراوە، بەڵام بەپەیوەندی لەگەڵ هۆکارەکانی دیکەدا لەوانەیە کاریگەریی زۆر جیاوازیان هەبێت. گواستنەوە و گەیاندن و ئاسانکاری پەیوەندییەکان وەک شارێگە و رێگە ستراتیجییەکان و رێگە ئاوییەکان و پایسکل و عەرەبانە و ماتۆر و ئۆتمبیل و پاس و رێگەی ئاسن و بەلەم و رادیۆ و تەلەفزیۆن و تەلەفۆن و چاپ و تەلەگراف هەریەکەیان لە بەکارهێنانی تایبەتی خۆیاندا کاریگەرییەکی تایبەتییان هەیە. ئاسانکارییە تەندروستییەکان شێوەی جۆراوجۆریان هەیە و لەوانەیە بە شێوەی دەرمانخانە و خەستەخانەی گوندەکان (چ پڕ پێداویستی بن یان نیمچەپڕ) و بنکەی تەندروستی و خانەی

تەندروستی بێت. زەمینەی چالاکی دامەزراوەکانی دیکەی پێشکەوتن یان خۆشگوزەرانی لەوانەیە هاندانی کشتوکاڵ، فێرکردنی گشتی، کارە دەستییەکان و شتی دیکە بێت. لە فاکتەرەکانی دیکەش دەتوانین ئاماژە بەسەندیکا، کۆمەڵە، دامەزراوەی ئایینی و دامەزراوە تەرفیهییەکان بکەین.

پێویستە رووداوە مێژووییەکانیش زیاد بکەین بۆ ئەو فاکتەرە جۆراوجۆرانەی ئاماژەمان پێ کردن. وشکەساڵی و نەخۆشییە درمەکان و شەڕەکان دەبنە هۆی نەمان یان کەمبوونەوەی ژمارەی دانیشتووانی هەندێک لەناوچەکان. کۆچی خەڵکی تازە هاتوو کاریگەری هەیە لەسەر رەوشی شوێنی حەوانەوە لە لادێدا. سەردەمە جیاوازەکان کە بەدوای یەکدا دێن لەیەک ناچن و خانووبەرەش دیاردەیەک نییە کە بە شێوەیەکی یەکجاری و هەمیشەیی لەناوچەیەکی دیاریکراودا بێتە ئاراوە، بەڵکو هەروەک ژیانی مرۆڤەکان ئەویش لە حاڵەتی گۆڕاندایە. بێگومان لە سەردەمی ئێمەدا خێرایی گۆڕانی شێوەی خانووبەرەکان لە ناوچە لادێییەکاندا زیاتر بووە. بەرنامەکانی ریفۆرمی زەویوزار، گەشەسەندنی شار، دروستبوونی جەمسەرە پیشەسازییەکان و گۆڕانی هۆکارەکانی گواستنەوە و گەیاندن.. هتد، هەموویان کۆمەڵێک رۆڵیان هەیە و هۆکاری دانیشتووان و ئابووریش هیچ کاتێک بێ کاریگەری نین [ ١٦١/ ٥٤-٥٧ ].

**پەرتەوازەیی و کۆبوونەوە: فەزا، شوێنی حەوانەوەو کێڵگە**

ئەو کۆمەڵە هۆکارەی کە لە رەهەندە سروشتی و یاسایی، مێژوویی، کۆمەڵایەتییەکانی گوندەوە سەرچاوە دەگرن دەبنە هۆی ئەوەی کە یەکەم: گوند روویەکی تایبەتی هەبێت و، دووەم: بەشەکانی ناوەوەی واتە خانوو و کێڵگە و دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان بە شێوازی جیاواز جێگیر بن. لە لێکۆڵینەوە کلاسیکییەکانی سۆسیۆلۆژیای گونددا سێ جۆری جیاواز لە پەیوەندی خانوو و کێڵگەو دامەزراوەی کۆمەڵایەتی لە فەزای گونددا دەستنیشان کراون.

**نیشەجێبوونی پەراگەندە.** بەسەرنجدان لەوەی کە جێگیربوونی خانووەکان لە هەندێک لە لادێکاندا بە شێوەیەکی پەراگەندەیە و خانووەکان لە نێو کێڵگەکاندان، ئەم جۆرە لادێیانە زاراوەی «پەراگەندە» یان «نا کۆمەڵ» یان بۆ بەکاردەبرێت، هەروەها نیشتەجێ بوونی پەراگەندە ناوچەگەلێکمان وەبیر دەخاتەوە کە لەڕووی ئەوەڕگاوە گرنگییەکی زیاتریان هەیە. یەکەکانی بەرهەمهێنانی کشتوکاڵی کە

چالاکی سەرەکییان ئاژەڵدارییە زۆربەی کات بەنێو لەوەڕگاکاندا بڵاوبوونەتەوە. لە ناوچەکانی باکووری ئەورووپا (بۆ نموونە سوید و نەرویج) ئەم یەکە (وحدە)انە لە نێو جەرگەی ئەو جەنگەڵاندان کە تەواوی ناوچەکە دادەپۆشن. ئەم ناوچانە کە پەیوەندیشیان پێکەوە هەیە زۆرجار گوند پێک ناهێنن (بەسەرنجدان لە سەرجەم پێوەرەکانی ناسینی گوند). زۆری خانووەکان لە گوندە تا کۆمەڵەکاندا زۆر گۆڕاوەو دووری کێڵگەیەک لە کێڵگەیەکی ترەوە بەپێی ناوچەکە لە چەند سەد مەترێکەوە تاکو چەند کیلۆمەترێک دەبێت. لە نموونەی ئەم جۆرە ناوچانە دەتوانین ئاماژە بە لادێکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بکەین، کە ئەم دوورییە هەندێ جار دەگاتە نزیکەی ٤٠ کیلۆمەتر. ناوچەکانی نیشتەجێ بوونی پەراگەندە بێ ناوەندی بە کۆمەڵ بوونی لادێیی نین. لە هەندێ حاڵەتدا کە خانووبەرەی پەراگەندە و لادێ پێکەوە یەک یەکەی ژیانی هاوبەش پێک دەهێنن دەتوانین جیاکارییەک بکەین لە نێوان دانیشتووانی لادێ و دانیشتووانە نیشتەجێ بووەکان لەناوەندی گوند یان شارۆچکەکاندا. لەم حاڵەتەدا دانیشتووان کە پێویستییان بەخزمەتگوزاری گشتییە ناچارە پەیوەندی بکەن بەهەندێ ناوچەوە کە لەوانەیە لێک دوور بن. بۆ نموونە لە سوید لە هەندێک ناوچەدا هەندێک دەزگای وەک کەنیسە، قوتابخانە، بەڕێوەبەرایەتی دەبینین بەبێ ئەوەی خەڵکانێکی نیشتەجێ لە دەوروبەری ئەم دەزگایەک هەبن. لە ئیتاڵیا دەستپێشخەری کراوە بۆ دامەزراندنی چەند دام ودەزگایانە بۆ خزمەتگوزاری گشتی. ئەم دەزگایانە بۆ ئەو خەڵکە پەراگەندانەن کە لە ناوچەیەکی فراواندا نیشتەجێن. بەبێ ئەوەی پەیوەندییەکی راستەوخۆ یان هاوسێیەتی لە نێوان لادێکان و ئەم دەزگایانەدا هەبێت. لە ئەڵمانیای خۆرئاوا بەگشتی ئەم دەزگایانە کەوتوونەتە هەردوو لای جادەکانەوە.

**نیشتەجێ بوونی بەکۆمەڵ.** لەڕووی شێوەی دەرەکییەوە ئەم جۆرە نیشتەجێ بوونە هەندێ جار بەشێوەی ناوچەی نزیک بەیەک و قەڵەباڵغە. گوند رووبەکی تایبەتی هەیە و دەتوانێت دوای ماوەیەک بگۆڕێت بۆ شارۆچکە. لەم گوندانەدا دەتوانرێت کۆڵانی باریک و پێچاوپێچ بەوردی لەسەر نەخشە دیاری بکرێن. پێویستە نیشتەجێ بوونی بەکۆمەڵ بەبێ لەبەرچاوگرتنی ژمارەی خانووەکان تاوتوێ بکرێت. ئەم جۆرە نیشتەجێ بوونە لە ژمارەیەکی کەمی خانووەوە دەست پێدەکات و لەوانەیە ژمارەی بگاتە سەدان خانوو. شێوەی ئەم جۆرە گوندانە زۆر هەمەچەشنە و لەوانەیە بەشێوەی کوچەیی یان قەڵایی یان ئەستێرەیی یان خاچی... بێت.

پێکهێنانی گونده بەکۆمەڵ بووەکان هەمیشە پەیوەندیدار نەبووە بە ئەنجامی چالاکییە کشتوکاڵییە هاوبەشەکانەوە. لە پێکهاتنی ئەم جۆرە گوندانەدا کۆمەڵە فاکتەرێکی وەک جۆری موڵکداری (وردە بۆرژوا یان درشتە بۆرژوا) ئاسایش، ئاو.... رۆڵیان هەبووە. لە سیستمی گەورەی موڵکداریدا بەشێوەیەکی گشتی مەیلی بە کۆمەڵ بوون هەیە. دەزانین کە نەمانی ئاسایش و بە تایبەتی ترس لە هێرشی دزەکان و لە هەندێ حاڵەتدا چادر نشینەکان کاریگەری هەبووە لە پەیدابوونی گوندی شێوە قەڵادا (کە لە ئاسیای ناوەندیدا زۆرە).

**شێوەکانی دیکەی نیشتەجێ بوون** لە نێوان گوندی پەراگەندە و گوندی بەکۆمەڵ بوودا ئاستێکی مام ناوەندیش هەیە. لە هەندێ باردا خانووەکان لە ناوچەیەکی نەک زۆر فراوان، بەڵام بەشێوەیەکی نارێک بڵاوبوونەتەوە. ئەم خانووانە لەوانەیە هەر چەند دانەیەک یان هەر یەکێکیان لە شوێنێکدابێت، لەم حاڵەتەدا هەڵبەتە ناوچەی نیشتەجێ بوون فراوانتر دەبێت و لەدامێنی هەر خانوویەکدا یان لەبەردەمیدا باخچەیەک هەیە. لەم جۆرە گوندانانەدا زۆربەی خانووەکان پێکەوە نەبەستراون، بەڵام دووری نێوانیشیان هێندە زۆر نییە.

### شێوەناسی ژینگە لادێییەکان

بەسەرنجدان لەو راستییەی کە لادێکان لەرووی شێوەی دەرەکی و توخمە ناوەکییەکانەوە لەسەر ئاستی ناوچەیەک ولاتێک یاخود چەند ولاتێک لێک جیاوازن سۆسیۆلۆژیستەکان لە هەوڵی ئەوەدا بوون کە بە لەبەرچاوگرتنی چەند پرەنسیپێک لادێکان لەرووی شێوەناسی (مۆرفۆلۆژی)یەوە پۆلێن بکەن. «هالینگزهید» (A.B. Hallingshead) کۆمەڵناسی ئەمەریکی سێ جۆر ژینگەی لادێیی دەستنیشان دەکات [١٦٢/ ٢٧٨-٢٧٩]. جۆری یەکەم بە «شارۆچکە» ناودەبرێت، کەتێیدا ناوچەکە بەشێوەیەکی گشتی حاڵەتێکی لادێییانەی هەیە و ئەرکەکانی کۆمەڵگای شارستانی بە دەگمەن تێبینی دەکرێن. کۆمەڵێک جوتیار کە لە دەوری یەک کۆبوونەتەوە و بە ناوەندە شارییەکانەوە دەبەسترێنەوە. شارۆچکە بە شێوەیەکی گشتی ژمارەی دانیشتووانی لە نێوان ٢٥٠-١٠٠٠ کەسدایە و کۆمەڵە خزمەتگوزارییەکی وەک وەرشەکانی چاککردنەوە و کوتاڵفرۆش و وردەواڵە فرۆشی (عطار)ی تێدایە (کە ئەنجامدانیان لە کێڵگەکانی دەوروبەردا مومکین نییە)، ئەو

پیشەوەرانەی سەرەوە لە شارۆچکەدا نیشتەجێن، بەڵام شوێنی نیشتەجێ بوونی جوتیارەکان ناو کێڵگەکانە.

جۆری دووەم دەتوانین بە «گوند» ناوی ببەین کە لە جۆری یەکەم بچووکترە و ژمارەی دانیشتووانی بەزۆری لە نێوان ٢٥-٢٥٠ کەسدایە و ئەم گوندە تەنها ناوەندێکی بچووکە بۆ ئەنجامدانی هەندێک خزمەتگوزاری. ئەم ناوچانە بەشێوەیەکی گشتی لە شوێنی بەیەکگەیشتنی دوو شارێگەدان یان دەکەونە دەوروبەری هێڵی شەمەندەفەرەکانەوە. فرۆشگا گەورەو گشتییەکان زێتر لەم ناوچانەدان و لەنزیکیانەوە بەنزینخانە و وەرشەی چاککاری ئوتمبیل هەیە.

جۆری سێهەم کێڵگە کشتوکاڵییەکانن (Farm) کە دانەویڵەو بەروبوومە کشتوکاڵییەکان بەرهەم دەهێنن لە تایبەتمەندییەکانی ئەم کێڵگانە فراوانی ئەوانە و جێگیریی دانیشتووانە تێیاندا. فراوانی ئەم کێڵگانە وادەکات کە دووریەکی تارادەیەک زۆر لە نێوانیاندا هەبێت.

لە «هۆڵەندا» پێوەری دەستنیشانکردنی جۆرە جیاوازەکانی کۆمەڵگای مرۆیی، سوود وەرگرتنە لە پۆلینێکی رەسمی کە چەندین جۆری شوێنی کۆبوونەوە دەگرێتەوە: لادێ، لادێی بە شار بوو، شار کە هەریەک لەم جۆرانەش خۆی دابەشبوونێکی هەیە. چوار بنەمای ئەم پۆلینە بریتین لە: پێوەری فیزیکی یان شێوەناسی (چڕی لە یەکەی رووبەردا)، کۆمەڵایەتی- ئابووری (پێکهاتەی دانیشتووانی چالاک)، ئەرک و رۆڵ (دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان)، کۆمەڵایەتی و دەروونی-کۆمەڵایەتی (شێوەی ژیان و تەرزی بیرکردنەوە).

سۆسیۆلۆژیستی فەرەنسی «هێنری ماندراس» (H. Mendras) لە هەوڵی ئەوەدایە کە ئەو دژایەتییە تەقلیدییەی کە لێکۆڵەران لەبەرچاویان گرتووە لە نێوان شارو لادێدا لە دیراسەدا لابات و چوار جۆری ژینگە دەستنیشان دەکات:

١- ناوەندە شارییەکان کە چالاکی ئیداری و بازرگانی و پیشەسازییان تێدا ئەنجامدەدرێت.

٢- ئەو ناوچانەی کە هیچ جۆرە چالاکییەکیان نییە جگە لە کشتوکاڵ و کاروبارە پەیوەندیدارەکان بە کشتوکاڵەوە.

٣- ناوەندە نیمچە شارییەکان کە «شارە خێوەتگاییەکان»و جەمسەرە کشتوکاڵییەکان لە خۆ دەگرێت.

٤- ئەو شارۆچکە بچووکانەی کە ئەو چالاکییە ئیداری و بازرگانییانەیان تێدا

ئەنجامدەدرێت کە پەیوەندیدارن بە لادێکانی دەوروبەریانەوە.
«چیتامبار» سۆسیۆلۆژیستی هیندی دوای تاوتوێکردنی شێوە جۆراوجۆرەکانی نیشتەجێ بوونی خەڵک لە کۆمەڵگای لادێییدا ئەم پۆلینەی خوارەوە پێشنیار دەکات [١٣/ ١٣٦-١٣٨].

١- **کێڵگە فراوان و دوورهەڵکەوتووەکان.** لەم جۆرە کێڵگانەدا، خێزانی لادێیی لە کێڵگەکەیدا (کە دەورەی خانووەکەی داوە) ژیان بەسەر دەبات. هاوسێیەکەی لەوانەیە چەندین کیلۆمەتر لێیەوە دووربێت. ئامێر پێویستییەکانی کێڵگە، چوارپێکان، بەروبوومی کۆکراوە، عەمبار و ئاسانکارییەکانی دیکە کە پێویستی پێیان هەیە لە کێڵگەدا هەن.

٢- **گوندە شێوە راستە هێڵییەکان.** لەم جۆرەدا، خانووەکان بەدرێژایی جادە، ڕێڕەوی رووبارەکان یان ڕێڕەوی هۆکارەکانی گەیاندن ریزبوون کە دەکەونە پشتی خانووەکان و لە شوێنێکی دان کە تاڕادەیەک دوورە لەوانەوە. بەم جۆرە خانووەکان لەیەک نزیکن و خەڵکەکانیان زیاتر دەستیان بەیەکدەگات. ئەم جۆرە گوندانە لە ئەوروپاو ئاسیادا دەبینرێن.

٣- **گوندە شێوە بازنەییەکان.** خانووەکان بەشێوەیەکی بازنەیی لە دەوری یەکتر کۆبوونەتەوە، بەزۆری شوێنە گشتییەکانی گوند دەکەونە ناوەندی ئەم بازنانەوەو خانووەکان لێک نزیکن، بەبێ ئەوەی ڕێکخستنی خانووەکان پەیوەندی هەبێت بەشوێنی کێڵگەکانەوە.

٤- **گوندە چوار ڕێیانی و ناوەندە فرۆشیارییەکان.** پێکهاتەی ئەمانە بە هۆی هەلومەرجی ئابووری ناوچەکەوەیە وەک ئامادەکردن و دابەشکردنی کالاکان. جگە لەمەش لەم ناوچانەدا بەنزینخانە، وەرشەی چاککردنەوە، سەرتاشخانە و دامەزراوەی لەم جۆرە دەبینرێن. ئەم جۆرە ناوەندانە حاڵەتی بازارییان هەیە و لە بنەڕەتدا یان شوێنی نشتەجێ بوونی کەسانێکە کە سەرگەرمی کڕین و فرۆشتنی بەروبوومە کشتوکاڵییەکانن یان شوێنکاری کەسانێکە کە لەم ناوەندانەدا دووکان یان کارگەی بچووکیان هەیە. جوتیاران بە گشتی لەم ناوچانەدا ژیان بەسەر نابەن، مەگەر ئەوەی کە زەوی و زاریان لەم دەوروبەرەدا بێت. زۆرجار ئەم ناوچانە لەو کۆمەڵە دووکانانە پێکهاتوون کە لە ڕێڕەوی جادەی سەرەکیدان.

٥- **گوندە بچووکەکان.** ئەم گوندانە دوورییەکی زۆریان هەیە لەگەڵ گوندەکانی دیکەداو هەروەها دووریشن لە ناوەندە گرنگەکانی لادێ یان شارەوە و بە

شێوەیەکی گشتی ئەم گوندانە بێبەشن لەو ئاسانکاری و خزمەتگوزارییانەی کە لە گوندە گەورەکانی دیکەدا هەن.

٦- **جۆرەکانی دیکە**: لە هەندێ باردا لادێ رۆڵێکی تایبەت دەگێڕێت، بۆ نموونە لە هیندستان لەو ناوچانەدا کە لەڕووی ئایینییەوە بە زیارەتگا دادەنرێن، سەرەتا مزگەوت پەرستگا یان بینای لەمجۆرە دروست دەکرێن و دواتر لە نزیک ئەوە کۆمەڵە بینایەک بۆ زیارەتکەران و گەشتیاران بنیات دەنرێن. شوێن و ناوچە مێژووییەکانیش لەوانەیە تارادەیەک بە هەمان شێوە بن (لەم جۆرە گوندانە لە ئێراندا زۆر دەبینرێن).

لە ئێراندا شێوە سەرەکییەکانی گوند بریتین لە[١٦٣/٢٣-٢٤].

١- گوندە پەراگەندەکان کە تێیاندا دووکان و خانووەکان لە گونددا و لەنێو کێڵگەکاندا بڵاوبوونەتەوە.

٢- گوندە پەستێوراو یان قەرەباڵغەکان کە تێیاندا گەڕەکەکانی گوند بەهۆی کۆڵانە باریکەکانەوە لێک جیادەبنەوە و خانووەکان کۆمەڵ و لە نزیک یەکەوەن.

٣- گوندە راستە هێڵییەکان یان شێوە کۆڵانی، کە تێیدا خانووەکان بە درێژایی رێگەیەک لەتەک یەکدا ریزبوون.

٤- گوندە قەڵا ئاساکان، کە شوێنی نیشتەجێ بوونی لادێییەکان لە شوێنێکی شێوە قەڵادا کۆبۆتەوە، ئەمەش زیاتر بەمەبەستی هۆکاری ئاسایش و ئارامی (هێرشی ئەوانی دیکە و تالان) بووە.

### لادێ و لادێییەکان

لادێیی بوون لەوانەیە هۆکارو شێوەی جۆراوجۆری هەبێت. پێدەچێت کەسێک لەبەرئەوە پێی بوترێت لادێیی کە لەلادێدا نیشتەجێیە، یان لەبەرئەوەی پیشەیەکی تایبەتی هەیە، یان لەبەرئەوەی منداڵیی خۆی لەوێ بەسەر بردووە. شێوەی وابەستەیی بە کۆمەڵگای لادێییەوە جیاوازەو شێوە جیاوازەکانی وابەستەیی بەلادێوە رادەی جیاوازی پەیوەستی کۆمەڵایەتی دێنێتە ئاراوە. ئەو کەسانەی کە لە لادێدا بەرژەوەندی جیاوازیان هەیە وابەستەییەکی تەواو یان نیمچە تەواویان هەیە بەم کۆمەڵگایەوە. وابەستەیی دەروونی بەلادێکانەوە لەوانەیە سەرچاوەو جەوهەرێکی خێزانی و هەستی هەبێت [١٥٦/٥٨-٦٤]. ئەوەی لەم باسەدا زێتر گرنگی پێدەدرێت، نیشتەجێ بوونە لە لادێ و شێوە جیاوازەکانی وابەستەییە

پێوەی. پێویستە سەرنج بدەین کە وابەستەیی بە لادێوە دەکرێت لەکاتی نیشتەجێ بوون لەشاریشدا بوونی هەبێت دەتوانین نموونەی ئەمە بە شێوەی جۆراوجۆر ببینین.

گەورە موڵکدارەکانی نیشتەجێی شار (لە ئێران)و وردە موڵکدارە شارنشینەکان یان جۆرە نوێیەکانی موڵکداری زەویوزارو کێڵگەکان لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەم جۆرەن. وابەستەیی بە لادێوە لە رێگەی پەیوەندییە مرۆییەکانەوە بە شێوە و رادەی جۆراوجۆر دەستنیشان دەکرێت: خێزانی، هاوسێتی، وابەستەیی بەکۆمەڵگای لۆکاڵی، چالاکی ئیش و کار، چالاکی تەرفیهی... هتد [١٥٦/ ٥٨-٦٤]. دەتوانین شێوەکانی وابەستەیی بە لادێوە لە چەند گۆشەیەکی وەک، نیشتەجێ بوون، وابەستەیی ئابووری، بەشداری کۆمەڵایەتی و پەیوەستی کولتوورییەوە، تاوتوێ بکەین.

١- **نیشتەجێ بوون.** نیشتەجێ بوون لە لادێدا هەلومەرجێکی تایبەت دێنێتە ئاراوە، چونکە پاک هەمیشە ئامادەیە و لەنێو رووداوەکاندایە. کۆمەڵێک لەو رووەوە نیشتەجێی لادێن کە شوێنی کار یان شوێنی نیشتەجێ بوونیان لە لادێدایە، ئەم جۆرە وابەستەیی تەواوە و تەنانەت کات بەسەربردن و رابواردنیشی بەشێوەیەکی گشتی وابەستەیە بە ژینگەوە. ئەم هەلومەرجە لەو گوندانەدا بەرقەرارە کە هێشتاکە بونیادی نەریتی خۆیان پاراستووە. هەندێکی دیکە لەلادێییەکان لەگەڵ ئەوەی کە ماڵیان لە لادێیە بەردەوام دەچنە شار، چونکە لە شاردا کاردەکەن. لە وڵاتە پیشەسازییەکانداو بەتایبەت ئەو ناوچانەی کە گەشەی شارنشینی تیایاندا زۆر زیادی کردووە، ژمارەیەکی بەرچاوی لادێییەکان لە کارگە و خزمەتگوزارییەکاندا کار دەکەن. هەندێک لەم کۆمەڵانە رۆژانە لە هاتوچۆدان لە نێوان شوێنی کار و شوێنی نیشتەجێ بوونیاندا. ئەم هاتوچۆیە هەندێ جار لە نێوان لادێی وڵاتێک و ناوەندێکی پیشەسازی وڵاتێکی دیکەدا دەبێت (بۆ نموونە لەنێوان ئەڵمان و بەلجیکادا). ئەم کۆمەڵە کەمتر لە ئیشکەرانی دیکەی لادێ ((نیشتەجێ هەمیشەییەکان)) لادێیین. دواجار پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە نیشتەجێ بوونی هەندێک خەڵک لە لادێدا کاتییە، بۆ پشووی هاوین یان پشووی کۆتایی هەفتە و... هتد.

٢- **وابەستەیی ئابووری.** بە چاوپۆشین لە جەوهەری نیشتەجێ بوون لە لادێدا پێگەی ئابووری دەتوانێت پاساودەری وابەستەیی بە لادێ و رادەی سەقامگیری ئەو بێت، ئەنجامدانی چالاکی پیشەیی و دەستخستنی دەرامەتی دەبێتە هۆی ئەوەی کە

تاک کەم تا زۆر جۆرێک لە وابەستەیی بۆ دروست ببێت بەلادێوە.

جوتیار لە بنەڕەتدا پشت دەبەستێت بە سوود وەرگرتن لە خاک و نرخی زەوی لەبەر چاندن یان سوود لێوەرگرتنیەتی وەک لەوەڕگا. هەندێکی دیکە لە نیشتەجێ بووانی لادێ بە سوود وەرگرتنی راستەوخۆ لە زەوی ژیان بەسەر نابەن، بەڵکو سەرچاوەی دەرامەتیان پێشکەشکردنی هەندێک خزمەتگوزارییە بەخەڵکانی لادێ. هەڵبەت کاتێک کە کڕیارەکانی ئەوانیش تەنها جوتیاران بن ئەوا دەرامەتیشیان پشت دەبەستێت بە بارودۆخی کشتوکاڵی. لەڕووی ئابوورییەوە ئەو کۆمەڵە بەتەواوی بە لادێیی دادەنرێن. هەندێکی دیکە لە نیشتەجێ بووانی لادێ کۆمەڵێک چالاکییان هەیە، بەبێ ئەوەی وابەستەییەکی ئەوتۆیان هەبێت بەکشتوکاڵەوە لە نموونەی ئەمانەش دەکرێت ئاماژە بکەین بەکارمەندانی پۆستەو مامۆستایان و فەرمانبەران لە گواستنەوە و گەیاندن.

زۆرێک لەم گرووپە مووچەی خۆیان لە رێگەی رێکخراوە جیاوازەکان لە دانیشتووانە ناوخۆییەکان وەردەگرن. لە وڵاتانی ئەوروپای خۆرئاوادا رووبەڕووی کۆمەڵێکی دیکە لە نیشتەجێ بووانی لادێ دەبینەوە کە هیچ جۆرە چالاکییەکی پیشەییان لەلادێدا نییە. ئەم کۆمەڵانە لەبەر هۆکاری جۆراوجۆر لەم ناوچانەدا نیشتەجێن (خانەنشینی، هەڵاتن لە ژیانی شار). ئەوانە لە هاتوچۆی بەردەوامدان لە نێوان شار و لادێدا و لەڕووی پیشەییەوە بەشێوەیەکی گشتی نامۆن بە لادێ.

یەکێک لە رەهەندە گرنگەکانی وابەستەیی ئابووری شێوەی موڵکداری زەوییە یان بەدەستەواژەیەکی وردتر جۆری سیستمی بەرهەمهێنانە، کە هەڵبەت شێوەی زۆرە. کاتێک کە نموونە گشتییەکانی موڵکداری تاوتوێ بکەین، دەبینین کە دەرەنجامە کۆمەڵایەتی- ئابوورییەکانی لەسەر ئاستی لادێ زۆر سەرنج راکێشن [٢١٥/ ١٦٠-١٦١].

٣- **بەشداری کۆمەڵایەتی**. هەبوونی پەیوەندیگەلێک لە جۆری هاوسێیەتی و بەشداری رێکخراو لە ژیانی کۆمەڵگای خۆجێیدا، بە شێوەیەکی گشتی ئاتاجی نیشتەجێ بوونە لە لادێدا. تێبینی ئەوە دەکرێت کە لە هەندێ حاڵەتدا نیشتەجێ هەمیشەییەکان و تەنانەت کەسانێک کە بنەچەیەکی لادێییان هەیە، رێژەی بەشداریکردنیان لە ژیانی خۆجێیدا کەمە. ئەگەر سەرچاوەی ئاگایی و هۆشیاری کۆمەڵایەتی تاکەکان لە دەرەوەی لادێ بێت و ژیانیان لە رێگەی دەرەوەی کایەی لادێوە دابین بکرێت، پەیوەندییان بەکۆمەڵگای لۆکاڵی و پەیوەندییە

کۆمەڵایەتییەکانی ئەم گرووپەوە تاکو دوا رادە کەمدەبێتەوە، زۆرێک لە خەڵکە شارییە نیشتەجێکان لە لادێدا، کە لادێ بۆ ئەوان تەنها شوێنی نیشتەجێ بوونە ئەم رەوشەیان هەیە. ئەم کۆمەڵە لەلادێدا نیشتەجێن، بەبێ ئەوەی نیشتەجێ بوونیان لایەنێکی کۆمەڵایەتی هەبێت. بەپێچەوانەوە لە هەندێ حاڵەتدا نیشتەجێ کاتییەکانی لادێ بە تایبەت ئەو کەسانەی کە چالاکی ئابوورییان هەیە تێیدا، بەشدارییەکی کۆمەڵایەتی بەرچاویان هەیە.

**بەراوردی هەلومەرجی زەوی وەک بەهایەک**

**لە سیستمە جیاوازەکانی موڵکداریدا** [٢١/١٥٩]

| جۆری موڵکداری | نرخدان بەزەوی | دەرەنجام |
|---|---|---|
| ١- موڵکداری خێلەکی | سوود لێوەرگرتن بەبێ خاوەندارێتی | فرۆشتنی زیادەی بەرهەم |
| ٢- موڵکداری خێزانی (نەریتی) | سود لێوەرگرتن و گوێزرانەوە بۆ نەوەی داهاتوو | پارەی زیادە لە باشکردنی زەویدا خەرج دەکرێت |
| ٣- موڵکداری خێزانیی (میکانیکی) | شیاوی کرین و فرۆشتن وەک هۆیەکی بەرهەمهێنان | پەیوەندی زۆری نێوان کێڵگەو تۆڕی ئابووری. |
| ٤- کێڵگەی گەورە (کۆمپانیاکان) | شیاوی کرین و فرۆشتن وەک یەکەیەکی بەرهەمهێنان | گرنگی بەڕێوەبەران |
| ٥- موڵکداری سۆشیالیستی | لە دەستدانی خاوەندارێتی تایبەت | گرفتی بەڕێوەبەرێتی و وەدیهاتنی هۆکارو پاڵنەر. |

٤- **پەیوەستەیی کولتووریی.** وابەستەیی کولتووریش بە ژینگەی لادێوە مەسەلەیەکی سەرەکییە، واتە رادەی بەکۆمەڵایەتی بوون و کولتوور پەسەندی تاک لە پەیوەندی لەگەڵ لادێدا، بەبێ ئەوەی سەرنجمان دابێتە شوێنی نیشتەجێ بوونی ئێستای. دەتوانین تاکەکان لەو رووەوە لێک جودا بکەینەوە کە قۆناغە سەرەتاییەکانی چوونە نێو ژیانی کۆمەڵایەتییان لەلادێدا بوو (بەکۆمەڵایەتی بوونی

سەرەتا) یان ئەوەی دواتر بەسترابنەوە بە لادێوە (بەکۆمەڵایەتی بوونی دواتر).
دەستەی یەکەم دەزانن بەزمانی ناوچەیی بدوێن، تەنانەت ئەگەر دواتریش زمانێکی دیکە بووبێتە زمانی قسەکردن و نووسینیان. شێوەی سەرەتایی زەینیان لەلادێدا شکڵی گرتووە و لە قۆناغی منداڵیدا لەگەڵ ئاژەڵ و رووەکدا خوویان گرتووە، بەکورتی لە دنیای سروشتدا گەشەیان کردووە. هەڵبەت رادەی کولتوور پەسەندیی سەرەتا وابەستەیە بە رادەی نیشتەجێ بوونی لە لادێدا و بارودۆخی ئەوانەوە. منداڵێک کە لە لادێدا دەچێتە قوتابخانە لەڕووی فیکرییەوە جیاوازە لە منداڵێک کە لە شاردا ئەم قۆناغە دەگوزەرێنێ.

کۆمەڵەی دووەم ئەو کەسانەن کە لە لادێدا پەروەردە نەبوونە و کاتێک هاتوونەتە لادێ کە قۆناغی سەرەتایی دروستبوونی کەسایەتیان لە شوێنێکی دیکەدا گوزەراوە. کولتوور پەسەندیی لادێیی ئەوان بابەتێکی لاوەکییە. لەڕووی کولتوورییەوە ئەم گرووپە لەبەر خووگرتنی دوایی بە لادێیی دادەنرێن. ئەم کولتوور پەسەندییە بەزۆری لە تەمەنێکەوە دەست پێدەکات کە تێیدا پەرچەکردارەکان کەسیی و ئارەزوومەندانەن و بەم پێیە زێتر لە کولتوور پەسەندیی یەکەم چالاکە (کولتوور پەسەندی یەکەم لە بنچینەدا لە قۆناغەکانی منداڵیدا شێوە وەردەگرێت و لە کردەوەدا بێبەرو ناچالاکە). ئەم کۆمەڵە بە گشتی کۆچەرن هەندێک کاری وەک مامۆستایەتی، کارمەندی، مەلایی و... دەکەن.

کاریگەری کولتوور پەسەندی سەرەتا دەتوانێت بە درێژایی تەمەن لەسەر کەسێتی تاک بمێنێتەوە، تەنانەت کاتێکیش کە ماوەیەک بەسەر بەجێهێشتنی ژینگەی لادێدا تێپەڕیبێت (کاریگەری لەسەر شێوەی وەڵامدانەوە، پلاندانان، شێوازی قسەکردن و.. هتد). بەپێی ئەوەی ژینگەی لادێ سەبارەت بەدنیای دەرەوە کراوە یان داخراوبێت، دەتوانرێت رووبەڕووی شێوەی جیاوازی کولتوور پەسەندی ببینەوە، تەنانەت لەنێو نیشتەجێیانی هەمیشەیی لادێییشدا. زەینی ئەو کەسە لادێییەی کە لە وڵاتێکی پێشکەوتوودا بەردەوام رۆژنامە دەخوێنێتەوە و گوێ لە رادیۆ دەگرێت، و تەماشای تەلەفزیۆن دەکات، لە کۆمەڵە چەمک و ئەزموون و بابەتێکەوە خۆراک وەردەگرێت کە لە ژینگەی لادێوە سەرچاوە ناگرێت. کاتێک ئەم کەسە بۆ چوونە قوتابخانەی ئامادەیی یان پیشەییەکان یان بۆ شوێنی کار یاخود بۆ رابواردن (تفریح) (سینەما، سەیرکردنی پێشبڕکێ وەرزشییەکان) دەچێتە شار سەروکار لەگەڵ کۆمەڵێک هۆشیاری و شێوازی دیدەنی و بیرکردنەوە و قسەکردنی

جیاوازکە لەلادێوە سەرچاوە ناگرن، پەیدا دەکات. کەواتە تەنانەت لە نێو کەسانێکدا کە کولتوور پەسەندی سەرەتایان لە ژینگەی لادێدا شێوەی وەرگرتووە، وەرگرتن (احتکاک)ی کولتووریی دەکرێت زۆر جۆراوجۆر بێت.

هەر لەم بوارەدا دەبێت ئەوەش زیاد بکەین کە ژینگەی لادێیی بەشێوەیەکی گشتی تاک کولتوورییە نەک فرە کولتووری، بەرەنگاریش لە رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ کولتوورەکانی دیکەدا بوونی هەیە. کەسێکی لادێیی کە ماوەیەکی کەمە لە لادێدا دەژیت چالاکییەکانی خۆی بەپێی دوو کولتوور رێکدەخات و ئەمە رووبەڕووبووی جۆرە دوالیزمەیەک (ازدواجیە) دەبێتەوە. یەکێک لەم دوو کولتوورە کاتێک بوونی خۆی پیشان دەدات کە لادێیی لە لادێوە دێت بۆ شار (بەهۆی کۆچکردن، ئەنجامدانی کاروباری ئیداری، فرۆشتنی بەروبووم)، هەروەها ئەوی دیکەیان کاتێک کە لادێیی لە شارەوە دەچێت بۆ لادێ (وەرگرتنی بەروبووم، سەردانی خزم و خێزان، فرۆشتنی کێڵگە).

**دژایەتی و جیاوازییەکانی لادێ - شار**

جیاوازیگەلێکی زۆر لە نێوان شارو لادێدا هەیە، یەکەمین و ئاشکراترین جیاوازی پەیوەندیدارە بە لایەنی جوگرافی لادێوە. شار فەزایەکی قەرەباڵغە کە رێژەی چڕی دانیشتووان لە چاو ئەو فەزایەی دەورەی داوە تارادەیەک زۆرە. کۆمەڵگای شاری چالاکی کشتوکاڵی تێدا نییە، باخچە و پارکەکان بە فەزای تەواوکەری ژیانی شار دەژمێردرێن و لە بنەڕەتدا بە لاوەکی دادەنرێن. جیاوازییەکی سەرەکی دیکەی شارو لادێ وابەستەیە بە بونیادی کاری دانیشتووانەوە. هەمە چەشنی کار لە کۆمەڵگای شاریدا دژایەتییەکی ئاشکرای هەیە لەگەڵ سادەیی کار لە لادێدا، بەتایبەت لە قۆناغی رابردوودا بە هۆی زاڵی کشتوکاڵ و دەسەڵاتی ئابووریی خۆژینەر (اکتفاء ذاتی) کۆمەڵگای لادێیی نەیدەتوانی هەمەچەشنییەکی ئابووری ئەوتۆی هەبێت [١٦٤/ ١٧-١٩].

دابەشکردنی کار دەبێتە هۆی ئەوەی کۆمەڵە چالاکییەک لەتەک یەکدا کۆببنەوە و کارە جۆراوجۆرەکان وابەستەییەکی بەرامبەرییان هەبێت پێکەوە. گەشەو بەردەوامی چالاکییە پسپۆڕییەکان وابەستەیە بە بوونی ژمارەیەکی دیاریکراو لە داواکار یان کڕیار. تەنها بەفراوانبوونی دابەشکردنی کارو پەیدابوونی پسپۆڕی جۆراوجۆر بواری چڕی زێتری دانیشتووان دێتە ئاراوە، هەر جۆرە بەپسپۆڕی بوونێکیش نابێتە هۆی

هاتنە ئارای کۆمەڵگایەکی ئاڵۆز یان شارێک. زۆری و هەمەچەشنی پسپۆرییەکان لەم بوارەدا بابەتێکی سەرەکییە. بۆ نموونە لەم ساڵانەی دواییدا لە هەندێک لە وڵاتاندا سیاسەتی کۆنەبوونەوەی پیشەسازی لە جێیەکدا بووەتە هۆی دەرکەوتنی ناوەندی پیشەسازی لە دەرەوەی کۆمەڵگا شارییەکان، بەبێ ئەوەی دروستبوونی کۆمەڵگایەکی تایبەت لە شێوەی شار یان لادێ لە ئارادا بێت.

لەڕووی جوگرافییەوە لەوانەیە لەنێوان شارو لادێدا وابەستەیی بوونی نەبێت، دیاردە سروشتییەکانی وەک جەنگەڵ، بیابان، دەریا، دەریاچە، شاخ و سروشتی دەست لێنەدراو دەکرێت ببنە جیاکەرەوەی لادێ و شار، ئەو ناوچانەی کە بە لادێ دانانرێن.

لادێیی لە پەیوەندییەکی راستەوخۆدایە لەگەڵ سروشتداو سوود لە زەوی و جەنگەڵ وەردەگرێت و کەمتر لە شارییەک بەکاربەر (مستهلک) یان کڕیارە. لادێیی شارەزایی لە هونەرێکدا هەیە کە کەم و زۆر هاوسێکەشی ئاگاداریانە. شارنشینەکان ئەو پەیوەندییە راستەوخۆیەیان لەگەڵ سروشتدا لە دەستداوە و زۆربەیان پێیان وایە کە شار کولتوورێکی باڵاتری هەیە لە کولتووری لادێ.

لە وڵاتانی ئەورووپای خۆرئاوا کە شارە گەورەکان لە ئەنجامی بازرگانی و دواتریش پیشەسازییەوە روویان لە گەشەسەندن کردووە یان هەندێ جار وەدیهاتوون، شارەکان گۆڕاون بۆ ژینگەیەکی هونەری و زانستی، و ریتمی ژیانی کۆمەڵگای پیشەسازی بەسەرجەم خەسڵەتەکانیەوە زاڵ بووە بەسەریاندا.

جوتیارێک تەنانەت ئەوکاتەی کە جۆرەها ئامێری نوێی کشتوکاڵیشی هەبێت هێشتا هەر پێڕەوی لە سیستمی ژیانی لادێیی کە شوێنکەوتەی (تابع) هۆکارە ناوچەییەکانە دەکات. گرنگترین لایەن کە لەم بوارەدا دەکرێت بهێنرێتە پێش چاو دابەشکردنی کاتەکانی کارە بەپێی رۆژو مانگ و ساڵ. کەسێکی شارنشین تاکو رادەیەک رزگاری دەبێت لەم کۆت و بەندانە. لە کۆمەڵگای لادێییدا دیاردەگەلێکی وەک وەرزی چالاک، زستان، وشکەساڵی، کاری زۆرو چڕ لە چەند رۆژێکی دیاریکراوی ساڵداو بێ نەزمی ئاووهەوای ساڵانە زۆر دەبینرێن کە بێگومان کاریگەرییان دەبێت لەسەر پێکهاتەی فیکری و کۆمەڵایەتی کۆمەڵگا. لە بەرامبەریشدا کار لە شاردا، چ لەکارگەدا بێت یان لە بەڕێوەبەرایەتی یان لە دووکان جۆرێک لە نەزمی میکانیکی هەیە [١٦٤/ ١٧-١٩].

لە ئەورووپای خۆرئاوادا تاکو پێش شۆڕشی پیشەسازی؛ شار ژینگەیەکی

پیشەسازی نەبوو بەو مانایەی ئەمڕۆ و شێوەی ژیان زۆر نزیک بوو لە سروشتەوە. ئەمڕۆکە لە وڵاتە پیشەسازیبە پێشکەوتووەکاندا، لادێکان هەمیشە پێشوازیکەری مەدەنیەتی شارەکانن، بەڵام بە کەمێک دواکەوتنەوە (تأخیر) کە ئەم جۆرە دواکەوتنە بەتێپەڕبوونی کات رووی لە کەمبوونە، لەم رووەوە باسی بەشار بوونی لادێکان دێتە ئاراوە. لە ئەورووپای ناوەڕاست خۆرئاوادا لەگەڵ ئەوەی هێشتاکە هەندێ ناوچەی لادێیی لە حاڵەتی دوورەپەرێزی (عـزلة)دان، بەڵام دەتوانین بانگەشەی ئەوەش بکەین کە جیاوازییەکی ئەوتۆ لە نێوان شارو لادێکانی ناوچەیەکدا نییە، چونکە بەردەوام سەرگەرمی ئاڵوگۆڕی کاڵاو خزمەتگوزاری و تیۆرو بیرو بۆچوونن. ئێستاکەش لە وڵاتانی ئەندامی کۆمەڵەی ئابووری ئەورووپادا ئەو بابەتە سەرەکییانەی کە لەسەر ئاستی لادێ باسیان لێدەکرێت بریتین لە: زیادکردنی بەرهەم، بەدواداچوونی بەردەوامی میتۆدەکانی بەرزکردنەوەی ئاستی سوود لێوەرگرتن، گرێبەندییەکانی کۆمەڵەی ئابووری و پرەنسیپەکان رکابەری کردن، قەیرانی ناسنامەی لادێیی لە ئەنجامی گۆڕانکارییە کولتوورییەکان، زاڵبوونی رەفتارە شارییەکان لە لادێدا، یەکسانی دانیشتووان (کەمبوونەوەی منداڵبوون، بەساڵاچوون... هتد) دانیشتووانی لادێیی نەگونجاو، زیادبوونی رێژەی مووچەخۆرو کەمبوونەوەی رێژەی جوتیارانی خاوەن زەوی و زار و.. هتد [٢١٤/ ٣-٤]

لە وڵاتانی پیشەسازی پێشکەوتوودا شێوەی ژیانی جوتیارێک زۆر لە شارییەک دەچێت. بۆ نموونە لە زۆربەی ناوچەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو ئوستورالیادا، ئامێری پیشەسازی لە کێڵگەدا بەکاردەبرێت و جووتیار سوود لەو ئامێرو هۆکارانەی ناو ماڵ وەردەگرێت کە لە ماڵە شارییەکاندا هەن، لەم رووەوە دەتوانین بەراوردی بکەین لەگەڵ شارنشینێکدا، بەڵام هەر لەگەڵ ئەوەی لە پانتایی چێنراو دەربچین، سروشت حاڵەتی سەرەتایی و دەست لێنەدراوی خۆی دەپارێزێت و شارەکان تارادەیەک لێک دوورن.

شارستانییەتی پیشەسازی، «شاری»بەو تەنها زیدبوونی ژمارەی دانیشتووانی شوێنێک ناتوانێت پێوەری سەرەکی بێت، «شارەکان» بارودۆخێکیان هەیە کە روونی سۆسیۆلۆژییەوە جیاوازە. لە ژینگەی شاردا داهێنانی فیکری لە هۆکارە سەرەکییەکانە، لە شاردا هێزی مرۆیی رووبەڕووی بزاوت و گۆڕانکاریی دەبێتەوە، هۆکارەکانی پەیوەندی کردن رێکدەخرێن، زەمینەی ئاڵوگۆڕی بازرگانی و کولتووری دروست دەبێت، کارو پیشەی جۆراوجۆر گەشە دەسەنن و دواجار شار دەبێتە هۆی

زیادبوونی بەروبوومە لادێییەکان. سوود وەرگرتن لە دیکۆمێنت و زانیاری نێو کتێبەکان، کتێبخانەو ئەرشیفەکان لە دوای دروستبوونی یەکەمین شارەکانەوە لە سۆمەرو میسرو چین دەست پێدەکات، بە درێژایی مێژوو هەمیشە شار وەک شوێنێک بووە بۆ ئالوگۆڕی فیکری و ماددی، هەروەها شار ناوەندی سەرەکی گەشەسەندنی داهێنان و نقارە هونەرییەکان و ئایدیۆلۆژی و کولتوورە. لە شاردایە کە هێزە سیاسییەکان دروست دەبن، رای باو ئەوەیە کە لادێ بەردەوام گرفتاری جۆرێک لە دواکەوتنی کولتوورییە، ناوەندی پاراستنی نەریت و بیروباوەڕە کۆنەکانەو لادێیی زیاتر لە شاری پارێزگار.

رێکخراوە کۆمەڵایەتییە جێگیرەکان لە لادێدا کۆمەڵێک تایبەتمەندییان هەیە کە ئەو لەشار جیادەکاتەوە، بۆ نموونە قوتابخانەی لادێ بەزۆری ئەم تایبەتمەندییانەی هەیە:

١- لەڕووی بینا و کەلوپەلەوە لە قوتابخانەی شار ناچێت.

٢- بەزۆری مامۆستاکان خەڵکی لادێ نین و لەوانەیە رەفتاری جیاوازیشیان هەبێت (جلوبەرگ پۆشین، قسەکردن، خۆراک، تەندروستی، رابواردن..هتد).

٣- لە بابەتی وانەکاندا مامۆستایان زۆر جەخت دەکەنە سەر بەها و رێکخراو و کەلوپەل و دروستکراوە پەیوەندیدارەکان بەدنیای دەرەوەی لادێ، هەرچەند کە لەوانەیە لە کتێبەکانیاندا جەختی زێتر کرابێتە سەر مەسەلە پەیوەندیدارەکان بە لادێوە.

٤- لەوانەیە قوتابخانە کۆمەڵە نۆرمێکی جیاواز لە نۆرمە لۆکاڵییەکان بەدیبهێنێت (ئاگادارکردنەوە لە هەندێ رەفتار، گۆڕینی بیرکردنەوە دەربارەی راست و هەڵە، بەجێ و نابەجێ، رێپێدراو و رێ پێنەدراو).

٥- لەوانەیە قوتابخانە تایبەت نەبێت بە خەڵکی لادێیەکی تایبەت و پێشوازی لە منداڵانی لادێکانی دیکەش بکات.

جیاوازی ئاستی بژێویش لە لادێ و شاردا بابەتێکی دیکەیە کە شیاوی گرنگی پێدانە. ئەم دژایەتییە لە رێژەی داهاتدا بە باشی دیارە. لە زۆربەی وڵاتانی دنیادا داهاتی جوتیارێک بەشێوەیەکی مام ناوەندی کەمترە لە زۆربەی ئەوانی دیکە. هەندێ حاڵەت، کە لەم رێسایە بەدەرن تایبەتن بە دانیمارک و هەندێک لە وڵاتانی ئەورووپای باکوور، کە لەم ناوچانەدا جوتیاران داهاتێکی هاوشێوەی داهاتی پیشەوەرانی دیکەیان هەیە، بەڵام پێویستە سەرەنج بدەین کە ئەم گرووپە ساڵانە

کۆمەکێکی بەرچاوی بێ بەرامبەر لە دەوڵەت وەردەگرن.

مێژوو ئەوە پیشاندەدات کە شارەکان هەمیشە ویستوویانە لادێکان وەک جۆرێک لە موستەعمەرەی نێوخۆیی دابنێن و لادێییەکانیش بەخەڵکانێکی بێبەش لە لێهاتوویی فیکری و وردبینی و تاڕادەیەک شیاوی بەزەیی بزانن. لە زۆربەی زمانەکاندا وشە گەلێکی وەک «لادێیی» «دێهاتی» ناوەڕۆکێکی خۆشیان نییە لە زەینی خەڵکی شاردا.

حکوومەتی وڵاتەکان کە بەزۆری ژێدەرێکی شارییان هەیە، گرنگییەکی زیاتریان داوەو دەدەن بەمەسەلەی شارەکان و لادێییەکان تا ڕادەیەک خەڵکانێکی فەرامۆشکراون. لە کۆمەڵگای لادێییدا کە لە رابردوویەکی زووەوە لە وڵاتی ئێمەدا بوونی هەبووە لەڕووی بونیادی پەیوەندی کۆمەڵایەتییەوە سێ کەلێن ( فجوة)ی سەرەکی تێبینی دەکرێن:

١- لەنێوان چینی دەسەڵاتدارانی کۆمەڵگا کە ژمارەیان زۆر کەم بوو و خەڵکی لادێییەکان کە زۆرینەی ئەندامانی کۆمەڵگایان پێکدەهێنا بەزۆری پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتی بەرامبەر بوونی نەبوو. لادێییەکان هیچ رۆڵێکیان نەبوو لە بڕیارە سیاسییەکانداو زیادەی بەروبوومەکانیشیان راستەوخۆ دەخستە بەردەست موڵکدار یان دەستەی دەسەڵاتدارەوە.

٢- جیاوازییەکی تەواو لە نێوان دوو بەشی کۆمەڵگا واتە کەمینەی نیشتەجێ لە شارەکاندا و زۆرینەی نیشتەجێ لەلادێکاندا هەبوو.

٣- کەلێنێک هەبوو لە نێوان کەمینەی خوێندەوارو زۆرینەی نەخوێندەواری کۆمەڵگا.

**پەیوەندییە بەرامبەرەکانی لادێ - شار**

لە لێکۆڵینەوە نوێیەکاندا گرنگی دەدرێت بە پەیوەندییە بەرامبەرەکانی لادێ و شارو لێکۆڵەرانی لادێ پێیان وایە کە لادێ لە شار جیا نییە و نابێت هیچ کام لەم دووانە دیراسە بکرێت بەبێ لەبەرچاوگرتنی ئەو پەیوەندییانەی دەیانبەستێت پێکەوە، بەڵکو پێویستە ئەم دووانە پێکەوە تاوتوێ بکرێن [ ١٦٥/ ٩١-١١٠].

لە توژینەوە سۆسیۆلۆژییە پراکتیکییەکاندا وا دەردەکەوێت کە رادەی جیاوازی کۆمەڵایەتی و ئابووری لادێ و شار پەیوەندیدارە بە ئاستی گەشەی کۆمەڵایەتی وڵات یان ناوچەی تاوتوێ کراوە. ئەمڕۆکە سۆسیۆلۆگەکانی کۆمەڵگای ئەورووپای

خۆرئاوا، کۆمەڵگای لادێیی وەک یەکەیەکی کۆمەڵایەتی تازە بەپیشەسازی بوو کە پێشتر لە قۆناغی تەقلیدی و ناپیشەسازیدا بوو لەبەرچاو دەگرن. لەگەڵ هەموو ئەمەشدا لەنێوان شارو لادێدا، هەرچەندە کە هەمیشە سنوور و مەرزی وردو دیار ئەو دووانە لێک جودا ناکاتەوە، جیاوازی و دژایەتی زێتر دەردەکەوێت لە لێک چوون [١٦٤/ ١٧-١٩].

لەسەر ئاستی وڵاتێک، ئابووری یاخود شارستانییەتە شاری و لادێییەک، پێش ئەوەی دوو جەمسەری دژیەک پێک بهێنن پێویستە بەتەواوکەری یەکتر لە قەڵەم بدرێن. لە زۆربەی مەسەلەکاندا شارەکان بە هاوکاری لادێکان دادەنرێن چونکە دەتوانن فاکتەرێک بن بۆ بێدارکردنەوەی لادێکان و چاوگەی هەندێک گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی بن لە لادێکاندا. هەروەها ناتوانین شارەکان بەجۆرە مشەخۆرێک لە پاڵ لادێکاندا لەقەڵەم بدەین. شارەکان هۆکار و ئامێری زۆر بە شێوەی جۆراوجۆر دەنێرنە لادێکانەوە، و ناوەندی کۆبوونەوەی کۆمەڵە خزمەتگوزارییەکن کە پێویستی بە سیستمێکی ئابوورییە بەشێوەیەکی گشتی. لەکاتێکدا کە لادێیی دابڕا و بە شێوەیەک کە لە وڵاتانی تازە پێگەیشتوودا دەبینرێن گرفتاری جۆرێک لە دووبارە بوونەوە یان نەگۆڕی (ثبوت) دەبن و ئەوەی کە کۆمەڵناسەکان بە «کولتووری نەگۆڕ یان دووبارە بوو» ناوی دەبەن پایەی ژیانی لادێیی پێک دەهێنێت. ئەو لادێیانەی کە دراوسێی شارەکانن بە بەراورد لەگەڵ لادێکانی دیکەدا دەوڵەمەندترن. پێش ئەوەی بتوانین لە بارەی باڵادەستی شارەکانەوە بەسەر لادێکاندا بدوێین پێویستە پەیوەندی بەرامبەری ئەم دووانە پێکەوە تاوتوێ بکەین، چونکە هەردووکیان لە رووبەرێکی دیکەدا کە هەرێمە، چالاکی دەنوێنن. لە وڵاتە پیشەسازییە پێشکەوتووەکاندا کۆچە رۆژانەییەکان لە دیاردە باوەکانی کۆمەڵگای لادێییەو ئەم جۆرە کۆچە هەمیشە حاڵەتی یەک ئاراستەیان نییە، واتە لەلادێوە بۆ شار. لەگەڵ ئەوەشدا، شار زۆرجار وەک ناوەندێکی سەرەکی دابەشکردنی کارو پیشە ناسراوە. هەر لەم جۆرە وڵاتانەدا دیاردەیەکی دیکەی جێگەی سەرەنج دوورکەوتنەوەی شوێنی نیشتەجێ بوونی زۆرێک لە شارییەکانە لە ناوەندی شاری و نیشتەجێ بوونیانە لە ناوچەی نیمچە لادێییدا، لە هەندێ حاڵەتدا لەم رێگەیەوە شارۆچکەو لادێکان دروست دەبن [١٦٦/ ٥١-٥٧]. لە وڵاتانی تازە پێگەیشتوودا زێدەبوونی کۆچی لادێییەکان بۆ شار دەبێتە هۆی پەیدابوونی گەڕەکە کرێکارییەکان و.... و شار گەشەیەکی ناهاوسەنگی دەبێت کە بەڵگەی کاریگەری لادێیە.

لە زۆربەی ناوچەکانی جیهاندا بەها کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگای لادێیی بەهۆی پەیوەندیی بە شارەوە دەکەونە ژێر کاریگەری گۆڕانکارییە زۆر خێراکانەوە، و لەم رووەوە لە هەندێ حاڵەتدا دژایەتی بەهاکان لەم کۆمەڵگانەدا گرفتی دروست کردووە.

**بەراوردی هەندێ لە بەها نەریتییەکانی کۆمەڵگای لادێیی و بەها نوێ و دژەکانی**

| بەها نەریتییەکان | بەها نوێییەکان |
| --- | --- |
| ١- وەفاداری و پشت بەستن بە خێزان | ١- مافەکانی تاکەکەس |
| ٢- موڵکداری زەویوزار وەک بابەتێکی جێگەی رێزگرتن | ٢- زەوی وەک هۆکارێکی بەرهەمهێنان |
| ٣- پارێزگاری | ٣- پێشکەوتن |
| ٤- تەسلیم بوون بەسروشت | ٤- زاڵبوون بەسەر سروشتدا |
| ٥- کات کوشتن | ٥- سوود وەرگرتنی کاریگەر لە کات |
| ٦- جەبرییەت | ٦- پەسەندکردنی ئەگەری گۆڕان و بەرپرسیاریەتی کۆمەڵایەتی |

**کورتەی بەش**

١- کشتوکاڵ نزیکەی دە هەزار ساڵ لەمەوپێش لە ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست دەستی پێکرد.

٢- دامەزرێنەرانی کشتوکاڵ کەسانێک بوون کە خۆراکی خۆیان لە رێگەی راووشکار و کۆکردنەوەی خواردمەنییەوە ئامادە دەکرد.

٣- بە بڕوای مارکس گەشەی بۆرژوازی هۆکارێکی گرنگ بووە لە گۆڕینی لادێکان بۆ ناوەندی شاری.

٤- پەیوەندی لادێییەکان و حکومەت لە ئێراندا بە درێژایی دوو سەدە لەسەر دوو تەوەری سەربازی و باج وەرگرتن بووە.

٥- لەگەڵ ئەوەی لە ئێراندا سیستمی (سەرانە) نەبووە، بەڵام بە درێژایی چەندین

سەدە لادێییەکان وابەستەبوون بە لادێوە.
٦- بۆ جیاکردنەوەی شار لەلادێ لە لێکۆڵینەوەکاندا گرنگی دراوە بەسێ هۆکاری دانیشتووان، جۆری چالاکی، بونیاد و پێکهاتەی کۆمەڵگا.
٧- چالاکییە سەرەکییەکانی جووتیارێک بریتین لە: پەیوەندی لەگەڵ زەویدا، بەڕێوەبردنی کێڵگە، دۆزینەوەی بازاڕ، بەکارهێنانی سوودمەندانەی سەرمایە و، چالاکییە لاوەکییەکان.
٨- «لمتون» بۆ ناسینی لادێ گرنگی دەدات بەدوو هۆکاری بونیاد و پێکهاتەی لادێ.
٩- سەرەکیترین تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگای لادێیی بریتین لە: سنووورداری ڕەهەندە جوگرافییەکان، کەمی چڕی دانیشتووان، گونجانی لادێییەکان (بەتایبەت لەڕووی کارو ڕۆڵە کۆمەڵایەتییەکانەوە)، جێگیری و بەرەنگاربوونەوە لە بەرامبەر گۆڕانەکاندا، گۆشەگیری ڕێژەیی کۆمەڵایەتی و جوگرافی و دواجار پشت بەستنی زێتر بە پێکهاتەی خێزانی و خزمایەتی.
١٠- لادێیی لە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ دایە لەگەڵ سروشت، و سیستمی ژیانی کاریگەرە بە هۆکارە هەرێمیەکان.
١١- ژیانی لادێیی لە فەزایەکی زۆر بەربڵاودایە و لەبەر ئەم هۆیە مەیلی گشتی بەرەو پەراگەندەییە.
١٢- سروشتی لادێ سروشتێکە دروستکراو، کە لە ئەنجامی کاری مرۆییەوە گۆڕانی بەسەر داهاتووە.
١٣- لادێیی، سەبارەت بە دیاردە سروشتییەکان زۆر هەستۆک(حساس)ە.
١٤- لادێیی سەروکاری هەیە لەگەڵ بەخێوکردنی ئاژەڵ و پەلەوەردا، بۆیە کاری ئەو وابەستەی رووەک و گژوگیاکانە، بەرهەمهێنانی بەروبوومی زیندوو پڕ مەترسییە و دواجار کاردانەوەی بەروبوومی زیندوو لە پەیوەندی لەگەڵ ژینگەدا بە تەواوی نە پێشبینی و نە کۆنترۆڵ دەکرێت.
١٥- گرنگترین هۆکارە کاریگەرەکان لە جێگیربوونی یەکە لادێییەکاندا بریتین لە:ئاو، زەوی، سەرچاوە سروشتییەکان، شوێنگەی سروشتی، سیستمی کشتوکاڵی، هۆکاری دیموگرافی، گەشەی تەکنەلۆژی، ڕێگاوبان، ئاسانکاری گشتی و دواجار پێشکەوتنی ناوچەیی و نەتەوەیی.
١٦- «چیتا مبار» کۆمەڵگا لادێییەکان دابەش دەکات بۆ: کێڵگە فراوان و

دووركەوتووەکان، لادێ شێوە راستەهێڵییەکان، لادێ شێوە بازنەییەکان، لادێی چوارڕییان و ناوەندی فرۆشتن و گوندی بچووک.
١٧- لادێکان بەزۆری لە دوو حاڵەتی پەڕاگەندە یان بەکۆمەڵبوو دان.
١٨- شێوە سەرەکییەکانی لادێ لە ئێراندا بریتین لە: پەراگەندە، بەکۆمەڵ بوو، راستەهێڵی و شێوە قەڵایی.
١٩- دەتوانین وابەستەیی تاکەکان بە کۆمەڵگای لادێییەوە لە چەند دیدگایەکی جیاوازی وەک: «نیشتەجێبوون، وابەستەیی ئابووری، بەشداری کۆمەڵایەتی و وابەستەیی کولتوورییەوە تاوتوێ بکەین.
٢٠- لە جۆرە جیاوازەکانی سوود لێوەرگرتندا چەند حاڵەتێکی تایبەت لە نرخدان بە زەوی و دەرەنجامی ئابووری و کۆمەڵایەتی تێبینی دەکرێن.
٢١- پەیوەستی کولتووری بە کۆمەڵگای لادێوە دەشێ حاڵەتی سەرەکی یان لاوەکی هەبێت.
٢٢- گرنگترین حاڵەتەکانی جیاوازی کۆمەڵگای لادێیی لەگەڵ کۆمەڵگای شاردا بریتین لە: جۆری کار، رەهەندەکانی کۆمەڵگا، چڕی دانیشتووان، هەلومەرجی ژینگەیی، جیاوازییە کۆمەڵایەتییەکان، چینایەتی کۆمەڵایەتی، بزاوتی کۆمەڵایەتی و دواجار گونجانی (تکیف) کۆمەڵایەتی.
٢٣- لە کۆمەڵگای لادێیی ئێراندا کەلێنێکی قووڵ هەبوو لە نێوان چینی فەرمانڕەوا و لادێییەکان شاری و لادێیی خوێندەوار و نەخوێندەواراندا.
٢٤- بەتەریبی لەگەڵ گەشەی کۆمەڵایەتی-ئابووری، پەیوەندی نێوان کۆمەڵگا لادێیی و شارییەکان زیاد دەبێت و جیاوازییەکانیان کەمدەبنەوە.
٢٥- بەها نەریتییەکانی کۆمەڵگای لادێیی لەدژایەتی دان لەگەڵ بەها نوێیەکاندا.

**جەوهەری شارنشینی**

لەنێو بیرمەندان و نووسەرانی ئێرانیدا گرنگیدان بە شارو خەسڵەتەکانی پێشینەیەکی دوور و درێژی هەیە. «حەکیم ناسر خەسرۆ» لە ساڵی ٤٤٤ی کۆچیدا، بەم شێوەیە وەسفی شاری ئەسفەهان دەکات: «شارێکە لە دەشتاییدا دامەزراوە. ئاووهەوایەکی خۆشی هەیەو لە هەر شوێنێکدا ئەگەر بیرێک بە قووڵایی دە گەز هەڵبکەنرێت، ئاوێکی سارد و خۆش دێتە دەرەوە. شارەکە شوورەیەکی مەحکەم و قایم و بڵندی هەیە، دەروازە و شوێنی جەنگی تیا دروست کراوە و لە دیوارەکانیدا کونی تیرهاوێشتن (کونە مەتەرێز) دروست کراوە. لەناو شارەکەدا جۆگەی ئاوی رەوان و خانووی چاک و بەرز هەیە، لە نێوەندی شاردا مزگەوتێکی گەورەی رێکوپێک هەیە کە نوێژی هەینی تێدا دەکرێ. دەڵێن شوورەی دەوروبەری شارەکە سێ فەرسەخ و نیوە» [١٦٧/ ١١٧].

سەرەڕای ئەوەی کە چەمکی شار زۆر بەکاردەهێنرێت، بەڵام هێشتا نارۆشنەو دەشێ لە گۆشەنیگای هەریەک لە، یاسایی، سروشتی، کۆمەڵایەتی، سیاسی و ئابوورییەوە پێناسەی جۆراوجۆری هەبێت، هەروەها پێوەرەکانی ناسینی شار لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی دیکە دەگۆڕێن.

«نێوەندی ئاماری ئێران» لە ساڵی ١٩٨٦ دا، بە چاوخشاندنەوە بە پێناسەی پێشوو، شاری بە شوێنێک داناوە کە شارەوانی هەبێت و ئیدی بەم شێوەیە پێوەری ئاماریی خرایە لاوە و پێوەری ئیداریی و سیاسی هەڵبژێردرا، تا پێش ئەو کاتە پێوەری «نێوەندی ئاماری ئێران» بۆ دیاریکردنی شار بوونی بەلایەنی کەمەوە «٥٠٠٠» کەس لە دانیشتووان بوو. لەو وڵاتانەی کە پێوەری جیاکردنەوەی شار لەلادێ بریتییە لە ژمارەیەکی دیاریکراو لە دانیشتووان، ئەم ژمارەیە لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی دی دەگۆڕێت.

نەک تەنها رێکخراوە حکوومییەکانی وڵاتان لە ناساندنی شاردا ناکۆکن، بەڵکو لە نێوان پسپۆڕانیشدا بەهەمان شێوە رێکەوتنێک لەم بوارەدا، بوونی نییە. کۆمەڵناسی ئەمریکی «وێبەر» - (A. weber) وا دەبینێت کە شار بریتییە لە شوێنی نیشتەجێ بوونی بەلایەنی کەمەوە هەزارکەسی پەیوەندیدار بەیەکەوە. بەڵام هەندێک لە لێکۆڵەرانی دیکە پێیان وایە شار هاوواتای کۆمەڵگای پسپۆڕی و نا کشتوکاڵییە. بەبڕوای ئەم گرووپە، جۆری چالاکی ئابووری سەرەکیترین پێوەرە.

کۆمەڵێکی دیکە لە گۆشەنیگای دەروونی و ڕەفتار و دابونەریتی جەمعییەوە پێناسەی شار دەکەن. کۆمەڵناسی ئەمریکی «پارک» پێی وایە کە نابێت شار تەنیا بە شوێنی نیشتەجێ بوونی کۆمەڵێک لە خەڵک، و نێوەندی گرێبەندییەکان دابنرێت، بەڵکو شار لە نەفسیەت، بیروڕا، دابونەریت و بڕوا و هەستگەلێکی تایبەت پێکهاتووە. هەندێک لە کۆمەڵناسان پێوەری ئیداری - حقوقی دەخەنەڕوو، و ئاماژە بە دامودەزگاکانی وەک شارەوانی، حکوومەتی ناوخۆیی و دامەزراوەی لەم بابەتە، دەکەن. [١٦٨/ ١٠-١٩].

لە وڵاتە پیشەسازییەکاندا، جیاکردنەوە یان دژایەتی تەقلیدیی نێوان کۆمەڵگای شار و لادێنشین، یان لەناوچووە یان لە ڕێڕەوی لەناوچووندایە. یەکێک لە گرنگترین تایبەتمەندییەکانی ئەم وڵاتانە لەم سەدەیەدا (سەدەی بیستەم) کەمبوونەوەی ئەو جیاوازییانەیە کە لە شێوازی گشتی ژیانی نێوان شارنشینەکان و لادێ نیشنەکاندا هەبووە. باشبوونی ڕێگاکانی پەیوەندی و هۆکارەکانی گواستنەوەو گەیاندن لە نێوان شارەکان و ناوچەکانی دەوروبەریان، لە گۆشەگیربوونی ناوچە لادێنشینەکانی کەم کردۆتەوە و پەیوەندی کۆمەڵایەتی دانیشتووانی ئەم ناوچانە زیاتر بووە. لەم وڵاتانەدا گەشەکردنی خێرایی نیشتەجێ بوون لە دەوروبەری (ضواحی) شارەکاندا، هۆکارێکی کاریگەربووە بۆ لەناوچوونی جیاوازی نێوان شارو لادێ. ژمارەیەکی بەرچاو لە خەڵکی لە لادێکاندا ژیان بەسەر دەبەن لە کاتێکدا کار و کاسبیان لەناو شارەکاندایە [٥٢/ ١٠٢-١٠٤].

**هێڵی لادێ - شار [١٣/ ١٩٥]**

دەتوانین تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی کۆمەڵگای شارنشین بەم شێوەیە کورت بکەینەوە:

١- فراوانیی رەهەندەکانی کۆمەڵگا،
٢- زیادبوونی رێژەی چڕیی دانشتووان،
٣- نەگونجانی دانیشتووان، بە تایبەتی لەڕووی دابەشکردنی کارو جیاوازی رۆڵەکان (فرەکاری)،
٤- پەیوەندی رەسمی و ناکەسێتی لە نێوان تاکەکاندا لەسەر بنەمای خێزانی ناوکی،
٥- ئامادەیی خەڵک بۆ پەسەندکردن و وەرگرتنی ئەزموونی جۆراوجۆر و نوێ.
٦- عەقلانییەت و رەفتارکردن لەسەر بنچینەی پێوەرە لۆجیکی و بەرژەوەندی خوازەکان.
٧- خۆلادانی زیاتر لە دابونەریتەکان،
٨- توانای فراوانکردنی نوێگەری و خۆڕاگرتنی زیاتر لە بەرامبەر رەفتارە لاسارەکاندا.
٩- پسپۆری لە چالاکییە سەرەکی و رەهەندەکانی وەک سیاسەت، پیشەسازی، رابواردن و کاتکوژی (ترفیە) و شتی دی،

**شار و بازاڕ**

بازاڕ ناوەندیترین دامەزراوەی شارە. شار شوێنێکە خەڵکی تیایدا خۆیان خواردەمەنی خۆیان ئامادە ناکەن، بەڵکو بە بەرهەمهێنانی کالاو خزمەتگوزارییەکانەوە خەریک دەبن و دەیگۆڕنەوە بە خواردەمەنی. کەواتە پێویستە هەر شارێک بازاڕێکی خواردەمەنیی هەبێت تا خەڵکی ناوچە لادێییەکانی دەوروبەر بتوانن خواردەمەنییەکانیان وەک کالایەک بۆ گۆڕینەوە بە کالاکانی ناو شار تێدا بخەنە روو [١٦٩/ ٣-١٠٣-١٠٤].

رۆژهەلاتناسی بەناوبانگی مەجەڕی (هەنگاری) «ڤامبری» لە ساڵی ١٨٦١ی زایینیدا چاوی بە شاری بوخارا کەوتووە، لە یادداشتەکانیدا دەنووسێت: «بەچوونە نێو بازاڕ و بینینی ئاپورەی دانیشتووان، کە رۆحیەتێک دەبەخشێتە ئەو شارە، نەمتوانی بەو دیمەنە سەرەنج راکێشە سەراسیمە نەبم. ئەوەندەی جۆار و جۆری نەژادەکان و رەفتار و جلوبەرگەکان کە لە هەموو شوێنێکدا بەرچاو دەکەوتن

سەرسامییان کردم، جوانی و سەروەتی ئەوێ سەرنجی رانەکێشام. لە رووخساری زۆربەی خەڵکدا سیمای ئێرانی بەرچاو دەکەوت، بەڵام تایبەتمەندییەکانی بەژن و باڵای تەتارییەکان بەهەموویانەوە لە ئۆزبەکەوە بیگرە تا دەگاتە قەرقیزی بەهۆی هەمە جۆرییانەوە بەرچاو دەکەوتن، سەرنجی منیان بەرە و خۆ راکێشا، دوایین جۆریان کە نەژادی تۆرانییەکانە دەشێ بەهۆی شێوازی رۆیشتنیانەوە (کە شێوازێکی گران و گەورەیان هەیە) لە ئێرانییەکان جیابکرێنەوە، ژمارەیەکی زۆری جوولەکەو هندییەکانیش بەرچاو دەکەون. لێرە و لەوێ بە شێوەیەکی نهێنی و سەرپێییانە، تەماشایەکی شتومەکی نێو دوکانەکانم کرد، کاڵای دروست کراوی ئەوروپایی بە رێژەیەکی کەم و کاڵاو کەلوپەلە روسییەکان بەشێوەیەکی زۆر لەوێ دەبینران» [٢١٦/ ٢٢٤].

لەو روانگەوە کە لە دێر زەمانەوە شار نێوەندی سەرەکی بگرە و بەردە (ئاڵوگۆڕی کاڵاو کەلوپەل) بوو، کۆنترین کاروپیشە کە جێگەی سەرەنجی سیاسەتمەداران بووە لایەنی حیسابدارییە، «خواجە نیزامولملیک» لە کتێبی «سیاسەت نامە»دا ئاماژە بەم خاڵانە دەکات کە: «هەروەها لە هەموو شارێکدا پێویستە حسابدارێک هەبێت، تاکو تەرازوو و نرخەکان بەراستی دابنرێت و کڕین و فرۆشتن رێکوپێک بکرێت، بۆ ئەوەی لەوێدا راستی پێشبکەوێت. هەموو ئەو شتانەی کە لە دەوروبەری شارەوە دێن و لە بازاڕدا دەفرۆشرێن، پێویستە چاودێرییەکی تەواو بکرێن، تاکو گزی (غش)و خیانەت نەکرێت و کیلۆکان بەراستی بپێورێن و فەرمان بە چاکە و نەهیکردن لە خراپە بەدیبهێنرێت..» [٢٧/ ٣٥].

کاتێک شار فراوان دەبێت، گرووپ و دەستەی پیشەیی جۆراوجۆریش تیایدا بەدەردەکەون، لێرەشەوە شار رووبەڕووی کێشە دەبێتەوە. بەپێی گێڕانەوەی نووسەری کتێبی (سیستم و سیستمایەتی لە رۆژگاری قاجاردا) ئەو کارسازییانەی (تدابیر) کە لە بارەی نەخشەگەلێکەوە کە بۆ شاری تاران پێشنیازکرابوون، لەتەک یەک دانانی پیشە جیاوازەکان بوو «کاروپیشەی هەر گەرەکێک پێویستە رێکوپێک رێکخرێن، بەپێی دانیشتووان و رادەی ئامادەیی ئەو گەرەکە، پۆلین کرابێت و هەر پۆلێک لە پۆلەکانی دیکە جیاوازبێت، نەک ئەوەی کە نەوت فرۆش و باروت فرۆش و ئاسنگەر و دەرمان فرۆش و توتن فرۆش تێکەڵ بە یەکتر بکرێن و کەسێک تەواوی ئەم کارە پێک ناکۆکانە لە ئەستۆ بگرێت..» [١٧٧/ ٨].

بە زۆری گەشەی ئابووری لەگەڵ گەشەسەندنی شارنشیندا پەیوەندییەکی نزیکی

جگە لە شار لە هیچ شوێنێکی دیکەدا نایەنە ئاراوە.

بۆ سەرهەڵدانی شار چەندین پێویستی جۆراوجۆر قووت دەبنەوە کە لە نێویاندا سێ فاکتەر، گرنگییەکی زیاتریان هەیە کە بریتین لە، بوونی بەرهەم هێنانی خواردەمەنی زیادە، سەقامگیری سیستمی گواستنەوە و گەیاندن، سوود وەرگرتن لە ئاستێکی دیاریکراوی تەکنەلۆژی. ئەم سێ پێویستییە سەرەکییە لەوێوە سەرچاوە دەگرن کە پیشەی سەرەکی شارنشینەکان بەرهەمهێنانی خۆراک نییە، بەڵکو پێویستە بە هۆی تۆڕی گواستنەوەو گەیاندنەوە لە نێوەندی بەرهەمهێنانەوە بگوازرێتەوە بۆ ئەوێ. سەرەڕای ئەمانەش سوود وەرگرتن لە ئاستێکی دیاریکراوی تەکنەلۆژی، فاکتەری سەرەکییە بۆ بەر کەنارکردنی مەسەلە و گرفتە تایبەتەکانی کۆمەڵگای شارنشین. یەکەمین ناوچە گەلێک کە توانیان ئەم هەلومەرجە بەدەست بخەن، دۆڵەکانی لێواری رووبارەکان بوون، یەکەمین شارستانییەتە شارییەکانیش لە لێوار رووبارەکانی وەک «نیل»دا دروست بوون. یەکەمین ئەنجامی پەیدابوونی ئەم شارانە، بەشێوەیەکی گشتی بریتبوون لە [٥٢/ ١٠٢-١٠٤]: فەراهەم کردنی توانای زیاتر لەڕووی دابەشکردنی کار، پەیدابوونی ئەرکگەلێکی ئیداری و سیاسی، بەدیهێنانی بازاڕێک کە تیایدا بازرگانی ئەنجامبدرێ، و سیستمی چینایەتی کۆمەڵایەتی شێوە وەرگرێت.

لەبەشی پێشوودا بینیمان کە بۆ جیاکردنەوەی شار لە لادێ، ئەرک و وەزیفەی هەریەکێکیان رۆڵی سەرەکی دەبینن. لادێ نێوەندی سەرەکی کشتوکاڵە لە کاتێکدا شار تەواوکەری ژیانی لادێیە. بوونی شار باس لەو راستییە دەکات کە دانیشتووانەکەی ژیانی خۆیان لە بەرهەمهێنانی زیادی کشتوکاڵیدا بەسەردەبەن و بەکاری ناکشتوڵییەوە سەرقاڵن. سەرەڕای ئەمەش شار نێوەندی کارو چالاکییە جۆراوجۆرە پیشەییەکانیشە. هەروەها لەکاریگەری و جێ دەستی شارنشینی، فرەیی پسپۆرییەکانە، لەوێوە کە لەشاردا دابەشکردنی کار بەشێوەیەکی زیاد فراوان دەبێت، تەنانەت لەناو خودی یەک شێوەی کاریشدا پسپۆریگەلێک سەرهەڵدەدەن.

**کاریگەرییەکانی شارنشینی**

یەکەمین ئەنجامی فراوانبوونی شار، بەرزبوونەوەی رادەی چڕی دانیشتووانە، شتێکی سروشتییە کە زیادبوونی ئەم چڕییە مەسەلەی لاوەکی تایبەت بهێنێتە پێشەوە، وەک ترافیک، کەمبوونی خواردەمەنی و گرفتە کۆمەڵایەتییەکان، لەوێشەوە کە لە شارەکاندا مەسەلەی کۆچکردن لە ئارادایە، ئیدی گرفتی گەورە کە لەبەردەم ئەم کۆچکەرانەدا قووت دەبێتەوە، هەڵکردنە لەگەڵ ژینگەی نوێدا لەڕووی ئابووریی، کۆمەڵایەتی، کولتووری و دەروونییەوە. یەکێکی دیکە لە تایبەتمەندییەکانی شار زۆری ڕەهەندەکانیەتی. لە لادێیەکدا پانتایی ئەو شوێنەی کە خانووەکانی لێن، (بەتایبەت لەولادێیانەی کە چڕن) بەتەواوەتی سنورداره، لە کاتێکدا ڕەهەندەکانی شار بە بەردەوامی لە حاڵەتی فراوانبووندان. شار، جگە لە ناوچەی سەرەکی خۆیشی هەمیشە لەگەڵ دەوروبەردا لە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆدایە، کەواتە فراوانبوونی شارو بەتایبەتی خێرایی گەشەکردنی، گرفتگەلی جۆراوجۆر دروست دەکات. لە تارانی کۆندا «لە ڕۆژگاری ناسرەددین شای قاجاردا» واتە وەختێک کە شاری تاران شارەوانی و سیستمی شارەوانی نەبوو «ناسرەددین شا» لە میانەی فەرمانێکی «میرزا یوسف موستەوفی ئەلمەمالیک» کەسێک کە سالانێک بوو لە پلەی پێشەوەی ولاتدا بوو ڕاسپێردرا بۆ ڕێکخستنی شاری تاران. لە فەرمانەکەیدا ئاماژە بە باسکردنی کاروباری کۆگاکان، پاک و خاوێنی، نۆژەن کردنەوەی شوێنە رووخاوەکان، دروست کردنی ئاودەستی گشتی، دروستکردنی گۆڕستانی نوێ، هات و چووی عارەبانە و ولاخ، و لە بارەی پاک و خاوێنی ناو شارەوە لە فەرمانەکەدا هاتووە: «هەر خاوەن ماڵێک یان کرێچییەک، پێویستە و فەرزە لە سەری ڕۆژانە بەردەم و چواردەوری ماڵەکەی خۆی گسک بدات و پاکی بکاتەوە و زبڵ و پیسی لەبەرچاودا نەهێڵێ، و ئەگەر ئەو تەلارو مولکانەش، مولکی دیوان بن، ئەوە پێویستە لە حسابی دەولەت پاک بکرێنەوە[ ١٧٢/ ٨].

| پێوەر | کۆمەڵگای شار | کۆمەڵگای لادێ |
| --- | --- | --- |
| شێوەی تێڕوانین | لە ئایندە دەڕوانن | بۆ رابردوو دەڕوانن |
| فاکتەری کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی | یاسا | دابونەریت |
| پەیوەندی تاکەکان | رەسمی و بەگرێبەست | عاتیفی و برادەرانە |
| دابەشکردنی کار | ئاڵۆزو فراوان | سادە و سنووردار |
| توانای بزاوتی چینایەتی | زۆر | سنووردار |
| سیستمی ئابووری | ئاڵۆز | پشت بەستوو بە خۆ |
| تواناکانی رابواردن و کات بەسەربردن | فراوان | سنووردار |
| باڵادەستی خێزان | سنووردار | زۆر |
| سیستمی پەروەردەیی | زیاتر رەسمییە | زیاتر نارەسمییە |

یەکێکی تر لە سیماکانی شار جۆراوجۆری دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکانە. لە شارەکاندا رووبەڕووی جۆرەها دامودەزگای حکوومی و ناحکوومی کە خاوەنی چەندین لایەنی ئیداریی، ئابووریی، سیاسی، کولتووری، ئایینی و رابواردن و کات بەسەربردنن دەبینەوە. هەر یەکێکیشیان بەسەرنج دان لەو رێکخراوەی کە هەیانە سەرقاڵی بەجێهێنانی ئەرکەکانیانن لە کۆمەڵگای شاردا.

لایەنێکی دیکەی ژیانی شار گۆڕانی دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکانە (ئایین، قوتابخانە، خێزان و هی تریش) کە هەر یەکێکیان لەڕووی شێوەوە، واتە دامەزراوە و رووکاری دەرەکی، ئەرک، گرنگی، ئیعتبار، و هەروەاش پەیوەندی لەگەڵ یەکێکی دیکەدا، حاڵەتی تەواو پسپۆری بە خۆوە دەگرن، لە هەندێک حاڵەتدا شارەکان خاوەنی ئەرک یاخود ئەرکگەلی دیاریکراوی خۆیانن، ئەم ئەرکگەلە کاریگەری قووڵیان لەسەر شکڵ و شێوەی باڵەخانە هەیە. گرنگترین ئەو رۆڵانە بریتین لە: ئایینی، ئیداریی، پیشەسازی، سیاسی، عەسکەری و بازرگانی. ئەم فاکتەرە جیاوازانە لە بونیادی هەندێک شاردا کاریگەرن، و هەندێک جار پێکهاتەی ئەم فاکتەرانەش بەشێوەیەکی گشتی دەتوانرێت ئەو گەڕەکانەی کە تایبەتن بەو چالاکییانەی لەسەرەوە باس کران دەست نیشان بکرێن.

## پێشینەی شارنشینی شارە دێرینەکان

لەڕووی مێژووییەوە دیاریکردنی سەرەتایەکی دروست وەک سەرهەڵدانی شارنشینی لە جیهاندا کارێکی دژوارە، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی بەڵگە مێژووییەکان نیشانمان دەدەن کە لەناوچەکانی هیند و چین، ڕۆژهەڵاتی نزیک و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا کۆمەڵگای شارنشینی درەوشاوە دەرکەوتوون.

زۆربەی مێژوونووسان پەیدابوونی ناوکە یەکەمەکانی شارنشینی دەگێڕنەوە بۆ میسری کۆن، و شاری کۆنی «ئەخناتۆن» لەسەدەی ١٤ی پ. ز بەنموونە دەهێننەوە. لە دەوروبەری ٣٤٠٠ ساڵ پ. ز لەگەڵ دامەزراندنی حکوومەتی مەرکەزی لەم وڵاتەدا شاری «مەمفیس» وەک پایتەخت دەست نیشان کرا. لەماوە ٢٨ سەدەی حوکمی فیرعەونەکان لە میسر، شارنشینی لەم وڵاتەدا گەشەیەکی بەرچاوی بەخۆوەبینی [١٧١/ ١٣٩].

دانیشتووانە شارییەکانی ڕۆژهەڵاتی نزیک، یەکەمین نێوەندی پەیدابوونی داهێنانەکان و دروستکردنی گۆڕانکاری لە کولتووری کۆندا بوون. لەم نێوەندەدا هەموو ان شاهێدی بەدیهاتنی گۆڕانە جۆراوجۆرەکان بوون هاوکات لەگەڵ بیروکراسیەت (پۆست، ژمێریاری، سەرژمێری)، ئاییینی (ڕۆژمێری خۆرشیدی، ئەستێرەناسی وەک قۆناغێکی سەرەتای زانست)، قۆناغگەلێکی تەکنەلۆژی (برۆنز و ئاسن) بوون. ئەم پێشکەوتنانە و پێشکەوتنە هاوشێوەکانی لە هیند و چیندا نیشانەی دەروازەیەکە بۆ پەڕینەوە لە کولتووری دەوارنشینی «بەدەوی»یەوە بەرەو ژیارە گەورەکان، و پردێکە لە نێوان پێش مێژوو و مێژوودا. [١٢٨/ ٣٧٠-٣٧١].

بەپێی بەڵگە مێژووییەکان یەکەمین نەتەوە کە نزیکەی پێنج هەزار ساڵ پێش لە دایک بوونی مەسیح، لەناوچەی باشووری میزۆپۆتامیا یان کلدە (عێراقی ئێستا) ژیانی شاریان هێناوەتە ئاراوە «سۆمەرییەکان» بوون و شارەکانی وەک «لاگاش»، «بابل»، «ئوروک» بەدەستی ئەوان دروست کراون. لەم نێوەندە شارییانەدا خەتی بزماری داهێنراو زەمینە یەکەمینەکانی گەشەی زانستە بیرکارییەکان و ئەستێرەناسی بەدیهاتن. لە ئێرانیشدا ژیاری شارنشینی لای عیلامییەکان و سەقامگیربوون لە شاری «شۆش» لە دەوروبەری پێنج هەزار ساڵ پ. ز دەست پێدەکات. شاری شۆش ( لە دەوروبەری دیزفولی ئێستا ) کە دواتر بوو بەسەنتەری عیلام [١٧١/ ١٣٧-١٤٣].

لە بارەی دروستبوونی شاری بابل دەخوێنینەوە [١١٩/ ١٣٥-١٣٦]: «لە نێوان دوو رووباری پاشوور- لە کەناری رووباری فورات، شاری بابل دروست بوو. لە سەرەتادا بابل شوێنێکی بچووکی نیشتەجێ بوون بوو کە لە چەند کووخێکی لە گڵ و کا دروستکراو پێکدەهات. شوێنگەی ناوچەی بابل باش بوو. لە دەوروبەریدا زەویگەلێکی بە پیتی لێ بوو. بابل لە شوێنێکدا بوو کە دیجلە زۆر لە فوراتەوە نزیک دەبووەوە، بازرگانەکان لە بەشی سەرەوەی رووباری دیجلە و فوراتەوە بە بەلەمی گەورە، ئەو کالایانەی کە خەڵکی لە نێوان ئەو دوو رووبارەدا پێویستیان بوو، دەگوازتنەوە بۆ بابل. دوو جادەی گرنگ لە نێوان دوو رووباردا، لە بابلەوە دەردەچوون، لە سەرەتای هەزارەی دووەمی پ. ز شانشینی بەهێزی بابل پێکهات. پایتەختی ئەم شانشینە شاری بابل بوو».

هەمان نووسەر لە بارەی یۆنانی کۆنەوە، لە شوێنێکی دیکەی هەمان کتێبدا دەنووسێت [١٢٠/٧٢]: «لە هەریەک لەو شارانەدا دەوڵەتێکی سەربەخۆ حوکمی دەکرد قەڵەمڕەوی ئەم حکوومەتانە، سەرەڕای ئەوەی بەسەر شارەکاندا بوو، دەوروبەری ئەو شارانەشی دەگرتنەوە، ئەو حکوومەتانە بە «دەوڵەتی شار ناوزەد دەکران».

## گەشەسەندنی شارنشینی

پێشتر بینیمان کە پەیدابوونی شار دەگەڕێتەوە بۆ هەزاران ساڵ لەمەوبەر هەرچەندە فراوانبوونی رەهەندەکانی و زیادبوونی رێژەی دانیشتووانی شارنشین لەسەر ئاستی هەموو دانیشتووانی وڵاتدا، دیاردەیەکی تازەیە کە لەم دوو سەدەیەی کۆتاییدا باسی لێوەکراوە، سەرەڕای گۆڕانەکانی شێوەی شارنشینی لە مێژوودا، لە دوای تێپەڕینی هەزاران ساڵ دانیشتووانی شارەکان هەروا لە رێژەیەکی سنووردادا ماونەتەوە. رۆمانی دێرین لە گەشترین چاخی خۆیدا دانیشتووانێکی کەمتر لە یەک ملیۆنی هەبوو و زۆربەی شارە گەورەکانی دنیا لە سەدەی نۆزدەدا، ژمارەی دانیشتووانیان لە پێنج سەد هەزار کەس کەمتربوون. بەپێی یەکێک لە ئەنجامگیرییەکان، رێژەی ئەو کەسانەی کە تاکو ساڵی ١٨٠٠ی زایینی لە ناوچە شارنشینەکاندا ژیاون نزیکەی ٢٪ بووە [٥٢/ ١٠٢-١٠٤].

لە ماوەی حەفتاو پێنج ساڵدا، واتە لە ساڵی ١٩٠٠-١٩٧٥ ژمارەی ئەو شارانەی کە زیاتر لە یەک ملیۆن دانیشتووی تێدابووە، بوو بە دە ئەوەندە. ئەو

شارانەی کە زیاتر لە پێنج ملیۆن کەسیان تێدابوو بوو بە بیست ئەوەندەی جاران. پێشبینی کراوە کە لە سەرەتاکانی سالّی ۲۰۰۰ زاینیدا بۆ یەکەمجار لە مێژووی مرۆڤایەتیدا ژمارەی شارنشینەکان لە لادێ نشینەکان زیاتر دەبێت.

بە پیاچوونەوە بە ژیارەکانی رابوردوووداو لێکۆڵینەوە لە شارەکانی وەک رۆما، قوستەنتینیە، ئەسکەندەریە، قودس، دیمەشق و بەغداد، دەبینین کە ناوەندە شارییەکان لە ولاّتێکدا، لەوانەش گەورە یا بچووک بەدەگمەن زیاتر لە ۱۰ ٪ی هەموو دانیشتووانی ولاّتەکەی تێدا نیشتەجێ بووە. لە دیارترین تایبەتمەندییەکانی شارە گەورەکان لە ژیارە کۆنەکاندا، فرە جۆری دانیشتووانی بووە لەو شارانەدا. لە نێوان ئەو خەلّکەدا، لە هەلّسوڕێنەرانی کاری حکوومەتەوە بگرە تا ئەو هەژارانەی کە زۆر بەزەحمەت بژێوی ژیانی خۆیانیان بەدەست دەهێنا، بوونیان هەبوو. بە پێچەوانەی زۆربەی شارو شارۆچکەکانی کۆمەلّگای پیشەسازی نوێ، ئەم نێوەندانە بە پلەی یەکەم نێوەندی پیشەسازی نەبوون. لەگەلّ ئەوەدا کە چالاکییە پیشەییەکان (بەمانا فراوانەکەی) لەم شارانەدا باوبوون، کاروباری سیاسی، بازرگانی و ئاینی لە گرنگترین ئەرکەکانی ئەم شارانە بوون.

بە سەرنجدان لەوەی کە ئەم شارانە بە زۆری بە نێوەندی حکوومەت دەژمێردران، زۆرێک لە خەلّکی پابەند بەتاقمی دەسەلاّتداراوە، پێیان باشبووە کە لەو ناوچانەدا بژین. لە ئەنجامدا، دانیشتووانی شار نەک تەنها لێپرسراوانی ولاّت و لەشکرییەکانی لە خۆ گرتووە، بەلّکو خێزان و مالّەکەشیان و ئەو کەسانەی کە پەیوەست بوون بە ئەوانیش لە خۆ دەگرتن. ژمارەی خزمەتکارانی چینی دەولّەمەندو نیمچە دەولّەمەندی نێو شاریش هەمیشە زۆر بوون. چەند کۆمەلّێکی دیکە لە شاردا نیشتەجێ بوون کە پیاوانی ئایینی و بازرگانەکان بوون و چالاکی بازرگانەکان خۆیان بووە هۆی ئەوەی کە خەلّکێکی بەرچاو بەرە و شارەکان رابکێشرێن و بە کاروبارە جۆراوجۆرەکانەوە سەرقالّبن. جگە لەمانەش شار نێوەندی بازار و دووکانەکان بووە، کە بێگومان لە چاو دووکانەکانی ئێستادا زۆر بچووک بوون. پیشەسازییە سەرەتاییەکان لە چوارچێوەی ئەم دووکانانەدا کەوەک کارگەیەک وابوون شێوەیان وەرگرت[ ۵۹/ ۲۷۲-۲۷۸ ].

«نچکینا» لە کتێبی «کورتە مێژووی جیهان»دا قۆناغەکانی گۆڕانی شارە کۆنەکان بۆ شارە گەورەترەکان لە سەدەی یانزەی زاییندا بەم شێوەیە وەسف دەکات: «یەکەمین جۆری بازرگانی کە سەر لەنوێ لە ئەوروپادا دەستی پێکردەوە،

ئاڵوگۆڕکردنی ئەو کاڵا گران بەهایانەبوو کە شایانی گوێزانەوەو هاوردنن لە ناوچە دوورەکانەوە، بە تایبەت ئەو کاڵایانەی لە خۆرهەڵات دروست دەکران، وەک، قوماشی بیزانس، عاج و ئاڵتونی ئاسیای بچووک و هیند، و جۆرەکانی «بۆن»ی عەرەبستان بوو، بەڵام بازرگانەکان کە لە نزیکی پیشەوەرانەوە نیشتەجێ بوون و وردە وردە دەستیاندایە فرۆشتنی ئەو کاڵایانەی کە پیشەوەران بەرهەمیان دەهێنان و بەم جۆرە توانایان بەخشییە پیشەوەران، کە کاڵاکانیان بگەیەننە ئەوبەری سنووری وڵاتەکەیان. بەم شێوەیە شارە نوێیەکانی ئەوروپا بوونە نێوەندی بازرگانی و پیشەسازی. لە سەرەتادا ئەم شارانە شتێک نەبوون جگە لە گوندێکی گەورە کە دانیشتووانەکەی سەرگەرمی کاری کشتوکاڵی و ئاڵوگۆڕکردن بوون و هەر یەکێکیان بۆ خۆی لەوەڕگا و، زەوی کشتوکاڵی، دارستان، سەرچاوەی ئاو (رووبار یا دەریاچە)ی هەبوو، بەڵام پیشەسازی، رۆژ بە رۆژ بەشێکی زۆری کات و هەوڵ و تەقەلاکانی کرێکارانی شاری بۆ لای خۆی رادەکێشا» [٣٣/ ٢١٤-٢١٥].

بەپێی گێڕانەوە مێژووییەکان بۆمان دەردەکەوێت کە «یەکەمین ئەو شارانەی کە دوای ئیسلام دروست بوون، ئەو سەربازگانە بوون کە لەسەرەتادا بۆ جێگیربوونی جەنگاوەرە موسڵمانەکان و کۆچەرییەکان دروست کرابوون. کوفە و بەسرە لەو جۆرە شارانە بوون کە لەدەیەی دووەمی کۆچیدا دروست بوون. لەم دوو شارەدا سەرەتا خانووەکان لە قامیش و زەل دروست کران و هەر هۆزێک لە شوێنێکدا نیشتەجێ بوو. پاش ماوەیەک لەم دوو شارەدا ئاگرێک کەوتەوە و ژمارەیەک لە خانووەکان ئاگریان تێبەربوو و لەناوچوون. لەوکاتەوە مۆڵەتیان لە خەلیفە عومەر خواست کە خانووەکانیان لە خشت و گڵ دروست بکەن، عومەر مۆڵەتی پێدان خانوو لە خشت دروست بکەن بە مەرجێک کە هیچ خانوویەک لە سێ ژوور زیاتر نەبێت و زۆریش بەرزنەکرێنەوە. موسڵمانان لە پاش وەرگرتنی مۆڵەتی بونیادنانی شار دەستیان کرد بە بیناکردن، یەکەمین تەلارێک کە لە هەریەک لەم دوو شارەدا دروست کرا مزگەوت بوو» [١٧٣/ ٨٨-٨٩]. لەم نموونەیەدا شێوەیەک لە پیادەکردنی پرەنسیپەکانی دروست کردنی شارمان بەرچاو دەکەوێت.

هەندێ شار، سەرەڕای نەبوونی هیچ جۆرە زەمینەیەکی پێشتری شار. بەهۆی بڕیارگەلێکی سیاسی و ئیداریی بەرە بەرە پەیدا دەبن و گەشە دەکەن. مێژوونووسان لەوەسفی تارانی کۆندا گوتوویانە: «چونکە تارانی بچووک لە سەر رێی شاری «رەی» بووە، هەرجارێک لەم رێگەیەدا کاروانچییەکان بڕۆیشتنایە، ئەم لادێیە

«تاران» نێوەندی رووتکردنەوە و رێگری بووە و ئەو چەتە و رێگرانە لەم لادێیەدا دەژیان، زۆرجار ئەو قافلەو کاروانیانەی لەنزیک تارانەوە هاتوچۆیان دەکرد، دەکەوتنە بەر هەڕەشەی ئەوانەوە... بە مەبەستی خۆپاراستن لە شاردا ژێر زەمین و کونە مەتەرێز و خەندەقیان دروست کرد بوو، بۆ ئەوەی کە وەختێک هێرشی دوژمنان دەستی پێکرد،لەم شوێنانەدا خۆیان حەشاربدەن» [١٧٤/ ٢٢٨]. بۆ پاراستنی شار لە رۆژگاری دێریندا، پێویست بوو لە دەوروبەری هەندێ شاردا قوللە، بورج و شورا دروستبکردایە تا حەسار و خەندەقی شارەکان لە ناوچەکانی دەوروبەر جیابکاتەوە. لە تارانیشدا بە چاولێکەریی لە شاری پاریس لە ساڵی ١٢٨٤ی کۆچی مانگیدا بە فەرمانی «ناسرەددین شای قاجار» بورج و شوورەی دێرینی تاران دروست کرا، لەسەر ئەم بنچینەیە تاران بەهۆی دوازدە دەروازەوە لە دەوروبەر جیادەکرایەوە. ئەم دەروازانە تا ساڵی ١٩٣٠ هەر مابوون و بەناوەکانی: دەروازە، شەمیران، خۆراسان، دەوڵەت،یوسف ئاباد، باغی شا، قەزوین، گومرک، خانی ئاباد، غار، حەزرەتی عەبدولعەزیم، دولاب، دوشان تەپەوە ناونرابوون.

کۆمەڵناسانی وەک «ماکس ڤێبەر»، «ویتفۆ گل» (Wittfogel) و «پیرن» (Pirenne) بەشێوەیەکی گشتی جۆرەکانی شار بۆ دوو شێوە دابەشدەکەن و ئەم دابەشکردنەش لە چوارچێوەی چەند چەمکێکی دووانەییەوە، بەڵام بە زاراوەی جۆراوجۆر دەردەبڕین کە بریتین لە رۆژهەڵات و رۆژئاوایی، بازرگانی و ئیداری، بورجوازی و تەقلیدی جۆری یەکەمی ئەم پۆلینانە، بە بۆچوونی ئەوان ناسێنەری ئەو شارانەن کە خاوەنی دوو ماهیەتی، ئابووری پێشکەوتوو و دەزگا دیموکراتییەکانی وڵاتانی ئەوروپای خۆرئاوان. لە جۆری دووەم، تەنانەت لە حاڵەتی هەلومەرجی یاریدەدەری وەک «چین»، شارەکان ئەو دوو سیفەتەی جۆری یەکەمیان نییە،بەشێوەیەکی گشتی لەم حاڵەتەدا پێویستە ئەوەش بڵێین کە هەر چەندە جیاوازیگەلێکی بەرچاو لەرووی سیاسی و کولتووری نێوان هەندێ لە شارەکانی ئەوروپاییەکان و شارەکانی خۆرهەڵات (کە زیاتر نێوەندی ئیداری بوون) هەبووە، بەڵام لە چەند لایەنێکی دیکەوە شارەکان لەم کۆمەڵگایانەدا تا رادەیەک هەلومەرجی لێکچوویان هەبووە [١٢٨/ ٣٧٠-٣٧١].

دەتوانین بەو ئەنجامە بگەین کە گرنگترین هۆکاری گەشەسەندنی شارە نوێیەکان بریتین لە[٢١٧/ ٢٠-٢٢]: شۆڕشی پیشەسازی، چالاکی بازرگانی، گۆڕانکاری لە هەلومەرجی کشتوکاڵیدا (جۆری چالاکییەکان و تەکنەلۆژیای

کشتوکاڵی)، زیادبوونی هۆکارەکانی گواستنەوە و گەیاندن و گەشەسەندنی پەیوەندییەکان، هۆکارە سیاسییەکان (پایتەختەکان، سەنتەری شارەکان، ویلایەتەکان)، و گەشەکردنی دەزگا پەروەردەییەکان، زیادبوونی ڕێژەی دانیشتووان، ئارامی و هەستکردن بە سەقامگیری، ئاسانکارییەکانی شارو چانسی سەرگەرمی و کات ڕابواردن و...

**بونیادی ژینگەیی کۆمەڵگای شاریی**

هەوڵێکی زۆر لەلایەن ژینگەناسان و جوگرافیزانانی بواری پۆلینکاری و ڕوونکردنەوەی تایبەتمەندییەکانی ناوچە جۆربەجۆرەکانی ناو شارێک و کاریگەری هۆکارە سروشتی- کۆمەڵایەتییەکان لەسەر بونیادی شارەکان خراوەتەگەڕ. ئەم هەوڵانە لەسەر ئەو گریمانەیەوە دراوە کە شێوەی سوود وەرگرتن لە زەوییەکان لەناوچە جیاوازەکانی شارێکدا جیاوازن. بۆ نموونە لە ناوچەیەکی پەراوێزدا، پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی دانیشتووان زۆر فراوانن، لە نێوانیاندا تارادەیەک پەیوەندییەکی دڵسۆزانە هەیەو هاووڵاتییانی ئەو شوێنە تا ڕادەیەکی باش حاڵەتێکی هاوشێوەیان هەیە. لە کاتێکدا کە لە ناوچەیەکی دیکەدا ئەو سیفەتانەی سەرەوە بە پێچەوانەوەیە. تەنانەت ناوی هەندێ لە شەقامەکانی شاریش لە هەندێک حاڵەتدا ئیلهامیان لە هەلومەرجی گرووپە کۆمەڵایەتییەکان یان پیشەی دانیشتووانی سەر شەقامە ناوبراوەکان وەرگرتووە، بۆ نموونە تارانی کۆن خاوەنی گوزەرو کوچەی وەک بازاڕ، عودلاجان، سنگلج، حەسەن ئاباد، چاڵە مەیدان، گود زەنبورک خانە (چاڵی هەنگدانەکە). گۆڕەپانی جۆراوجۆری وەک ئەمین سوڵتان، بەهارستان، سەرقەبری ئاغا، ماڵ فرۆشەکان، کافرۆشەکان و گومرگ. هەر یەکێکیشیان ئەنجامدەری ڕۆڵێکی کۆمەڵایەتی و ئابووری تایبەت بوو. کەمن ئەو شارانەی کە پێکهاتەی کۆمەڵایەتی خۆیان لە بەکارهێنانی فەزا شارییەکاندا تاماوەیەکی زۆر بەشێوەیەکی جێگیر بپارێزن، و بەزۆری لە ماوەی یەک یا چەند «دەیە»یەکدا چەندین گۆڕانکاری لە کاروباری کۆمەڵایەتی ناوچە شارنشینە جیاوازەکاندا ڕوو دەدەن [١٦٨/ ١٠- ١٩].

بەراوردی بەشێک لە تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگای شاری لە هەلومەرجی پێش پیشەسازی و پیشەسازیدا. [٨/ ٢٨٩].

## جیاوازییەکان

| شاری پێش پیشەسازی | شاری پیشەسازی |
| --- | --- |
| - بچووک، ژمارەی دانیشتووانی لە ١٠-١٠٠ هەزارکەس | - گەورە، ژمارەی دانیشتووانی لە ١٠٠-٨٠٠ هەزار کەس |
| - سەربەخۆ لە لایەنی سیاسییەوە | - پاشکۆی وڵات |
| - بوونی خێزانی گەورەو فراوان | - بوونی خێزانی ناووکی و بچووک |
| - پەروەردەو فێرکردن تایبەت بە چینی خۆشگوزەرانە | - پەروەردەو فێرکردن بۆ هەموو کەسە. |
| - یەکێتی ئایینی | - فرە ئایینی |
| - بوونی دەروازە لە دەوروبەری شاردا، سنووورداری ناوچەکانی دەوروبەری | - فراوانی رەهەندەکانی شار، دەوروبەرێکی فراوان |
| - کاروباری تەندروستی: لابردنی پاشەرۆی مرۆیی و ئاژەڵی | - کاروباری تەندروستی: لابردنی پاشەرۆی پیشەسازی، پیسبوونی هەوا. |

## وێکچوونەکان

- گەشەکردنی جیاوازییە چینایەتییەکان.
- گۆشەگیربوونی کەمینەکان.
- حوکمدان بەپێی ژینگە و چالاکییە ئابوورییەکان.
- نەگونجان: فرەیی پیشەو مرۆڤەکان.
- رابواردن و کات بەسەربردنی دەستە جەمعی.
- گەشەکردنی ژیانی فیکری، هونەرو زانستەکان.

بۆ لێدوان لە هەلومەرجی گشتی ژینگەیی، پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە گرنگترین پرۆسەکانی ژینگەناسی کە شارێک لە میانەی قۆناغەکانی گەشەی خۆیدا

رووبەڕوویان دەبێتەوە بریتین لە: [٥٢/ ١٠٣-١٠٤]
١- پرۆسەی حەزکردن لە جیابوونەوە، کە بەردەوام لە نێوەندە گەورەکانی شاردا لە حاڵەتی بەرێوەچووندایە. خاوەن چالاکییە جۆربەجۆرەکان، یاخوە ئەندامانی گرووپە نەتەوەیی، نەژادی، ئایینی یا چینە کۆمەڵایەتییەکان، هەریەکێکیان ئارەزووی ئەوە دەکەن شوێنێکی تایبەتی بۆ نیشتەجێ بوون هەڵبژێرن.
٢- پرۆسەی بەسەنتەربوون، کە بەسەنتەربوونی شوێنی (محلي) چالاکییە تایبەتی وەک بازرگانی و رابواردن (تفريح) و لەم بابەتانە پیشان دەدات هەڵبەتە لە هەندێ باردا فاکتەرەکانی وەک گەشەی زیادی دانیشتووان، زیادبوونی رێژەی دانیشتووانی دەوروبەر، یان زیادبوونێکی زۆری نرخی زەوی کە دەشێ بزاوتێکی پێچەوانە بهێننە ئاراوە، کە لەم حاڵەتەدا پێویستە ئەوە بە ناسەنتەربوون ناودێر بکرێت.
لە بواری بونیادی ژینگەیی کۆمەڵگای شاریدا تیۆری بەناوبانگ هەیە، لێرەدا ئاماژە بەگرنگترینیان دەکەین [١٦٩/ ١٠٤]. تیۆری «بازنەی تاک ناوەند» (Concentric zone) لە ساڵی ١٩٢٥ لەلایەن «برجس» (E. W Burgess) کۆمەڵناسی ئەمریکییەوە خرایەڕوو. بەپێی ئەم تیۆرە شارەکان خاوەن چەند ناوچەیەکن کە لە نێوەندی شارەوە بەرەو کەنارو دەوروبەر (ضواحي) فراوان دەبێت و بریتین لە: ناوچەی بازرگانی، بازرگانی و رابواردن (تفريح)، ناوچەی گواستنەوەیی (انتقالي) (کە پێکهاتووە لەگەڕەکی هەژار نشینەکان، نێوەندە نیشتەنییە کۆنەکان و کارگەی بچووک)، ناوچەی چینە هەژارەکان و دەوروبەری شار کە شوێنی نیشتەجێبوونی خەڵکی خۆشگوزەرانە.
«تیۆری کەرتی» (Sector theory) لە ساڵی ١٩٣٩ لەلایەن کۆمەڵناسی ئەمریکی «هۆمر هویت» (H. Hoyt) خرایەڕوو. دوو خاڵی گرنگی ئەم تیۆرە نرخە جیاوازەکانی زەوی و گەشەکردنی شارە. ئەم کەرتانە بەدرێژایی شارێگە رێبوارییە جۆراوجۆرەکان دروست دەبن، تاکو ئەوەی کە لە ئەنجامی پەیوەندی بە یەکترەوە کەرتی سەر رێگا دوورودرێژە سەرەکییەکانی هاتوچۆ پێک بهێنن. لە هەمان کاتدا ئەو ناوچانەی دەکەونە نێوان ئەم رێگە سەرەکییانەوە، ناتوانن لە سنوورێکی دیاریکراو زیاتر فراوان بن.
تیۆری «چنسی هریس» (G. D. Harris) دەربارەی ژینگەی شار (تیۆری چەند ناوکی)، لەسەر ئەو بنەمایە کە شار، کۆمەڵە نێوەندێک یا ناوکێکە، کە

هەریەکەیان پەیوەستە بەوەزیفەیەکی تایبەتەوە. هەریەک لەم نێوەندانە لە سەرەتای ژیانی شاردا پێکدێن و هەوڵدەدەن بەتێپەڕینی کات بەردەوامی بە ژیانی خۆیان بدەن. بەشێک لەو فاکتەرانەی کە لە وەزیفەو سەقامگیربوونی ئەم ناوکانەدا بەشدارن بریتین لە: پێویستبوونی خەڵک بە بەشێک لە شێوەکانی ئاسانکاری، شێوەی زەوی، دواجاریش نرخ و بەهای زەوی.

پێویستە بزانین کە هیچ کام لەم تیۆرانە بەتەواوی دروست یا نادروست نییە، بەڵکو هەریەکێکیان لە لایەنێکی تایبەت لە دابەشکردنی شوێن لە پانتایی شار دەڕوانێت، لەم روانگەیەوە دەشێ بۆ شارێکی دیاریکراو، تیۆرێک گونجاوتر بێت لە تیۆرەکانی دی. لەهەر توێژینەوەیەکی ژینگەناسیدا پێدەچێ هەموو ئەم گۆشەنیگایانە بەکار بهێنرێن [١٧٦/ ١٧-٣٠]، بەڵام لە نێوان ئەم تیۆرانەدا توخمگەلێکی هاوبەش هەیە، کە بریتین لە: بوونی ناوچەیەکی دیاریکراو بۆ کاروباری بازرگانی و کڕین و فرۆشتن، ئاماژەیەکی ئاشکرا بە ناوچە هەژارنشینەکان، و تەواوی ئەم تیۆرانە لەسەر ئەو گریمانەیە تەبان کە نرخی جۆراوجۆری زەوی رۆڵێکی گرنگی لە دیاریکردنی وەزیفەی ناوچە دەست نیشانکراوەکانی ناو شاردا هەیە.

لەکاتێکدا کە شارە گەورەکان فراوانتر دەبن ئەوا ناوچەکانی دەوروبەریشیان (بەتایبەت لادێکان) لەڕووی بونیادی ئابووری، پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان دابونەریت، و بەها کۆمەڵایەتییەکان گۆڕانکارییان بەسەردا دێت، لە هەندێ باردا پێدەچێ لە ماوەیەکی دووورودرێژدا، تەنانەت گەر ئەم لادێیانە لە نێو نێوەندە شارستانییەکان نغرۆ نەبن و مۆرکی لادێیانەی خۆیان لە دەست بدەن و یاخود بۆ نێوەند گەلێک کە شوێنی نیشتەجێ بوون کرێکاران و کارمەندانی کەناری شارەکان بگۆڕێن (وەک هەندێ لە لادێکانی دەوروبەری تاران).

«تیۆری چەند ناوکی»

ناوچە:
١- نێوەندی ئیداری و بازرگانی.
٢- ناوچەی پیشەسازی سووک
٣- شوێنی نیشتەجێ بوونی چینی نزم «هەژار»
٤- شوێنی نیشتەجێ بوونی چینی مام ناوەند.
٥- شوێنی نیشتەجێ بوونی چینی باڵا «دەوڵەمەند».
٦- ناوچەی پیشەسازی قورس.
٧- ناوچەی بازرگانی دوورە دەست.
٨- «دەوروبەری نیشتەجێیی.
٩- دەوروبەری پیشەسازی.
١٠- کەنارنشینانی خاوەن کار لە شاردا.

تیۆری «بازنەی تاک ناوەند»

«تیۆری کەرتی»

## شۆڕشی پیشەسازی

لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەمی زایینی بەدواوە، مێژوونووسانی ئابووری زاراوەی (شۆڕشی پیشەسازی)یان بۆ ئەو گۆڕانکارییە مەزنە تەکنیکی و ئابوورییە بەکارهێنا کە لە ماوەی ساڵانی ١٧٦٠ تا ١٨٣٠دا لە ئینگلتەرا روویدا. بە تێڕوانینی ئەوان، بەمیکانیکی بوونی پیشەسازیی رستن و چنین و پێشکەوتنەکانی، فراوانبوونی پیشەسازیی ئاسن، بەکارخستنی مەکینەی هەڵمی،

سەقامگیری سیستمی کارگەیی، و پێشکەوتنەکانی دیکە، ئابووری ئینگلتەرای رووبەڕووی شۆڕش کردووە، سیستمی لە بنچینەدا کشتوکاڵیی نیوەی سەدەی هەژدەهەم لە سەدەی نۆزدەیەمدا گۆڕا بۆ سیستمی پیشەسازی [١٧٨/ ١٣١-١٣٤].

لەگەڵ ئەوەدا کە بەهۆی شۆڕشی پیشەسازییەوە گۆڕان لە کارگەکاندا زۆر بەرچاو بوو، لە هەمان کاتدا گۆڕانکاریی لە کانگا، گواستنەوەو گەیاندن، و کشتوکاڵیشدا گرنگی خۆی هەبوو. لە هەلومەرجێکدا کە چەمک و مانای مەکینەی نوێ و پرۆسەی تەکنۆلۆژی لای هەمووان جێگەی سەرسوڕمان بوو، کاریگەریی ئەمانەش خۆبەخۆ شۆڕشێک بوو، چونکە گۆڕانکارییەکی یەکجار زۆری لە پێکهاتەی کۆمەڵایەتیدا هێنایە ئاراوە. ئەوەی کە چەند جارێک لە دروستکردنی ئامێرو مەکینەی کارگەکان گرنگتربوو، سیستمی کارگەکان بوو کە بەڕێوەبەرانی یەکەی پیشەسازیی و کرێکارانی شاری لە دوو چینی کۆمەڵایەتیدا دادەنا. لە ئەنجامی ئەو گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەی لە شۆڕشی پیشەسازییەوە سەریهەڵدا، وردە وردە شار هەموو تایبەتمەندییە دیمۆگرافییەکانی خۆی لەدەستدا. بزاوتە گەورەکانی هێزی کار بەرەو شارەکان - لەگەڵ ئەوەدا کە سەرەتا لە ئینگلتەرادا بەهۆی بوونی هەندێ بەربەستی یاساییەوە دواکەوت - رەهەندگەلێکی زیاتر لە جاران فرەوانی وەرگرتن. زیادبوونی ژمارەی دانیشتووانی نێوەندە شارییەکان کە لەسەرەتای چەرخی نوێدا تاڕادەیەک هێواش بوو، خێراییەکی زۆری بەخۆوە بینی [١٢٨/ ٣٠٤].

بەتێڕوانین لە ئەوەی کە ناتوانرێت کۆتاییەکی دیاریکراو بۆ شۆڕشی پیشەسازی وێنابکرێت و وادابنرێت کە ساڵی ١٨٣٠ ساڵی کۆتایی شۆڕشەکەیە، هەندێ لە کۆمەڵناسانی هاوچەرخ هەوڵیانداوە قۆناغبەندییەکی بۆ بکەن، هەر لە سەرەتای دەسپێکردنیەوە تاکو تێپەڕبوونی هەموو قۆناغە تایبەتەکانی ئەم شۆڕشە، ئێمە بە لێکۆڵینەوە لەم تێڕوانینە، تایبەتمەندییە هەمەکییەکانی (کلی) هەر قۆناغێک بەکورتی ئاماژە پێدەدەین:

لە قۆناغی یەکەمدا واتە لە نیوەی سەدەی هەژدەهەمەوە، کاتێک کە ئینگلتەرا کۆمەڵگایەکی تەواو کشتوکاڵی بوو. شۆڕشی پیشەسازی لە رستن و چنین و ئاسن و پیشەسازی هەڵمییەوە دەست پێدەکات. داهێنانی یەکەمین مەکینەی هەڵمین لەم قۆناغەدا، پێدەچێ گرنگترین نوێکاری و داهێنان بووبێت قۆناغی دووەم لە دەیەکانی ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەوە دەست پێدەکات و بەتایبەتمەندییەکانی وەک

گەشەکردنی خێرای پیشەسازی ڕێگای ئاسن، داهێنانی تەکنیکەکان بەرهەمهێنانی فراوانی پۆڵا، پەیدابوونی بەلەمی ماتۆڕی، و بەکارهێنانی تەکنۆلۆژیا لە کشتوکاڵدا دەناسرێتەوە. قۆناغی سێیەم لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەمەوە دەست پێدەکات و خەسڵەتە ڕەسەنەکانی بریتین لە گەشەی بەدەستهاتوو لە بواری ئۆتمبیل، پیشەسازی، کارەبا، تەلەفۆن و پیشەسازی نەوت. قۆناغی چوارەم کە هاوکاتە لەگەڵ جەنگی دووەمی جیهانی، قۆناغی گەشەیەکی بەرچاوە لە بواری دروستکردنی فڕۆکە، پیشەسازی ئەلەمنیۆم، ئەلیکترۆنیک و پیشەسازی پلاستیک. ئەمڕۆ ئێمە لە سەرو بەندی قۆناغی پێنجەمی شۆڕشی پیشەسازیداین، کە تایبەتمەندییەکانی بریتین لە: سوود وەرگرتن لە وزەی ناوکیی، دروستکردنی سەتەلایتەکان (مانگی دەستکرد)، کۆمپیوتەر، ئۆتۆماتیکی بوونی (تەواو یان نیمچە تەواو) زۆربەی پیشەسازییەکان.

بەپێی ئەم وەسفە، ئاساییە کە دەبێت شۆڕشی پیشەسازی وەک گشتێکی هەمەکی لەبەرچاو بگیرێت، بەجۆرێک ڕەهەندی جیهانی هەیەو بەکۆمەڵگایەکی تایبەتەوە پەیوەست نییە. لەبەرچاوگرتنی ئەم قۆناغانەش مانای ئەوە نییە کە دەبێت هەموو کۆمەڵگایەک بەناچاری هەموو ئەم قۆناغانەی تێپەڕاندبێت، بەپێچەوانەوە، وادەردەکەوێت کە هەندێک لە تازە هاتووەکان بۆناو دنیای پیشەسازی هەندێ لەو قۆناغانە یاخود لانی کەم بەشێکیان بەجێ هێشتبێت و چووبێتە قۆناغێکی دیکەوە، یاخود لە حاڵەتی تێپەڕاندندا بن. وڵاتێک کە هەنووکە لە حاڵی پێشکەوتندابێت، مومکینە لە یەک کاتدا دەست بۆ چەندین چالاکی دانانی ڕێگای ئاسنین، دروستکردنی شاڕێگەو دانانی هێڵی ئاسمانی - کە هەریەک بە قۆناغێکی جیاوازی شۆڕشی پیشەسازییەوە پەیوەستە - ببات[٥٩/ ٣١٢-٣٢٦].

لە قۆناغە یەکەمەکانی شۆڕشی پیشەسازییدا، زۆرێک لە بونیادەکانی ژیانی کشتوکاڵی بەبێ گۆڕان مانەوە، بەڵام ئەمڕۆ لەو کۆمەڵگایانەدا کە لە قۆناغی چوارەمی شۆڕشی پیشەسازییدان (کە ئاماژەیان پێکرا) سیستمی کۆن تاڕادەیەکی زۆر لەناوچووە. یەکێک لە گرنگترین نیشانەکانی، گۆڕانی سەرچاوەی وزەیە. بەپێی نەریت لە کۆمەڵگا کۆنەکاندا مرۆڤ و ئاژەڵەکان بە سەرچاوە سەرەکییەکانی وزە دەژمێردران. کاروبارێکی وەک بزواندن، دەرهێنان، بەرزکردنەوە، بڕینەوەو هەڵکەندن بەسوود وەرگرتن لە هێزی ماسوولکەیی مرۆڤ و ئاژەڵان ئەنجام دەدران.

هەڵبەت دواتر ئاو (سوود وەرگرتن لە ڕەوڕەوەی ئاوی (ناعوور) و با بەلەمی چارۆکەدارو ئاشی ئاو) جێگەی هێزی ماسوولکەیان گرتەوە، لەگەڵ شۆڕشی پیشەسازی نەک تەنها سەرچاوەی وزە گۆڕان. بەڵکو چەندێتی وزەی بەرهەمهێنانیش بە ڕێژەیەکی زۆر خەیاڵی زیادی کرد.

**پێکهاتەی کۆمەڵایەتی - ئابووریی کۆمەڵگای پیشەسازیی**

«شارنشینی بەرهەمهێنان» لە خەسڵەتە دیارەکانی کۆمەڵگای پیشەسازییە. لە کۆمەڵگا پێش پیشەسازییەکاندا، چالاکییە بەرهەمهێنەکان لەناوچە لادێ نشینەکاندا چڕ بووبوونەوە. لەم قۆناغەدا کشتوکاڵ چالاکیی سەرەکی بوو، جوتیاران بەشی گەورەی هێزی کاریان پێکدەهێنا. لەم حاڵەتەدا دانیشتووانی شار ژمارەیان کەمبوو، زۆربەشیان پێگەیەکی کارکردنی بەرچاویان نەبوو. سەرەڕای ئەوەش ژمارەیەکی زۆری خەڵک بە بەرهەمهێنانی چەندین کاڵای ناپێویست لە بواری جوانکاری (ئیشی دەستی هونەری)و کار گوزارییەکان بۆ پێویستی چینە باڵاکان (کە ژمارەشیان کەم بوو) خەریک بوون. شۆڕشی پیشەسازی هەموو ئەم ڕەهەندانەی گۆڕین. هەر لە سەرەتاوە تەکنۆلۆژیای نوێ لەشاردا سەقامگیربوو. ئەو مەکینەو ئامێرانەی کە لە قۆناغی یەکەمی شۆڕشی پیشەسازییدا داهێنرابوون، سوودمەندبوون و کارگەکان ژمارەیەکی بەرچاوی دانیشتووانیان لە دەوری خۆیان کۆکردەوە. هەڵبەت لە هەمان کاتدا کە پیشەسازیی نوێ پێویستی هێزی کار لە شارەکاندا زیاد دەکات، پێشکەوتنە بە دەستهاتووەکانی بواری کشتوکاڵی بەرە بەرە پێویستی بە کرێکارانی لادێیی کەم کردەوە. بەم شێوەیە تاکو کەمێک پێش کۆتایی هاتنی سەدەی هەژدەهەم، کۆچکردنێکی فراوان دەست پێدەکات. ئەمڕۆ لە کۆمەڵگا پیشەسازییە پێشکەوتووەکاندا، دابەشکردنی تەقلیدییانەی دانیشتووان لە نێوان شارو لادێ لەسەر ئاستی وڵاتێکدا بەتەواوی حاڵەتێکی پێچەوانەی بەخۆوەگرتووە [٥٩/ ٣٦٩-٣٧١].

لە ئابوورییەکی تەقلیدیدا، وەڵامدانەوەی مەسەلەی بەرهەمهێنان و دابەشکردن (چ شتێک، بەچ ئەندازەیەک، و بۆ چ کەسێک بەرهەم بهێنرێت) لە ڕێگەی گەڕانەوە بۆ ئەرکە ڕابردووەکان پراکتیزە دەبێ، بەڵام کاتێک ئابووری دێتە «قۆناغی بازاڕ»وە بڕیارە بنەڕەتییەکانی ئابووریی لە ڕێگەی پرۆسەی پەیوەندی بەرامبەری ئاڵۆزیی هێزەکانی داواکاری و خستنەڕوو، کە ڕەنگدەرەوەی بیرو باوەڕو بەهاکانی

هەموو ئەندامەکانی دامەزراوەکانی کۆمەڵگایە، لە پەیوەندیی بەسەروەتیشیانەوە وەردەگیرێن. دواجار لە روانگەی ئابوورییەوە چەند مەرجێک پێویستە بۆ بەدیهاتنی کۆمەڵگایەکی پیشەسازیی. گرنگترین مەرجەکانیش ئەمانەن: سەقامگیریی و بەرقەراریی دەزگاکانی بەرهەمهێنان بەشێوەیەکی فراوان، بوونی بازاڕێکی پارەو ئیعتیباریی، بوونی تۆڕێکی کارامەی گواستنەوەو گەیاندن و تایبەتمەندییەکان، سەقامگیریی لایەنی کەمی رێژەی پێویستی شارنشینی لەسەر ئاستی هەموو کۆمەڵگا، سەرهەڵدانی دامەزراوەو بەهایە کۆمەڵایەتییە پێویستەکان بۆ بەپیشەسازیی بوون و بوونی سیستمی ئاڵوگۆڕی پشت ئەستوور بە بازاڕی کەرتی گشتی کاڵاو خزمەتگوزارییەکان، و دواجار پەیدابوونی چەمکی قازانج، کرێ و مافی کار[١٨٦/ ٩-١٠].

ئابووریی لە کۆمەڵگای پیشەسازیدا ئابووری بەرهەمهێنانە، لە تایبەتمەندییەکانیشی سوود وەرگرتنی زۆرە لە کاری مرۆیی و لە رێگەی بەکارهێنانی مەکینە، کارەبا، ئەلیکترۆنیک و وزەی ناوکییەوە کامڵ دەبێت.

ئەم شێوەیەی ئابووری پێویستی بەفراوانبوونی بەردەوام هەیە، واتە خستنە بازاڕی بەرهەمهاتووی نوێ و دروستکردنی بازاڕی نوێیە. بەپێچەوانەی ئابووریی بژێوییەوە، ئابووری بەرهەمهێنان هەمیشە لە حاڵەتی دینامیکییەتی بەردەوامیدایەو لە زۆر باردا وەستان جگە لە شکستهێنان مانایەکی نییە. بەم مانایە ئابووریی کۆمەڵگای پیشەسازیی بەپێی پێویست چەندین رەهەندی فراوانی هەیە، خاوەنی ماهیەتی نێو نەتەوەییە، لەسەر تۆڕێک مامەڵەی فراوان راوەستاوە کە لە بنەڕەتدا پارەو ئیعتیبار لە خزمەتی خۆیدا دادەنێت، لە حاڵێکدا کە کۆمەڵگایەکی نا پیشەسازی هەمیشە لە رووبەڕووبوونەوە دایە لەگەڵ هەڕەشەی وشکەساڵی و بێبەرهەمی، کۆمەڵگای پیشەسازیی لەترسێکی بەردەوامی زێدە بەرهەمیدایە. لەم حاڵەتەدا زۆرجار تاکە رێگە، فراوانکردنی بازاڕو (بازاڕی ناوەوەو دەرەوە) دواجار کەمکردنەوەی سەعاتی کاری هەفتانەو ساڵانەی مرۆڤەکانە. بەهۆی کەمکردنەوەیەکی بەرچاوی سەعاتی کار لە زۆربەی وڵاتە پیشەسازییەکاندا، کۆمەڵگا بەخێرایی بەرەو رووی (ژیاری دەستبەتاڵی) دەڕوات[١٧٩/ ١٠٧]. ژیارێک کە تایبەتمەندییەکانی بەکەمکردنەوەی سەعاتی کار، کەمکردنەوەی تەمەنی خانەنشینبوون، و وەدیهاتنی شێوازی جۆراوجۆری گوزەراندنی کاتی دەستبەتاڵی ناودێرکراوە.

**بەکارهێنانی سەرچاوە جیاوازەکانی وزە لە وڵاتە پیشەسازییەکاندا**

**لە ماوەی ساڵانەکانی ١٨٥٠ - ١٩٥٠[١٩٦/٧٨]**

١- دار
٢- رەژووی بەرد
٣- رەژوو
٤- نەوت ٥- گازی سروشتی ٦- ئاو
٧- با
٨- کاری ئاژەڵ
٩- کاری مرۆڤ

بەسەرنجدان لە مانەی سەرەوە، کە زیاتر دەرهەق بەرەهەندەکانی ئابووریی کۆمەڵگای پیشەسازی بوون، هەروەها لەبەرچاوگرتنی کاریگەرییەکانی ئەم فاکتەرانەو هەموو دامەزراوە کۆمەڵایەتییە کاریگەرەکان، دەتوانین جیاوازیی و دژایەتییەکانی نێوان کۆمەڵگای پیشەسازی و ناپیشەسازی لە تابلۆیەکدا بەراورد بکەین [١٦٩/ ١٠٣-١٠٤].

## بەشێک لە جیاوازی و دژایەتییەکانی کۆمەڵگا پیشەسازیی و نا پیشەسازییەکان

| کۆمەڵگای پیشەسازی | کۆمەڵگای ناپیشەسازی |
|---|---|
| - تەکنۆلۆژیا لە حاڵەتێکی سەرەتاییدایە | - تەکنۆلۆژیا پێشکەوتووە |
| - سنووداریی ڕەهەندەکانی کۆمەڵگا | - فراوانی ڕەهەندەکانی کۆمەڵگا |
| - سنووڕداریی دابەشکردنی کار | - سیستمی ئاڵۆزی دابەشکردنی کار |
| - ڕۆڵی گرنگی گرووپەکانی خزمایەتی | - سنووداریی ڕۆڵی گرووپەکانی خزمایەتی |
| - نەخوێندەواریی و کەمی خوێندەواری | - فراوانی ئاستی خوێندەواریی |
| - بەکارهێنانی سنووڕداری هۆکارەکانی پەیوەندی | - باڵادەستی هۆیەکانی پەیوەندی دەستەجەمی لە کۆمەڵگادا |
| - باڵادەستیی نەریتە زارەکیەکان | - باڵادەستی نەریتە نووسراوەکان (کتێب، کاسێت، فیلم) |
| - بەرزیی ڕێژەی لادێنشین | - بەرزیی ڕێژەی شارنشین |
| - پشتبەستن بەخودی کۆمەڵگا (بەشێوەیەکی ڕێژەیی یان تەواوەتی) | - وابەستەیی دوولایەنە لەگەڵ گرووپەکانی دیکەدا |
| - فرەیی کولتوورە لۆکالییەکان، بەڵام نەک لە نێو یەک کولتووردا | - فرەیی وردە کولتوورەکان بەڵام لەنێو یەک کولتووردا |

کۆمەڵناسی ئەمریکی «وێرس» (Wirth) بە پشتبەستن بە لێکۆڵینەوەکانی خۆی لە شارەکانی ئەمریکادا کۆمەڵگای شارنشین لەرووی فراوانی، چڕی دانیشتووان، و وێکنەچوون بەخاوەنی تایبەتمەندییە تایبەتییەکانی دەزانێت، بەبیرو بۆچوونی ئەو، ئەم خەسڵەتانە دەبنە هۆی دروست بوونی شێوەیەکی تایبەت لە پەیوەندیی کۆمەڵایەتی. لەسەر ئەم بنەمایەوە پەیوەندی نێوان تاکەکان پەیوەندییەکی ڕەسمیی تێپەڕ و سەر پێییە. شارنشینان لەگەڵ زۆربەی ئەو کەسانەی کە پەیوەندییان پێوە دەکەن، پاڵنەرێکی سوود خوازییان هەیە (من دەتوانم چ کارێک بۆ تۆ ئەنجام بدەم - تۆ دەتوانیت چ کارێک بۆ من ئەنجام بدەیت؟) وێرس دەریدەخات کە شارنشینان لە هەوڵی سوود وەرگرتن دان لە خەڵکی دیکەو شار ئەم جۆرە چالاکییانە بەهێز دەکات. پەیوەندیی شارنشینان رووکەش و ناسکن بەم هۆیەشەوەیە کە لە شارەکاندا نەخۆشی دەروونی، خۆکوشتن، تاوان، فەساد، و جۆرەکانی لێکهەڵوەشانی کۆمەڵایەتی زۆرترە تاکو لە لادێکاندا [ ١٨٠/ ٤٧٤].

بەکارهێنانی رووکارە جۆراوجۆرەکانی تەکنۆلۆژیای نوێ، دیاردەی جۆراوجۆری لە

بەرامبەر کۆمەڵناساندا قووتکردۆتەوە، بۆ ئەوانەش هەلی تازەی بۆ لێکۆڵینەوە هێناوەتە ئاراوە. بۆ نموونە بەکارهێنانی کۆمپیوتەر بەشێوەیەکی زیاتر لە جاران لە کۆمەڵگای هاوچەرخ و کاریگەریی کۆمەڵایەتی، ئابووری و کولتووری کۆمپیوتەر، چەندین بابەتی تایبەتی لەڕووی کۆمەڵناسییەوە خولقاندووەو بۆتە هۆی ئەوەی کە رۆڵی کۆمپیوتەر لەڕووی: گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکان، شێوازی پەیوەندی، دیدگاو درککردنەکان، ڕێکخستنی کار، سیستمی پەروەردەیی، بونیادی سیاسی، سیستمی ئابووری و هەندێ رەهەندی دیکەش بخەنە بەر باس و لێکۆڵینەوە.

لەم رووەوە پەیوەندی نێوان بەپیشەسازیبوون و شارنشینی، پەیوەندییەکی ئاڵۆزە، کە ناتوانرێت لە نێوان رادەی شارنشینی و گەشەکردنی پیشەسازیدا، ئاستێکی گونجاو دیاربکرێت بەشێوەیەک کە هەردووکیان بەیەک شێوە گەشە بکەن. لە دنیای هاوچەرخدا، بەتایبەت لەو وڵاتانەی کە لەحاڵی گەشەکردندان بەزۆری گەشەی شارنشینی لە پێش گەشەی پیشەسازییەوە بووە، هەڵبەت بەدەر لەو حاڵەتانەی کە شاری نوێ بۆ وەدیهێنانی پیشەسازی تواندنەوەی ئاسن و پاشکۆکانی یا دامەزراوەی هاوشێوەی ئەوان بەرهەم هاتوون (وەک شاری پۆڵا لە ئەسفەهان).

لەم باسەدا پێویستە ئەوە بزانین کە بەشێکی تایبەتی کۆمەڵناسی کە کۆمەڵناسی پیشەسازییە، بەدرێژایی چەند دەیەی دوایی، گەشەیەکی بەرچاوی کردووەو کاروبارێکی وەک: دیاردەی بەپیشەسازیبوون و ئەو تەنگ و چەڵەمانەی لێیەوە سەریان هەڵداوە، پەیوەندی مرۆڤ بە ئامێرەوە، پەیوەندی ئامێرەکان بەهێزی مرۆیی و کۆمەڵگاوە، کێشەو گرفتی کرێکاران، و مەسەلەی کارگەکان دەخاتە بەر باس و لێکۆڵینەوە.

لە میانی ناسین و جیاوازییەکانی نێوان کۆمەڵگا پیشەسازییەکان و نا پیشەسازییەکاندا، جۆرج فریدمان (G. Fried mann) کۆمەک لە هەردوو زاراوەی ژینگەی پیشەسازیی و ژینگەی تەکنیکی وەردەگرێت، ژینگەی سروشتی، ژینگەیەکە تیایدا مرۆڤ لە پەیوەندیەکی راستەوخۆو نزیکدایە لەگەڵ سروشتداو خۆی لەگەڵ پێویستی و سنووردارییەکانی ژینگەی سروشتیدا هەماهەنگ دەکات. لە بەرامبەریشدا لە ژینگەی هونەرییدا، لە نێوان مرۆڤ و سروشتدا تۆڕێک لە مەکینە، تەکنیکی ئاڵۆز، زانیارییەکان، شتگەلی دروستکراو و دواجار ئەو توخمانەی گۆڕانیان بەسەرداهاتووە پەیوەندی دروست دەکات. چیدی مرۆڤ لە

حاڵەتی وابەستەییدا نییە لەگەڵ سروشتدا، بەڵکو بەپێی پێویستییەکان، و حەزەکان و مەیلەکان سروشت فۆرمەلە دەکات. بەدەربڕینێکی وردتر، مرۆڤ سوود لە سروشت وەردەگرێت و بەسەریدا زاڵ دەبێت، بەپێی ئامانجەکانی خۆی سوودی لێوەر دەگرێت، بەدەربڕینی «فریدمان» ژینگەی تەکنیکی، «ژینگەیەکی نوێ»یە، چونکە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا دیاردەیەکی نوێیە. ئەم ژینگەیە دەرەنجامی شۆڕشی پیشەسازییە. واتە پەڕینەوە لە قۆناغی ئامێرەوە بۆ مەکینە، لەکاری دەستییەوە بۆ کاری میکانیکی. لەراستیدا ژینگەی تەکنیکی تایبەتمەندییەکی کۆمەڵگای نوێیە بەڵکو لە هەمان کاتدا هۆکارو بەدیهێنەری کۆمەڵگای نوێشە [ ١٨١/ ٢٠٣-٢٠٦ ].

**کۆمەڵگای پاش پیشەسازی**

چەمکی کۆمەڵگای پاش پیشەسازی لەلایەن ئابووریناسان و کۆمەڵناسانی هاوچەرخ، بەتایبەتی «جۆن کانت گالبرایت» (G. K.Galbraith)ی ئەمریکی و «ئالان تۆرین» (A. Tourain)ی فەرەنسییەوە، بۆ دەستنیشانکردنی قۆناغێک کە کۆمەڵگا گەشەکردووەکانی هەنوکە پێیگەیشتوون، بەکارهێنراوە.

لەم کۆمەڵگایانەدا ناتوانرێت هەلومەرجی ئابووریی گەشەکردن لە هەندێ فاکتەری دیکەی وەک لێکۆڵینەوەکانی زانستی و تەکنیکی، پەروەردە، بەرهەمهێنان و گواستنەوەی زانیارییەکان لە بوارە جۆراوجۆرەکان و... کە وابەستەییەکی نزیکی بە هێزەکانی بەرهەمهێنانەوە هەیە، جودا بکرێنەوە.

ئەم کۆمەڵگایانە چ ئەوانەی پشت ئەستوورن بە سەرمایەداریی یان سۆسیالیزم، لە رێگەی توانای زیاتریی بەرنامەرێژی گۆڕانکارییەکان، کۆنترۆڵی سیستمی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، و کاریگەریی دانان لەسەر پێویستیی و مەیلەکان دەستنیشان دەکرێن. ئەم کۆمەڵگایانە لە ژێر هەژموونی رێکخراوە سیاسی و ئابوورییە گەورەکاندان، کە دەخوازن بەشدارییەک لەسەر بنەمای لایەنگیری کۆمەڵایەتی و کولتووریی دیاریکراو لەلایەن هێزە باڵا دەستەکانەوە، لەتاکەکاندا بەدیبهێنن. وێنەکانی دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی گۆڕاون. سنورداریێتی بەکاربردن جێگەی خۆی بۆ زیادبوونی بەرهەمهێنان چۆڵ کردووە. کاریگەریی کەناڵەکانی گەیەنەرە نێوەندییەکانی هۆکارەکانی پەیوەندییە دەستە جەمعییەکان لەسەر پەروەردەو

پێگەیاندنی منداڵان و گەنجان زیاتره لەکاریگەریی خێزان و تەنانەت قوتابخانەش. کۆنترۆڵکردنی پەیوەندییەکان توانایی داوه بەدەسەڵاته سیاسییەکان کە له کۆمەڵگادا کاریگەربن[ ٤٠/ ١٦٢-١٦٣].

بەبۆچوونی «ئالان تۆرین» کۆمەڵگای پاش پیشەسازیی زیاتر وەدیهێنەری نامۆبوونه تاکو سەرمایەگوزاری. مرۆڤی نامۆ کەسێکه بیروهۆشی، بەبەردەوامی دەستکاری دەکرێت و له سیستمێکی گۆڕاودایه که خۆی کۆنترۆڵی ناکات. تەنانەت ئەگەر ئەو کەسه له مەسرەفێکی روو له زیاد بوونیشدا بەشداربێت و له هەندێ ئیمتیازاتی کۆمەڵایەتیش بەهرەمەندبێت. بەهۆی ئەم نامۆبوونەوه، دژایەتییەکی نوێ دێته پێشەوه که زیاتر خەسڵەتی کۆمەڵایەتی و کولتووریی به خۆوه دەگرێت تا ئابووریی. له نێو گەنجان و هەموو ئەو گرووپانەی که ئامادەی قەبوڵکەری گۆڕانن، خوازیاریی دابڕانی کولتووریی و دەستێوەردان له مافی بڕیاردانی تاکەکان دەخرێتەروو، کە دەتوانرێت بەدابڕانی بەشداریکردنی تاک له بەرهەمهێنان، و بەشداریی هاوکات لەگەڵ وابەستەییدا ئەنجام بدرێت. لەم بارودۆخەدایه که زانکۆ وەک نێوەندێکی ناڕەزایی سەبارەت به ڕێکخراوه سیاسیی و ئابوورییەکان دەردەکەوێت. قوتابیانی زانکۆ، لێکۆڵەران، و مامۆستایانی کەمتەمەن که لێهاتوویی زانستی و هونەرییان هەیه، وەک رەواج پێدەری پێشهات و رووداوەکان شۆڕشگێڕانەتر له جاران دەردەکەون، بەپێچەوانەوه چینی کرێکار چیتر هۆکاری کۆمەڵایەتی هێنده چالاک نین و بەهەمان شێوه چیدی تواناکانی سەرکار بەتاکه توخمی سیستمی دەسەڵات ناژمێردرێن. پێویسته ئەوەش بڵێین که ئەم چەمکه (چەمکی کۆمەڵگای پاش پیشەسازی) لەم ساڵانەی دواییدا کەوته بەر رەخنەی توندی رابەرانی ڕێکخراوه سیاسیی و سەندیکاکانی بزاڤە کرێکارییەکان. ئەم گرووپانه چەمکی کۆمەڵگای پاش پیشەسازیی رەتدەکەنەوەو پێیان وایه که چینی کرێکار لەرووداوه کۆمەڵایەتییەکانی وڵاته پیشەسازییەکاندا وەک هێزێکی ڕێنومایکەر دەمێنێتەوه[ ٤٠/ ١٦٢-١٦٣].

**کۆمەڵگای ئەلیکترۆنی**

هەرچەنده زاراوەی «کۆمەڵگای ئەلیکترۆنی» هێشتا له نووسراوه کۆمەڵناسییەکاندا هێنده بەکارهێنانێکی چەمکیانەی وەرنەگرتووه، بەڵام پەیدابوونی شێوازی نوێی پەیوەندییەکان له چوارچێوەی ئامێره تایبەتەکاندا، لەناو

تۆڕە گەورەکانی زانیارییدا وەک «ئینتەرنێت» هەروەک: خۆشەویستیکردن، کۆنفرانس، مونازەرەی ئەلیکترۆنی و... بۆتە هۆی ئەوەی کە لە فەزای ئەلیکترۆنیدا جۆرێک لە کۆمەڵگای مەجازی وەدیبێن. لەم کۆمەڵگایانەدا ڕێسای چوونە نێو ژیان لە حاڵی شکڵگرتندایە. بەم پێیە دەتوانین بگەینە ئەو ئەنجامەی کە ئێستا چەندین فەزای کۆمەڵایەتی نوێ پەیدابووەو ئەم فەزایانەش پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان دەخەنە ژێر کاریگەرییەوە. شاڕێگەکانی زانیارییەکان لەرووی کۆمەڵایەتی، کولتووریی و ئابوورییەوە چەندین فەزای دیاریکراو بۆ مرۆڤەکان وەدیدەهێنن، فەزاگەلێک بەشێوازو توخمی تازەوە، فەزاگەلێک بەبێ سنووری جوگرافیی و سیاسی و دواجار ئەم هەلومەرجە شێوەیەک لە مرۆڤی لە هەموو جێیەک ئامادە دەداتە دەست. ئەم شاڕێگایانە کاریگەریی دەخەنە سەر ئابووری، پەروەردە، پەیوەندییەکان، سیاسەت، کات بەسەربردن و رابواردن، خۆشگوزەرانی و... ئاگاییەکان، تێڕوانینەکان و رەفتارەکانی مرۆڤ لەسەرتاسەری گۆی زەویدا دەخەنە ژێر کاریگەرییەوە، ئەم مرۆڤانە بەبێ رۆیشتنە دەرەوە لە ماڵەکانی خۆیان، دەتوانن گەشتێکی مەجازی بەجیهاندا بکەن، و لەم گەشتەدا دەتوانن دەربارەی کارەکان، لێکۆڵینەوەکان، و بیروباوەڕەکانی خۆیان پرس و ڕا بەخەڵکانی دیکە بکەن. زیاد لەوەش لە رێگەی ئەم کەناڵەوە دەتوانرێت چەندین هاوڕێی نەدیو پەیدابکرێن، پرۆسەی بانکی ئەنجام بدرێت، ئاگاداریی نرخی سەهمەکان بێت، دەتوانی بۆ دەزگاکان چەندین کاری جۆراوجۆر ئەنجام بدەی، بکڕی و.. دەزانین کە تەجهیزی کۆمپیوتەر بەمۆدێم (modem) بۆتە هۆی ئەوەی کۆمپیوتەر لە حاڵەتی کەسیی دەربچێت و بچێتە ناو بازنەی پەیوەندییە دەستە جەمعییەکانەوەو چەمکی نوێی «گرووپی ئەلیکترۆنی» لە کۆمەڵگای نوێدا ببێتە واقیع.

تەمەنی مەکینەی میکانیکی نووسین(چاپ) لە جیهانی پیشەسازیدا نزیکەی سەدەیەک، و مەکینەی نووسینە ئەلیکترۆنییەکانیش نزیکەی پەنجا ساڵ چالاک بوو. لە ساڵانی ١٩٨٥ بەدواوە وردە وردە کۆمپیوتەر جێگەی ئەم جۆرە مەکینانەی گرتەوە، بەڵام تاکو سەرەتاکانی ١٩٩٠یش هەر نووسین لەسەر کاغەز شێوەی سەرەکی نووسین بوو. پێویستە چاپکەرە نوێیەکانی وەک مەرەکەب (Ihkjet)و لێزەر (lazer)یش لە هەمان خانەدا دابنرێن. ئەو گۆڕانکارییە تەکنۆلۆژیانەی کە لە دەیەی ١٩٩٠ بەدواوە لە جیهاندا روویانداوە تەنانەت بەرهەمهێنانی کەرەستەی چاپی تەقلیدی وەک بڵاوکراوە، کتێب و هەموو چاپکراوەکانی دیکەشی خستوونەتە

ژێر تیشک و رۆشناییەوە، وردە وردە لە پلەی یەکەمدا ناسینی تەواوەتی کۆمەڵگا نوێیەکانی بۆ پەیوەندی نووسراو گۆڕیی و بەشێوەیەکی هێدی و بەرە بەرە لاپەڕەی کۆمپیوتەر(لای کەم لە چەند بوارێکدا) جێگەی چاپکردنی تەقلیدی گرتەوە. لاپەڕەیەک کە توانایی گۆڕانکاریی تێدایە [ ٢٢١/ ٩]. ئەمڕۆ نووسینی ئەلیکترۆنی بوارێکی فراوان دەگرێتەوەو پرۆسەی «بەکۆمپیوتەریبوون» بەرە بەرە هەموو قۆناغەکانی بەرهەمهێنان دەگرێتەوە. گەیاندنی بابەت و هەواڵەکان یان وتارەکان، گوێزانەوەیان لە رێگەی تۆڕەوە، تێکەڵکردن، لێکهەڵپێکانی زانیارییەکان، دانانی وێنەو هێڵکاری، سازکردنی لاپەڕەکانی و دواجار چاپکردن و بڵاوکردنەوەو دابەشکردن و... ئەم پرۆسەیە بۆتە هۆی نەمانی زۆر لە پیشەو کارەکان، لە هەمان کاتدا چۆنیەتی بەرهەمهێنانیش (لەڕووی ماددیەوە) گەشەیەکی باشی کردووە.

نووسینی کتێب، گۆڤار، رۆژنامە لە شوێنێکی جیهانداو لە هەمان کاتدا چاپکردنی لە چەند شوێنی دیکەدا (هەڵبەت لەگەڵ ئەنجامی گۆڕانە پێویستەکاندا بەپێی شوێنە جیاوازەکان) بۆتە کارێکی بەربڵاوی ئاسایی. تەکنۆلۆژیای بەرهەمهێنانی دیسکی پەستێوراو (CD)یش لە بەرهەمهێنانی نووسینە ئەلیکترۆنییەکاندا کاریگەرییان هەبووە. ئەمەش لە حاڵێکدایە کە تەکنۆلۆژیای فرە میدیایی (multimedia) لەم بوارەدا خراوەتەڕوو، واقیعێک کە نووسین، دەنگ و رەنگ بەئاسانی و خێرایی لە تەنیشت یەکتردا دابنرێن. لەساڵی ١٩٩٠ بەدواوە بەرە بەرە بەرهەمهێنان و خستنەڕووی گۆڤارەکان، بانکەکانی زانیاریی، ئەنیسکلۆپیدیاکان، کۆمەڵە هونەرییەکان و زۆرێک لەبەرهەمەکان لەوانەش کلاسیک و هەنووکەییەکان کە خراونەتە سەر دیسکە پەستێوراوەکان رەواجیان پەیداکردووەو بەشێک لە چالاکییەکانی بڵاوکەرەوە گەورەکان پێکدێنێت [ ٢٢١/٤٣].

**بەپیشەسازیبوون و گەشەسەندنی ئابووریی - کۆمەڵایەتی**

سەرەڕای پرۆسەی خێرای بەپیشەسازیبوون لە دوو سەدەی رابردوودا (سەدەی هەژدەو نۆزدە)، تەنها سێیەک (١/٣)ی دانیشتووانی جیهان لەو کۆمەڵگایانەدا دەژین کە بتوانرێت بەشێوەیەکی تەواو چەمکی کۆمەڵگای پیشەسازییان بەسەردا ببڕێت، زۆرینەی خەڵک سەر بەو کۆمەڵگایانەن کە لەژێر کاریگەریی شۆڕشی

پیشەسازیدا بوون، چ لە ڕێگەی پروپاگەندەی تەکنۆلۆژیی نوێی پیشەسازیی و چ بەهۆی ئەو پێشهاتانەی کە بەهۆی بازرگانییەوە ڕوویانداوە. ئەم کاریگەرییانە (لە هەردوو جۆرەکە یان تێکەڵەیەک لەهەر یەکێکیان) کۆمەڵگاگەلێکیان پێکهێناوە کە دەکرێ بۆ دوو دەستە پۆلین بکرێن، دواکەوتووەکان (Under developed) و تازە پێگەیشتوو (Developing).

هەرچەندە ئەم پۆلینە لەلای هەموو کەس پەسەند نییە. زۆرێک لەم کۆمەڵگایانە لە حاڵەتی وەرچەرخاندان، وەرچەرخان لە حاڵەتی کشتوکاڵیی سەرەتاییەوە یان گەشەکردوو بۆ قۆناغی نوێی پیشەسازیی. زانایانی کۆمەڵناسی ئەم حاڵەتە بە نوێخوازیی (Modernization) ناودێر دەکەن. ئەم چەمکە ڕۆشنکەرەوەی ئەو حاڵەیە کە پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی و کولتووریی هەموو لایەنەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی (نەک تەنها لایەنی تەکنۆلۆژیی) دەگرێتەوە.

لە زۆربەی، شیکردنەوەو ڕاڤە ئابووریی - کۆمەڵایەتییەکاندا هەموو کۆمەڵگا دواکەوتوو و تازە پێگەیشتووەکان، بەبێ جیاکردنەوە لێکۆڵینەوەیان لەسەر دەکرێت. کە ڕەنگە شتێکی هەڵە ئامێز بێت. ڕاستییەکەی ئەوەیە کە لە نێوان ئەم کۆمەڵگایانەدا، لە زۆربەی لایەنەکاندا چەند جیاوازییەکی گرنگ هەیە. ڕادەی گەشەکردنی تەکنۆلۆژیی کۆمەڵگا دواکەوتووەکان کەمترە لەهی کۆمەڵگا تازە پێگەیشتووەکان. لەم کۆمەڵگایانەدا ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتووان بەپرۆسەی بەرهەمهێنانی سەرەتاییترین پێویستییەکانی کۆمەڵگا (واتە خواردن و پۆشاک)وە سەرقاڵن. یەکێکی دیکە لە پێوەرەکانی ناسینی کۆمەڵگا دواکەوتووەکان لە ڕووی هەلومەرجی تەکنۆلۆژیی و ئابوورییەوە ئەوەیە کە ئاستی سوودو بەرهەم نزمە. لەوێشەوە کە ئاستی شارنشینی لەم کۆمەڵگایانەدا نزمترە لە کۆمەڵگا تازە پێگەیشتووەکان، ئیدی ئەزموونی خەڵکانی ئەم وڵاتانە لە بواری توخمەکانی ژیانی نوێی ئابووریی وەک پارە، بازرگانی و کڕین و فرۆشتن، بازاڕ، پسپۆریی لە پیشەدا، پەروەردە و بیرۆکراسیشدا سنووردارترە. لە بازاڕی کاری ئەم وڵاتانەدا فەراهەم کردنی هێزی مرۆیی بۆ نوێکردنەوەی پایەکانی حکوومەت و دامودەزگا ئابوورییەکانی، بەزۆری زەحمەتە. وێڕای ئەوەی کە لەلایەنی ناسیونالیزمییەوە حوکم دەکات، کە هێزی مرۆیی لۆکاڵی (محلي) لە چالاکییە ئابوورییە نوێیەکاندا بەکاربهێنرێت، بەڵام کەمیی هێزی پسپۆڕو تایبەتمەند ڕێگە لەم کارە دەگرێت [١٨٢/ ١٥٠-١٦٢].

کۆمەڵگا تازە پێگەیشتووەکان چەندین دەیەیە سەرگەرمی رووبەڕووبوونەوەی چەندین مەسەلەن کە پێدەچێ رێگر بووبن لە بەردەم گەشەکردنیاندا. سەرەڕای ئەوەی کە ئەم کۆمەڵگایانە تارادەیەک لە حاڵەتی بەپیشەسازیبووندان، زۆرینەیەکی بەرچاوی شارنشینانی ئەم وڵاتانە گرفتاری هەژارییەکی وەک هەژاریی کۆمەڵگا کشتوکاڵییە سەرەتاییەکانن. لە هەمان کاتدا باشبوونی رێژەیی رەوشی پەروەردەو فێرکردن و زیاتر گەیشتنیان بە هۆکارەکانی پەیوەندی دەستەجەمعی، هیواو چاوەڕوانییەکانی ئەوانیان زیاد کردوون و هۆشیارییەکی تاڕادەیەک زۆریی دەرهەق بە ژیانێکی باشتر لەواندا هێناوەتە گۆڕێ. ئەم دژایەتییانەو چەندین مەسەلەی دیکەش، هەلومەرجی شۆڕشیان فەرز کردووە کە بۆتە هۆی ئەوەی دانیشتووانی ئەم وڵاتانە بە زۆری تەواوی دنیا لەگەڵ هەلومەرجی تایبەتی خۆیاندا ببەستنەوە. وڵاتێکی تازە پێگەیشتوو، لە رووی تەکنۆلۆژییەوە تێکەڵەیەکی عەجیب و غەریبە لە کۆن و نوێ. لادێییەکان بەزۆری سوود لەو ئامێرە زۆر سەرەتاییانە وەردەگرن کە لە باوو باپیرانیانەوە بۆیان ماونەتەوە. لەم وڵاتانەدا تەکنۆلۆژیای کۆن لە کەرتی کشوکاڵیدا رەواجێکی زیاتری هەیە. دەتوانرێت ئابووریی ئەم وڵاتانە بۆ دوو بەش دابەش بکرێت: ئابووریی تەقلیدیی و ئابووریی نوێ. ئابووریی تەقلیدی لە بنەڕەتدا حاڵەتی کۆمەڵگا کشتوکاڵییەکان یاخود نیمچە کشتوکاڵییەکانی هەیە. تارادەیەک لەسەر هەمان ئەو ریتمەیە کە سالانی رابردوو لەسەریبوو. هۆکارو تەکنیکەکەش هەمان جۆرە و سوود وەرگرتن لە ئاستێکی نزمدایە. لەولاشەوە ئابووریی نوێ سوود لە تەکنیک، ئامێر، نموونە گەلی رێکخراوەیی وەردەگرێت، کە بەشی زۆری ئەم شتانەی لە کۆمەڵگای پیشەسازییەوە خواستووە، ئەو توخمانەی کە یەکجار پێشکەوتوو و تایبەتمەندن. ئەم جۆرە کۆمەڵگایە، لە پەیوەندیدا لەگەڵ هەلومەرجی ئابووریی دنیادا شوێنگەیەکی ئازار چێژی هەیە، بەتایبەت داهێنانە تەکنۆلۆژییەکان کە پێدەچێ ئەم جۆرە کۆمەڵگایانە رووبەڕووی بارودۆخێکی دژوارببکەنەوە. بەهۆی بەکارهێنانی تەکنیک و میتۆدی نوێی تەندروستییەوە، رێژەی مەرگ و مردن لەم وڵاتانەدا بە ئەندازەیەکی باش کەمی کردووە، بەڵام جگە لە بوارگەلێکی دیاریکراوو سنووردار رێژەی لەدایکبوون هەروەک جاران ماوەتەوە. ئەنجامی ئەم حاڵەتەش زیادبوونی خێرای دانیشتووانە کە بەشێکی زۆر گەورەی بەرهەمهێنان (کە بە زەحمەت بەدەست دێت) تایبەت دەکات بەخۆوە. (١٨٣/ ٥٤٤-٥٥٥].

لەو هۆکارانەی کە لەدنیای هاوچەرخدا بۆتە هۆی زیادبوونی خێرای دانیشتووان

له ژمارەیەک لە شارەکانی ولاتێکدا، مەیل و ویستی توێژە جیاوازەکانی خەڵکە بۆ ژیان بەسەر بردن لە شارە گەورەکاندا، کە پێدەچێ لە ولاتانی تازە پێگەیشتوودا گەرموگوڕییەکی زیاتری هەبێت. چەندین ساڵ لەمەوبەر نووسەری «قابوسنامە» وەسیەتی بۆ کوڕەکەی خۆی کردووە کە دەڵێ: «تاکو دەتوانی جێگەو ماڵی خۆت لە شارە گەورەکاندا بسازێنەو لە هەوڵی ئەوەدابە کە پاراوو سازگاربێت» شاری گەورە بۆتە یەکێک لە ئەفسانەکانی دنیای هاوچەرخ. چونکە وادەزانرێت کە لەشارە گەورەکاندا مرۆڤگەلێکی مەزنتر دەژین و دەزگاو دامەزراوەی گرنگتر بوونیان هەیە. لە هەمان کاتدا شارە گەورەکان بەتایبەت لە ولاتانی تازە پێگەیشتوودا، لەگەڵ مەسەلەو گرفتی جۆراوجۆر لەلایەنی ئابووریی، کۆمەلایەتی، خۆشگوزەرانی، تەندروستی و... هاوکات بوونەو دەبن.

ئەو کۆمەڵگایانەی کە لە ڕێڕەوی بەپیشەسازیبووندا هەنگاو هەڵدەگرن و پێشینەی کۆمەڵگای کشتوکاڵییان لەسەر شانە، لەگەڵ چەند مەسەلەیەکی سەرچاوە گرتوو لە بڵاوبوونەوەی توخمە کۆمەلایەتی و کولتوورییەکانی وەرگیراوو خوازراو لە کۆمەڵگا پێشکەوتووە پیشەسازییەکاندا ڕووبەڕوو دەبنەوە. لەگەڵ ئەوەشدا کە زۆرێک لە لێکۆڵەرانی پێشوو بڕوایان وابوو کە هۆکاری دواکەوتنی ئەم ولاتانە، تەنها چەقبەستوویی و دواکەوتوویی تەکنۆلۆژیی و ئابووریی خۆیانە. ئەمڕۆکە ئەو مەسەلەیە بەتێڕوانینێکی قووڵتر تەماشا دەکەن و ڕۆشنی دەکەنەوە کە مەسەلەی ئەم ولاتانە یەکجار ئاڵۆزترە لەوەی کە تەسەور دەکرا، لەسەر ئەم بنەمایەوە پێویستە چەندین لایەنی سیاسی، ئابووریی، خێزانیی، ئایینی، جوگرافیی و کولتووریی لەبەرچاو بگیرێت. ئەم ولاتانە پێویستییان بەرێگە چارەگەلێکی هەمەلایەن هەیە.

### کورتەی بەش

١- دەتوانرێت شار لە دیدگای ئابووریی، یاسایی، کۆمەلایەتی، سیاسی و ئامارییەوە پێناسە بکرێت.

٢- یەکێک لە بنەڕەتیترین دامەزراوە کۆمەلایەتییەکانی شار، بازاڕە.

٣- زەرورەتە سەرەتاییەکانی پەیدابوونی شار بریتین لە: بوونی زێدە بەرهەمی خۆراک، سەقامگیری سیستەمی گواستنەوەو گەیاندن و سوودوەرگرتن لە ئاستێکی دیاریکراوی تەکنەلۆژیا.

٤- جیاوازی نێوان شارو لادێ زیاتر لە رووی ئەرکە جیاوازەکانەوە دەخرێنەڕوو.

٥- گرنگترین دەرەنجامەکانی شارنشینی بریتین لە: چڕی دانیشتووان، فرەیی ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییەکان، گۆڕانی دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان.
٦- شارەکان بەپێی گرنگترین هۆکاری بوونیان: هەریەکێکیان دەتوانێت ڕۆڵێکی تایبەتی هەبێت یاخود چەندین ڕۆڵ لەگەڵ یەکدیدا بگێڕن.
٧- شارە کۆنەکان تارادەیەک سەربەخۆ بوون، لە هەندێ کاتدا گۆڕاون بۆ نێوەندی ئیمپراتۆری.
٨- تاکو ساڵی ١٨٠٠ی زایینی تەنها لەسەدا دووی دانیشتووانی جیهان لە ناوچە شارنشینەکاندا دەژیان.
٩- لە میسری کۆن و میزۆپۆتامیادا ناوچەی شارنشینی گرنگ بەدەرکەوتوون.
١٠- لە پاش هاتنی ئیسلام شارەکانی بەسرەو کوفە دروست بوون.
١١- شاری نوێ حاڵەتێکی پیشەسازیی هەیە، چەندین ڕەهەندی فراوانی هەیە، لە کاروباری سیاسی و ئابووریی و کۆمەڵایەتی وڵاتدا ڕۆڵێکی زۆریان هەیە.
١٢- گرنگترین تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگای شارنشین بەم شێوە گەشەکردووەی ئێستا بریتین لە: فراوانی ڕەهەندە جواگرافییەکان، زۆری چڕی دانیشتووان، پێکنەچوونی شارنشینان (بەتایبەت لەڕووی کارو ڕۆڵی کۆمەڵایەتییەوە)، زاڵبوونی پەیوەندییە ناکەسیی و ڕەسمییەکان، ئاڵۆزیی کۆمەڵگا، ئەقڵانییەت، دوورە پەرێزیی زیاتر لە هەمبەر نەریتەکاندا، مەیلی داهێنان، پسپۆڕیخوازی.
١٣- گرنگترین پرۆسەکانی ژینگەناسی بریتین لە: حەزکردن لە جودایی و حەزکردن لە بەسەنتەربوون.
١٤- تیۆرە بەناوبانگەکان لەمەڕ بونیادی ژینگەیی بریتین لە (تیۆری بازنەی تاک جەمسەر)، (تیۆری کەرتی)و (تیۆری چەند ناوکیی).
١٥- گەشەکردنی شارە گەورەکان کار دەکاتە سەر ناوچەکانی دەورو بەریشیان.
١٦- «وێرس» بڕوای وابوو کە لەشاردا، پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان ناکەسی (غیر شخصی)، رووکەش و تێپەڕن.
١٧- وێڕای ئەوەی کە زۆربەی مێژوونووسان دەسپێکردنی شۆڕشی پیشەسازیی لە ساڵانی نێوان ١٧٦٠ تا ١٨٣٠ لە ئینگلتەرا لە قەڵەم دەدەن، بەڵام کۆمەڵێکی دیکە ڕەخنەیان لەم بیروبۆچوونە هەیە.
١٨- دەتوانرێت پرۆسەی گۆڕانکاری شۆڕشی پیشەسازیی لە پێنج قۆناغدا چڕ بکرێنەوە، کە لەنیوەی سەدەی هەژدەهەمەوە دەست پێدەکات و ئێستاش ئێمە لە

دەروازەی قۆناغی پێنجەمدایین.

١٩- لە گرنگترین دەرەنجامەکانی شۆڕشی پیشەسازیی گۆڕانی سەرچاوەکانی وزەیە.

٢٠- کۆمەڵگای پیشەسازیی لەرووی بەرهەمهێنان، دابەشکردن و بەکاربردنەوە خاوەنی خەسڵەتی تایبەتی خۆیەتی.

٢١- کۆمەڵگای پیشەسازیی پشت ئەستوورە بە ئابووریی بەرهەمهێنان کە هەمیشە لە حاڵی دینامیکییەتدایە.

٢٢- بەکارهێنانی پیشەسازیی لە کۆمەڵگا نوێیەکاندا، مەسەلەو کاروبارێکی تایبەتی هێناوەتە ئاراوە کە پێوستە بخرێتە بەر ناسین، پێشگرتن، و چارەسەر.

٢٣- یەکێک لە مەیلە بەرچاوەکانی کۆمەڵگای پیشەسازیی بایەخدانە بە ژیاری کات بەسەربردن و رابواردن.

٢٤- «جۆرج فریدمان» لە میانی رۆشنکردنەوەی جیاوازییەکانی نێوان کۆمەڵگای پیشەسازیی و ناپیشەسازییدا هاوکاری لە دوو چەمکی ژینگەی تەکنیکی و ژینگەی سروشتی وەردەگرێت.

٢٥- کۆمەڵگای پۆست پیشەسازیی کۆمەڵگایەکە تیایدا پەیوەندیی دوولایەنە لە نێوان هۆکارو هەلومەرجی گەشەکردن لەگەڵ چالاکییە فراوان و پێشکەوتووەکاندا لە بواری لێکۆڵینەوەی زانستی و پەروەردەیی و ئاڵوگۆڕی زانیارییەکانەوە، زیاتر لە جاران هەستی پێدەکرێت.

٢٦- «ئالان تۆرین» بڕوای وایە کە لە کۆمەڵگای پۆست پیشەسازییدا، چیتر کارمەندە چالاکەکانی رەوتە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان کرێکاران نین، بەڵکو پشکی سەرەکی لەم رەوتانەدا لێکۆڵەران و رۆشنبیران هەیانە.

٢٧- کۆمەڵگای ئەلیکترۆنی کە بە سوودوەرگرتنی لە کۆمپیوتەرە مۆدێم (Modem) دارەکان، لەسەر بنەمای شارێگەکانی زانیاریی و پشتبەستوو بەبانکەکانی زانیاریی هاتۆتە بوون، کەش و هەوایەکی کۆمەڵایەتی نوێی لە کۆمەڵگا نوێیەکاندا هێناوەتە ئاراوە (فەزای ئەلیکترۆنی).

٢٨- نووسینە ئەلیکترۆنییەکان لە گرنگترین دەسکەوتەکانی تەکنۆلۆژییە نوێیەکانی زانیارییەکانن. هەموو قۆناغەکانی بەرهەمهێنانی بڵاوکراوەو هەموو دەسکەوتە دەنگی و رەنگییەکان کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی ئەم پرۆسەیەوە.

٢٩- لەڕووی چۆنێتی و چەندێتی گەشەوە، دەتوانرێت کۆمەڵگاکان بۆ دوو شێوە

دابەش بکرێن: دواکەوتووەکان و تازە پێگەیشتووەکان.
٣٠- نابێت هۆکاریی کەمی گەشەسەندنی ئابووری-کۆمەڵایەتی، لە روانگەی سنووردارو تاک هۆکارییەوە تاوتوێ بکرێن. گەشەسەندن پرۆسەیەکی ئاڵۆزە چەندین رەهەندی سیاسی، ئابووریی، کولتووریی و ژینگەیی هەیە.

## پێشەکی

چالاکییەکانی رۆژانەی مرۆڤ لە کۆمەڵگادا، لەسەر بنەمای سیستەمی کۆمەڵایەتی (Social Order) دامەزراون. ئەم سیستەمە لە رێگەی تاک و رەفتاری گرووپە کۆمەڵایەتییەکان بەردەوامی وەردەگرێت. لە راستیدا هەر رەفتارێکی کۆمەڵایەتی لە رێگەی نۆرمگەلێک و یاسای تایبەتەوە بەڕێوە دەبرێت. لێرەدا مەبەست لە نۆرمەکان پێوەرگەلێکی رەفتارین کە لە رێگەی تاک و گرووپە کۆمەڵایەتییەکانەوە لە هەمووان چاوەڕێ دەکرێت. ئێمە ئەم نۆرم و یاسایانە فێردەبین یان لانی کەم زانیاریمان لە بارەوە پەیدادەکەین. ئەم کارە لە قۆناغە سەرەتاییەکانی ژیاندا لە رێگەی پرۆسەی بەکۆمەڵایەتیبوون لە نێو خێزاندا ئەنجام دەدرێت، و لە قۆناغەکانی دواتر لە رێگەی بەدەستهێنانی ئەزموونەکانەوە بە درێژایی ژیان دەستەبەر دەبێت [١١٦/١٤٧-١٤٨].

پێناسەی هەندێ لە رەفتارەکان وەک رەفتارگەلێکی لادانکاریی، یەکێکە لە جۆرەکانی بەهێز کردنی نۆرمە گرێبەندییەکان «Contractul Norms». هەموو کۆمەڵگاو گرووپەکان، ئەوتاکانەی کەرەفتاریی لادانکارییان هەیە بە شێوەی جۆراوجۆر سزا دەدەن، سزایەک کەلە پەسەند نەکردن و گاڵتە پێکردنەوە دەسپێدەکات و تاکو شێوەکانی وەک ئەشکەنجەو برینی ئەندامەکانی لەش، زیندان و کوشتنیش بەردەوام دەبێت.

لەم فەسڵەدا بەکورتی رەهەندە جۆراوجۆرەکانی چەند چەمکێکی پەیوەندیدار، وەک: نۆرمەکان، بەهاکان، لادانە کۆمەڵایەتییەکان، نامۆبوون و دواجار سیستەمی کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی دەخەینە بەرباس و لێکۆڵینەوە.

## نۆرمە کۆمەڵایەتییەکان

نۆرم (Norm) رێسایەکی رەفتارییە دەستنیشانی ئەوە دەکات کە لە هەلومەرجێکی دیاریکراودا خەڵکان دەبێ چ جۆرە رەفتارێکیان هەبێت. سوودی ئەم ستانداردە رەفتارییە ئەوەیە کە یارمەتیی مانەوەی نموونەی پەیوەندییە دوولایەنەییە کۆمەڵایەتییەکان و شێوەی ئەنجامدانی کارەکان دەدات. لەم رووەوە نۆرمەکان کاریگەریی دەخەنەسەر بەهاو ئاراستە کۆمەڵایەتییەکان کە رێگەپێدەر و نەهیکەریی رەفتارەکانە. هەر کولتوورێک یان وردە کولتوور یان هەر گرووپێک خاوەنی چەند

نۆرمێکە کە ئەم نۆرمانە حوکمیان لەسەر دەکەن؛ و لەم ڕێگەیەشەوە ڕەفتارە گونجاوەکان دەستنیشان دەکات. یاساکان، شێوەو تەرزی پۆشاک پۆشین، ڕێنماییە ئیدارییەکان، بەرنامەی خوێندن، ڕێساکانی یاریی و وەرزشەکان، هەموویان جۆرێکن لە نۆرمی کۆمەڵایەتی.

خاڵێک کە لە ڕوانگەی سۆسیۆلۆژیاوە گرنگە ئەوەیە کە بزانین نۆرمە کۆمەڵایەتییەکان چۆنی دێنەئاراوە؟ هەندێک لە نۆرمەکان لە ڕێگەی ئایین، دەسەڵاتی یاسادانان، یاخود حکوومەتەکانەوە دێنەئاراوەوە. بەشێکی زۆری نۆرمە گرنگەکانی ژیانیشمان بەهۆی دابونەریتەکانەوە پەیدا دەبن و دەچنە ڕیزی شێوازە تەقلیدی و دووبارە بووەکانی ئەنجامدانی کاروباری ژیانی ڕۆژانەوە. ئەوەی کە بەلای نۆرمەکانەوە گرنگە، فشاری کۆمەڵایەتی سەرچاوەگرتووە لە کەسانێکەوە کە پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتی دوولایەنە پێکیەوە بەستوون. کەسەکان دەربارەی شتەکان دادوەری دەکەن، ئەم دادوەرییانە بۆکەسانی دیکەش دەگوازنەوە [١٩٣/١٠٦].

هەر کۆمەڵگایەک لە بواری ئەو ڕەفتارو تێڕوانین و بۆچوونانەوە (Attitude) کە پشتگیرییان لێ دەکات، خاوەنی ڕێساو یاسای خۆیەتی. منداڵێک زوو بەزوو نۆرمە ڕەفتارییەکانی کۆمەڵگاکەی خۆی وەردەگرێت. ئەو ڕەفتارانەی کە لەلایەن باوک و دایکی منداڵەوە بەباش و دروست هەڵدەسەنگێندرێن، دەبێتە مایەی پاداشت و پشتگیریی کردن و لەحاڵەتی ئەنجامدانی ڕەفتارێکی هەڵەدا ئاگادار کردنەوە بەکار دەهێنرێت. لەسەر ئەم بنەمایە منداڵ ڕەفتارەکانی خۆی، کە بۆ هەریەکێکیان هەلومەرجی گونجاوی هەیە، فێردەبێت [١٧٨/١٨]. هەموو نۆرمەکانی کۆمەڵگایەک گرنگییەکی وەکو یەکیان نییە و لەم ڕووەوە کۆمەڵناسان لە هەوڵی جیاکردنەوە و پۆلبەندکردنی ئەم نۆرمانە دان. «ویلیەم گراهام سامنێر» یەکێکە لەو کۆمەڵناسە یەکەمیانەی کە هەستاوە بە پۆلینکردنی ئەم نۆرمانە [٢٥/٥٢]. پۆلینەکەی «سامنێر» لە بنەڕەتدا گرنگی بە ناسینی فرەیی نۆرمە کۆمەڵایەتییەکان دەدات و بەم شێوەیە بۆ سێ دەستە دابەشیان دەکات:

١- شێوازە میللییەکان (Folk Waies)، کە بریتین لە دابونەریت یان شێوازە نەریتییەکانی ئەنجامدانی کارەکان، ئەم دەستەیە شێوازی گونجاوی ڕەفتارو کارن کە کۆمەڵگا ڕێگەی پێداون یاخود بەباشتریان دەزانێت. سەرپێچیکردن لە شێوازە میللییەکان سزای بە شوێنەوە نابێت. ئەگەر سنووردارییەکیش بێتە ئاراوە ئەوەندە بەشێوەیەکی جیددی نییە. کانگای شێوازە میللییەکان ناڕۆشن و بێبەرنامەیە. ئەم

شـێـوازانە بە ڕێکەوت دێنە ئاراوە، بەڵام پەسـەند دەکـرێن و لە ناو کـولـتـووردا دەمێننەوە.

٢- ڕەسمە کۆمەڵایەتییەکان، کەبریتین لە رووە کردارییە پێویستەکان و بۆ خۆشگوزەرانی کۆمەڵگا بە پێویست دەژمێردرێن. بۆنموونە لە ناوبردنی ژیانی مرۆڤێک (جگە لە دوژمن لە کاتی جەنگداو لە جێگەی تایبەتی دیکەشدا) بە سەر پێچیکردن لە ئاداب و رسووماتی پەیوەندیدار بە پاراستنی ژیانی مرۆڤ حساب دەکرێت و بەتاوان دەژمێردرێت. کەسانێک کە حەرامکراوە کۆمەڵایەتییەکان پێشێل دەکەن، یان پێویستبوونی ئەو دەخەنە ژێرپرسیار، بەگشتی بە شێوەیەکی توندوتیژ سزادەدرێن.

«سامنێر» بڕوای وابوو کە ڕەسمە کۆمەڵایەتییەکان دەتوانن هەموو شتێک لە تەوەرێکی دروستدا دابنێن. بەدەربڕینێکی دیکە ئەوەی کە ڕەسمەکان چ ڕەفتارێک دەگرنەخۆ گرنگییەکی ئەوتۆی نییە، بەڵکو گرنگ ئەوەیە کە خەڵکی پشتگیریی بکەن و بەپێی ئەو رسوماتە کاربکەن.

٣- یاساکان، نۆرمگەلێکن کە لەلایەن کاربەدەستانی دەوڵەتەوە بەرقەرار دەبن و بەهۆی ئەو زەمانەتکردنە ئیجرایییانەی کە هەیانە خاوەنی شەرعییەتی یاساین. یاساکان هەمیشە لەگەڵ رسووماتی کۆمەڵایەتیدا وێکنایەنەوە و هەر بۆیە سەر پێچیکردن لەو یاسایانە بەرێژەیەکی زۆر روودەدات. لەو حاڵەتانەدا کە یاساکان لە چوارچێوەی ڕەسمە کۆمەڵایەتییەکاندا گەشە دەکەن، رێزگرتن لەو یاسایانە زۆرە. لە دیدگایەکی دیکەوە دەتوانرێت ئەنجامگیری ئەوە بکرێت کە پێدەچێ نۆرمەکان ڕەسمی یا نارەسمی بن و لەبەرامبەریشیاندا وەڵام یان زەمانەتی پیادەکردن هەبێت کەلایەنێکی پۆزەتیڤ یان نێگەتیڤی هەبێت [ ٢٠/ ٧٥].

**جۆرەکانی نۆرمە ڕەسمیی و نارەسمییەکان و پەرچەکردار دەرهەق بە نۆرمەکان**

| جۆریی نۆرم | پەرچەکردار (وەڵام)<br>پۆزەتیڤ | نێگەتیڤ |
|---|---|---|
| ڕەسمی | مووچەی زیادە | سزادان |
| ڕەسمی | مەدالیا | دەرکردن |
| نارەسمی | بزەخەندە | ناوچاوگرژکردن |
| نارەسمی | ستایشکردن | سووکایەتی پێکردن |

نۆرمەکان لە هەموو هەلومەرجێکدا پێڕەوییان لێناکرێت و لە هەندێ حاڵەتدا خەڵکان دەست لە پێڕەویکردنی هەندێ نۆرم هەڵدەگرن ئەمەش، وەختێک کە دەزانن پێڕەویکردنیان پشتگیرییەکی ئەوتۆی لێناکرێ. پێدەچێت لە کۆمەڵگایەکدا کارێک نایاساییش بێت، بەڵام گرووپی جۆراوجۆریش ئەم کارە ئەنجام بدەن. هەندێ جار یەکێک لە نۆرمەکان بەوهۆیەوە وەک سەرپێچییەک ناونووس دەکرێت کە لەگەڵ نۆرمەکانی دیکەدا پێچەوانە دێتەوە [ ٧٥/٢٠ ].

بۆ نموونە رەنگە دەنگەدەنگ و هەرایەک لە شوقەی دراوسێیەکدا ببیستین و گوێمان لە دەنگی کەسێک بێت کە داوای یارمەتی بکات، ئەگەر بمانەوێت لە ژوورەکەی خۆمان دەربچین و لە دەرگای ژوورەکەی بدەین و رەنگە یارمەتیی کابرای هاوارکەریش بدەین، پێدەچێ بگەینە ئەو دەرەنجامەی کە ئەگەر ئەو کارەبکەین پێمان دەگوترێت: «جا ئەمە چ پەیوەندییەکی بەتۆوە هەیە»!

**بەها کۆمەڵایەتییەکان**

لەگەڵ ئەوەی کە هەرکەس بۆ خۆی چەند ئامانج و ئاواتێک بەدی دەهێنێ، بەڵام کولتووریش کۆمەڵێکی گشتی لە ئامانج بۆ تاکەکان دابین دەکات، بەهاکان (Value) لە راستیدا چەمکگەلێکی گرووپین. لەوەی کە لە رووی کولتوورییەوە باش، پەسند و گونجاو یان ئەوەی خراپ، ناپەسند و نەگونجاو بۆی دەڕوانرێت. بەها کۆمەڵایەتییەکان ئەوە دەستنیشان دەکەن کە لە کۆمەڵگادا چ شتێک بۆ خەڵکی گرنگە و لە رووی ئەخلاقییەوە چ شتێک دروستە. پێدەچێ بەهاکان لە هەندێ حاڵەتدا لایەنێکی دیاریکراو و ئاشکرایان هەبێت، وەک رێزگرتنی دایک و باوک یان خانەدانیی و، یاخود پێدەچێ حاڵەتێکی گشتیتریان هەبێت، وەک سەلامەتی، خۆشەویستی و دیموکراسی [ ٧٥/٢٠ ] .

بەهاکان کاریگەرییان لەسەر رەفتاری تاکەکان هەیە، وەک پێوەرێک بۆ هەڵسەنگاندنی کاری خەڵکی تر سوودیان لێوەردەگیرێت. بەزۆری پەیوەندییەکی راستەوخۆ لە نێوان بەهاکان، نۆرمەکان و دادوەرییەکاندا یاخود شێوەی پەرچەکرداری کۆمەڵگادا هەیە. بۆ نموونە لەکۆمەڵگایەکدا کە نرخێکی زۆر بۆ «هاوسەرێتی» دادەنێت، خاوەنی نۆرمگەلێکە کە کاری سێکسیی ناشەرعی (زینا) مەحکووم و سزا دەدات. لە کۆمەڵگایەکدا کە رێز لە ماڵ و سامانی تایبەتی

خەڵکان دەگیرێت، و وەکو بەهایەک تەماشا دەکرێت بەدڵنیاییەوە یاسایەک لە دژی دزین و تالانکردنی ماڵ و سامانی خەڵکی دێتە ئاراوە.

لە هەموو کۆمەڵگایەکدا هەندێ بەها گرنگی زیاتری پێدەدرێت. لە کۆمەڵگای پیشەسازیدا بەوەعدەبوون، پێشکەوتنی ماددی و ململانێ، لە بەها گرنگە کۆمەڵایەتییەکانن. لە حاڵێکدا کە لە کۆمەڵگایەکی ناپیشەسازیدا پێدەچێ بەهای دیکە گرنگیی زیاتری هەبێت. لە کۆمەڵگایەکی سادەدا تاکەکانی کۆمەڵگا بەئاسانیی لەسەر کۆمەڵە بەهایەک رێک دەکەون لە حاڵەتێکدا کە لەکۆمەڵگا پیشەسازییەکاندا سیستمێک لە بەهاکان زاڵ و بالادەستە. بۆ نموونە پێویستە ئەوپەڕی گرنگی بەگەشەی ئابووریی بدرێت یان بە ژینگە؟ ئایا پێویستە خەڵکان زیاتر پەرە بەتاکگەرایی بدەن یان بە بیروباوەڕی گرووپی؟ لەکۆمەڵگا ئاڵۆزەکاندا رێکنەکەوتن لەسەر بەهاکان حاڵەتێکی ناکۆتای هەیەو بەهاکان بەردەوام لە حاڵەتی گۆڕاندان. گۆڕانی بەهاکانیش بەنۆبەی خۆی کاریگەریی لەسەر دابونەریت و رسووماتەکان بەجێدەهێڵێ [٦٣/٧].

لە راستیدا تێڕوانینەکان و بۆچوونەکان، ئامادەیی هەنگاونان یاخود رەفتارێکی بزوێنەری مرۆڤن بەرەو هەنگاونانێکی دیاریکراو. تێڕوانینەکان بەبەهاکانەوە پەیوەستن و هەردووکیشیان لەسەر بنەمای ئەندێشەو بڕواگەلێک کە لە رێگەی بینین و قووڵبوونەوە لە رەفتاری خەڵکانی دیکەوە دێنە بوون. لەوێوە کە تێڕوانین و بەهاکانیش لە رێگەی کولتوورەوە پێناسەدەکرێن، ئیدی لە کۆمەڵگایەکەوە تایەکێکی دی جیاوازییان هەیە [٥٢/ ٢٢-٢٣].

تێڕوانین و بەهاکان لە رێگەی ئەزموون و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە دوولایەنەکانەوە فێری خەڵکانی دیکەش دەکرێن و رەنگە هەندێ جار لەسەر بنەمای لاگیری (التحیز) «Prejudice» و کلێشەکانیش «Stereotypes» بن، پێدەچێ لە کلێشەسازی خەڵکان یان گرووپەکاندا هەندێ تایبەتمەندییان پێبدرێت کە دەتوانن ناکۆتابن و دواجار بەشێوەیەکی یەکجار فرەجۆر دەربکەون. ئەوەی کە دەڵێین فلان گرووپ تەمبەڵن، ژنان شوفێری باش نین، فلان کۆمەڵ خراپ، نادروست، بەرژەوەندیخواز، میهرەبان، وەفادار و......هتد ن.

لەم حاڵەتەدا لەگەڵ چەندین شێوەی کلێشەسازیدا رووبەڕووین. لەدواجاردا رۆڵی کلێشەکان ئەوەیە کە هۆکارێک بۆ پێشبینی رەفتاری خەڵکان بۆ ئێمە دەسازێنێ، کە رەنگە کلێشەیەکی پشت ئەستوور نەبێت بەواقیع، یاخود گشتاندنی

بەشێک لە رەفتارە تاکانەییەکان بێت بەسەرگرووپێکی گەورەدا. لەلایەکی دیکەوە ئەم کلێشانە شێوەیەک لە رەفتار لەبەرامبەر لە کلێشەگیراویشدا دادەنێت. کەسێک کە مۆرکی تاوانباریی لێدەدرێت رەنگە لەلای خۆیەوە چەندین رەفتاری گونجاو لەگەڵ ئەو مۆرک و تۆمەتەدا نیشان بدات.

### لادانی کۆمەڵایەتی

بەدرێژاییی ئەم چەند دەیەی دوایی گشت ئەو توێژینەوانەی لە بواری لادانە کۆمەڵایەتییەکاندا ئەنجام دراون بە شێوەیەکی نارۆشن رووبەڕووی پێناسەی رەفتاری لادانکاری «Deviance» بوونەتەوە. لە هەمان کاتدا کە زۆرجار ئەم پرسیارە لە ئارادا بووە کە چ رەفتارێک لە چوارچێوەی ئەم پێناسەیەدا جێگەی دەبێتەوە؟ بەشێوەیەکی گشتی ئەو رێکەوتنە بوونی هەبووە کە هەندێ کاری وەک تاوان و گوناهکاری؟، ئالوودەبوون بە ماددەی بێهۆشکەر، مادده کحولییەکان، بەدڕەوشتی، نەخۆشی دەروونیی، توندوتیژی سێکسی، تەڵاق، خۆکوشتن، لە ریزی رەفتاری لادانکارییدا دابنێن. هەرچەند کە لە پێناسەی ئەم چەمکانەدا دیسان کێشەوگرفت هەیە. زاراوەی جۆراوجۆری وەک گرفتە کۆمەڵایەتییەکان، پاشاگەردانی کۆمەڵایەتی یان زیانناسی (پاتۆلۆژی) کۆمەڵایەتیی بۆ ناولێنانی ئەم جۆرە زانیارییانە بەکارهێنراوە کە سەرەڕای جیاوازییان، ئەم چەمکانە لەو بوارەدا هاوبەشن کە خاوەنی رووی نێگەتیڤن و باس لە رەفتارگەلێک دەکەن کە جێگەی پەسەندکردنی کۆمەڵگانین [٦٧/١٣٩-١٤٧].

پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە زۆربەی ئەو کۆمەڵناسانەی کە لە ژێر چەندین ناونیشانی وەک گرفتە کۆمەڵایەتییەکان یا زیانناسی کۆمەڵایەتیدا باسی لادانە کۆمەڵایەتییەکان دەکەن، لانی کەم لە رووی پێناسەوە دەگەڕێنەوە بۆ هەردوو چەمکی نۆرم و لادان، و پێوەرەکانی خۆیان وەک رەفتار ناودێر دەکەن. بۆ نموونە «رۆبەرت نیسبێت» (R.Nisbet) دەڵێت گرفتی کۆمەڵایەتی شێوەیەکە لە رەفتار کە لەلایەن سیستمی کۆمەڵایەتییەوە وەک سەرپێچییەک لە نۆرمێک یا کۆمەڵە نۆرمێکی پشتگیریی کراو لە کۆمەڵگاوە تەماشا دەکرێت [١/١٨٦]. لە کۆی پێناسەکانی کۆمەڵناسانەوە دەتوانرێت ئەنجامگیری ئەوە بکرێت کە لادان بریتییە لە کۆمەڵە رەفتارێکی تاکانەیی یان دەستەجەمعی کە لەگەڵ، نۆرم، چاوەڕێییەکان، و بەها راگەیاندراوەکاندا یان پەسندکراوی کۆمەڵە خەڵکێکدا ناسازگار دێتەوەو لە

ئەنجامی کاریگەریی دەرکەوتنی ئەم ڕەفتارانەدا دژایەتی و ناکۆکییەک دروست دەبێت کەسەردەکێشێ بۆ تێڕوانینێکی سەرزەنشتئامێز و پەرچەکرداری وەک سزادان، دەرکردن، گۆشە گیریی و تەنانەت لە سێدارەدانیشی لێدەکەوێتەوە [ ٣٧/٢ ]. بەتێڕوانین بۆ ئەم پێناسەیە، ڕەنگە سادەترین پێناسە بۆ ڕەفتاری لادانکاری ئەوەبێت کە بڵێین: «هەر کارێک یان بەیانێک لە لایەن ئەندامانی کۆمەڵگاوە کە بە جۆرێک لە سنوور بەزێنیی بۆ نۆرمە گرووپییەکان بناسرێت، ئەوە حاڵەتێکی لادانکارییە» بە کورتی لادان نەگونجانە لەگەڵ نۆرمە گرووپییەکاندا بەڵام لەسەر بنەمای ئەم پێناسەیەوە هەرکاتێک دزێک سەروەت و سامانی دزراو بگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنەکەی لە جیاتی ئەوەی لەگەڵ هاوڕێ دزەکانی دابەشی بکات، ئەوا ڕەفتارێکی لادانکاریی ئەنجامداوە، چونکە بەپێچەوانەی نۆرمی گرووپەکەی خۆی (باندی دزەکان) کاریکردووە! سەرەڕای ئەم جۆرە ئیشکالیەتانەش، ئەم پێناسە سەرەتاییە دەتوانێت تاڕادەیەک یارمەتیمان بدات بۆ تێگەیشتن لە مەسەلەکە. یەکەمین جیاکەرەوەی ئەم پێناسەیە ئەوەیە کەنامانباتەوە بۆ لای «تاکی تاوانبار» بەڵکو بنەمای پێناسەکە ڕەفتارە. جیاکەرەوەی دووەمی ئەوەیە کە هیچ جۆرە ڕەفتارێکی تایبەت خۆی لە خۆیدا و بەبێ گەڕانەوە بۆ وەڵامی خەڵکانی دیکە، بەلادان ناژمێردرێت. بۆ نموونە کوشتنی کەسێکی تر، ئەگەر سەربازێکی دوژمن بێت لەشەڕدا یان کەسێکی مەحکووم بە کوشتنی کەسێکی دیکە بێت، بەتاوان ناژمێردرێت. سێیەمین جیاکەرەوەی پێناسەکە گەڕانەوەیە بۆ داوەریکردنی خەڵکان، چونکە چەمکی هەر کارێکی دیاریکراو لە پەیوەندی لەگەڵ خەڵکاندا دەخرێتەڕوو و هیچ کارێک لە خودی خۆیدا داوەریی لەسەر ناکرێت. ڕێزگرتن و سەرزەنشتیش هەردووکیان لە میانی پەیوەندی نێوان خەڵکیدا پێناسە دەکرێن، دواجار پێویستە بگوترێت کە ئەم پێناسەیە ڕوویەکی زەینی نییە و وابەستە نییە بە تێڕوانین و بەهاکان یان وەڵامە تایبەتییەکانی چەند کۆمەڵناسێکەوە کە تۆژینەوە لەسەر ئەم پرۆسەیە دەکەن [ ٦٧/ ١٣٩-١٤٧ ]. هەڵبەت ئیشکالێک کە لێرەدا جێگەی خستنە ڕووە ئەوەیە کە ئەگەر ئێمە پشت بەوە ببەستین کە ئەندامانی هەرگرووپێک، سەرپێچیکردن لە نۆرمەکان، بەلادان بژمێرن، ئەو کاتە گرفتێک دێتە پێشەوە کە: کام گرووپ وکام نۆرم؟ گرووپەکان لە ڕووی نۆرمەکانەوە لەیەکدی جیاوازن. تەنانەت هەندێ لە ئەندامانی گرووپێکی دیاریکراویش هەندێ لە بەهاو نۆرمەکان پەسەند ناکەن یا بەتەواوی پشتگیریی لێناکەن، بەهاو نۆرمەکانی

ئەندامانی گرووپ و بەدرێژایی زەمانە گۆڕانی بەسەردا دێت، دواجار بە تێڕوانینی هەندێ لە ئەندامانی گرووپێک هەندێ نۆرم گرنگترن و لای هەندێکی دیکەش بەپێچەوانەوە. تەواوی ئەم حاڵەتانە لە نێو ئەم پێناسەیەدا شایانی قسە لێوەکردنن و ئەگەر نۆرمەکان جیاواز و گۆڕاو بن ئەم پرسیارە دێتە پێشەوە کە: چۆن چۆنی سەرپێچیکردنی هەندێ کەس لە نۆرمەکان وەک رەفتارێکی لادانکاریی دەخرێتە بەر داوەریکردن؟ رەنگە رەفتارەکانی کەسێک لەگەڵ نۆرمەکانی گرووپێکدا گونجاوبن، بەڵام لەلایەن ئەندامانی دیکەی کۆمەڵگاوە مەحکووم دەکرێن (ئەو کۆمەڵگایەی کە گرووپەکەش بەشێکە لەو) پێدەچێ رەفتارێکی تایبەتی ئێمە لەلایەن پۆلیسی شارەوە پەسەند نەبێت، لە حاڵەتێکدا دۆستەکانمان بە تەواوی ئەو رەفتارە پەسەندبکەن [٦٧/ ١٣٩-١٤٧].

لادان شتێکی رێژەییەو رەهایی وەرناگرێت. خەڵکان نەبەشێوەیەکی تەواو و رێک و راست بەپێی نۆرمەکان کاردەکەن و نەبەشێوەیەکی تەواو لە حاڵەتی لادانکارییدان (Deviant). کەسێکی تەواو لادەر زۆر ئەستەمە بتوانێت بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ لە ژیاندا بمێنێتەوە. رەنگە لادەرە زۆر ئاشکراو «مۆرک لێدراوەکانیش» (وەک تاوانکاران یان لادەرە سێکسییەکان) لە رووی پۆشاک پۆشین، خواردن، کات بەسەر بردن و شتگەلێکی زۆری وەک چالاکییە جۆربەجۆرەکانی ژیانی رۆژانە، حاڵەتێکی سادەو سروشتی و تەواو نۆرمئامێزیان هەبێت. لەلایەکی دیکەوە رەنگە زۆربەی خەڵکانی تەواو ئاسایی، هەندێ جار رەفتاری لادانکارییان هەبێت [١٨٧/ ٣٠-٣٢]. بە لێکۆڵینەوە لە تایبەتمەندییەکانی لادان دەتوانرێت ئەم توخمانە دەستنیشان بکرێن [١١/١٨٩]:

١- نۆرمەکانی کۆمەڵگایەک تایبەتمەندیی و رەفتارەکان دەشەرعێنێ.

٢- تاکەکانی کۆمەڵگایەک خۆیانن کە تایبەتمەندیی و رەفتارەکان دەردەخەن (دەنوێنن).

٣- هەمیشە پشتگیریی نەکردنی کۆمەڵایەتی بۆ خەڵکانێک کە تایبەتمەندیی و رەفتارێکی دیاریکراو پیشان دەدەن، لە ئارادایە.

٤- هەندێ لە رەفتارەکان لە ریزی رەفتارە ئاساییەکان وەدەردەنرێن.

٥- بە تێڕوانین بۆ گۆشەگیریی کۆمەڵایەتی هەندێ لە رەفتارەکان، بوار بۆ پەیدابوونی گرووپگەلی لادەر دەسازێندرێت.

لەو رووەوە کە لادان، لە کۆمەڵگادا دەناسرێت و پێناسەدەکرێت راڤەو شیتەڵکاری هۆکارەکانیی و دەستنیشانکردنی هۆکارە کاریگەرەکانی و دواجار سزادانی کەسانی لادەر، یەکێکە لەو بوارانەی کە سالانێکی دوورودرێژە جێگەی مشتومڕی گرووپی فەیلەسووفان، دادوەران، دەروونناسان و کۆمەڵناسان و........ بووە. بۆ نموونە دیتنەوەی (دۆزینەوەی) بواری لادانکاریی لەسەر بنچینەی تایبەتمەندییە تاکەکەسییەکاندا لە نووسراوە کولتوورییەکانی جیهاندا رەگ و ریشەیەکی کۆنی هەیە. لە چیرۆکی «کلیلەو دمنە»دا هاتووە کە «هەر کەسێک برۆی گەورەو کراوە بێت، چاوی راستی لەچاوی چەپی بچووکتر بێت و بەردەوام چاوی تیل (خێل) بێت و لووتی زیاتر بەلای راستیدا کەوتبێت، لە هەر شوێنێکی ئەندامەکانی لەشیدا سێ موو روابێت، و هەمیشە رووی بەرەو زەویی بێت، ئەوە زاتی ناپاکی ئەو کەسە مۆڵگەی فەساد و فرووفێڵ و غەدر کردن دەبێت» [١٣٥/١٨٤]. پەیوەندی نێوان لادان و ئاستی ئیمکانیات لە توانای کەسانێکدا کە دەستیان بۆ درێژ دەکەن، خالێکە زۆر لە مێژە بایەخی پێ دراوە. هەموومان بیستوومانە کە: «دزێک بە چراوە هات، کالای باشتری برد» پاراگرافێکی جیایە. لە لایەکی دیکەوە بە ئاوڕدانەوە لە لێکۆڵینەوە کۆمەڵناسییەکان، دەتوانین رەگ و ریشە کۆمەلایەتییەکانی لادانکاری بەم شێوەیە پۆلین بکەین [١٤٥/٨].

١- گۆڕان لە نۆرمەکانداو نەبوونی نۆرم، ٢- پێکداکێشان و دژایەتی بەهاکان، ٣-خستنەڕووی پێناسەگەلی نوێ بۆ شتەکان، ٤- لە دەست چووە کۆمەلایەتییەکان، ٥- نەگەیشتن بە ئامانجەکان، ٦- دژایەتی نێوان هۆکارو ئامانجەکان، ٧- نەبوونی پاکێتی؟ و بوونی دووڕوویی، ٨- چاوپۆشینی کۆمەڵگا لە تاوانکارە تایبەت و یەخەسپییەکان.

لە کۆتایی ئەم باسەدا پێویستە لەم بوارەدا ئەوە بەبیربهێنینەوە کە بوونی چەندین جۆری سزا یاساییەکان لەبەرامبەر چەندین جۆری لادانکارییدا، هەمیشە بە مانای ئیعتیباری کۆمەلایەتی یاساکان و پراکتیک کردنیان نییە. بەتایبەت لەو تاوانانەی نێوان خەڵکاندا هەیە، زۆربەی کات سەلماندنی روودانی تاوانێک یەکجار درێژە دەکێشێ و ئەستەم دەبێت و لەم رووەوە لەکۆمەڵگای نوێشدا «داوەریکردن» یان گەڕانەوە بۆ «داوەرێک کە هەردوو لا پێی رازیبن» یان ئەوەی کە لەکۆندا «ریش سپییان» دەیانکردو دەیانگوت، گرنگی هەیە. سەرەڕای ئەمە بەشێک لە یاساو

پێـوەریش لەڕووی ڕاپەڕاندنەوە ڕووبەڕووی ئیشکالییـەت دەبنەوە. لە کـتێـبی قانوونی کونت دا کە لە ساڵی ١٢٩٦ی کۆچی مانگیدا لەلایەن (کونت دۆمۆنت فـرت) و بەفـەرمـانی «ناسـرەدین شـای قـاجـار» ئامـادەکـراوە. هاتووە کـە «ئەو کـەلوپەلانەی کـە دەدرێن بەکـاسـبکارێک بۆ ئەوەی سـازی بکات یان دروسـتی بکاتەوە، یان پارچەیەک کـە دەدرێت بە پینەچییـەک بۆ ئەوەی بیـدۆزێت، ئەگـەر خراپی بکات یان بەپێی سەلیقەی خاوەنەکەی نەبێت ئەوە بۆ ماوەی بیست و چوار کاتژمێر تا مانگێک زیندانی دەکرێت و نرخ و پارەی ئەو کاڵایەشی لێدەسەنرێت کە خراپی کردووە. ئەگەر کۆنیش بێت، پێویستە کاڵایەکی نوێ بداتەوە بە خاوەنەکەی [٨/١٨٥].

**قوربانیان و لادانکاریی**

قـوربـانیـانی ڕووداوە پەیوەندیدارەکان بە جۆرەکـانی لادانکاریی و پاشـاگەردانی کۆمەڵایەتی کەسانێکن کە بەگشتی لەلایەن لێکۆڵەرانەوە فەرامۆش کراون، و ڕەنگە زیاتر هەڵسـوڕێنەرانی ڕووداوێکی وەک تاوان بن کـە دەبنە مـایەی گـرنگیـپـێـدانی تاوانناسـان و کـۆمـەڵناسـان. تەنانەت لەو کـاتانەشـدا کـە گـرنگیـان پێ دەدرێت و ئامـاژەیان پێ دەکـرێت لەلایەن هۆکـارە پەیوەندیدارەکـانەوە، بەزۆری قـوربانی وەک بارمـتەیەک دەبێـتە مـایەی ڕاکێـشـانی سـەرنجی ڕای گـشـتی (قـوربـانیـانی تیـرۆر، قـوربـانیـانی جـەنگ و ...) تاوانکار بەپێچـەوانەی قـارەمـانی نێـو بەرهەمە فـراوانە ئەدەبییـەکان، ڕۆمـانە پۆلیـسـییـەکان، فـیلمـە سینەماییـەکان و تەنانـەت لێکۆڵینەوە زانسـتـیـیـەکـانیـشـە. هەڵبـەت وەک بەدرێژایی مـێـژوو هەندێ لە قـوربـانیـان بە بەختکردنی گیانی خۆیان، سیمبولی گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتی و مێژووییەکان بووەو دەزانین کـە ناویشـیـان لە ژێر ناونیـشـانی وەک «شـەهیـد» لە مـێـژوودا مـاوەتەوە [٣/٢١٨].

ئاسـاییە کە نـاوی هەندێ قـوربانی یادهێنەری بەشـێک لە پەرچەکرداری قـووڵی هەسـتـئـامـێـزن و پێدەچێ لەبەر ئەوە بێت کـە پشـکنینی ئەنگێـزە، تایبـەتمەندی و مـەسـەلەکـانی قـوربـانیـان لە گـۆشـەنیگای لێکۆڵەرانی زانسـتـیی و کـۆمـەڵگای چاودێریکەرەوە، ئەوەنـدە خـۆشـویـسـتـراو و پەسـەندکـراو نەبێت. بە ئاوێتـەکـردنی هەسـتی تاکایەتی و هۆکارە کـۆمـەڵایەتیـیە کـاریگەرەکـانیش، دەکرێت بگەینە ئەو دەرەنجامەی کە قوربانی کەسێکە کە لە ئەنجامی کاریگەریی هۆکارێکی دەرەکییەوە،

(لەچاو حاڵەتی ئاسایی و تەواوی خۆیەوە)، دوچاری زیانێک دەبێت لەکۆی کەسایەتی خۆی. هۆکارێک کە لە رووی کەسیی و کۆمەڵایەتییەوە حاڵەتێکی دیار و دەستنیشانکراوی هەیە. ئەم پێناسەیە رێگەی ئەوە خۆش دەکات کە مەفهوومی قوربانی سنووردار بێت و بتوانین لانی کەم پێرستێک لەم جۆرە قوربانیانە، وەک نموونەیەکی دەستنیشانکراو بەدەست بهێنین کە ئەمانەن: منداڵانی قوربانی زیان و ئازار، قوربانیانی توندوتیژیی خێزان، قوربانیانی سەرپێچکەر لە یاسا سزاییەکان بەشێوەیەکی گشتی، قوربانیانی رووداوە شوفێرییەکان، قوربانیانی تاوانە دژە مرۆڤایەتییەکان، قوربانیانی هەنگاونانە تیرۆریستییەکان، قوربانیانی جەنگ، و دواجار قوربانیانی کارەساتە سروشتییەکانی وەک (بوومەلەرزە و لافاو و بورکانەکان) و چەمکێکی پەیوەندیداری دیکەی قوربانی کە بەدرێژایی مێژوو گرنگییەکی زۆری هەبووە، خۆبەختکردنە، کە رووکارە تاکانەیی و کۆییەکانی نیشانداوە. هەرچەندە خۆبەختکاران واتە ئەوانەی کە خۆیان دەکەن بەقوربانی و (بەلەبەرچاوگرتنی هۆکارو ئەنگێزە زۆر جیاوازەکانیش)، بەجۆرێک لە قوربانی دەژمێردرێن، بەڵام ناتوانرێت لە ریزی قوربانیانی لافاو یان بومەلەرزەدا دابنرێن. رۆڵ و ئەرکە جیاوازەکانی ئەم جۆرە لە خۆبووردن و خۆبەختکارییەو بەدەربڕینی کۆمەڵناسانە بریتین لە: خستنە رووی جۆرێک لە مەحکوومییەتی دەستەجەمعی، سیستەم بەخشین بەتوندوتیژی کۆمەڵایەتی، بەبیانووکردنی پەیوەستییە مەعنەوییەکان، و دواجار سازاندنی داواکاریی و خواستەکان یان روئیا دەستەجەمعییەکان، دەتوانرێت زۆربەی ئەم رۆڵانە لە رووکارە جۆربەجۆرەکانی ئەم خۆبەختکارییانەدا تێبینی بکرێن (٨/٢١٨].

ئەو لێکۆڵەرانەی کە بەدرێژایی دەیەی رابردوو (هەشتاکانی سەدەی بیستەم)، لێکۆڵینەوەیان لەمەڕ قوربانیناسی (Victimology) ئەنجامداوە، بەشێک لە هۆکارەکان بۆ سێ جۆری (ژینگەیی، کۆمەڵایەتی و دەروونی) وەک هۆکارگەلێکی خەتەرناک (Risk Factor) لە قوربانیداندا پۆلین دەکەن [٤٨/٢١٨-٥٠]:

أ- هۆکاریی کۆمەڵایەتیی: پیشەو کارە خەتەرناکەکان (شوفێری، فەرمانبەرانی پاراستنی رێکوپێکی، کاروباری پۆلیسی)، شێوەی ژیان (نیشتەجێ بوون، رۆیشتن بۆنێوەندو گەڕەکە خەتەرناکە پڕ لە شەڕو دژوارەکان، پەیوەندیی لەگەڵ تاوانکاراندا...) هەلومەرجی کۆمەڵایەتی- ئابووری (هەژاری، نیشتەجێ بوون لەشوێنە ناخۆش و ناشارستانییەکاندا، دابڕان لە کۆمەڵگا، مەحروومبوون لە

بەهرەو شتەکان)، گۆشەگیریی کۆمەڵایەتی (ژیان لە ژینگەیەکی دوور لە خێزان، کۆچکردن، کارکردن لە شوێنی دوور لە ئاوایی).
ب- هۆکاریی ژینگەیی: تەمەن (لەتەمەنی جیاوازدا ئەگەری خەتەر جیاوازە)، رەگەز (جیاوازی نێوان ژن و پیاو)، هەلومەرجی جەستەیی (هێزی جەستەیی، نەخۆشیی و دەردەداری).
ج- هۆکاری دەروونی: بێئاگایی (سادە نوارین بێ ئیحتیاتی)، پشتبەستنی نابەجێ (لەدەستدانی هۆشیاریی و دیقەت)، بێ متمانەبوونی توندڕەوانە (سەرنج راکێشانی تاوانکاران بەهۆی ئیحتیات کردنی بێجێ و زیادەڕەویکردن لەئیحتیاتکردن)، لادانە سێکسییەکان (هۆمۆسێکسواڵی و......).

## مۆرکی لادانکاریی

پێدەچێ کەسێک هەڵسێ بەکارێک کە لە دیدی ئەوانی ترەوە بەلادان بژمێردرێت، بەڵام لەلایەن زۆرینەی تاکەکانی کۆمەڵگاوە مۆرکی تاوانکاری پێوەنارێت. لەگەڵ ئەوەشدا پێدەچێ کە زۆرێک لەخەڵک، تووشی جۆرێک تاوان هاتبن، بەڵام تەنها خەڵکێک مۆرکی تاوانکارییان پێوەدەنرێت. جیاوازی نێوان رێژەی لادان و رێژەی مۆرکی لادان ئەو راستییە دەخاتەڕوو کە ژمارەیەکی کەم لە خەڵکی پێدەچێ بەهیچ شێوەیەک لە خەڵکانی دیکەش جیاواز نەبن بەلانی کەم لەڕووی رەفتاری لادانکارییەوە، گرفتاری پرۆسەی مۆرک لێدان دێن [ ١٧٥/ ٦٢-٦٣].

پێدەچێ کە لە پرۆسەی (مۆرک لێدان) دا چەندین هۆکار بەشداری بکەن، ئەو هۆکارانەی کە دەبنە هۆی ئەوەی رەفتارێک بەلادان بژمێردرێت. ئەم هۆکارانە لەلای «ویلیەم گود» (W.J. Goode) بەم شێوەیە خراونەتەڕوو [٦٧/ ١٣٩-١٤٧]:
١- قابیلییەتی بینین: ئەگەر کەسێک لەکاتی ئەنجامدانی رەفتارێکی لادانکارییدا بەتەواوی ببینرێت لەلایەن خەڵکییەوە، ئەگەری لێدانی مۆرکی لادانکاری زیاترە بۆی.
٢- زۆر پشتیوانی نەکردن: ئەویش ئەوەیە کە توندیی و قوڵی دژایەتی لەگەڵ رەفتارێکی لادانکاریی تاچ رادەیەکە و بە چ جۆرێک لەلایەن خەڵکییەوە بۆ ئەو رەفتارە دەڕوانرێت، هۆکارێکی گرنگە لە چەسپاندنی مۆرکی تاوانکارییدا. لە

زۆربەی کۆمەڵگاکاندا لێدان و لە خەڵک هەڵدان وەک ڕەفتارێکی لادانکاری ناسێنراوە.

٣- دووبارەکردنەوەی سەرپێچی: بە ڕێژەیەک کە کەسێک کارێکی لادانکاری دووبارە و چەند بارە ئەنجام دەدات، ئیدی ئەگەری بەلادەر لە قەڵەمدانی ئەو کەسە لەلایەن خەڵکییەوە زیاتر دەبێت، چونکە ئەو ڕەفتارە لە ریزی تایبەتمەندییەکانی کەسێتی ئەو کەسە دەژمێرن.

٤- فشاری کۆمەڵایەتی: هەرکاتێک فشاری کۆمەڵایەتی لەکاتێکی تایبەتدا لەهەمبەر کارێکدا زیاتر بێت، توندی پەرچەکردار دژی ئەو فشارە کۆمەڵایەتییەش لەوانەیە زیاتر لێبێت. دەکرێت ئەم فشارە رووکاری سیاسی و تۆڵەیی تایبەت یان گرووپیی هەبێت. پۆلیس کاتێک دەڕوانن لە ڕۆژنامەکاندا رەخنە لە بەرزبوونەوەی رێژەی دزیکردن دەگرن، ڕەنگە بە شێوەیەکی توندترو زیاتر کاربکەن بۆ بەرگرتن لەو دیاردەیە.

٥- سەرچاوەو هەلومەرجی سەرپێچیکاران: کەسانێک کە بتوانن بەشێوەیەکی لێهاتووانەتر تاوان ئەنجام بدەن و تەکنیک و لێهاتووییان زیاتر بێت، بەگشتی کەمتر یاخود درەنگتر مۆرکی تاوانکارییان لێدەدرێت. تەنانەت کاتێک سەرپێچییەکەشیان ئاشکرا دەبێت، باشتر دەتوانن بەرگری لە خۆیان بکەن. کەم نین ئەو وڵاتانەی کە دادگاکانیان، لە نێوان هەژار و دەوڵەمەند یان ناسراوو نەناسراودا، لەکاتی روودانی کوشتنێکدا لەدادگاییکردندا جیاوازیی دەکەن.

**تیۆرەکان و لادانە کۆمەڵایەتییەکان**

کۆمەڵناسانی پێڕەوی قوتابخانەی وەزیفی، ڕەفتاری لادانکاریی لە ریزی ئەرک و ڕەفتارە دژێوەکان دادەنێن. ئەرکی دژێو (Dys Function) دەگەڕێتەوە بۆ دەرەنجامێک کە لە ڕەفتار، بیروبڕوا، یان چالاکی گرووپییەوە سەرچاوە دەگرێت و ڕەگوڕیشەی لە پێویستییەکانی وەزیفەی سیستمی کۆمەڵایەتیدا هەیە. بۆ نموونە وێکهاتنەوەی کەسێک لەگەڵ نۆرمەکانی سیستمێکدا لەسەرەکیترین پێویستییەکانی هەموو سیستمە کۆمەڵایەتییەکانەو سەرپێچیکردن لەم بنەمایانە حاڵەتێکی تێکدەرانە یان لاوازکەری هەیە، چونکە سیستمی کۆمەڵایەتی و ڕێککەوتن لەبارەی بەردەوامی سیستمی کۆمەڵایەتیدا دەخاتە مەترسییەوە [٥/١٩٠].

کۆمەڵناسی ئەمریکی «مارتن» بە لێکۆڵینەوە لەو تیۆرە جۆراوجۆرانەی کە لە حاڵەتی نەبوونی نۆرمدا خراونەتە روو، نموونەی تیۆرەکەی خۆی لەمەڕ راڤەو شیکردنەوەی لادانە کۆمەڵایەتییەکان. لەسەر ئەم سێ هۆکارە بینا دەکات:

١- ئامانجە کولتوورییەکان، کە ئەو خواست و ئارەزوو و مەیلە جۆراوجۆرانە دەگرێتەوە کەخەڵکی لە رێگەی کولتوورەوە فێریان بووە.

٢-پێوەرەکانی رەفتاری کۆمەڵایەتی، کە بریتین لەو میتۆدو هۆکارە گونجاوو پەسەندانەی کۆمەڵگا بۆ دەستخستنی ئامانجە کولتوورییەکان. بەدەربڕینێکی دیکە، کۆمەڵگا بەدانانی چەندین پێوەری رەفتاریی دیاریکراو، شێوازی دەستخستنی ئامانجە کولتوورییەکان دیاری دەکات، ئەم پێوەرانەش لەلایەن کولتوورەوە دیار و پشتگیریی دەکرێن.

٣- هۆکارە دامەزراوەکان: کە رۆشنکەرەوەی شێوەی دابەشکردنی تواناکان و هۆکارو چانسەکانە بۆ وەدەستخستنی ئامانجە کولتوورییەکان. بەدەربڕینێکی رۆشنتر پێویستە لە رێگەی ئەم توانایانەوە (امکانات) ئامانجەکان بەدەستبهێنرێن. «مارتن» دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە هەستکردن بە فشار، سەرگەردانی و سەرلێشێواوی تاک لە خودی خۆیدا بە هۆی هیچ کام لەو هۆکارانەی سەرەوە نییە بەتەنها، بەڵکو لە پەیوەندی نێوان ئەم هۆکارەکانەوە سەرهەڵدەدات. بونیادی کولتووریی کۆمەڵگا، تاکەکان دەخاتە بەردەم جۆرە ئامانجێکەوە، رێسا گەلێکیش لەو پێناوەدا بۆگەیشتن بە ئامانجەکان (وەک رێسایەکی پەسەند) دیاری دەکات. بەڵام لەوێوە کە هۆکاری پەسەند لەبەردەم هەموو کەسێکدا بە شێوەیەکی یەکسان نییە، ئیدی ئەمە دەبێتە مایەی نەگەیشتن بەئامانج و دروستبوونی هەستی سەرگەردانی لە نێوان خەڵکیداو رەفتاری لادانکاریی سەرهەڵدەدات. لە راستیدا بێئومێدی سەرچاوەگرتوو لە دابڕانی نێوان ئامانج و پێوەرو تواناکان دەبێتە هۆی ئەوەی کە وەلائی کۆمەڵایەتی خەڵک دەرهەق بە ئامانج و هۆکارە دامەزراوەکان سست ببێت و هەلومەرجی نائاسایی (بێ نۆرم) بێتەکایەوە.

«مارتن» دواجار دەگاتە ئەو دەرەنجامەی کە لەم سەروبەندەدا پێنج هەلومەرجی جیاواز لەبەرامبەر تاکدا هەیە کە پەیوەندیی بەپەسەندکردن یان پەسەندنەکردنی ئامانج و هۆکارە دامەزراوەکانەوە هەیە. ئەگەر پەسەندکردن بە نیشانەی (+) رەتکردنەوەش بە (-) دەستنیشان بکەین ئەم خشتە تایبەتەمان دەست دەکەوێت [١٩١/ ١٧٠-١٧٢].

| ڕێگاکانی وێکهاتنەوە | ئامانجی کولتووریی | هۆکارە دامەزراوەکان |
| --- | --- | --- |
| گونجان | + | + |
| داهێنان لەسەرپێچیکردندا | + | − |
| بڕیارگەرایی | − | + |
| گۆشەگیری | − | − |
| کودەتاو یاخیبوون | ± | ± |

بەپێی ئەو خشتەیەی کە «مارتن» دەیخاتە ڕوو تەنیا لە حاڵەتی پەسەند کردنی ئامانجی کولتووریی و هۆکاریی دامەزراودا تاک دەگاتە حاڵەتێکی گونجاو چوار ڕێگەکەی دیکە جۆرێکن لە ڕەفتاری لادانکاریی. داهێنەرانی سەرپێچیکردن (دزەکان، بەرتیل خۆران، ساختەچییەکان،...) ئامانجە کولتوورییەکان پەسەند دەکەن بەڵام هۆکارەکان ڕەت دەکەنەوە، بڕیارگەراکان (ئەو کارمەندانەی کە تەنیا لە بڕیارەکان دەڕوانن) ئامانجە کەلتوورییەکان پشتگوێ دەخەن. گۆشەگیرەکان (ئالوودەبووان، مەیخۆران و...) ئامانج و هۆکارەکان پشتگوێ دەخەن، دواجار یاخیبووە کودەتاچییەکان لە هەوڵی سەقامگیری ئامانج و هۆکاری دامەزراوەیی دیکەدان و لە هەمان کاتدا ئەوەی کە هەیە ڕەتدەکەنەوە [ ١٩١/ ١٧٠-١٧٢].

لە حاڵێکدا کە «مارتن» پێی وایە لادانکاریی لە ئەنجامی نەتوانینی تاکەوە بۆ دەستخستنی ئامانجە چاوەڕوانکراوەکانی کۆمەڵگاوە سەرهەڵدەدات، «ریزمن» لەو باوەڕەدایە کە لە کۆمەڵگا تەقلیدییەکاندا، ڕەفتاری خەڵکان لە ڕێگەی تەقلیدەکانەوە ڕێنمایی دەکرێت. لەم کۆمەڵگایانەدا کۆمەڵێک نەریتی لەگەڵێکدا گونجاو دەبنە هۆی ڕێنمایی کردنی ڕەفتارەکان و لادان لە ڕەوشی باڵادەست یەکجار سنووردارە. لە بەرامبەریشدا لە کۆمەڵگا نوێیەکاندا ڕەفتاری مرۆڤەکان لەسەر بنەمای ڕەوشێکە کە نەک لە ڕێگەی نەریت، بەڵکو لەلایەن ئەوانی دیکەوە ڕێنمایی دەکرێن. «ریزمن» ئەوە بەبیر دێنێتەوە کە چەند سەدەیەک لەمەوبەر لە کۆمەڵگا خۆرئاواییەکاندا خەڵکی لە ڕێگەی هۆشیاریی دەستەجەمعی و لەسەر بنەمای نۆرمە باڵادەستەکانی ژیانی خێزانی و کۆمەڵگاییەکان لە گرووپەکاندا بەشێوەیەکی هێمن و ئارام دەژیان. ئەمڕۆکە کەسێتی مرۆڤەکان لەلایەن ئەوانی

دیکەوە ڕێنمایی کراوەو لەوێوە کە نەریتی گونجاو و کۆمەڵگای ئارام بوونی نییە، ڕێنماییەکی ڕۆشنیش کە بتوانێت ڕێنمایی ڕەفتاری تاک بکات بوونی نییەو ئەوەی دەمێنێتەوە «دادوەرییەکانی ئەوانی دیکە»یە. بەئاوڕدانەوە لەوەی کە لە کۆمەڵگا نوێیەکاندا چەندان گرووپی زۆر بە خۆیان و نۆرمی ڕەفتاریی جۆراوجۆرەوە لە ئارادان، حەزکردن لە ئەوانی دیکەش ڕێنماییەکی شایانی پشت پێبەستن بۆ تاکەکان وەبەرناهێنێ. ئەنجامەکەشی ئەوەیە کە ڕەفتارەکان سیفەتی جێگیریی و بەردەوامی لە دەست دەدەن و پشت بە هیچ نۆرمێکی جێگیر نابەستن. «ریزمن» دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە لەو ڕووەوە کە لەکۆمەڵگا گۆڕاو و ئاڵۆزەکانی هەنووکەدا بوونی گرووپی ئارام و جێگیر شتێکی مەحاڵە، دواجار خەڵکانی ئۆتۆنۆم (خودموختار) پەیدا دەبن کە بەبێ بوونی ڕەگ و ڕیشەیەک لە کۆمەڵگایەکی ئارامدا و بەبێ هەستی پەیوەستیی بەگرووپێکی دیاریکراوەوە، بەو شێوەیەی خۆیان ئارەزوویان لێیە کاردەکەن. بەکورتییەکەی «ریزمن» بڕوای وایە کە نەبوونی ڕەگوڕیشە لە نەریت و تەقلیدەکانی کۆمەڵگاو بوونی هەستی ئۆتۆنۆمی، هۆکاری سەرهەڵدانی ڕەفتارە لادانکارییەکانە [١٧٣/٧].

«مەک کلۆسکی» (Mc closky) و «شار» (Schaar) پێیان وایە کە ڕەنگە نەبوونی نۆرم تەنیا یەکێک بێت لەڕەهەندە تێکدەرو نێگەتیڤەکانی ژیان و کۆمەڵگا. ئەوان بەڵگەگەلێک پیشان دەدەن کە لەسەر ئەو بنەمایە ڕەفتارە لادانکارییەکان تەنها لە نێوان ئەو کەسانەدا سەرهەڵنادات کە بەگوتەی «مارتن» دووچاری شکستی سەرهەڵدراو لە مەحروومبوون هاتوون، بەڵکو ڕەنگە لە نێوان خەڵکانی زۆر سەرکەوتووشدا بەهەمان شێوە ڕەفتاری لادانکاری دەربکەوێت. ئەو زانایانە بەپشتبەستن بە زانیارییەکانیان ئەوەیان نیشانداوە کە ئەو کەسانەی لە ئاستێکی باڵای ڕەفتاری لادانکاریدان، هەمان ئەو کەسانەن کە لە دوژمنایەتی لەگەڵ خەڵکاندا، شلۆقی و ڕاڕایی، بەدبینی، ڕەفتاری سەرکوتکارانە، و چەندانی دیکە لە نیشانەکانی «نامۆبوون» لەلایان بوونی هەیە.

کۆمەڵناسانی پێڕەوی «قوتابخانەی ململانێ» لەو باوەڕەدان کە خودی ژیان بریتییە لە کۆمەڵێک دژایەتی و ململانێ و کێبەرکێ و ڕووبەڕووبوونەوە. هەرکەسێک، هەر گرووپ و میللەتێک لە هەوڵی بەدەستهێنانی شتگەلێکدایەو ئەم هەوڵەش ڕەنگە پشتبەستوو بە هاوکاریی یان یەکگرتنی ئەوانی دیکەش بێت، بەڵام لە دواجاردا هەموو هەوڵێکی ئێمە ئەوەیە کەسەرچاوە دیاریکراوەکان لە ژێر

کۆنترۆڵی خۆماندا دابنێین، لێرەوەیە کە کێبەرکێ تۆخمێکی سەرەکییە لە مەیدانی بازاڕداو هەر کێبەرکێیەک بە ڕەهەندێکی سەرەکی ژیانی کۆمەڵایەتییەوە پەیوەندە و لێرەوەیە کە ڕەفتارە لادانکارییەکان دەخرێنەروو [٤٣/١٩٢].

**دیدگا تیۆرییە جیاوازەکان دەربارەی لادانکاریی [٢١٩/٣]**

| دیدگا | خاڵی بنەڕەتی | بەڵگە | سەرچاوەی لادان | باشترین نموونە |
|---|---|---|---|---|
| فشارە بونیادییەکان | بۆچی ڕێوڕەسمە کۆمەڵایەتییەکان پێشێل دەکرێن؟ | کۆمەڵگە لە ڕێگەی فشارە بونیادییەکانەوە لادان پەیدادەکات. | خەڵکی ناتوانن لە ڕێگەی هۆکارە پەسەند کراوەکانەوە بگەنە ئامانجە کولتوورییەکان | دزیکردن لای چینە زۆر هەژارەکان |
| گواستنەوەی کولتووریی | بۆچی لادان لەلای هەندێک زیاترە لە لای هەندێکی دیکە؟ | ڕەفتاری لادانکاریش وەک هەر ڕەفتارێکی دیکە چانسی فێربوونی هەیە. | خەڵکی دەکەونە ژێر کاریگەری وردە کولتوورەکان و ڕەفتارەکانی خۆیانی لێوە بەدەستدەخەن. | باندە خراپەکارەکان |
| دژایەتی | بۆچی هەندێ کەس هەموو شتێکیان هەیە و هەندێکیش بێبەشن و مۆرکی لادانکارییان لێدەدرێت؟ | سیستمی دامەزراوەیی هۆکاریی دژایەتی نێوان گرووپەکانە. | ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی هۆکاری نابەرامبەریی و کێبەرکێیە. | تاوانە سیاسی و ئابوورییەکان |
| مۆرکلێدان | چۆن چۆنی مۆرکی لادانکاریی لە خەڵک و ڕەفتارەکان دەدرێت؟ | هیچ کەس و هیچ کارێک لەخودی خۆیدا لادەرنییە. لادان بریتییە لە پێناسەیەکی کۆمەڵایەتی. | ئەو کەسانەی کە مۆرکی لادانکارییان لێدەدرێت لادەر دەردەچن. | لادان لە نێوان کەسە بێ تواناکاندا. |

لەکۆتایی ئەم بەشەدا دەبێ ئەوەش بڵێین کە نزیکەی هەموو بیرمەندانی لادانکاری لەسەرئەوە تەبان کە «بێ نۆرمی» تەنها هۆکاری دەرکەوتنی ڕەفتارە

لادەرەکان نییە، بەڵام ئەمەی کە گرنگی ئەم (بێ نۆرمی) تا چ رادەیەکە و چۆن چۆنی رەفتارە لادەرەکان دێنێتەکایەوە، خاڵێکە کە بەبێ وەڵام ماوەتەوە [١٣٤/ ٦٧٥-٦٧٦].

## نامۆ بوونی کۆمەڵایەتی

نامۆبوون (Alienation) هەلومەرجی کەسێکە کە لە خۆی بێگانە بۆوە. چەمکی فرەڕەهەندی زاراوەی نامۆبوون ئەوە بەدەردەخات کە بەکارهێنانی ئەم چەمکە تەنیا لە بواری کۆمەڵناسیدا نییە، بەڵکو لە بواری ماف، شیتەڵکاری دەروونی و فەلسەفەشدا سوود لەم چەمکە وەرگیراوە. نامۆبوون لەگەڵ دەرکەوتنی لادانکاریدا پەیوەندیی هەیە و رەنگە بتوانرێت بانگەشەی ئەوە بکرێت کە دەتوانێت لە هەندێ کاتدا زەمینە بۆسەرهەڵدانی هەندێ لادانی کۆمەڵایەتی بڕەخسێنێت، لێرەوە لەم فەسڵەدا باسێکی کورت لەسەر ئەم بابەتە دەخەینەڕوو.

بەپێی دیدگای «مارکس» و گرووپێک لەپێڕەوانیی، کارکردن و بەتایبەت کاری زنجیرەیی و بەش بەش بوو (بەشێوەیەک کە لە یەکە پیشەسازییە گەورەکاندا هەیە) کە لە بارودۆخ و هەلومەرجێکی پۆلیسی و لەژێر کۆنترۆڵێکی توندوتیژدا ئەنجام دەدرێن، بۆ بەشێکی زۆر لە کرێکاران هۆکاری سەرەکی نامۆ بوونە. بەڵام لە پشتی ئەم نامۆبوونەوە، کۆمەڵگای نوێ بەدیهێنەری جۆری نوێی نامۆبوون بووە؛ بۆ نموونە نامۆبوون بەهۆی ژیان لەشارە گەورەکاندا، نامۆبوون بەهۆی زیادە مەسرەفیی لە ئەنجامی راگەیاندنەوە، نامۆبوون بە هۆی شێوازە نوێیەکانی گوزەراندنی و کاتی دەست بەتاڵی؛ کەلە هەلومەرجێکی هەڵچوون ئامێز، رەسمیی و چەقبەستوودا شکڵ دەگرێت.

چەمکی نامۆبوون لە ساڵی ١٨٤٤دا لە نووسینەکانی مارکسدا دەرکەوت. بەبڕوای ئەو کارکردن ئەو توخمەیە کە مرۆڤ لە ئاژەڵان جیادەکاتەوەو شتێکی تایبەتە بە مرۆڤەوە. لە وێوە کە مرۆڤ کاری خۆی بەرەو دەرەوەی خۆی کە دەرهەق بەئەو بێگانەیە؛ دەگوێزێتەوە. ئیدی هۆکاری نامۆبوون بۆخۆی فەراهەم دەکات. دواجار بەبڕوای «مارکس» نامۆبوون هاومانای چەمکی (المطابقە)بوونی مرۆڤە لە سیستمی بەرهەمهێناندا. دەکرێ بەڵگەی نامۆبوونی مرۆڤ لەو واقیعەوە تێبینی بکرێت کە لە سیستمی سەرمایەدارییدا هۆکاری بەدەستهێنانی بژێوی تاک لە دەستی ئەوانی دیکەدایە، و هێزی نامرۆیی بەسەر هەمووشتێکدا زاڵە

[١٢٤/١٩٣]. کەواتە نامۆ بوون، بریتییە لە ژێر دەستبوونی مرۆڤ لەلایەن هێزێکی نامرۆییەوە کە کرێکار دەگۆڕێت بۆ ئامێرێک، بۆ بەدەستهێنانی ئامانجە تاکانەییەکانی خۆی. ئەنترۆپۆلۆژیای کولتووریی بەپشتبەستن بەچەمکی مارکسیستی، نامۆبوون سێ لایەن یاخود شێوازی دابڕانی تاک لە بوونی واقیعی خۆی بە روونکردنەوەی خوارەوە لێک جیادەکاتەوە؛

١- نامۆبوونی کۆمەڵایەتی: بەم پێیە تاکی نامۆ بە پاڵپشتی جۆرێک لە تەبایی کوێرانە لەبەرامبەر سیستەمی کۆمەڵایەتی- ئابووریدا کە لە بەردەمیدایە، لە حاڵەتێکی وابەستەییدایە. ئەو کەسە کۆیلەی بەڵگە گەلێکی نهێنی ئامێزە کەتەنیا رووکارە پۆزەتیڤەکانی سیستەمی کۆمەڵایەتی و ئابووری بەهێزدەکات، و واقیعی راستی هەلومەرجی نامۆکەر دەشارێتەوە.

فشاری هۆکارە نوێیەکانی پڕوپاگەندەی بازرگانی، و بەتایبەت جودایی کرێکاران لە نێوەندی دەسەڵات و بڕیاردانی سیاسی، لە سیستەمێکدا کە وەزیفەکەی دووچاری تێکچوون بووە، لە هۆکارە سەرەکییەکانی نامۆبوونی کۆمەڵایەتین. پێویستە ئاماژە بەوە بکرێت کە وابەستەیی یان تەبایی تاک لە ناو سیستەمێکدا بەتەنیایی و بەبێ لەبەرچاو گرتنی هەلومەرجی ئەو سیستەمە، ناتوانرێت بە نامۆبوون دابنرێت. پێویستە لێرەدا دووحاڵەتی تایبەت لێکدی جودا بکرێنەوە. یەکەم تەبابوونی رەخنەگرانەیە، واتە پەسەندکردنی هۆشیارانەی نۆرمەکانی سیستەمێکی کۆمەڵایەتی و ئاگایی هاوکات لەگەڵ رەخنەگرتن دەرهەق بەکارکردنی ئەو سیستەمە، لە حاڵەتێکدا کە لە بواری دووەمدا تاک بە شێوەیەکی نائاگاو کوێرانە لە سیستەمەکەدا نغرۆ دەبێت، تاک بڕوای بەسیستەمەکە هەیەو دەرهەق بەو سیستەمە (المطابقە) (Identification) دەکات. کەئەم حاڵەتە دەبێتە هۆی نامۆبوونی کۆمەڵایەتی. هەڵبەت لە حاڵەتێکدا کە سیستەمی کۆمەڵایەتی رووبەڕووی تێکچوون دەبێتەوە. ئەم حاڵەتە وەختێک روودەدات کە تاک دەرهەق بە سیستەمی بەرهەمهێنان لە کۆمەڵگادان(المطابقە) بکات، لەهەمانکاتیشدا باڵادەستی ئەو بەهایانە بوونە هۆی سەرکەوتن لە کۆمەڵگادا بەبێ هیچ دوودڵییەک پەسەند بکات [١٨٨/٢٩-٣١].

٢- نامۆبوون لە سیستەمی کولتووریدا: ئەم شێوەیەی نامۆبوون رەهەندێکی ئایدیۆلۆژی هەیەو بەمانای پەسەندکردنی تەقلیدی سیستەمی کۆمەڵایەتی و لە هەمان کاتدا رەتکردنەوەی هەر جۆرە باس و گفتوگۆیەکی رەخنەگرانەیە.

٣- نامۆبوون لە سیستەمی «من»ی تاکدا. لەم حاڵەتەدا تاک بەبەشێک لە

کەسایەتی خۆیدەگات، بەدەربڕینێکی دیکە خۆی بە «من»ی خۆیەوە وابەستەدەکات. بەم پێیە «من»ی ئەو بۆخۆی ڕەهەندێکی ڕەهای هەیەو ئەوانیدیکە جگە لە هۆکارو شتگەلێک هیچی دیکەنین. ئیدی جۆرێک لە خۆپەسەندی سەرکوتکارانە لەو کەسەدا بەدیاردەکەوێت و ئەگەری هەرجۆرە پەیوەندییەکی مرۆییانەی ئەو کەسە لەگەڵ خەڵکانی دیکەدا لەبەین دەچێ.

لە بواری دیاردەی نامۆبووندا دەتوانرێت دوو ڕەهەند لە یەکدی جیابکرێنەوە. کە لە هەمان کاتدا وابەستەی یەکتریشن، بەم شێوەیە:

١- لەبەین چوونی کەسایەتی سەربەخۆ، ڕەسەن و واقیعی تاک، واتە جیابوونەوە لەوەی کەسازێنەری خودی مرۆییە. تاک لە ژیانی ڕۆژانەی کۆمەڵایەتیدا بەشداریکردنی هۆشیارانەی لە دەستداوە.

٢- نامۆبوون لە سیستمێکدا کە وەزیفەی ئەو سیستمە ڕووبەڕووی تێکچوون بۆتەوە.

بەڵگە نەویستە نامۆبوون بەو شێوەیەی کە ڕاڤەو شرۆڤە کرا، واتە نامۆبوون لە دیدگای مارکسیستییەوە چیدی ناتوانێت بەهەمان ئەو شێوەیەی کە لەکۆمەڵگای سەرمایەداری زەمانی مارکسدا (واتە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم) ڕاڤە وشرۆڤە دەکرا، لە ئارادابێت. نامۆبوون لە کۆمەڵگای ئەمڕۆدا گۆڕاوە بۆ دیاردەیەکی کۆمەڵناسیی. کە پەیوەندی بە هۆکاری کۆمەڵایەتی- کولتووریی، جوگرافیی و مێژووییەوە هەیە [١٢٤/١٩٣].

چەمکی نامۆبوون، سەرەڕای ئەو نارۆشنییەی هەیە، ئەمڕۆکە لە نووسراوە کۆمەڵناسییەکاندا بەکاربردنێکی فراوانی هەیەو گرووپێک لە لێکۆڵەران لە وەسفی جۆرە جیاوازەکانی نەخۆشییەکانی شارستانییەتی هاوچەرخ، سوود لەم چەمکە وەردەگرن. هەندێکیان ئەم حاڵەتە بەنەخۆشییەکی کوشندە دادەنێن و هەندێکی دیکەش بەنەخۆشییەکی سەردەمی منداڵی شارستانییەتی پیشەسازیی دەژمێرن [١٨٧/٢-٣].

### کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی

کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی (Social Control) پرۆسەیەکە کە لە ڕێگەیەوە لە گرووپێکدا یان لە کۆمەڵگایەکدا، شێوازی تەبایی لەگەڵ نۆرم و نموونە ڕەفتارییەکاندا ئەنجامگیری دەکرێت. بێگومان یەکەمین هۆکاری کۆنترۆڵی

کۆمەڵایەتی خودی خۆمانین. هەر یەکێک لە ئێمە خاوەنی لێپرسراویگەلێکن و جۆرێک لە کۆنترۆڵ لەسەرکارەکانی خۆمان پیادە دەکەین. بەڵام لەوێوە کە لە گۆشە گیریدا ناژین، و لەژێر دەسەڵاتی خیزان، گەڕەک، دۆستان، و سیستمی پەروەردەییداین، ئیدی تەواوی ئەو هۆکارانە لە پرۆسەی ئاشنا کردنی ئێمەدا بە بەهاکانی کۆمەڵگا چالاکییان هەیە. هەر کاتێک ئەم هۆکارانە نەتوانن ڕۆڵی پێویست لە ڕووی کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتییەوە لەسەر ڕەفتار ئەنجام بدەن، ڕەنگە ڕەفتارێکی یاسا پێشێلکارانەمان هەبێت و لەگەڵ پۆلیس، یاساو دادگا، واتە لەگەڵ بەشێکی دیکە لە هۆکارەکانی کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتیدا ڕووبەڕوو ببینەوە [١١٦/١٤٧-١٤٨].

لە کاروباری کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتیدا، یاساکان خاوەنی گرنگییەکی تایبەتن و ڕۆڵی ئەوان کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتییە لەسەر کەسانێک کە لەگوێڕایەڵی نۆرمە کۆمەڵایەتییەکان سەرپێچی دەکەن. لە بنەڕەتدا یاساکان بۆ ئەوە نوسراونەتەوە کە توانا ببەخشنە خەڵکی تاکو بەشێوەیەکی ڕێکخراو لە کۆمەڵگادا پێکەوە بژین و کاری یاساکانیش لە کۆمەڵگادا بەڕێگەی جۆراوجۆر پیادە دەکرێت. بەم پێیە هەندێ جار گوتراوە کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی پرۆسەیەکە لە ڕێگەیەوە سیستمێک لە کۆمەڵگادا بەرقەرار دەبێت. بەزۆری ئاشکراترین رووکاری مەحکەمی کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی لە ڕێگەی پۆلیس و هێزەکانی ئاسایش، یاساکان، و دادگا جۆراوجۆرەکانەوە بەرقەرار دەبێت. بەڵام دەشزانین کە کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتیش هەمیشە بە بەشێک لە پرۆسەی بەکۆمەڵایەتیبوون دەژمێردرێت. تاکەکان هاوکات لەگەڵ گەشەی کۆمەڵایەتی خۆیاندا دابونەریت و رسوماتی کۆمەڵگا پەسەند دەکەن و ئەم کارەش لە ڕێگەی گرووپ و دەزگای وەک خێزان، گرووپەکانی دۆستان، قوتابخانە، زانکۆ و شوێنی کارەوە دەستبەکاردەبێت. ئاساییە کە وەختێک کەسێک سەرپێچی لە نۆرمەکان دەکات، فشاری نۆرمە کۆمەڵایەتییەکان حوکم دەکات کە داوا لەو کەسە بکرێت سەرلەنوێ لەگەڵ نۆرمەکاندا تەبابێتەوە. بەبێ ئەم جۆرە کۆنترۆڵانە سیستمی کۆمەڵایەتی بەرقەرار نابێت [١٨/١٨٧].

چۆن چۆنی کۆمەڵگا دەتوانێت لەوە دڵنیابێت کە نۆرمە بنەڕەتییە کۆمەڵایەتییەکان چاودێریی و پارێزگاری دەکرێن؟ بە سەرنج دان لەوەی کە کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی بۆ تەکنیک و ستراتیژێک کە لە پێناوی ڕێکخستنی ڕەفتاری مرۆیی لە کۆمەڵگادا هاتۆتە بوون، دەگەڕێتەوە، ئەنجامەکەی ئەوە دەبێت کە کۆنترۆڵی

کۆمەڵایەتی لە هەموو ئاستەکانی کۆمەڵگادا بەکار دەبرێت. ئێمە لە خێزاندا فێردەبین کە گوێڕایەڵی دایک و باوکمان بکەین. لە نێو گرووپی دۆستاندا پێویستە پێڕەوی لەبنەما باڵادەستەکانی ئەو گرووپە بکەین و لەدامەزراوە ئیدارییەکانیشدا ناچار دەبین کە سیستمی رەسمی یاساو رێوڕەسمەکان بپارێزین. لە کۆتاییدا حکوومەتیش لە هەر وڵاتێکدا بە دانانی یاساو رێوڕەسم و کۆنترۆڵ لەسەر پراکتیک کردنیشی بەپێی پێویست خەڵکی ناچار دەکات بۆ پێڕەویکردنی لەو یاساو رێوڕەسمە [ ٢٠/١٥٢].

**چاکسازییە کۆمەڵایەتییەکان**

زۆرێک لە خەڵکی بڕوایان وایە کە لەبارەی هەر جۆرە رەفتارێکی لادانکاری، یان هەلومەرجێکی نەخوازراودا، ئەنجامدانی چەند هەنگاوێک مومکینە و دواجار دەتوانرێت هەرجۆرە گرفتێکی کۆمەڵایەتی چارەسەر بکرێت. ئەو شتەی چاوەڕوان دەکرێت ئەوەیە کە بە بەرنامەرێژیی تایبەت بتوانرێت لانی کەم لە رادەی توندیی و کاریگەریی هەندێ گرفت کەم بکرێتەوە. بەم پێیە، فشاری کۆمەڵایەتی بەگشتی لە رووی هێنانە ئارای گۆڕانکارییە خوازراوەکان، چاککردنی رەفتارەکانی خەڵکی، و نوێکردنەوەی بونیادی دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکانەوە زیادە. لەگەڵ ئەوەدا کە دڵبەستنی تاکەکانی کۆمەڵگا بەکاریگەریی هەنگاوەکانەوە لە رووی کەمکردنەوەی لادانە کۆمەڵایەتییەکانەوە زۆرە، بەڵام چەندین گرووپی مرۆییش هەیە کە ئاڵۆزییەکانی پەیوەندیدار بە پرۆسەی ئەنجامدانی چاکسازییە کۆمەڵایەتییەکان ئەوەندە بەگرنگ ناگرن و هەرواش رەخنەگرانی بواری کۆمەڵایەتی و رەوشی چاکسازییە کۆمەڵایەتییەکان دیدگای یەکسانییان لەهەمبەر چارەسەری کێشەکاندا نییە [١٢/ ٤٢٣-٤٣٠].

رەنگە هەموو بانگەشە چاکسازیخوازییەکان نەبنە چاکسازییەکی واقیعی. هەندێ لە چاکسازییەکان بوارێکی سنوورداریان هەیە و بەرووکەش دەژمێردرێن. تەنانەت لە هەندێ باردا بەشێک لە چاکسازییەکان دەبنە هۆی پاراستنی گرووپی سەرپێچیکاری دیکە، بەم پێیە هەندێ لە لێکۆڵەران زەروورەتی بەکارهێنانی چاکسازی بونیادی لە جێگەی چاکسازیی رێژەیی. لە چاکسازیی رێژەییدا رەگوڕیشەی سەرهەڵدانی کێشەکان لە ناوناچن. رەنگە چاکسازانی کۆمەڵایەتی زیاتر قەناعەتیان بە بەرقەراربوونی هاوسەنگی هەبێت. لە چاکسازیی بونیادییدا

گۆڕان لە بەهاکان، ئیمتیازەکان، ڕەفتارو سیستەمەکاندا لە ئارادایە و بواری کارەکە تەنیا بەخستنەڕووی بەرنامەیەک یان سیاسەتێکی نوێ کۆتایی نایەت. هەڵبەت لە هەندێ حاڵەتدا ڕێگەچارەکانیش دەبن بەگرفت. لەگەڵ ئەوەشدا کە لە کۆمەڵگادا چەندین دەزگاو دامەزراوە بۆ هێنانەدی سیاسەتێکی کۆمەڵایەتی تایبەت، دەرمانی نەخۆشیی و تەنگ و چەڵەمەکان، و چارەسەریی کێشە و گرفتەکان یان ڕەفتارە لادانکارییەکان، دێنەکایەوە، بەڵام ڕێک دەکەوێت کە خودی ئەم دامەزراو نە دەبنە بەدیهێنەری گرفتی تایبەت. ڕەنگە دەزگاو هەلومەرج و ڕەفتارەکانی دامەزراوەیەکی چارەسەرکار، گرفتی نوێ بۆ نەخۆشەکان یان کەسانی دەوروبەریان بخوڵقێنێ. زیندانەکان لەبەر خاتری چاککردنی ڕەفتاری تاوانکاران دروستکراون، بەڵام ڕەنگە هەندێ جار گرفتی نوێ بۆ زیندانییەکان یان بۆ کۆمەڵگا بخوڵقێنن [١٢/٤٢٣-٤٣٠].

## کورتەی بەش

١- هەموو کۆمەڵگایەک لە ڕێگەی نۆرمەکانەوە، ڕەفتارەگونجاوەکان دەستنیشان دەکات.

٢- پێناسەی هەندێ لە نۆرمەکان وەک ڕەفتارێکی لادانکاریی لەپێناو بەهێزکردنی نۆرمە کۆمەڵایەتییەکانە.

٣- نۆرم بنەمایەکی ڕەفتارییە کە ڕەفتاری تاکەکان لە هەلومەرجێکی دیاریکراودا دەستنیشان دەکات.

٤- نۆرمە کۆمەڵایەتییەکان لە ڕێگەی ئایین، یاسا، حکومەت و ئەزموونە تاکانەییەکانەوە فۆرمۆلە دەبن.

٥- هەموو نۆرمەکانی کۆمەڵگا گرنگی یەکسانیان نییە.

٦- «سامنێر» نۆرمەکان بۆ سێ گرووپ پۆلێن دەکات، شێوازە مییللییەکان، رسووماتی کۆمەڵایەتی، و یاساکان.

٧- لە بەرامبەر نۆرمە ڕەسمیی و نارەسمییەکاندا وەڵامی پۆزەتیف و نێگەتیف هەیە.

٨- نۆرمەکان لە هەموو هەلومەرجێکدا پارێزگاریی ناکرێن.

٩- بەها کۆمەڵایەتییەکان ئەوە دەستنیشان دەکەن کە چ شتێک چاک، خراپ، دروست یان نادروستە.

١٠- بەهاکان وەک پێوەرێک بۆ هەڵسەنگاندنی کاری خەڵکی سوودیان لێوەردەگیرێت.
١١- بەهاکان لە کۆمەڵگا جیاوازەکاندا پێکهاتەو گرنگیی رێژەیی جیاوازیان هەیە.
١٢- مەیلەکان بریتین لە ئامادەگیی هەنگاونان یارەفتار بەشێوەیەکی تایبەت.
١٣- دەکرێ مەیلەکان لەسەر بنەمای کلێشەسازیی پێکهاتبن.
١٤- لە راڤەو شرۆڤەی لادانە کۆمەڵایەتییەکاندا سوود لە چەمکی دیکەی وەک گرفتە کۆمەڵایەتییەکان، پاشاگەردانیی کۆمەڵایەتی، زیانناسیی کۆمەڵایەتی وەرگیراوە.
١٥- هەرکارێک یان بەیانێک کەلەلایەن ئەندامانی کۆمەڵگاوە بەلادان لە نۆرمە گرووپییەکانی بناسرێت رەهەندێکی لادانکاری هەیە. لادان ناتەباییە لەگەڵ نۆرمە گرووپییەکاندا.
١٦- لادان رێژەییەو حاڵەتێکی رەها (مطلق)ی نییە.
١٧- دەتوانرێت رەگ و ریشەی لادانە کۆمەڵایەتییەکان لە: گۆڕانی نۆرمەکان و نەبوونی نۆرم، دژایەتی بەهاکان، پێناسەی نوێ بۆ شتەکان، لە دەستچووەکان، دەستنەگەیشتن بە ئامانجەکان، دژایەتی نێوان ئامانج و هۆکارەکان، نەبوونی غیرەت و مەردایەتی، و بارهاتوویی کۆمەڵگا لەبەرامبەر هەندێ لە تاوانکاراندا؛ پۆلێن بکرێت.
١٨- قوربانییانی لادان کەسانێکن کە بە هۆی هۆکارێکی دەرەکی تووشی زیان دەبن.
١٩- قوربانییان لە لێکۆڵینەوە لادانکارییەکاندا بەزۆری کەسانێکی فەرامۆشکراون.
٢٠- دەتوانرێت هۆکارە خەتەرناکەکانی بە قوربانیبوون بۆ سێ بەش پۆلێن بکرێن: هۆکاری ژینگەیی، کۆمەڵایەتی و دەروونی.
٢١- کۆمەڵگا مۆرکی تاوانکاری تەنها لە کۆمەڵێک خەڵک دەدات.
٢٢- مۆرک لێدان پەیوەندی هەیە بە: قابیلییەتی بینینی لادان، توندی بەرپەرچ دانەوە، دووبارەکردنەوەی سەرپێچی، فشاری کۆمەڵایەتی، سەرچاوەکانی سەر پێچیکارانەوە.
٢٣- بە تێڕوانینی قوتابخانەی وەزیفی رەفتارە لادانکارییەکان بە کارێکی

نیگەتیڤ دەژمێردرێن.

٢٤- تیۆری «مارتن» لەبواری رەفتاری کۆمەڵایەتیدا، لەسەر پەیوەندی نێوان سێ بنەمای: ئامانجە کولتوورییەکان، کۆنترۆڵی رەفتاری کۆمەڵایەتی و هۆکارە دامەزراوەکان شێوەیان وەرگرتووە.

٢٥- مارتن پێنج رێگەی جێبەجێ کردن لەیەکدی جیادەکاتەوە:گونجان، داهێنان لە سەرپێچیکردندا، بڕیارگەرایی، گۆشەگیری، یاخیبوون و کودەتا.

٢٦- «ریزمن» پێی وایە کە لە کۆمەڵگای پیشەسازییدا رەفتاری خەڵک لەسەر بنەمای نەریتەکان نییە، بەڵکو لەسەر بناغەی ئەوانی دیکە فۆرمۆلە دەبێت.

٢٧- بە بڕوای «ریزمن» نەبوونی رەگوڕیشەی نەریتەکان لە کۆمەڵگاداو هەستکردن بە خۆڕێبەری (خودموختاری) هۆکاری سەرهەڵدانی رەفتارە لادانکارییەکانی کۆمەڵگا پیشەسازییەکانە.

٢٨- پێڕەوانی قوتابخانەی ململانێ، کێشمەکێش و کێبەرکێکانی نێوان تاکەکان بەهۆکاری رەفتارە لادانکارییەکان دەزانن.

٢٩- بە بڕوای «مارتن»، لادان لە ئەنجامی نەبوونی توانایی تاک بۆ وەدەستهێنانی ئەو ئامانجانەی کە کۆمەڵگا چاوەڕێیەتی دروست دەبێت.

٣٠- نامۆبوون هەلومەرجی کەسێکە کە دەرهەق بە خۆی بێگانە دەبێتەوەو دەتوانێت بواری دەرکەوتنی رەفتارە لادانکارییەکان هەموار بکات.

٣١- لە زانستی ئەنترۆپۆلۆژیای کولتووریدا نامۆبوون بۆ سێ بەش دابەش دەکرێت: کۆمەڵایەتی، سیستمی کولتووریی، و سیستمی «من»ی تاکانەیی.

٣٢- شێوەی گونجان لەگەڵ نۆرم و نموونە رەفتارییەکاندا، لە پرۆسەی کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتییەوە وەردەگیرێت.

٣٣- مەبەست لە کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی تەکنیک و ستراتیژێکە کە لە پێناو رێکخستنی رەفتاری مرۆییەوە لە کۆمەڵگادا دێتە بوون.

٣٤- کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی لە هەموو ئاستەکانی کۆمەڵگادا پیادە دەکرێت و هۆکارەکانی کۆنترۆڵ فرەجۆرن.

٣٥- لە پرۆسەی کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتیدا یاساکان خاوەنی گرنگییەکی تایبەتن.

٣٦- کایەی چاکسازییە کۆمەڵایەتییەکان لە سەرو بەندی پێشکەشکردنی رێگە چارەیەکدایە بۆ لەناوبردنی رەفتارە لادانکارییەکان.

تەنانەت لەکات و سەردەمی ئێمەشدا کە بەتەنها ژیان، لە دەرەوەی کۆشی خێزان لەهەر زەمانێکی دیکە ئاسانتر دێتە پێش چاو، زۆربەی بەتەمەنەکان پێیان باشە کە دوای تەواو کردنی سەعاتەکانی کاری رۆژانە بگەڕێنەوە نێو خێزان و کاتەکانی دیکەیان تا رۆژی دواتر لەوێدا بگوزەرێنن. کۆمەڵگا، ئێمەی بەجۆرێک راهێناوە کە تەنها کەسانێکی کەم لەوانەیە هاوسەر نەگرن یان خێزان پێک نەهێنن [ ٦٧/ ٣٦٩].

خێزان لە مانای گشتی خۆیدا چەمکێکی جیهانییە. خێزان لە هەموو شوێنێکدا بوونی هەیە، چونکە وەڵامدەرەوەی کۆمەڵێک پێداویستییە کە بۆ سەرجەم مرۆڤایەتی هاوبەشن. تاکەکانی مرۆڤ لە خێزانەوە ژیان دەست پێدەکەن، تەنانەت کاتێکیش کە خێزان لە دووکەس - دایک و منداڵ - پێک هاتبێت، لە ماڵێکی ئاساییدا کە لە دایک و باوک و خوشک و براکان پێکهاتووە، تۆڕێک لە پەیوەندی بەرقەرارەو لەبەر ئەوەی ئەم یەکە کۆمەڵایەتییە گرنگییەکی زۆری هەیە لە ژیانی مرۆڤدا، کۆمەڵناسان بەدامەزراوەیەکی کۆمەڵایەتی ناوزەدی دەکەن. لەگەڵ ئەوەی کە بونیادەکان و زۆرێک لە ئەرکەکانی خێزان لەوانەیە لە کۆمەڵگایەکەوە بۆ کۆمەڵگایەکی دیکە بگۆڕێن، بەڵام ئەو خاڵەی کە هێشتا واقیعییە ئەوەیە کە کۆمەڵگا لە خێزانەکان پێکهاتووەو زۆربەی تاکەکانی کۆمەڵگا لە خێزانەوە ژیان دەست پێدەکەن [٤٥/ ٦٣-٦٨].

مێژوونووسان لە بارەی پێکهێنانی یەکەمین گرووپە خێزانییەکان و رۆڵی ئەندامەکانیانەوە دەنووسن: «سەرجەم خزمەکان لە ئەشکەوتێکدا یان لە چەند خانوویەکی گەورەدا دەژیان. پیاوان راویان دەکرد، ماسییان دەگرت و هۆکارەکانی کارکردنیان دروست دەکرد. هەروەها ژنەکانیش گژوگیا خۆراکییەکانیان کۆدەکردەوە. منداڵانی تەمەن سێ تا چوار ساڵ یارمەتی ژنەکانیان دەدا. خواردنی بەدەستهاتوو دابەش دەکرا بەسەر سەرجەم خێزاندا، ژنەکان پێستی ئاژەڵیان دەتاشی و پاکیان دەکردەوە لە چەوری، و دواتر بەکاردی بەردینە دەیانبڕی و جل وبەرگیان لێ دروست دەکرد. پێستەی ئاژەڵ و خۆراکی پاشەکەوتکراو، شاخ و ئێسقانەکان موڵکی سەرجەم خزمەکان بوو [١١٩/ ٢٩].

«کۆنفۆشیوس» خێزانی وەک پایەی دەوڵەت دادەناو، «ئۆگست کۆنت» بڕوای وابوو کە دەبێت خێزان یەکەی کۆمەڵایەتی زانست (کۆمەڵناسی) بێت لە حاڵەتی

پێشکەوتنی کۆمەڵگادا نەک «تاک». «چارلز هورتن کولی» کۆمەڵناسی ئەمریکی خێزانی بەیەکەمین و ئایدیالترین نموونە دەزانی بۆ گرووپە سەرەتاییەکان، گرووپێک کە ئەرکی پاراستن و پارێزگاری کردنی مرۆڤە و ئەفرێنەری جوانترین هەستی ناسراوی مرۆڤایەتییە [٨/ ٣٥١].

لە کۆمەڵگا نوێیەکاندا رەوش و بارودۆخی خێزان بۆتە جێگەی لێکۆڵینەوە، رادەی جیابوونەوە (طلاق) لە زیادبووندایە، مەودای نێوان وەچەکان زیاد دەبێت، ئەو گرفتانەی کە لە پەیوەندی نێوان دایک و باوک و منداڵەکانیانەوە سەرچاوە دەگرن، دەگەنە چڵە پۆپە، و زۆرێک لە ئەرکەکانی خێزان بە قوتابخانەو دامەزراوەو دەزگاکانی دیکە دەسپێردرێت. چ کێشەیەک رووی داوە؟ بۆچی ئەم گۆڕانکارییانە پەیدا بوون؟ ئایا لە رابردوودا کێشە نەبووە؟

دەتوانین بڵێین کە خێزان لە مانای تایبەتیدا گرووپێکی کۆمەڵایەتییە کەتێیدا رەوایەتی دەدرێت بەپەیوەندی سێکسی نێوان ژن و پیاو، زاوزێ بەشێوەیەکی رەوا مومکین دەبێت، لە بەرانبەردا کۆمەڵگا لەڕووی چاودێری و گەشەی منداڵانەوە بەرپرسە، جۆری جێگیرو تایبەت لە هەست و سۆز دێتە ئاراوەو بەهێز دەکرێت، و دواجار خێزان یەکەیەکی ئابووری و بەلایەنی کەم بەکاربەرە [٣١/ ٦٨٠].

چەمکی ماڵ (عائلة) جیاوازە لە خێزان (أسرة) کە زۆرتر لە توێژینەوە کۆمەڵایەتی و ئامارییەکاندا بەکاردەبرێت. ئەندامەکانی خێزان ژمارەیەک کەسن کە بودجەیەکی خێزانیی هاوبەشیان هەیە و خێزان دەکرێت خەڵکانێک بگرێتەوە کە خزمی دووربن یان تەنانەت خزمیش نەبن. لەسەر بنەمای پێناسەی «سەنتەری ئاماری ئێران» خێزان، لە چەند کەسێک پێکدێت کە لە جێگەیەکدا پێکەوە ژیان بەسەر دەبەن، هاوخەرجن و پێکەوەنان دەخۆن. تەنانەت کەسێکیش کە بەتەنهایی ژیان بەسەر دەبات بەخێزان دادەنرێت [٢/١٥٨]. ئەم سەنتەرە هەروەها خێزان دابەش دەکات بۆ جۆرەکانی خێزانی ئاسایی نیشتەجێ، نانیشتەجێ و دەستەجەمعی (وەک نیشتەجێبووان لە سەربازگە، خانەی بەساڵاچووان، زیندانەکان و...هتد). بەم پێیە دەبینرێت کە خێزان یەکەیەکی ئامارییە.

لە کۆمەڵگای ئەورووپیدا لە ماوەی ئەم چەند دەیەی دواییدا لە مەیدانی کۆمەڵناسی خێزاندا چەمکی «سۆسیۆلۆژیای هاوسەر» (علم الاجتماع الزوج) جێگەی سەرنج بووە، هۆی ئەمەش رێژەی بەرچاوی ئەو هاوسەرانەیە کە لە دەرەوەی چوارچێوەی خێزان ژیانی هاوبەشیان بۆ خۆیان هەڵبژاردووە (پێکەوە ژیان). لێرەدا

هەرکاتێک ئەو پرسیارە بێتە پێشەوە کە ژیانی هاوسەری لە چ کاتێکەوە دەست پێدەکات؟ وەڵامی ئەم پرسیارە دژوار دەبێت. ئایا دەبێت یەکەم پەیوەندی سێکسی بکرێتە پێودانگ یان دەست پێکردنی پێکەوە ژیان؟ یاخود یەکەمین بەرنامەڕێژی بۆ ژیانی رۆژانە بەشێوەی پێکەوە؟ مەسەلەکە لێرەدایە کە دەرکەی چوونە ژوورەوە لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی دیکە زۆرجار هێندە لەسەرخۆیە کە جیاکردنەوەی حاڵەتێک لە حاڵەتێکی دیکە دژوار بەڵکو نامومکینە [ ٢٠٠/ ٣ ].

یەکێک لەو چەمکانەی کە کۆمەڵناسان لە کاتی توێژینەوەدا باسی لێدەکەن «خزمایەتی» (Kinship) یە کە دەکرێت بەپەیوەندی کۆمەڵایەتی نێوان تاکەکانی خێزان پێناسەی بکەین. خزمایەتی دەکرێت وەسفی ئەو پەیوەندییە دانەبڕاوەی ئێمەبکات کە لەگەڵ دایک و باوک و خوشک و براکانماندا هەمانەو یان بۆ تۆڕێکی فراوانتری خزمایەتی واتە مام و پوورو کوڕەمام و... هتد بەکاریبرێت[ ١١٦/ ٣٧- ٣٨].

**هاوسەرگرتن**

چەمکی هاوسەرگرتن واتە پەسەندکردنی پێگەیەکی نوێ. پێگەیەک لەگەڵ کۆمەڵێک ئیمتیاز و ئەرکی نوێ و لە هەمان کاتیشدا رازی بوون بەم پێگەیە لەلایەن ئەوانی دیکەوە. رێورەسمی هاوسەرگرتن و ئەو نەریتانەی پێوەی بەستراون چەند شێوازێکی دیکەن کە ئەم گۆڕانی رۆڵە ئاشکرا دەکات و بانگەشەی بۆ دەکات. لە هەندێک کۆمەڵگای وەک ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا تەنانەت لەنێو هۆمۆسێکسواڵەکانیشدا ئەم ئارەزووە تێبینی کراوە کە هاوسەر بگرن و ئەم هاوسەرگرتنەش وەک پایەی پێکهێنانی خێزانێک بناسرێت[ ٧/ ٢٣٤-٢٣٥]. لە راستیدا، هاوسەرگرتن رەوایەتی دەدات بەپێگەیەکی کۆمەڵایەتی و کۆمەڵێک ماف و وابەستەیی یاسایی دەهێنێتە ئاراوە.

لە هەندێ کۆمەڵگادا شێوازێک لە هاوسەرگرتن پەیرەو دەکرێت کە بەپێی ئەو شێوازە هەندێک لە ئەندامانی خێزان کاتێک لە دایک دەبن، دەبێت بەناچاری ببنە هاوسەری کەسانێکی دیکەو لەم کاتەدا هەڵبژاردنە تاکەکەسییەکان پێویست نابێت، بەڵام کاتێک هەڵبژاردنی هەنووکەیی بابەتێکی پێویست بێت، ئەم کارە دەکرێت بەشێوەی جیاواز ئەنجام بدرێت. تاکەکان دەتوانن خۆیان هاوسەری خۆیان هەڵبژێرن (هەندێک جار هەم بەڕێنومایی دایک و باوک). لەوانەیە دایک و باوک شووکردن

یان ژن هێنان بە لەبەرچاوگرتنی ئارەزووەکانی کچ و کوڕ یان تەنانەت بەبێ ئەوەش ڕێک بخەن. لەوانەیە بەپێدانی دیاری مارەیی زۆر تاڕادەیەک هاوسەرێک بکڕن. هەریەک لەم نموونانە دەشێ جۆرێک بێت لە ئەنجامدانی پرۆسەی هاوسەرگرتن لە گۆشەیەکی دنیاداو لە ڕێگەی سیستمی کولتووری و بەها بونیادنراوەکان لەسەری پارێزگاری لێبکرێت.

لە هاوسەر هەڵبژاردندا (سەرەڕای شێوەی ئەنجامدانی) بەردەوام لە کۆمەڵگاکاندا کۆمەڵێک پێوەرو دیسپلین: لەسەر بنەمای بەها کۆمەڵایەتییەکان جێگەی سەرنج بووە کە بەتێپەڕبوونی کات گۆڕانی زۆری بەسەر داهاتووە. دانەری «قابوسنامە» بەپێی دیسپلینەکانی سەردەمی خۆی ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکات [ ٣٥/١٤٤-١٤٥ ] : «بەڵام کە داوای ژن دەکەی داوای سەروەتەکەی مەکەو داوای ئەوپەڕی چاکی ژن مەکە کە بەچاکی خۆشەویست (مەعشووقە) وەردەگرن، دەبێت ژن رووپاکی ئایین پاکی کابان و مێرد دۆست و داوێن پاک و شەرمن بێت و زمان درێژ نەبێت و ماڵ خۆشەویست بێت تاکو باش بێت.. بەڵام ژنێکی بەحەیاو حیشمەتتر لە خۆتت نەوێت، و تاکو کچت دەست بکەوێت بێوەژنت نەوێت تاکو لە دڵی ئەودا بێجگە لە خۆشەویستی تۆ خۆشەویستی کەسی دیکەی تێدا نەبێت و وابزانێت هەموو پیاوان وەک یەکن ئارەزووی پیاوێکی دیکەی نەبێت. هەروەها هەڵبێ لە دەستی ژنی دەست بڵاو و دەمەوەڕ و ناکابان».

لە هەندێ لە کۆمەڵگاکاندا پەیوەندی ژن و مێردایەتی، پەیوەندییەکی هەمیشەییەو لە کاتێکدا لەوانەیە لە هەندێ کۆمەڵگای دیکەدا پەیوەندییەکی ناهەمیشەیی (سست) بێت. پێوەرەکانی هاوسەرگرتن زۆر جیاوازن: لە هەندێ کۆمەڵگادا لەوانەیە یەکێک لە ژن یان مێرد بەسەر ئەوی دیکەدا زاڵ بێت لە کاتێکدا لە کۆمەڵگای دیکەدا ژن و مێرد بە یەکسان دادەنرێن. لە هەندێک کۆمەڵگادا پەیوەندی سێکسی لە پێش هاوسەرگرتنەوەیە، و لە هەمان کاتدا لە کۆمەڵگای دیکەدا هاوسەرگرتن لە پێش پەیوەندی سێکسییەوەیە [ ١٩٤/ ٦٣-٦٨]. لە کۆمەڵگا جیاوازەکاندا کۆمەڵێک شێوەی جیاوازی هاوسەرگرتن دەبینرێن، و لەبەرئەوەی بیرکردنەوەکان لە بارەی هاوسەرگرتن و منداڵ بوونە پەیوەندییان پێکەوە هەیە، لە هەندێک کۆمەڵگادا کۆمەڵێک دیسپلین وەک گرەنتی جێبەجێ کردن (یاسایی، ئەخلاقی و یان ئایینی) دەستنیشان کراون کە لە حاڵەتی سەرپێچی کردنی یاسادا ئەو سزادانانە پیادە دەکرێن کە لەلایەن کۆمەڵگاوە دانراون [ ٤٥/٦٣-٦٨].

## ڕۆڵ و ئەرکی خێزان

لە کۆمەڵگا نەریتییەکاندا، هەندێک لە ئەرکەکان کە لە خێزانی نوێدا لە ئەستۆی دەزگاکانی دیکەدایە، بە بەرپرسیارێتییەکانی خێزان دادەنرێن. خێزان رازییە کە پەروەردەو فێرکردنی ئەندامەکانی لە ئەستۆ بگرێت، کار دابین بکات بۆ ئەندامەکانی، هۆکارەکانی بەسەر بردنی کاتی دەست بەتاڵییان بۆ فەراهەم بکات، ئاسانکاری خۆشگوزەرانیان بۆ دابین بکات، توانا (امکانات)ی ئابووری وەدی بهێنێت و تەنانەت تاکەکان فێری ئایینیش بکات [١٩٤/ ٦٣-٦٨]. ئەو تۆڕە پەیوەندییەی کە بەپێی ئەوە ئەندامانی خێزانێک پەیوەندییان پێکەوە هەیە لە ژێر دەسەلاتی کۆمەڵێک یاساو ڕێوڕەسم و دابونەریتدایە کە پێگەو ڕۆڵی تاکەکان دەست نیشان دەکات. مێرد ڕۆڵێکی تایبەتی هەیە، و ڕۆڵی هاوسەرێتی لەلایەن ژن و مێردەوە دەگێڕدرێت. لە هەندێ خێزاندا لەوانەیە کوڕی گەورەش خاوەنی پێگەیەکی تایبەت بێت.

پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە هەموو ئەمجۆرە چاوەڕوانیانە تایبەت نەبوونە بە ڕۆژهەلاتەوە. لە وەسفکردنی «خێزان»دا لە یۆنانی کۆندا هاتووە [١٢١/ ١١٧]: «سەرجەم کارەکانی ناوماڵ ژنان ئەنجامیان دەدا. ژنانی یۆنانی باوەڕیان وابوو کە ژن دەبێت بەچاکی ماڵی خۆی بپارێزێت و گوێڕایەڵی پیاوبێت. ئەگەر پیاو میوانێکی بهاتایە، ژن لە ژوورەکە دەڕۆیشتە دەرەوە. تەنانەت ژنان زۆر بە دەگمەن دەڕۆیشتنە دەرەوەی ماڵ. بەپێچەوانەوە پیاوی یۆنانی نزیکەی تەواوی کاتی ڕۆژانەی خۆی لە دەرەوەی ماڵ بەسەر دەبرد. ئەمە هەمان ئەو بابەتەیە کە «سعدی شیرازی» چەند سەدەیەک دواتر بڕوای پێ هەبوو:

«ژنی چاک و گوێڕایەڵ و داوێن پاک، پیاوی فەقیر دەکاتە پاشا. ئەگەر ژن ڕێگەی بازاڕی گرتەبەر لێی دە، ئەگەر نا تۆ لە ماڵەوە دانیشە وەک ژن». «ئیمام موحەمەدی غەزالی» لە کتێبی «کیمیای سعادت»دا ناونیشانێکی بەناوی «ئادابی ژیان لەگەڵ ژناندا» لەسەرەتای مارەبڕینەوە تاکو کۆتایی تەرخان کردووە [١٩٥/ ٢٤٧-٢٥٤]و ئامۆژگاری پیاوان دەکات کە ئاگایان لەم خالانە بێت: خوان (ناندان بەدۆستان)، خووی چاک لەگەڵ ئافرەتاندا، گالتە کردن لەگەڵ ژناندا، چاودێری کردنی هاوسەنگی لە گالتەوگەپدا (تاڕادەیەک کە لە ئیعتیباری کەم نەکاتەوە)، چاودێری کردنی قسەکردن لەگەڵ بێگانە (پاراستنی ئەو لە نامەحرەمەکان)، چاککردنی بژێوی، فێرکردنی زانست و ئایین، ئەگەر دوو ژنی هەیە دادپەروەری

رابگرێت لە نێوانیاندا، هاورێییەتی کردن، منداڵ بوون، دوورکەوتنەوە لە جیابوونەوە (طلاق) تاکو لە تواناداا بێت.

لە دنیای هاوچەرخدا سەرەڕای ئەو جیاوازییە بەرچاوەی کە لە ناوچە جیاوازەکاندا هەیە لەسەر ئەرکەکانی «خێزان» دەتوانین ئەرکە سەرەکییەکانی خێزان لەم خاڵانەی خوارەوەدا کورت بکەینەوە [٥٢/ ٧-١١٣]:

١- زاوزێ بە گشتی ئەرکی تایبەتی خێزانە. بەم مانایە رێکخستنی پەیوەندی سێکسی تەنها بەشێکە لە زەمینەیەکی بنەڕەتی. بۆ ئەوەی کۆمەڵگا بمێنێتەوە پێویستە جێگرتنەوەی ئەندامەکانی لە رێگەی لە دایک بوونەوە زامن کرا بێت.

٢- پەیوەندی سێکسی و رێکخستن و رەوایەتی دان بە ئارەزووە سێکسییەکان لەلایەن خێزانەوە دەبێت. لەگەڵ ئەوەی شێوەی رەفتارە سێکسییەکان لە کۆمەڵگایەکەوە بۆ کۆمەڵگایەکی دیکە جیاوازە، بەڵام هەمیشە رووبەڕووی رێسایەک دەبینەوە کە ئەوە دیاری دەکات چ کەسێک دەتوانێت بابەتی پێکگەیشتنێکی رەوا (مشروع) بێت. تێبینی ئەوەکراوە کە قەدەغە بوونی زینا لەگەڵ مەحرەمەکاندا نزیکەی لە سەرجەم کۆمەڵگاکاندا بوونی هەیە (هەرچەندە کە پێناسەیەکی یەکسان بۆ زینا لەگەڵ مەحرەمەکاندا بوونی نییە). سەرەڕای ئەوەی کە هیچ کۆمەڵگایەک نییە هیچ جۆرە رێسایەکی نەبێ بۆ پەیوەندییە سێکسییەکان، لەگەڵ ئەمەشدا لێکۆڵینەوەکانی «جۆرج مەردۆک» (J. Murdock) ئەوە پیشان دەدات کە هەندێک لە کۆمەڵگاکان رێگە دەدەن بە پەیوەندی سێکسی پێش هاوسەرگرتن لەگەڵ هەندێک مەرجدا. تەنانەت لەو کۆمەڵگایانەشدا کە پەیوەندییە سێکسییەکان زۆر سەخت وەرناگیرێن بۆچوونی تاکەکان لە بارەی دروستکردنی ئەمجۆرە پەیوەندییانە زێتر فەراهەم کردنی زەمینەیەکە بۆ هاوسەر گرتنێکی گونجاوتر (وەک سەلماندنی توانای هەردوولا لە بەرهەمهێنانی منداڵدا) نەک مەبەستێکی رووتی بنیاتنراو لەسەر خۆشگوزەرانی و رابواردن.

٣- چاودێری و پارێزگاری کردنی منداڵان بەتایبەت تاکو کاتێک منداڵ لەرووی پێگەیشتنەوە قۆناغی وابەستەیی تێنەپەڕاندووە کارێکی پێویستە. هەروەها ئەم ئەرکە لەوانەیە تاکە بەساڵاچووەکانیش بگرێتەوە. هەرچەندە لە هەندێک لە کۆمەڵگاکاندا بەحاڵی خۆیانەوە وازیان لێدەهێنن تاکو لەناوبچن. لەگەڵ ئەوەشدا راستییەکەی ئەوەیە کە لە سەرجەم کۆمەڵگاکاندا خێزان وەک پەناگەو

هۆکـارێکی بەرگـریکردنە بۆ ئەندامـەکـانی. هەندێ جـار ئەم ئەرکـە ناونراوە پاراستن.

٤- بەکۆمەڵایەتی کردن پرۆسەیەکە کە لە رێگەیەوە منداڵانی خێزان فێری ژیان دەبن لە کۆمەڵگادا. بەم جۆرە مرۆڤ حاڵەتی مرۆیی بەخۆوە دەگرێت و کەسێتی ئەو گەشە دەکات. پرۆسەی بەکـۆمەڵایەتی بـوون بەردەوامییـەک دێنێتـە ئاراوە کە ئەندامانی کۆمەڵگا وردە وردە لەلایەن لاوانەوە جێگەیان دەگیرێتەوە.

٥- خێزان لە رێگەی جێگەگرتنەوە یان تایبەتی کردنی پێگەوە هەندێک شوێنگەی کـۆمـەڵایەتی بەئەندامـەکـانی دەسـپـێـرێت. لە رێگەی لە دایکبـوونی رەواوە، شـوێنگەی منداڵ لە نێـو کـۆمـەڵێک پەیوەندی (تعـهـدات) خزمـایەتیـدا دیاری دەکرێت. خێزان بەهەمـان شێوە شـوێنگەکانی ژیانی تاک و پێگەی کـۆمـەڵایەتی تایبەتی ئەو لە ژیاندا دیاری دەکات.

٦- ئەرکی سـۆزداری (عـاتیـفی) خێـزان لە پێـویسـتـی مـرۆڤـەوە بۆ خـۆشـویسـتن و وابەستەییە عـاتیـفـیـیەکانەوە سەرچاوە دەگرێت. لە رێگەی ئەندامێـتیـیـەوە لەم گرووپەدا پەیوەندییـە سەرەتاییەکان لەوانەیە فـراوان بـبن کە لە هەمـان کـاتدا بۆ سەرجەم تاکـە ئەنـدامـەکـان رازیکەربن. بەبێ بوونی خـۆشـەویسـتی و هەسـتی وابەسـتـەیی، لەوانەیە خـێـزان رووبەڕووی هەندێک گرفـتی دەروونی و عـاتیـفی ببێتەوە.

٧- خـێـزان لە هەندێ لە کـۆمـەڵگـاکـانداو بەدرێژایی مـێـژوو ئەرکی ئابووریشی لە ئەسـتـۆدا بووە. ئەم دیاردەیە لە نێـو ئەندامـانی ئەو خـێـزانانەدا بینراوە کـە لە یەکەکانی بەرهەمهێنانی ئابووریدا هاوبەشییـان هەبووە (وەک کێڵگەی خێزانی کەتێیدا گەنجترین و بەتەمەنترین ئەندامانی خێزان بەشدارن). لەکاتێکدا کەلە کۆمەڵگای نوێدا رۆڵی خێزان لە بەرهەمـهێنانی ئابووریدا گرنگییەکی کەمتری هەیە، لە بەرانبـەردا خـێـزان بەیەکـەیەکی بەکـاربەر (مـسـتـهلک) - (لە رووی ئابورییەوە)- دادەنرێت.

**جۆرەکانی خێزان**

«مۆرگان» ئەنترۆپۆلۆژیستی ناسراو لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا (خێزانی کۆن) لە پۆلێنکردنی جۆرەکانی خێزاندا لە دیدگای گۆڕانی جۆرەکانییەوە بەدرێژایی مێژوو لە

کۆمەڵگای مرۆییدا ئەم نموونەیەی خوارەوە دەخاتەڕوو [ ٢١٩/ ٥٧٨-٥٧٩]، نموونەیەک کە سەلماندنی لەڕووی بەڵگە مێژووییەکانەوە بەتەواوی مومکین نەبووە.

١- خێزانی هاوخوێن (هاوسەرگرتنی خوشک و برا هەقیقی و زڕەکان لەگرووپێکدا).

٢- خێزانی بە کۆمەڵ «پونالوایی» (شوکردنی خوشکی هەقیقی و زڕ خوشکە جۆراوجۆرەکان بە مێردی یەکتری لە گرووپێکدا) یاخود ژیانی هاوبەشی کۆمەڵێک پیاو لەگەڵ کۆمەڵێک ژندا.

٣- خێزانی هاوسەریی (یان هاوسەرێتی ناتایبەتی هاوسەرە جیاوازەکان).

٤- خێزانی باوکسالاری (هاوسەرێتی پیاوێک لەگەڵ چەند ژنێکی جیاوازدا).

٥- خێزانی یەک هاوسەری (هاوسەرێتی پیاوێک لەگەڵ یەک ژندا).

لەکۆمەڵگا نوێیەکاندا، دەکرێت بە لەبەرچاوگرتنی کۆمەڵێک پێوەری جیاواز خێزان پۆلین بکەین کە گرنگترینیان لە خوارەوە دێنێتەوە [ ٥٢/ ١١٣-١١٧].

**١- فراوانی ڕەهەندەکانی خێزان،** کە ئەم جۆرانەی خوارەوە دەگرێتەوە:

**یەکەم:** خێزانی هاوسەرێتی (ناوکی) کە تەنها لە مێرد، ژن، منداڵان پێکهاتووە. ئەم خێزانە پشت ئەستوورە بەو وابەستەییەی کە لە هاوسەرگرتنەوە سەرچاوە دەگرێت. ئەمجۆرە خێزانە لە ئێراندا لە بڵاوبوونەوەیەکی خێرادایە و لە کۆمەڵگای پیشەسازی خۆرئاوادا زۆربڵاوە.

**دووەم:** خێزانی هاوخوێن یان فراوان (هاوبەش) لە کەسانێک پێک دێت کە بەهۆی پەیوەندی خزمایەتی و خوێنەوە پێکەوە بەستراون. بە گشتی ژمارەی ئەندامەکانی لە خێزانی ناوکی زۆر زیاترە، (باوک و داپیرە، خوشکی باوک، خوشکی دایک، خاڵ و مام و منداڵەکانیان و کەسانی دیکەش). سۆزو بەرپرسیارێتییەکان بەجۆرێک لەنێو ئەندامەکانیدا بڵاوە کە منداڵان بەخێرایی پەیوەندی دروست دەکەن لەگەڵ تاکەکانی دیکەدا. لەم جۆرە خێزانە لە کۆمەڵگای ئێرانی زۆر زۆرەو لە کۆمەڵگای پیشەسازی خۆرئاواشدا دەگمەنە، بەڵام بە هەر حاڵ هەیە.

٢- **شێوازی هاوسەرگرتن،** کە ئەمجۆرانەی خوارەوەیە:

**یەکەم:** تاک هاوسەری، واتە حاڵەتێک کە بەو پێیە ژنێک شوو دەکات بە پیاوێک. ئەمجۆرە هاوسەرگرتنە نموونەیەکی بەربڵاوە لە زۆربەی کولتوورەکانی جیهانی ئەمڕۆدا.

**دووەم:** جۆرێکی دیکە لە پێکگەیشتن، چەند هاوسەرییە کە لە کۆمەڵگای پیشەسازی خۆرئاوادا زۆر دەگمەنەو ئەویش حاڵەتێکە کە باس لە چەند ژنێک یان چەند مێردێک دەکەین لە یەک خێزاندا. فرەژنی جۆرێکە لە هاوسەرگرتن کە پیاوێک دوو ژن یان زیاتری هەیە. لە بەرامبەریشدا فرەمێردی کە هەڵبەتە لە دنیای ئەمرۆدا زۆر زۆر دەگمەنە جۆرێکە لە یەکێتی هاوسەرگرتن کە لە یەک ژن و چەند پیاوێک پێکدێت. هاوسەرگرتنی بە کۆمەڵ بە حاڵەتێک دەوترێت کە باس لە فرەیی ژن و پیاو (هەردووکیان) دەکرێت کە لە ئاستێکی زۆر زۆر دەگمەندایە.

٣- **شێوەی هەڵبژاردنی هاوسەر،** کە ئەم جۆرانەی خوارەوە دەگرێتەوە:

**یەکەم:** ڕێساکانی ناوخێزان بڕیار دەدات کە تاک دەبێت لە نێو گرووپێکی دیاریکراودا هاوسەری خۆی هەڵبژێرێت. لەبەرچاو نەگرتنی ئەم ڕێسایانە هەندێک جار ڕووبەڕووی پەرچە کردارێکی توند دەبێتەوە.

**دووەم:** ڕێساکانی دەرەوەی خێزان لەلایەکی دیکەوە جەخت دەکاتەوە لەسەر هاوسەرگرتن لە دەرەوەی گرووپێکی دیاریکراودا.

لە بارەی کارکردنی ئەم دوو جۆرە جیاوازەوە، هەر کۆمەڵگایەک کۆمەڵێک سنوور لەڕووی وابەستەیی بە گرووپەوە (دەرەوەی خێزان)و سنوورە گرووپییەکانەوە (نێو خێزان) دەستنیشان دەکات، کە دەستیان هەیە لە هەڵبژاردنی هاوسەردا.

٤- **ناوەندی قورسایی هێز،** کە ئەم جۆرانەی خوارەوەیە:

**یەکەم:** خێزانی باوکسالار کە تێیدا پیاوان دەسەڵاتیان بەدەستە.

**دووەم:** کاتێک لە خێزاندا ژن زۆرترین هێزو توانای لە دەستدایە بەم خێزانە دەوترێت دایکسالار.

**سێیەم:** خێزانی یەکسانخواز کە لە کۆمەڵگای پیشەسازی خۆرئاوادا زۆر بڵاوەو بە شێوەیەکی کەم تا زۆر هێز لە نێوان هەردوو ڕەگەزدا دابەش دەکرێت.

لە دیدگایەکی دیکەوە «پارسونز» چوار پێکهاتەی جیاوازی هێز لە خێزاندا لە یەکتر جیا دەکاتەوە [٣١/ ٦٨٠]:

أ- هێز لە نێو خێزاندا پەراگەندەیە، واتە هەندێک دەسەڵاتیان زیاترە بەسەر هەندێکی دیکەدا.

ب- بوونی دووهێزی جیاواز بەلایەنی کەمەوە.

ج- بوونی دووهێز کە یەکێکیان لەسەر بنەمای ئابووری و نان پەیداکردنەو ئەوی دیکەش لەسەر بنەمای پەروەردەو ڕێنومایی کردن.

د- هێز دوو جەمسەرە، بەڵام لەسەر بنەمای تەمەن و ڕەگەزە: مێرد (باوک کە نان پەیدا دەکات) ژن (دایک کە پەروەردەکەرە)، منداڵ کە شوێنکەوتەیەکی دوو جەمسەری هەیە.

٥- **بنەچەو نەسەب**، کە ئەم جۆرانەی خوارەوە دەگرێتەوە:

أ- لە خێزانی «باوک نەژاد»دا خزمایەتی لە ڕێگەی باوکەوە دەستنیشان دەکرێت.

ب- لە خێزانی «دایک نەژاد»دا پەیوەندی خوێنی لە ڕێگەی دایکەوە دیاری دەکرێت.

«فردریک ئەنگلس» لە وەسفکردنی ئەمجۆرە خێزانانەدا دەنووسێت: «لەسەرجەم شێوەکانی خێزانی بە کۆمەڵدا، باوکی منداڵ دیار نییە، بەڵام دایکی دیارە. ئەگەرچی ئەو سەرجەم منداڵەکانی خێزانی بەکۆمەڵ بەمنداڵی خۆی دەزانێت و ئەرکی دایکایەتی خۆی لە بەرانبەریاندا جێبەجێ دەکات، لەگەڵ ئەمەشدا ئەو - دایک - منداڵە سروشتییەکانی خۆی دەناسێتەوە لەوانیتر. بەم جۆرە ئاشکرایە کە لە هەر کوێیەک کە هاوسەرگرتن بەکۆمەڵ بێت، خزمایەتی تەنها لە ڕێگەی دایکەوە دەتوانرێت دەستنیشان بکرێت و بەم شێوەیە تەنها نەژادی مێ بەرەسمی دەناسرێت» [١٦٩/ ٦٥].

ج- لە خێزانی «دوو نەژاد»دا کە لە کۆمەڵگای پیشەسازی خۆرئاوادا بەربڵاوە، خزمایەتی لە هەردوولاوە (ژن و پیاو) دیاری دەکرێت.

٦- **شوێنی نیشتەجێبوون**، کە ئەم جۆرانەی خوارەوەیە:

أ- خێزانی «نیشتەجێ لەلای باوک» خێزانێکە کە پیاو دوای ژنهێنان لە خێزان یان گوندی ڕەگەزی نێردا شوێنی نیشتەجێ بوون هەڵدەبژێرێت.

ب- خێزانی «نیشتەجێ لەلای دایک» لە حاڵەتی پێچەوانە دایە. مێرد لە خێزان یان گوندی ڕەگەزی مێدا نیشتەجێ دەبێت.

ج- خێزانی سەربەخۆ بەحاڵەتێک دەوترێت کە مێرد لە شوێنێکی دوور لە خێزانی ژن و مێرد نیشتەجێ دەبێت.

لەنێو ئەو جۆرانەی سەرەوەدا دووجۆری خێزانی فراوان و خێزانی ناوکی دەخەینە ژێر باس و لێکۆڵینەوەوە.

**خێزانی فراوان**

خێزانی فراوان (Extended) دوو خێزانی ناوکی گرێدراو یان زێتر دەگرێتەوە. خێزانی فراوان زیاتر دەتوانین بەخێزانی «هاوخوێن» ناوزەدی بکەین، لە کاتێکدا

خێزانی ناوکی خێزانێکی ژن و مێردییه. [٤٥/ ٦٣-٦٨]

له وڵاتی «چین» له قۆناغی پێش شۆڕشدا، خێزان له ژمارەیەکی زۆری خزمان پێک دەهات که له شوێنێکدا یان له نزیکی یەکترەوە ژیانیان بەسەر دەبرد، و پێکدەهاتن له باپیرەو داپیره، کوڕەکانیان، هاوسەرو منداڵەکانی کوڕەکانیان و تەنانەت هەندێ جار نەوەی ئەمانیش. بۆ ناولێنانی ئەمجۆره خێزانه وشەی «هاوخوێن» بەکاربراوه، که لەڕووی زمانەوانییەوه بەمانای «لەیەک خوێن» دێت، هەڵبەت لەم حاڵەتانەدا خزمایەتی له ڕێگەی باوکەوه دیاری دەکرێت. لەم جۆره خێزانەدا وابەستەییەکی زۆر هەیه به بەساڵاچووانەوه و بەڕێزێکی زۆرەوه باس له باوباپیری کۆچکردوو دەکرێت. نەریته پشت ئەستوورەکان به پێگەی کۆمەڵایەتی و ئەخلاق، خێزان وەک سیستمێکی گونجاو و ڕێکخراو لێدەکات. که تێیدا هەرکەسێک بەباشی دەزانێت که پێگەی خۆی له کوێدایه. خێزان وەک یەکەیەکی کۆمەڵایەتی گرنگییەکی زێتری هەیه له تاکەکەس، و له ئەنجامدا هاوسەرگرتن زۆربەی جار لەلایەن دایک و باوکه بەساڵاچووه شارەزاکانەوه «گەورەکان» ڕێک دەخرێت و ئارەزووەکانی کچ و کوڕ زۆر جێگەی گرنگی پێدان نییه [٨/ ٣٥٢-٣٥٤].

«محمد بەهمەن بیگی» له بارەی تایبەتمەندییەکانی هاوسەرگرتنەوه له نێو خێڵەکانی فارسدا دەڵێت: «خوازبێنی کچان لەلایەن ڕیش سپییەکان و ژن و پیاوه بەدەسەڵات و بەڕێزەکانەوه ئەنجام دەدرێت و گرنگییەکی تایبەت دەدرێت به هەڵبژاردنی ئەم جۆره ژن و پیاوانه، چونکه کەسێتی ئەم کەسانه کاریگەریی هەبووه لەسەر بڕیاری خاوەن کچ و هەندێ جار لەگەڵ ناڕازی بوونی تەواویشدا دەکەونه ژێر کاریگەریی دەسەڵاتیانەوەو بۆ پاراستنی ئەدەب و ڕێز لەم جۆره کەسانه داواکارییەکانیان جێبەجێ دەکرێت. ڕەتکردنەوەی داواکاری ئەم خوازبێنیکەرانه به نەنگی دادەنرێت و هەر بەم هۆیەشەوه له قەبووڵکردنی ئەم فەرمانه زۆربەیان - خاوەن کچەکان - بووراون. دوای ئەوەی خێزانی کچ ڕەزامەندی پیشاندا، ڕازی کردنی کوێخاو سەرۆک عەشیرەت یان یەکێک له مانه زەروورییەو خێزانی خوازبێنیکەر به پێشکەشکردنی دیاری و مارەیی، ڕەزامەندی و ئیجازەی ماڵی کچەکه بەدەست دەهێنن [٨/١٤٨].

له خێزانی فراواندا پیاوان زاڵن بەسەر ژیانی خێزانیدا، فەرمانەکانیان پێویسته جێبەجێ بکرێت، تازه بووک بەرپرسیاره له بەرامبەر دایک و باوکی مێردەکەیدا.

«ئیمام موحەمەدی غەزالی» لە کتێبی «کیمیای سعادت»دا دەربارەی «مافی مێرد بەسەر ژنەوە» دەنووسێت: «مافی مێرد بەسەر ژنەوە ئەوەیە کە ژن لە ماڵەوە دانیشێت، و بەبێ پرسی مێردەکەی لە ماڵ نەچێتە دەرەوە و زۆر نەگەڕێت، و لەگەڵ هاوسێکاندا تێکەڵاوی و قسەی زۆر نەکات، و بەبێ پێویستی نەچێتە لایان، و جگە لە چاکە باسی مێردەکەی نەکات و ئەگەر گرفتێک لە نێوانیاندا بوو لەنێو خەڵکیدا باسی نەکات و نەیگێڕێتەوە، هەروەها لە هەموو کارێکدا سوور بێت لەسەر خۆشی و شادی مێردەکەی، خیانەت نەکات لە ماڵی و بەزەیی پێیدا بێتەوە، و ئەگەر هاوڕێیەکی مێردەکەی هات لە دەرگایاندا بە جۆرێک وەڵامی بداتەوە کە نەیناسێتەوەو خۆی داپۆشێت تاکو نەیناسنەوە [ ١٩٥/ ٢٥٥ ].

لە خێزانی هاوخوێن دا پەیوەندییەکی بونیادی هەیە لەنێوان کوڕو باوکدا، بە جۆرێک کە باڵدەکێشێت بەسەر پەیوەندی ژن و مێرددا، خێزان بەردەوامی هەیە، و هەرچەند کە ئەندامەکانی لەناو بچن، بەڵام بە تێپەڕبوونی کات لەلایەن کەسانی نوێوە جێگەیان پڕ دەکرێتەوە، و خێزان هەروا درێژە دەدات بە ژیانی خۆی. لەگەڵ ئەوەی کە دابونەریتی رەسمی نێوکۆمەڵگا کۆمەڵێک ئیمتیازی زۆر دەداتە پیاوان، لە هەمان کاتدا ژنانیش لە هەندێ کاتدا بە تێپەڕبوونی کات بە تایبەت لە قۆناغی کامڵ بووندا ئیعتبارێکی تایبەت بۆخۆیان بەدەست دەهێنن. گەنجەکان شوێنکەوتەی بەساڵاچووەکانن، و خێزان کۆمەڵێک خەسڵەتی موحافزکارانەو تارادەیەک جێگیری هەیە[ ١١٨/ ١١٢- ١٣٠ ].

ئەم جۆرە خێزانە، لەگەڵ کۆمەڵگای لادێییدا زۆر گونجاوە کە تێیدا نەریت زاڵەو گۆڕان لەسەرخۆیە، لەوەش زیاتر سەرجەم ئەندامانی خێزان دەبێت لە پێناوی مانەوەدا پێکەوە کار بکەن هەرچەند کە دەبێت تاکەکەس هەندێک لە ئارەزووەکانی خۆی بەقوربانی بەرژەوەندییەکانی ژیانی خێزانی بکات، لەگەڵ ئەمەشدا خێزان هەستێکی وابەستەبوون و ئارامی دەدات بەئەندامەکانی. لە زۆربەی ئەو کۆمەڵگایانەی کە لەڕووی گەشەی کۆمەڵایەتی و ئابوورییەوە لە پلەی یەکەمدان، زۆرێک لە پێگە کۆمەڵایەتییەکان حاڵەتێکی ڕێژەییان هەیە. واتە پشت بەستوون بەلەدایک بوونی تاکێک و لەبەر ئەو خزمایەتی گرنگییەکی زۆری هەیە.

خێزانی فراوان دابەشکراوە بۆ دووجۆری «باوکسالار»و (دایکسالار). لە خێزانی «باوکسالار»دا کە بە شێوەیەکی گشتی لە دایک و باوک و منداڵەکانیان و منداڵی کوڕەکانیان پێک دێت، سەرپەرشتی خێزان لە ئەستۆی باوک یان گەورەی

خێزاندایە، لەم خێزانانەدا بەساڵاچووترین کەسی خێزان لە هەمان کاتدا بەتواناترین کەسی خێزانەو ژنان لەم بارودۆخەدا ئیمتیازێکی ئەوتۆیان نابێت. خێزانی باوکسالار لە ئێراندا زۆر کۆنەو بەگوتەی مێژوونووسان بەردەوام لەگەڵ کۆمەڵێک ئەرکی وەک بەرهەمهێنانی ئابووری و پەروەردەو فێرکردن، پەروەردەی ئایینی و کات بەسەربردنیشی (ترفیهی) لە ئەستۆدابووە.

لە حاڵەتی «دایکسالار»دا خێزان پێکدێت لە دایک و باوک و منداڵەکانیان و ماڵ و منداڵی کچەکان. باوک لەڕووی بەڕێوەبردنی کاروباری خێزانەوە ڕۆڵێکی ئەوتۆی نییە، و خزمایەتی لە دایکەوەیە. خێزانی دایکسالار لەسەرەتاییترین شێوەکانی خێزان بووە. لە قۆناغەکانی سەرەتادا، واتە پێش جێگیربوونی مرۆڤ لە شوێنێکی جێگیردا و دەست پێکردنی چالاکییە کشتوکاڵییەکان، زەروورەتی ژیان وایدەکرد کە پیاوان بۆ ڕاوکردن و کۆکردنەوەی خۆراک یاخود هەندێ جار بۆ بەشداری کردن لە شەڕەکاندا جیاببنەوە لە خێزان و لەم حاڵەتەدا ژنان بەڕێوەبردنی ئەرکەکانی خێزانیان لە ئەستۆ دەگرت. لەبەرئەوە کۆمەڵێک زاراوەی وەک «مانەوە لە لای دایک»و «دایک نەژادی» بۆ وەسفی بارودۆخی خێزان لەم قۆناغەی گەشەدا بەکاربراوە.

**خێزانی ناوکی**

خێزانی ناوکی پێک دێت لە ژن و مێردو منداڵەکانیان. خێزان تاکو رادەیەکی تەواو لە خزمانی دیکە جیا بۆتەوەو تاکەکان هەندێ جار دەچن بۆ سەردانی یەکتر. زاراوەی خێزانی ژن و مێردی پەیوەندیدارە بەهاوسەرگرتن و خێزانی ناوکی (Nuclear) بەو مانایەیە کە خێزان هیچ یەک لە خزمانی دیکە ناگرێتە خۆی ( ٨/ ٣٥٤]. خانەی سەرەکی خێزان لە ژن و مێردێک پێکدێت کە زۆربەی کات لە ئەنجامی پەیوەندی بەیەکترەوە پێککەیشتوون، و لەوانەیە پێککەیشتنیان تەنانەت بە نارەزایی کەسانی دیکەو هەندێک جار دوای ماوەیەکی کورتی یەکتر ناسین بووبێت. لەم خێزانەدا پێش هەرشتێک رەزامەندی و خۆشبەختی تاک گرنگە و چاودێری کردنی بەرژەوەندییە گشتییەکان گرنگییەکی ئەوتۆیان نییە. لە وڵاتە پیشەسازییەکاندا ژن و مێرد لەرووی پێگەو شوێنگەوە لە خێزاندا تارادەیەک یەکسانن. بەردەوامی ژیانی ئەم خێزانە کاتییەو هەتا هەتایی نییە، لەبەرئەوەی بوونی خێزان لە هاوسەرگرتنەوە دەست پێدەکات و بەمردنی ژن و مێرد کۆتایی دێت. ئەم جۆرە خێزانە لەگەڵ سەرجەم ئەو گرفتانەی کە پێدەچێت هەیبێت، تاک رەوانەی هەوڵەکێبرکێیەکان دەکات لە کۆمەڵگاداو رێگەی بۆ خۆش دەکات کە لە رەهەندە جیاوازەکانی وەک شوێنی نیشتەجێ بوون، درێژەدان بەخوێندن، مژووڵ بوون، و ئەندامێتی لە رێکخراوو کۆمەڵە جۆراو جۆرەکاندا بەشێوەی تاکەکەسی تێبکۆشێت. سەرەرای ئەوەی زۆرێک لە هەست (شعور)ە خێزانییەکان بەردەوام لە ئارادایە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئارەزووە خێزانییەکانی ئەو - خێزانی ناوکی - لە خێزانی هاوخوێن کەمترە.

لە ریزی هۆکارەکانی گۆڕانی خێزان، و ئارەزووی زێتر لە جارانی خێزان بۆ گۆڕان بۆ خێزانی ناوکی (واتە ئەو خێزانەی پێکدێت لە دایک و باوک و منداڵەکانیان) ئاماژە کراوە بەکۆمەڵێک هۆکاری دیکە وەک: بزاوتنی شوێنگەی کارو گۆڕانی شوێنی نیشتەجێ بوون و هاتنە ئارای ناوەندی شاری نوێ، کە بوونەتە هۆی ئەوەی چەندین لێکۆڵینەوە ئەنجام بدرێت دەربارەی شارنشینی و بەپیشەسازی بوون و کاریگەرییان لەسەر ژیانی خێزانی.

| پێوەر | خێزانی فراوان | خێزانی ناوکی |
|---|---|---|
| ژمارەی منداڵان | زۆر | کەم |
| رەهەندی خێزان | گەورە | بچووک |
| بەرپرسی ئاگاداری بەساڵاچووان | خێزان | خانەی بەساڵاچووان |
| دەست بەتاڵی و رابواردن | خێزان | پسپۆری و بازرگانی |
| بەرپرسی فێرکردن | خێزان | قوتابخانە |
| تۆڕی پەیوەندی هاوسێیەتی | بەهێز | لاواز |
| یەکسانی ژن و پیاو | پیاو لەپێشترە | یەکسانیی ژن و مێرد |
| هەڵبژاردنی هاوسەر | لە ئەستۆی خێزاندایە | لە ئەستۆی کچ و کوڕدایە |
| وابەستەیی تاک بەخێزانەوە | زۆر | کەم |
| بەرپرسی پەروەردەی ئایینی | خێزان | قوتابخانە |
| رادەی جێگیری | زۆر | کەم |

لە ئێرانی ئێستادا، بەشێوەیەکی گشتی خێزان لە قۆناغی گواستنەوە دایە، هەرچەند کە لە ماوەی چەند دەیەیەکی رابردوودا بەردەوام رێژەی خێزانی ناوکی بەتایبەت لە شارە گەورەکاندا زیادی کردووە، بەڵام دەبێت ئەوە بزانین کە بە شێوەیەکی گشتی خێزانی ئێستای ئێران لە نێوان فراوان و ناوکی دایە یان بەدەستەواژەیەکی دیکە لە حاڵەتێکی گواستنەوەدایە.

**گۆڕان لە خێزانی هاوچەرخدا**

سەرەکیترین ئەو گۆڕانکارییانەی کە لەم چەند دەیەی دواییدا لە پێکهاتەو پەیوەندییە خێزانییەکاندا لە زۆربەی شوێنەکانی دنیادا روویانداوە دەتوانین لەم خاڵانەی خوارەوەدا کورت بکەینەوە[ ٥٢/ ١١٣-١١٧]:

١- فراوانی رەهەندەکانی خێزان، لە ماوەی ئەم ساڵانەی دواییدا تارادەیەک وردە وردە لە زۆربەی وڵاتاندا کەم بۆتەوە یان لە کەمبوونەوەدایەو لێکۆڵینەوەکان ئەوە پیشان دەدەن کە هۆکارە سەرەکییەکانی بریتین لە:

أ- گەشەی شارنشینی و کاریگەرییە لاوەکییەکانی. لە کاتێکدا کە دەکرێت لەلادێدا خێزانی فراوان بوونی هەبێت (بوونی هێزێکی مرۆیی زیاتر لە کاری کشتوکاڵیدا)، بەڵام لە شارەکاندا بڕیارەکانی قەدەغەکردنی کاری منداڵان و زۆری خەرجی ژیانی رۆژانە بارودۆخێک دەهێنێتە ئاراوە کە ژمارەی منداڵان سنووردار دەکات.

ب- وا دێتە پێش چاو کە یەکێکی دیکە لە هۆکارە سەرەکییەکان کارایی زێترو پەسەندکردنی زیاتری هۆکارەکانی پێشگرتن لە سکپڕی بێت. گۆڕان لە رەوتی ئەخلاقی خەڵکی لەلایەک و فراوانبوونی ئاستی فێربوونیان لەلایەکی دیکەوە، توانای پێویستی فەراهەم کردووە لەڕووی کاریگەربوونی راگەیاندن لە بواری کۆنترۆڵی لە دایکبوون و لە ئەنجامیشدا تێگەیشتن و پەسەندکردنی.

خێزانەکان یەک تێڕوانینیان نییە لە بواری تەندروستی و رێکخستنی خێزاندا. لە خێزانی نوێ و نوێخوازدا، ئارەزووی سنووردارکردنی ژمارەی منداڵان زیاترەو لە بەرامبەریشدا خێزانی نەریتی (تقلیدی) ئارەزووی لە منداڵی زۆرە[ ١٥٩ / ٦٩ ].

جـ- هۆکارێکی دیکە ئەو گۆڕانکارییانەیە کە بە تایبەت لەوڵاتە پیشەسازییەکاندا روویداوە لەڕووی ئابووری خێزان و پەیوەندی خێزان بە کاڵا بەکاربراوەکان و بەکارهێنانی زێتر لە جارانی ئەو کاڵایانە. لە زۆرێک لە ماڵەکاندا لەوانەیە کڕینی ئوتمبیلێکی نوێ لە پێشتر بێت لە بوونی منداڵێکی زیاتر [١٩٤-١٩٣/١٩٧].

**بەراوردی تێڕوانینی خێزانە نەریتی و نوێیەکان دەربارەی رێکخستنی خێزان**

| پێوەر | خێزانی نەریتی | خێزانی نوێ |
| --- | --- | --- |
| بەهاکان: | منداڵی زێتر، دڵنیایی زیاتری لەدایکبوونی منداڵ لە دەستی خوادایە. رازیکردنی مێرد گرنگە. | منداڵی زیاتر، زەمانەتی کەمتر پێویستە لە دایکبوون رێک بخرێت. خۆشگوزەرانی خێزانیش گرنگە. |

| | | |
|---|---|---|
| رەفتارەکان: | بەکارهێنانی هۆکاری گشتی<br>باس نەکردنی مەسەلە<br>سێکسییەکان لەگەڵ مێرددا | بەکارهێنانی هۆکاری دڵنیاکەر<br>باسکردنی مەسەلە<br>سێکسییەکان |
| نۆرمەکان: | زاڵی هەمەلایەنەی پیاو<br>بەناشیرین سەیرکردنی<br>هۆکارەکانی پێشگیری<br>لەسک پڕبوون. | مافی یەکسان و هاوبەش<br>دەشێ هۆکارەکانی پێشگیری<br>پەسەند بکرێت. |

د- بێگومان ئازادی زێتری ژنان یەکێکی دیکەبووە لە هۆکارە گرنگەکان. یەکسانی کۆمەڵایەتی- سیاسی ژن و پیاو لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا بەدیهات و بەزیاد بوونی داواکاری بۆ کاری ژنان و فەراهەم بوونی هەلی زێتری کار بۆ ئەوان بۆ چوونە نێو کاری جیاواز، پێگەی ئابووری و کۆمەڵایەتی ژنان گۆڕاو هاوکات لەگەڵ ئەو، رۆڵی ژن وەک ماڵدار، هاوسەرو دایک بەهەمان شێوە گۆڕانی بەسەرداهات. توانای ژن لەڕووی لەمنداڵبوون و پێشتگرتن لە سکپڕی توانای ژنی زیاتر کردووە لەڕووی هەڵبژاردنی ژیانی خۆیەوە. ژمارەی ئەو ئافرەتە هاوسەردارو شوونەکردووانەی لە دەرەوەی خێزان کار دەکەن زیاد بووەو ئەنجامی ئەم مەسەلەیەش سەربەخۆیی زیاتری ئەوانە [١٩٨/ ٧٩-٨٢].

«پولاک» لەگەشتنامەکەیدا بەئاماژەکردن بەشوێنگەی ژن لە قۆناغی قاجاریدا لە ئێران دەنووسێت: بە ژنی رێزدار دەوترێت «خانم»و ژنانی پلە دوو پێیان دەوترێت «بیگم» یان «باجی»، لە نزمترین پلەیشدا ژنان بە «زەعیفە» ناودەبرێن. نازناوی «بی بی» بەمانای (خاتوون) پێشتر باو بووە، بەڵام ئێستا بەکار ناهێنرێت. [١٥٧/٢٢٠]

٢- تەمەنی هاوسەرگرتن لە وڵاتانی پیشەسازی خۆرئاوادا لە حاڵی دابەزیندایە لە کاتێکدا تەمەنی هاوسەرگرتن لەو وڵاتانەی لە حاڵەتی گەشەسەندندان (Developing) (کە لەرابردوویەکی نزیکدا بەتایبەتی لە کۆمەڵگا لادێییەکانیاندا زۆر نزم بوو) ئێستا زیادی کردووە.

٣- ئارەزوو و ئامادەگی تاکەکان لە هەمبەر جیابوونەوە (طلاق) گۆڕاوە. لە کاتێکدا کە لەرابردوودا رادەی جیابوونەوە زۆر کەم بوو، بەڵام ئێستا لە زۆربەی وڵاتانی دنیادا (بەتایبەت لە کۆمەڵگای پیشەسازیدا) ئەم رێژەیە لە بەرزبوونەوەدایە.

٤- ڕێژەی ئەو ژنە بەمێردانەی دەچنە نێو بازاڕەکانی کارەوە لە زۆربەی وڵاتانی دنیادا لە زیادبووندایە، کە یەکێکە لە ئەنجامە سەرەتاییەکانی سەربەخۆیی زیاتری ژنانی ئیشکەر. لە بواری کولتووریشدا پێگەی ژن و وێنەی کۆمەڵایەتی ئەو لە ژینگە جیاوازەکاندا لە ژێر کاریگەری گۆڕانکاری دابووە. بەڵگەنەویستە کاری ژنان دیاردەیەکی نوێ نییەو ئەوان لە بوارەکانی بەرهەمی کشتوکاڵی و کاروباری ماڵدا هەمیشە چالاک بوون. لە هەندێک لە گرووپەکانی کاردا وەک ئیشکەرەکان و کاسبکاران و پیشەوەران، دیاریکردنی سنوور لە نێوان کاری ناوماڵ و بەشداری کردن لە چالاکییەکانی مێرددا هێندە ئاسان نییە.

لەگەڵ ئەوەی ژنان لەسەرجەم کۆمەڵگاکانی مرۆڤایەتیدا کاریان دەکرد، بەڵام کاری ئەوان لە دنیای نوێدا جیاوازییەکی بنەڕەتی هەیە لەگەڵ سەرجەم سەدەکانی پێشوودا. خەسڵەتی بنەڕەتی کاری ئێستەی ژنان ئەوەیە کە دەتوانن بەشێوەیەکی سەربەخۆ لە مێردو منداڵ و لە ژینگەیەک لە دەرەوەی خێزان و ئەوەی هەیەتی سەرگەرمی کاربن و لە کاری خۆیاندا بەرزببنەوە. بەڵام لەوێوە کە دەرامەتی کاری ژنان بە گشتی ئاستێکی نزمتری هەیە لە کاری پیاوان، چوونە نێو کاری گرنگ دژوارە بۆیان، و ڕۆڵی دایکایەتی و هاوسەری ئەوان زاڵە بەسەر ڕۆڵی پیشەیی ئەواندا، دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی و سەربەخۆیی کاری ئەوان بەشێوەیەکی کردەیی گۆڕانێکی ئەوتۆی بەسەردا نەهاتووە (٦٧/ ٣٨٤].

گۆڕانکاری بنەڕەتی لە بواری کاری ئافرەتاندا لە دنیای خۆرئاوادا پێویستە لەسەدەی نۆزدەهەم و پێشکەوتنی پیشەسازی لەم سەدەیەدا - سەدەی بیست- تاوتوێ بکرێت. لەبەرئەوەی لەم قۆناغەدا ژمارەیەکی زۆری ژنان لە گرووپی مووچەخۆران بوون. لە ئەورووپادا کەمێک دوای کۆتایی هاتنی جەنگی یەکەمی جیهانی ڕێژەی ژنانی ئیشکەر لە کارخانەکاندا بەڕادەیەکی زۆر زیادی کرد، بەڵام وردە وردە ڕووی لە کەمبوونەوە کرد. ئێستا لە ئەورووپا زۆرترین ژمارەی ژنانی ئیشکەر لە بەشە خزمەتگوزارییەکاندا چالاکی دەنوێنن [ ٥٧/ ١٤١-١٤٤].

گرتنە ئەستۆی هەندێک کار لەلایەن ژنانەوە کە پێشتر تایبەت بووە بەپیاوان وەک نەشتەرگەریی، شوفێری کامیۆن (لۆری)و، وەزارەت و کاری لەمجۆرە لە ئێستادا بە شێوەیەکی گشتی شتێکی ناوێزەیە. توێژینەوەی گرووپە جۆراوجۆرەکانی کار ئەوە دەردەخات کە هەندێ لە کارەکان لە کۆمەڵگای ئەمڕۆدا تایبەتن بەژنان. لەسەر ئاستی کادیرە باڵاکان ژنان زێتر سەرگەرمی پیشەی مامۆستایین تاکو

پزیشکی. لەسەر ئاستی کادیرە مام ناوەندییەکاندا ڕێژەی مامۆستایانی قوتابخانە زۆر زۆرە، لە نێو کارمەندە ئاساییەکاندا پیشەی زۆری ژنان سکرتێری و چاپکردنە. لە نێو کۆمەڵی ئیشکەراندا ڕێژەی ژنانی ناپسپۆر زیاترە.

ئەم بارودۆخە نایەکسانە زیاتر «لە پێشیداوەرییە کولتوورییە وابەستەکان بەکاری ژنانەوە سەرچاوە دەگرێت». لێکۆڵینەوەکانی خانم «شومبار دولو» (M.J. Chombart de Lauwe) لە فەرەنسا ئەوە پیشان دەدات کە رازی بوونی کۆمەڵگا لە ئافرەت وەک بالۆیز یان ئەندازیارێک زۆر سادەترە لە رازی بوونی لە ئافرەت وەک پسپۆری کارەبا یان فیتەر. پسپۆری پیشەیی ژنان لە هەندێک لە کارەکاندا کۆمەڵگا پێی رازی نابێت. هەمان لێکۆڵینەوە ئەوە پیشان دەدات کە تێڕوانینی چینە کۆمەڵایەتییەکان دەربارەی کاری ئافرەتان لە دەرەوەی ماڵ وەک یەک نییە. ناڕازی بوونی کرێکاران بەرامبەر کاری ژنان لە دەرەوەی ماڵ زیاترەو چینە ناوەندییەکان لە کەسانی دیکە زێتر رازین بەکاری ژنان. کاتێک کە مەسەلەی کاری ژنە بەمێردە منالدارەکان دێتە ئاراوە ناڕەزاییەکان زیاتر دەبن [ ٤٠/ ١٠٠- ١٠١].

٥- خێزان هێشتا رۆڵی سەرەکی خۆی کە بەرهەمهێنانی منداڵی نوێیە بۆ ژیان لە کۆمەڵگادا پاراستووە. لەگەڵ ئەوەی کە رادەی لە دایک بوونی ناڕەوا (غیرمشروع) لە جیهاندا لە ماوەی ئەم ساڵانەی دواییدا زیادبووە، بەڵام ڕێژەکەی لە پێودانگی گشتیدا زۆر زیاد نییە. لە هەمان کاتدا هەرچەندە رادەی لە دایکبوون کەم بۆتەوە لە بەرامبەردا ئەگەری مانەوەی منداڵان روو لە زیاد بوونە.

٦- خێزان لەڕووی ئەرکی بەکۆمەڵایەتی کردنەوە هەروا بەگرنگی ماوەتەوە، هەرچەند کە زۆرێک لە ڕەهەندە تایبەتییەکانی فێرکردنی (کارو... هتد) بە دامەزراوە تایبەتییەکانی دیکەی وەک قوتابخانە سپێردراوە. فێرکردنە ئاکاری و ئاینییەکان چیدی لەماڵ و لە ڕێگەی بەشداری کردنی سادەی خەڵکی لە نێوان ماڵ و مزگەوتدا ئەنجام نادرێت. فێرکردنە ئاکاری و ئایینییەکان زێتر لە چوارچێوەی خزمەتەکانی قوتابخانەو دامەزراوە ئایینییەکان و هۆکارە دەستە جەمعییەکاندا ئەنجام دەدرێت. رۆڵی دەوڵەتەکان لەم بوارەدا بەردەوام لە زیاد بووندا بووە. لە پەروەردەو فێرکردندا گوژمە (کلفە)ی زۆربەی ئەو قوتابخانانەی کە زۆرینەی قوتابیان و قوتابیانی زانکۆ سوودیان لێوەردەگرن لەسەرچاوەکانی داهاتی گشتییەوە دابین دەکرێت. لەمەش زیاتر دەوڵەتەکان بە هاوکاری ڕێکخراوو کاربەدەستە

لۆکالییەکان پێشبینی پێویست دەکەن لەڕووی دابین کردنی کارەوە بۆ لاوان لە ئایندەدا.

٧- وا دێتە پێش چاو کە ئەرکی عاتیفی خێزان بەتایبەت لە کۆمەڵگای پیشەسازی خۆرئاوادا لەم سالآنەی دواییدا زیاتر بووە. هەرچەندە کە هەڵسەنگاندن و پێوانی ئەم خەسڵەتە دژوارە، بەڵام پێدەچێ کولتووری هاوچەرخ بە بەراورد لەگەڵ رابردوویەکی نزیکدا زێتر جەخت لەسەر «پێکەوە ژیان»و «پێکەوەبوون» دەکاتەوە. هەر لەم پەیوەندییەدا کە تێبینی دەکەین سەرچاوە وەڵامگۆکانی دیکە بەپێویستییە عاتیفییەکانی تاک لەگەڵ بزاوتی زێتری خێزانی ناوکیدا لەڕووی کۆمەڵایەتی و فیزیکییەوە کەمبوونەتەوە (کۆمەڵی لۆکاڵی، هاوسێیەتی، خێزانی فراوان و نموونەی ئەمانە). بزاوتی شوێنی (مكاني) زیاتر کە بە هۆی پێشکەوتنی هۆکارەکانی گواستنەوەو گەیاندنەوە فەراهەم بووە، ئەندامانی خێزانی پەراگەندەو لێک جیاکردۆتەوە، بەڵام لە هەمان کاتدا ئەم هۆکارانە یارمەتی ئەندامانی خێزان دەدەن کە پەیوەندییان هەبێت پێکەوە.

٨- ئەرکەکانی خێزان لەڕووی پاراستن و پارێزگاری کردنەوە گەشەیەکی ئەوتۆیان نەکردووە. کۆمەڵێک دەزگای وەک خانەی بەساڵاچووان و رێکخراوەکانی خزمەتگوزاری کۆمەڵایەتی و یارمەتییەکانی رێکخراوەکانی دابینکاری کۆمەڵایەتی (ضمان الأجتماعي) پێویستی بەپارێزگاری خێزانی کەم کردۆتەوە. زۆرێک لە رێکخراوەکانی خۆشگوزەرانی و خزمەتگوزاری منداڵان و لاوان، تەنانەت ئەگەر بەشێوەیەکی تایبەتیش بەڕێوەببرێن هێشتا هەر لە یارمەتییە داراییەکانی دەوڵەتەوە بەشێوەی راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ سوود وەردەگردن. بێجگە لەمەش کۆمەڵێک خزمەتگوزاری وەک چاودێری تەندروستی و خۆراکی قوتابیانی قوتابخانەکان و پارێزگاری کۆمەڵایەتییان زۆرجار بەبەشداری دەوڵەت ئەنجام دەدرێت.

٩- لەکۆتاییدا خێزان وەک یەکەیەکی بەرهەمهێن گرنگی خۆی وردە وردە لە دەست دەدات و زێتر لە جاران دەگۆڕێت بۆ یەکەیەکی بەکاربەر یان بەرخۆر (مستهلک). چالاکییە ئابوورییەکان لە حاڵی حازردا بە زۆری لە لایەن دامەزراوە ئابووری، تایبەتی یان دەوڵەتییەکانەوە هەروەها دامەزراوە وابەستەکان پێیانەوە ئەنجام دەدرێن و چیدی خێزان بەدامەزراوەیەکی ئابووری دانانرێت.

زیادبوونی ڕێژەی جیابوونەوە (طلاق) لە قۆناغی ئێمەدا، بەتایبەتی لە کۆمەڵگای پیشەسازی خۆرئاوادا بووەتە هۆی ئەوەی ئەم بابەتە ببێتە جێگەی سەرنجی کۆمەڵێکی زۆر لە پسپۆڕان و جاروبار تەنانەت هێندێک ئەم بابەتە بە نیشانەی لەنێوچوونی خێزان دادەنێن لە ساڵانی داهاتوودا (٢٠٠/ ٤٤-٤٥].

زۆربەی جار دەگوترێت کە ئەمڕۆکە خەڵکی بە خەم و گرفتێکی کەمترەوە بە بەراورد لەگەڵ جاراندا ڕوودەکەنە هاوسەرگرتن، لەبەرئەوەی «جیابوونەوە» (طلاق) وەک بیمەیەک (ضمان) وایە بۆیان، لە حاڵەتێکدا کە ئەگەر هاوسەرێتی گرفتی تێکەوت و سەرکەوتوو و دڵخۆشکەرنەبوو، دەتوانێ وازی لێ بهێنن. زۆربەی جار جیابوونەوە کاتێک ڕوودەدات کە هاوسەرەکان گەنج بن. زۆربەی هاوسەرێتییەکان دوای بەسەربردنی ڕۆژانی خۆشی، تووشی جۆرێک لە قەیران دێن و زۆرێک لە هاوسەرەکان چەند هەنگاوێک هەڵدەگرن بۆ لەناوبردنی پەیوەندی نێوانیان. ئەوەی کە بۆچی هەندێک لە هەنگاوەکان درێژترن؟ ناتوانین بەپشت بەستن بەیەک هۆکار وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە بەڵکو کۆمەڵێک هۆکار لە ئارادایە کە بە تەنها یان پێکەوە دەبنە هۆی تێکدانی ژیانی ژن و مێردایەتی[ ١٩٩/ ٥٣٩-٥٤٠].

«فالسام» (Folsom) کۆمەڵناسی ئەمریکی هەوڵی داوە کە هۆکارەکانی قەیرانی ژن و مێردایەتی لەم خاڵانەی خوارەوەدا کورت بکاتەوە[ ٧٨/ ٢٦٠-٢٦١].

١- هۆکاری شوێنگەیی و ناکەسێتی (غیر شخصیة) وەک لەشساغی، بارودۆخی ئابووری، دەستێوەردانی خزمان، لە دایکبوونی منداڵی نەویستراو و جۆرەها بەدبەختی دیکە.

٢- کەم وکورتی کەسی و کەسێتی (شخصي و شخصیة) لە یەکێک لە هاوسەرەکاندا یان لە هەردووکیاندا، وەک نەخۆشی دەروونی، ئەلکوولی بوون، نەزۆکی، مەیلە سێکسییە لادەرەکان، و نیشانەکانی دیکەی لادانی دەروونی (انحراف نفسي).

٣- جیاوازی یان لێک نەچوونە کەسێتییەکان لەڕووی پێشینەی زەینی و کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئایینی و هونەری و، هەندێک هەستۆکی (حساسی) تایبەت.

٤- نەگونجانی ڕۆڵەکان وەک ئارەزووە نایەکسانەکانی هەردوو هاوسەرو ئەو بێ

بەشییانەی کە لەبێ توانایی هاوسەرێتییەوە لەوەدیهێنانی ئارەزووەکانی هەر لایەکەوە سەرچاوە دەگرێت، هەندێک لەو هۆکارانەی کە دەبنە هۆی لەناوچوونی ژیانی ژن و مێردایەتی لەو ڕۆڵانەوە سەرچاوە دەگرێت کە هەریەک لە ژن و مێرد دەیگێڕن لە ژیانی ژن و مێردایەتی خۆیانداو لە قۆناغی منداڵی و لە خێزانی پێشوویاندا فێری بوون. کارکردن بەم ڕۆڵانە زۆرجار بۆ هەریەک لە هاوسەرەکان بە نائاگاییەو ئەوەی کە گرفت دروست دەکات نەگونجانی ئەوانە لەگەڵ یەکتردا لە چوارچێوەی خێزانێکدا. لە نێو ئەم ڕۆڵانەدا کە هەمەچەشنن دەتوانین ئاماژە بەمانەی خوارەوە بکەین[ ٧٨/ ٢٦٠-٢٦١ ].

أ- ژنی زاڵ بەسەر مێردەکەیدا پیاو بە رازی بوون بە ڕۆڵی شوێنکەوتەیی (ژێر دەسەڵات) لە ماڵی باوکی و لە نێو گرووپی هاوڕێکانیدا، لە ژیانی هاوسەرێتیشدا رازی دەبێت بە دەسەڵاتی هاوسەرەکەی.

ب- ژن یان پیاوی بە ناز. کەسێک کە لە منداڵیدا خۆشەویستی دایک و باوک بووبێت و لە گەنجێتیدا جێگەی پیاهەڵدانی ئەوان بووبێت، لە ژیانی هاوسەرێتیشدا هەمان چاوەڕوانی هەیە لە هاوسەرەکەی.

ج- مێردێک کە دەیەوێت بیپەرستن. کەسێکی ئاوەها وەک خوایەکی بچووک وابووە بۆ دایک و باوکی.

د- ئیرەیی بردنی نائاسایی ژن یان مێرد. ئەم حاڵەتە پێدەچێت لە بێ بەری بوونی عاتیفییەوە لە قۆناغی منداڵیدا، سەرچاوە بگرێت.

هـ- کزی سێکسی ژن. ئەم حاڵەتە زۆرجار دەرەنجامی کەموکوڕتییە لە پەروەردەی ژیانی هاوسەرێتیدا.

و- ژنی منداڵ سیفەت. ژن وەک «کچی بچووکی دایکی» هەرگیز ڕێی پێنادرێت کە گەورە ببێت.

ز- ئەو مێردانەی بە کەڵکی پشت پێ بەستن نایەن. پیاوێک کە پێی وایە کە دەبێت هەموو ژنانی وەک دایکی خۆشیان بوێت.

ئەو لێکۆڵینەوانەی کە لەوڵاتە پیشەسازییەکاندا ئەنجام دراون لە ڕەهەندی پێچەوانەی تەلاقدا واتە لە بواری بارودۆخی یارمەتیدەر بۆ بەردەوامی ژیانی هاوسەرێتی هاوکات لەگەڵ خۆشبەختی و سەرکەوتنندا ئەم هۆکارانەی خوارەوە بەکاریگەر دادەنێت [ ٥٢/١١٣-١١٧ ]:

أ- لێکچوونی ژن و مێرد لەڕووی بیروباوەڕە ئایینییەکانەوە.

ب- بوونی قۆناغی دەزگیرانداری بەماوەی شەش مانگ یان زیاتر.
ج- بوونی پێشینەیەکی پەروەردەیی گونجاو لە ژیانی خێزانی و بەتایبەت لە قۆناغی منداڵیی هەردوو هاوسەردا.
د- بوونی توانای دارایی تارادەیەکی مامناوەندی لە کاتی هاوسەرگرتن.
هـ- پێکەوە گونجان و توانای نەرمی نواندنی هەردوو هاوسەر.
و- لێکچوونێکی ڕێژەیی ئاستی خوێندن.
ز- بوونی شارەزایی پێویست لە بواری خێزانداریدا.

### کورتەی بەش

١- خێزان یەکێکە لە گرنگترین دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگای مرۆیی و کۆمەڵناسان لە ریزی گرووپە سەرەتاییەکاندا دایاندناوە.
٢- پێویستە چەمکی ماڵ و خێزان لێک جیابکرێنەوە.
٣- خزمایەتی پەیوەندی نێوان ئەندامانی خێزان بەشێوەی ناوکی یان فراوانە.
٤- سۆسیۆلۆژیای هاوسەر لە باسە نوێیەکانی کۆمەڵناسی خێزانە لە کۆمەڵگای پیشەسازی خۆرئاوادا.
٥- هاوسەرگرتن رازی بوونە بەجۆرێک لە پێگەی نوێ.
٦- میتۆدی جیاواز هەیە بۆ هەڵبژاردنی هاوسەر.
٧- خێزانی نەریتی ئەرکی زۆری هەیەو کۆمەڵە بوارێکی وەک بەرهەمهێنانی ئابووری، پەروەردەو فێرکردن و ئایین و کاتبەسەربردنی (ترفیهي) دەگرێتەوە.
٨- ئەرکە سەرەکییەکانی خێزان لە دنیای هاوچەرخدا بریتین لە: زاوزێ، رەوایەتی دان بەپەیوەندی سێکسی، چاودێری و پارێزگاری منداڵان، بەکۆمەڵایەتی کردن، جێگەگرتنەوەو لە هەندێ حاڵەتدا بەرهەم هێنانی ئابووری.
٩- «مورگان» بەتێڕوانینێکی تەواوکارییەوە خێزان دابەش دەکات بۆ: هاوخوێن، کۆمەڵ (جماعي)، ژن و مێردی، باوکسالاری، تاک هاوسەری.
١٠- دەتوانین خێزان لەڕووی چەند پێوەرێکی وەک، فراوانی رەهەندەکانی خێزان و خزمایەتی، شێوەی هاوسەرگرتن و شێوەی هەڵبژاردنی هاوسەرو ناوەندی قورسایی هێزو بنەچەو شوێنی نیشتەجێ بوونەوە ریزبەندی بکەین.
١١- (پارسونز) چوار پێکهاتەی جیاوازی هێز لە نێو خێزاندا دەستنیشان دەکات.
١٢- خێزانی فراوان خێزانێکە هاوخوێن کە چەند وەچەیەک لە خۆیدا جێدەکاتەوە.

١٣- خێزانی فراوان بنیاتنراوە لەسەر گرنگی زێتری گرووپی خێزانی، هێزی بە تەمەنەکان و فراوانی ئەرکەکان.
١٤- خێزانی فراوان رۆڵێکی دیاریکەری هەیە لە هاوسەرگرتنەکاندا.
١٥- خێزانی فراوان تەمەنێکی درێژی هەیە و سێ تا چوار وەچە دەتوانێت بەردەوام بێت.
١٦- خێزانی فراوان دەکرێت دابەش بکرێت بۆ دووبەشی سەرەکی باوکسالاری و دایکسالاری.
١٧- خێزانی ناوکی لە خزمانی دیکە جیابۆتەوەو ژن و مێردو منداڵەکان دەگرێتەوە.
١٨- خێزانی ناوکی خێزانێکە شیاوی لەناوچوونە.
١٩- گرنگترین هۆکارەکانی کەم بوونەوەی رەهەندەکانی خێزان لەسەردەمی ئێمەدا بریتین لە: شارنشینی، فراوان بوونی هۆکارەکانی پێشگرتن لەسک پڕبوون، گۆڕان لە شوێنگەی ئابووری خێزان، و ئازاری زێتری ژنان.
٢٠- گرنگترین ئەو گۆڕانکارییانەی کە لەخێزانی هاوچەرخدا رووی داوە بریتین لە: کەمبوونەوەی رەهەندەکانی خێزان، دابەزینی تەمەنی هاوسەرگرتن لە خۆرئاوا، گۆڕانی تێڕوانینەکان دەربارەی جیابوونەوە، بەرزبوونەوەی رێژەی کاری ئافرەتان، گۆڕانی رۆڵی بەرهەم هێنانی توخمە تازەکان، وەرچەرخانی ماهیەتی بەکۆمەڵایەتی کردنی منداڵان، زیادبوونی رۆڵی عاتیفی خێزان، زیادنەبوونی رۆڵی پارێزگاری خێزان و گۆڕانی خێزان بۆ یەکەیەکی بەکاربەر (مستهلک).
٢١- هۆکارەکانی قەیرانی هاوسەرێتی بریتین لە: هۆکارە ناکەسێتییەکان (غیر شخصیة)، کەموکورتییە کەسییەکانی یەکێک لە دووهاوسەر، جیاوازی یان لێک نەچوونە کەسێتییەکان و یەکنەگرتنەوەی رۆڵەکان.

## سەرچاوەکان:

ئەم بەشە ئەو سەرچاوانە دەگرێتەوە کە لە نووسینی کتێبەکەدا سوودیان لێ وەرگیراوە.


1_ Brown, k. An Introduction to Sociology. Cambridge: Polity. 1996.

2_ Ferréol, G. Vocabulaire de la sociologie, Paris: P.U.F. 1995.

3_ Wander Zanden, J. W. The Social Experience. New York: Mc Graw-Hill. 2nd Edition. 1990.

4_ Mukhi, H.R. Social Structure, Change and Investigation. Delhi: SBD. 1995.

5_ Wander Zanden, J.W. Sociology. New York: Mc Graw-Hill. 1990.

6_ Pickvance, C.G. Voluntary Associations. in: Burgess, R. G. Key Variables in Social Investigation. London: Routledge and Kegan Paul. 1986.

7_ Horton, P.B. et al. Sociology. Singapore Mc Graw-Hill. 6th Edition. 1984.

8_ Stewart, E.W. Introduction to Sociology. New York: Mc Graw-Hill. 4th Edition. 1988.

9_ Bertholet, J.M. La construction de la sociologie, Paris: P.U.F. 1991.

10_ Fichter, J.H. La sociologie. Bruxelles: Editions Universitaires. 1969.

11_ Sugarman, B. Sociology. London: Heinemann Educational Books. 1984.

12_ Mc Kee, J.B. Sociology. New York: Holt. 1981.

13_ Chitambar, J.B. Introductory Rural Sociology. New York: Halsted Press. 1973.

١٤_ دورکیم، امیل. قواعد روش جامعه شناسی. ترجمهٔ علی محمد کاردان. تهران: انتشارات مؤسسهٔ مطالعات و تحقیقات اجتماعی دانشگاه تهران. ١٣٤٣.

15_ Jaccard, P. Introduction aux sciences sociales. Toulouse: Privat. 1971.

16_ Cuvillier, A. Manuel de sociologe. Paris: P.U.F. Tome I. 1970.

17_ Giddens, A. Sociology. Cambridge: Polity. 1989.

18_ North, P.J. People in Society. London: Longman. 1973.

19_ Worsley, P. Modern Sociology. U. K: Penguin. 1982.

20_ Schaefer, R. Sociology. New York: Mc Graw-Hill. 1989.

۲۱_ سازمان جهانی بهداشت، تحقیق در سیستم های بهداشتی. ترجمهٔ منوچهر محسنی و... وزارت بهداشت، درمان و آموزش پزشکی: تهران. ۱۳۶۹.

22_ Akoun, A. et al. La sociologie. Paris: Larousse. 1978.

23_ Muchielli, A. Les Methodes Qualitatives. Paris: P.U.F. 1991.

24_ Lockerbie, L. et al. Questionnaire Design. Switzerland: International Epidemeilogical Association. 1986.

25_ Berthelot, J.M. La construction de la sociology. Paris: P.U.F. 1991.

۲۶_ محسنی، منوچهر. جامعه شناسی عمومی. تهران: طهوری. چاپ چهاردهم. ۱۳۷۵.

۲۷_ خواجه نظام‌الملک. سیاستنامه. به کوشش دکتر جعفر شعار. تهران: شرکت سهامی کتابهای جیبی. ۱۳۷۳.

28_ Coulon, A. L'Ecole de Chicago. Paris: P.U.F. 1992.

29_ Assoun, P.L. L'Ecole de Francfort. Paris: P.U.F. 1987.

30_ Hall, R.H. Organizations, Structures, Processes, and Outcomes. New Jersey: Prentice Hall. 1991.

31_ Faris, R.E. Handbook of Modern Sociology. Chicago: Rand Mc Nally & Co. 3rd Edition. 1968.

۳۲_ بارنز، اچ. ای و بکر، اچ. تاریخ اندیشهٔ اجتماعی. جلد اول. ترجمهٔ جواد یوسفیان و علی‌اصغر مجیدی. تهران: امیرکبیر. ۱۳۵۴.

۳۳_ نچکینا و... تاریخ مختصر جهان. ترجمهٔ محمد تقی فرامرزی. تهران: انتشارات دنیا. جلد ۱. ۱۳۵۶.

34_ Tenzer, N. La politique, Paris: P.U.F. 1991.

۳۵_ عنصرالمعالی کیکاوس بن اسکندر. گزیدهٔ قابوس نامه. تهران: شرکت سهامی کتابهای جیبی. ۱۳۵۳.

۳۶_ فروخ، عمر. عقاید فلسفی ابوالعلاء. ترجمهٔ حسین خدیو جم. تهران: سازمان کتابهای جیبی. ۱۳۴۲.

۳۷_ حلبی، علی‌اصغر. تاریخ فلاسفهٔ ایرانی. تهران: کتابفروشی زوار. ۱۳۵۱.

۳۸_ رادمنش، عزت‌الله. کلیات عقاید ابن خلدون. تهران: انتشارات قلم. ۱۳۵۷.

39_ Bouthoul, G. Histoire de la sociologie, Paris: P.U.F 1967.

40_ EDMA. La sociologie. Paris: Livre de Poche. 1979.

41_ Comte, A. La Science sociale. Paris. Gallimard. 1972.

42_ Timasheff, N. Sociological Theory. New York : Random House. 3rd Edition. 1976.

43_ Cazeneuve, J. et al. La sociolgie. Paris: Centre d'Etude et de Promotion de la Lecture. 1970.

44_ Maus, H.A. Short History of Sociology. London: Routledge & Kegan Paul. 1967.

45_ Wright, F.J. et al. Basic Sociology. London: Macdonald & Evans. 3rd Edition. 1975.

46_ Mitchell, G.D.A Dictionary of Sociology. London: Routledge & Kegan Paul. 1968.

47_ Sumpf, J., Hugues, M. Dictionnaire de sociologie. Paris: Larousse. 1973.

48_ Panoff, M., Perrin, M. Dictionnaire de l'ethnologie. Paris: Payot. 1973.

49_ EDMA. L'anthropologie. Paris: Livre de Poche. 1977.

50_ Giacobbi, M. et al. Initiation à la sociologie. Paris: Hatier. 1990.

51_ Herman, J. Les languages de la sociology. Paris: P.U.F. 1988.

52_ Braun, D.D. Sociology, Nebraska: Cliff's Notes. 1971.

53_ Piaget, J. Le Structuralisme. Paris: P.U.F. 6ème Edition. 1974.

54_ Freeman, H.E. et al. Applied Sociology. San Francisco: Jossy-Bass, 1983.

55_ Smadja, E. Le rire. Paris: P.U.F. 1993.

۵۶ـ آلپورت، گوردون، و... روان شناسی اجتماعی از آغاز تاکنون. ترجمهٔ محمد تقی منشی طوسی. مشهد: آستان قدس رضوی. ۱۳۷۱.

57_ Konig, R. sociologie. Paris: Flammarion. 1972.

58_ Achard, P. La sociologie du langage. Paris: P.U.F. 1993.

59_ Lanski, G. Human Societies. New York: Mc Graw-Hill. Book Company. 1970.

60_ Houlet, T.F. Dictionary of Modern Sociology. New York: Littlefield. 1972.

۶۱ـ پولاک، یاکوب ادوارد. سفرنامهٔ پولاک. ترجمهٔ کیکاوس جهانداری. تهران: خوارزمی. چاپ دوم. ۱۳۶۸.

62_ W.H.O. Health and the Environment. Geneva: W.H.O. 1986.

63_ Mauzur, A. et al. Biology & Social Behavior. London: Colber Macmillan Publishers. 1974.

۶۴ـ وات، کنت. مبانی محیط زیست. ترجمهٔ عبدالحسین وهاب زاده. مشهد: اترک. ۱۳۶۴.

65_ EDMA. L'écologie. Paris: Livre de Poche. 1980.

66_ Oliver, G. L'écologie humaine. Paris: P.U.F. 1975.

67_ Good, W.J. Principles of Sociology. New Delhi: Tata. 1979.

۶۸_ کشاورز، کریم. هزار سال نثر فارسی. جلد اول. تهران: شرکت سهامی کتابهای جیبی. چاپ سوم. ۱۳۵۵.

۶۹_ دهخدا، علی‌اکبر. امثال و حکم. جلد اول. چاپ سوم. تهران: امیر کبیر. ۱۳۵۲.

۷۰_ آگ برن و نیم کف. زمینهٔ جامعه شناسی. ترجمه و اقتباس ا.ح.آریان پور. تهران: دهخدا.۱۳۴۷.

71_ Halbwacks, M. Morphologie sociale. Paris: Arman Colin 1970.

72_ Robinson, D. Epidemiology and The Community Control of Disease. London: Churchill Livingston. 1985.

۷۳_ پرسا، رولان. جمعیت شناسی اجتماعی. ترجمهٔ منوچهر محسنی. تهران: انتشارات دانشگاه تهران (۱۴۲۷). ۱۳۶۳.

74_ Cazeneuve, J. Dix grandes notions de la sociologie. Paris: Editions du Seuil. 1976. P. 81, 83-84.

۷۵_ خواجه نصیرالدین طوسی. اخلاق ناصری. تهران: مؤسسه مطبوعاتی اسلامی. ۱۳۴۶.

76_ Véron, J. Population et développement. Paris: P.U.F. 1994.

۷۷_ تکمیل همایون، ناصر. درآمدی بر ریشه های فرهنگ شناسی. نامهٔ پژوهشکده، سال سوم، شمارهٔ اول، ۱۳۵۸. ص: ۷-۱۰۱.

78_ Sutherland, R.I. et al. Introductory Sociology. Chicago: J.B. Lippincott. 1961.

79_ Linton, Ralf. The Tree of Culture. New York: Alfred A. Knopf. 1957.

80_ Broom, L. et al. Sociology. 5th edition. New York: Harper & Row. 1973.

81_ Hellriegel, D. et al. Organizational Behavior. New York: West Publishing Co. 5th Ed. 1989.

82_ Reisman, D. The Lonely Crowed. New York: Doubleday, Inc. 1973.

۸۳_ روزنامهٔ کیهان. شمارهٔ ۷۷۸۶، یکشنبه ۱۱ آبان ۱۳۴۸. ص ۱۴.

84_ Krech, D. et al. Individual in Society. New York: Mc Graw-Hill. 1983.

85_ Zémor,p. La communication publique. Paris: P.U.F. 1995.

86_ Lenski, G. Human Societies. New York: Mc Graw-Hill. 1970.

۸۷_ اکبری، علی‌اکبر. لمپنیسم. تهران: مرکز نشر سپهر. ۱۳۵۲. ص: ۶۸-۵۲.

88_ Herskovits, M.J. Les bases de l'anthropologie culturelle. Paris: Payot. 1967.

89_ De Varine, Hugues. La culture des autres. Paris: Seuil. 1976.

90_ Malinowski, B. Une theorie scientifique de la culture. Paris: Francois Maspero. 1968.

۹۱_ آرین پور، یحیی. از صبا تا نیما. تهران: شرکت سهامی کتابهای جیبی. چاپ سوم. ۱۳۵۳.

۹۲_ اشرف‌الدین گیلانی. دیوان نسیم شمال. تبریز: نشر احیاء. ۱۳۵۶.

۹۳_ آل احمد، جلال. در خدمت و خیانت روشنفکران. تهران: انتشارات خوارزمی. جلد اول. ۱۳۵۷.

94_ Busson, A. Le management des entreprises artistiques et culturelles. Paris: Economica. 1993.

95_ Maisonneuve, J. La dynamique des groupes. Paris. P.U.F. 1969.

96_ Lindzey, G, et al. Social Psychology. New York: Amerind. Vol. 4 2nd Edition. 1975.

۹۷_ نالز، ملکم و نالز، هولدا. مقدمه‌ای بر تکاپوشناسی گروه‌ها. ترجمهٔ محسن قندی. تهران: مؤسسه مطبوعاتی عطایی. چاپ دوم. ۱۳۵۰.

98_ Gurvitch, G. La vocation actuelle de la sociologie. Paris: P.U.F. Tome 1, 3éme Edition. 1963.

۹۹_ باتامور، تی. بی. جامعه شناسی. ترجمه حسن منصور و حسن حسینی کلجاهی. تهران: شرکت سهامی کتابهای جیبی. ۱۳۵۵.

100_ Huntin, S. Les société secrètes. Paris: P.U.F. 1970.

۱۰۱_ رائین، اسمعیل. فراموشخانه و فراماسونری در ایران. جلد اول. تهران: امیرکبیر. ۱۳۵۷.

102_ Deaux, K. et al. Social Psychology. Pacific Grove (USA): Cole. 1988.

103_ Matiniello, M. L'éthnicité dans les sciences sociales contemporaines. Paris: P.U.F. 1995.

۱۰۴_ رشیدپور، ابراهیم. ارتباط جمعی و رشد ملی. تهران: انتشارات مؤسسه مطالعات و تحقیقات اجتماعی دانشگاه تهران (شمارهٔ ۶۳). ۱۳۴۸.

۱۰۵_ کلاین برگ، اتو. روانشناسی اجتماعی. ترجمهٔ علی محمد کاردان. تهران: نشر اندیشه. ۱۳۶۸. جلد دوم.

106_ O'Brien et al. Readings in General Sociology. New York: Houghton Mifflin.1980.

107_ Rocher, G. Introduction à la sociologie. Tome 2. Paris: H.M.H. 1968.

108_ Thévenet, M. La culture d'entreprise. Paris: P.U.F. 1993.

109_ Busino, G. Les théories de la bureaucratie. Paris: P.U.F. 1993.

110_ Mariet, N. Psychosociologie d'aujourd'hui. Paris: Bordas. 1975.

۱۱۱_ آرین پور، یحیی. از صبا تا نیما. تهران: شرکت کتابهای جیبی. جلد اول. ۱۳۵۳.

۱۱۲_ صدیق، عیسی. یادگار عمر. تهران: دهخدا. ۱۳۵۳.

113_ Birou, A.Vocabulaire pratique des sciences sociales. Paris: Les Editions Ouvière. 1966.

114_ Defrasne. J. et al. La vie associative en france. Paris: P.U.F. 1995.

115_ Babbie, E.R. Society by Agreement. Belmont (USA): Wadsworth. 1977.

116_ Power, R. et al. Sociology. England: Pitman. 1986.

۱۱۷_ راوندی، مرتضی. زندگی ایرانیان در خلال روزگاران. تهران: کتابفروشی زوار. ۱۳۶۲.

118_ Lowie, R. Traité de sociologie primitive. Paris. Payot. 1969.

۱۱۹_ کورفکین، ف. پ. تاریخ دنیای قدیم. ترجمهٔ م. بیدسرخی. تهران: انتشارات شبگیر. جلد اول. ۱۳۵۳.

۱۲۰_ کورفکین، ف، پ. تاریخ دنیای قدیم، ترجمهٔ غلامحسین متین. تهران: انتشارات شبگیر. جلد سوم. ۱۳۵۴.

۱۲۱_ کورفکین، ف.پ. تاریخ دنیای قدیم. ترجمهٔ غلامحسین متین. تهران: انتشارات شبگیر. جلد دوم. ۱۳۵۴.

۱۲۲_ راوندی، مرتضی. تاریخ اجتماعی ایران. جلد سوم. تهران: امیر کبیر. ۱۳۵۶.

123_ Briand, J.P. et al. Les classes sociales. Paris. Hatier. 1980.

۱۲۴_ مارکس، کارل و... مانیفست. تهران: همراد. ۱۳۵۷.

125_ Bottomore, T.B. Classes in Modern Society. London: George Allen. 1973.

126_ Ball, F. et al. Le système social. Paris: Larousse. 1979.

127_ Young, M. The Rise of the Meritocracy, 1870-2033. Baltimore: Penguin Books, Inc. 1961.

128_ Petersen, P. Population. New York: The Macmillan Co. 2nd Edition. 1969.

۱۲۹_ دنسکوی، گ. م. آگیبالووا، ا.و. تاریخ سده های میانه. تهران: پیام. ۱۳۵۵.

130_ Bates, D.G. et al. Cultural Anthropology. New York: Mc Graw-Hill. 3rd Edition. 1990.

131_ Shalins, M.D. Tribesmen. New Jersey: Prentice-Hall. 1968.

132_ Harris, M. Culture, Man, & Nature. New York: Thomas Y. Cromwell Co. 1971.

۱۳۳_ کازنوو، ژان. مردم شناسی. جلد اول. ترجمهٔ ثریا شیبانی. تهران: مؤسسهٔ مطالعات و تحقیقات اجتماعی. ۱۳۴۹.

134_ Smelser, N.J. Handbook of Sociology. London: Sage. 1988.

۱۳۵_ سعیدیان، عبدالحسین. مردمان جهان. تهران: انتشارات علم و زندگی. ۱۳۶۲.

۱۳۶_ ورجاوند، پرویز. روش بررسی و شناخت کلی ایلات و عشایر. تهران: انتشارات مؤسسهٔ مطالعات و تحقیقات اجتماعی دانشگاه تهران (شمارهٔ ۲۹). ۱۳۴۴.

۱۳۷_ ودیعی، کاظم. مقدمه بر جغرافیای انسانی ایران. تهران: انتشارات دانشگاه تهران (شماره ۱۲۸۰). ۱۳۴۵.

۱۳۸_ ایلات و عشایر (مجموعه مقالات). تهران. آگاه. ۱۳۶۲.

۱۳۹_ صفی‌نژاد، جواد. «ساخت سنتی در عشایر ایران». نامهٔ علوم اجتماعی. (دورهٔ جدید). شمارهٔ ۳. جلد اول. زمستان ۱۳۶۸. ص: ۷۱.

۱۴۰_ مرکز آمار ایران. سرشماری اجتماعی ـ اقتصادی عشایر کوچنده (۱۳۶۶). تهران: مرکز آمار ایران. ۱۳۶۷.

141_ Wolf, E.P. Peasants. New Jersey. Prentice-Hall. 1966.

142_ Bahmanbegui, M. in: Nomads of the World. Washington D.C.: National Geographic Society. 1971.

۱۴۳_ محسنی، منوچهر. معتبر، منصور. تحقیقی در برخی از جوانب حیات فرهنگی عشایر قشقائی. مجلهٔ دانشکده. سال اول. شمارهٔ اول. ۱۳۵۳. ص: ۱۱۱-۱۱۰.

۱۴۴_ بدیعی، ربیع. جغرافیای مفصل ایران. تهران: اقبال. جلد اول. ۱۳۶۲.

۱۴۵_ امان‌اللهی، سکندر. کوچ نشینی در ایران. تهران: بنگاه ترجمه و نشر کتاب. ۱۳۶۰.

۱۴۶_ ناصری، عبداله. فرهنگ مردم بلوچ. تهران (بدون نام ناشر). ۱۳۵۸.

۱۴۷_ افشار سیستانی، ایرج. ایل ها، چادرنشینان و طوایف عشایری ایران. ۱۳۶۸. جلد اول.

۱۴۸_ بهمن بیگی، محمد بهمن. عرف و عادت در عشایر فارس. تهران: انتشارات سعدی. ۱۳۲۴.

149_ Stewart, I.E. (Editor). Peoples and Cultures of the Middle East. Vol. I. New York: The National History Press, 1970.

۱۵۰_ استروس، لوی. توتمیسم. ترجمهٔ مسعود راد. تهران: انتشارات طوس. ۱۳۶۱.

۱۵۱_ ابوعلی محمدبن محمد بلعمی. گزیدهٔ تاریخ بلعمی. تهران: امیرکبیر. ۱۳۷۳.

۱۵۲_ دهقان نژاد، مرتضی. «زورمالیه». جام، شمارهٔ ۲۹، ۱۳۷۳، ص ۱۲-۸

153_ Oakley P. et al. Approches to Participation in Rural Develpment. Geneva: ILO. 1989. pp. 37-40.

۱۵۴_ دنسکوی، گ. م و... تاریخ سده های میانه. ترجمهٔ رحیم رئیس‌نیا. تهران: انتشارات پیام. ۱۳۵۵.

۱۵۵ـ لمتون، آن. مالک و زارع در ایران. ترجمهٔ منوچهر امیری. تهران: بنگاه ترجمه و نشر کتاب. ۱۳۴۷.

156_ Hoyois, G. Sociologie rurale. Paris: Editions Universitaires. 1968.

157_ Smith, T. et al. Principles of Inductive Rural Sociology. Philadelphia: F.A. Davis Co. 1970.

۱۵۸ـ مرکز آمار ایران. نتایج نهایی سرشماری ۱۳۶۵ کل کشور. تهران: مرکز آمار ایران. ۱۳۶۸.

159_ Sanders, I.T. Rural Society. New Jersey. Prentice-Hall. 1977.

160_ Mendras, H. Société paysannes. Paris: Armand Colin. 1976.

161_ De Fracy, H. L'espace rurale. Paris: P.U.F. 1975.

162_ Sanderson, D. Rural Sociology and Rural Social Organization. New York: John Wiley and Sons. 1942.

۱۶۳ـ وثوقی، منصور. جامعه شناسی روستایی. تهران: انتشارات کیهان. ۱۳۶۶.

164_ Charrier, J.B Citadins et Ruraux. Paris: P.U.F. 1970.

165_ George, P. Géographie sociale du Monde. Paris: P.U.F. 1970

166_ George, P. Géographie agricole du Monde. Paris. 9ème Edition. 1975.

۱۶۷ـ ناصر خسرو قبادیانی. سفرنامه. تهران: شرکت کتابهای جیبی. ۱۳۵۴. ص: ۱۱۷.

168_ Morris, R.R. Urban Sociology. New York : Fredrick A. Prayer. 1968.

169_ Goldthrope, J.E. An Introduction to Sociology. London: Cambridge University Press. 1968.

170_ Hodges, H.M. An Introduction to Sociology. New York: Harper and Row 1971.

۱۷۱ـ فضائی، یوسف. پیدایش انسان و آغاز شهرنشینی. تهران: امیرکبیر. ۱۳۴۷.

۱۷۲ـ روزنامهٔ همشهری. ۱۵ مرداد ۱۳۷۳.

۱۷۳ـ سلطان زاده، حسین. مقدمه‌ای بر تاریخ شهر و شهرنشینی در ایران. تهران: امیرکبیر. ۱۳۶۷.

۱۷۴ـ نجمی، ناصر. ایران قدیم و تهران قدیم. تهران: انتشارات جانزاده. ۱۳۶۳.

175_ Lamarque, 6. L'exclusion. Paris: P.U.F. 1995.

176_ Burgess, S.W. et al. Urban Sociology. Chicago: The University of Chicago Press. 1970.

۱۷۷ـ «اولین های تهران قدیم». روزنامهٔ همشهری. ۲۸ مهر ۱۳۷۳.

178_ Pietsch, M. La Révolution Industrielle. Paris: Payot 1963.

179_ Rocher, G. L'organisation sociale. Vol.2. Paris: Editions HMH. 1968.

180_ Goode, E. Sociology. New Jersey: Prentice-Hall. 1984.

181_ Friedmann, G. Sept études sur l'homme et la technique. Paris: Conthier. 1977.

182_ Novack, D. et al. (Editors). Development and Society. New York: St. Martin's Press. 1984.

183_ Schneider, E.V. Industrial Sociology. New Delhi: TATA. 1983.

۱۸۴_ ابن مقفع. کلیله و دمنه. گزینش رضاانزابی نژاد. تهران: انتشارات جامی. ۱۳۷۲.

۱۸۵_ «اولین های تهران قدیم». روزنامه همشهری. ۲۶ مهر ۱۳۷۳.

186_ Merton, R.K. et al. Contemporary Social Problems. New York: Harcourt Brace. 1984.

187_ Morris, T. Deviance and Control. London: Hutchinson of London. 1976.

188_ Davis, N.J. et al. Social Control of Deviance. New York: Mc Graw-Hill. 1990.

189_ Dintiz, S. et al. Deviance. New York: Oxford University Press. 1975.

190_ Antonio, R.T. et al. Social Problems. Boston: Allyn and Bacon. 1975.

۱۹۱_ اشرف، احمد. کژرفتاری مسایل انسانی و آسیب شناسی اجتماعی (پلی کپی). تهران: آموزشگاه عالی خدمات اجتماعی. ۱۳۵۵.

192_ Henslin, J.M. et al. Social Problems. New York: Mc Graw-Hill. 1983.

193_ Disertori, Beppino. Piazza, Marcella. La Psychiatrie sociale. Paris: ESF. 1976.

194_ Hurd, G. Human Societies. London: Routledge & Kegan Paul. 1973.

۱۹۵_ غزالی، امام محمد. کیمیای سعادت. به تصحیح احمد آرام. چاپ هفتم. تهران: کتابخانهٔ مرکزی. ۱۳۵۵.

۱۹۶_ انگلس، فردریک. منشأ خانواده، مالکیت خصوصی، و دولت. ترجمهٔ مسعود احمدزاده. تهران: پیشاهنگ. چاپ دوم. ۱۳۵۷.

197_ Ford, T.R. et al. Social Demography. N.J. Prentice Hall. 1970.

۱۹۸_ پرسا، رولان. جمعیت شناسی اجتماعی. ترجمهٔ منوچهر محسنی. تهران: انتشارات دانشگاه تهران. چاپ دوم. ۱۳۶۳.

199_ Kirkpatrick, C. The Family. New York: The Ronald Press. 2nd Edition. 1963.

200_ Kaufman, J.C. Sociologie du couple. Paris: P.U.F. 1993.

201_ Brée, J. Le comportement du consommateur. Paris: P.U.F. 1994.

202_ Devito. J. A. Les fondements de la communication humaine. Québec: Gaëtau Morin. 1993.

203_ Mollard, C. L'ingénieurie culturelle. Paris: P.U.F. 1994.

204_ Marshall, G. Concise Dictionary of Sociology. Oxford: Oxford University Press.

1996.

205_ Bakin, H. Les reseaux et leurs enjeux sociaux. Paris: P.U.F. 1993.

206_ Bilton, T. et al. Introductory Sociology. London: Macmillan, 2nd Edition. 1990.

207_ Lugan, J.C. La systèmique sociale. Paris: P.U.F. 1993.

208_ Mucchielli, R. Opinions et changement dlopinion. Paris: ESF. 1988.

209_ Hannoun, M. Solitudes et sociétés. Paris: P.U.F. 1993.

210_ Mills, T.M. The Sociology of Small Groups. New Delhi: Prentice Hall of India. 1988.

211_ Giffard, P.O. La télégestion. Paris: P.U.F. 1994.

212_ Deliège, R. Le système des castes. Paris: P.U.F. 1993.

213_ Chappuin, R. et al. Role et Statut. Paris: P.U.F. 1995.

214_ Béteille, R. La crise rurale. Paris: P.U.F. 1994.

215_ Mendras, H. Les société paysannes. Paris: Folio. 1995.

۲۱۶ـ وامبری، آرمین. زندگی و سفرهای وامبری. ترجمهٔ محمدحسین آریا. تهران: شرکت انتشارات علمی و فرهنگی. ۱۳۷۲.

217_ Vatsyayan. Urban Sociology. Delhi: Kedar Nath. 1995.

218_ Filizzola, G. et al. Victimes et victimologie. Paris: P.U.F. 1995.

۲۱۹ـ مورگان، لوئیس هنری. جامعهٔ باستان. ترجمهٔ محسن ثلاثی. تهران: مؤسسهٔ مطالعات و تحقیقات فرهنگی. ۱۳۷۱.

۲۲۰ـ پولاک، ی. سفرنامهٔ پولاک. ترجمهٔ کیکاووس جهانداری. تهران: انتشارات خوارزمی. ۱۳۶۸.

221_ Laufer, R. et al. Texte, hypertexte, hypermedia. Paris: P.U.F. 1992.

| | | |
|---|---|---|
| Production economic | (الاقتصاد الانتاجي) | ئابووریی بەرهەمهێنان |
| Political direction | (الاتجاه السياسي) | ئاراستەی سیاسی |
| Social direction | (الاتجاه الاجتماعي) | ئاراستەی کۆمەڵایەتی |
| Anarchism | (الفوضوية) | ئانارشیزم |
| Ethnocentrism | (التمركز الثقافي) | ئێتنۆسێنتەریزم |
| Athnography | (الاثنوغرافيا) | ئێتنۆگرافیا |
| Egocentrism | (مركزية الذات) | ئیگۆسێنتەریزم |
| Function | (الوظيفة) | ئەرک |
| Disfunction | (الاختلال الوظيفي) | ئەرک شێوان |
| Empiricism | (المذهب التجريبي) | ئەزموونگەری |
| Rationalism | (العقلانية) | ئەقڵگەرایی |
| Cultural engineering | (الهندسة الثقافية) | ئەندازیاریی کولتووری |
| Social anthropology | (علم الانسان االاجتماعي) | ئەنترۆپۆلۆژیای کۆمەڵایەتی |
| White collars | (الطبقة الموظفين) | ئێخەسپی |
| Objectivity | (الموضوعية) | بابەتییەت |
| Patrilineal descent | (النسب الابوي) | باوکنەسەبی |
| Social movement | (الحركة الاجتماعية) | بزاڤی کۆمەڵایەتی |
| Social mobility | (الحراك الاجتماعي) | بزاوتی کۆمەڵایەتی |
| Generational mobility | (الحراك الاجيال) | بزاوتی وەچەکان |
| Elite | (النخبة) | بژاردە |
| Culture diffusion | (الانتشار الثقافي) | بڵاوبوونەوەی کولتووری |
| Principle | (المبدأ) | بنەما |
| Bourgeoisie | (البرجوازية) | بورژوازیەت |
| Social structure | (البناء الاجتماعي) | بونیادی کۆمەڵایەتی |
| Telegestio | (الادارة عن بعيد) | بەڕێوەبردن لە دوورەوە |
| Depreciation | (الاستهلاك) | بەکاربردن |

| | | |
|---|---|---|
| Production | (الانتاج) | بەرهەمهێنان |
| Socialization | (التنشئة الاجتماعية) | بەکۆمەڵایەتیبوون |
| Organization socializa-tion | (التنشئة الاجتماعية-العضوية) | بەکۆمەڵایەتیبوونی ئۆرگانی |
| Value | (القيمة/القيم) | بەها |
| Bureaucracy | (البيروقراطية) | بیروکراسی |
| Observation | (المشاهدة) | بینین |
| Questionnaire | (الاستبيان) | پرسیارنامە |
| Proletariat | (الطبقة العاملة) | پرۆلیتاریا |
| Classification | (التصنيف) | پۆلێن |
| Reaction | (ردالفعل) | پەرچەکردار |
| Social relation | (العلاقة الاجتماعية) | پەیوەندی کۆمەڵایەتی |
| Social contract | (العقد الاجتماعي) | پەیمانی کۆمەڵایەتی |
| Progress | (التقدم) | پێشکەوتن |
| Profession | (المهنة) | پیشە |
| Industry | (الصناعة) | پیشەسازی |
| Social communication | (الاتصال الاجتماعي) | پێکگەیشتنی کۆمەڵایەتی |
| Social status | (المكانة الاجتماعية) | پێگەی کۆمەڵایەتی |
| Social structure | (البناء الاجتماعي) | پێکهاتەی کۆمەڵایەتی |
| Standard | (المعيار) | پێودانگ |
| Taboo | (المحرمات) | تابو |
| Individualism | (الفردية/الفردانية) | تاکگەرایی |
| Typology | (علم الانماط) | تایپۆلۆجیا |
| Tradition | (التقليد) | ترادیسیۆن/نەریت |
| Stratum | (الشريحة) | توێژ |
| Social stratification | (التدرج الاجتماعي) | توێژبەندیی کۆمەڵایەتی |
| Totem | (الطوطم) | تۆتەم |
| Totamism | (الطوطمية) | تۆتەمیزم/ تۆتەمپەرستی |
| Researcher | (الباحث) | تۆژەر |

| | | |
|---|---|---|
| Research | (البحث) | تۆژینەوە |
| Technocracy | (التكنوقراطية) | تەكنۆكراسی |
| Divorce | (طلاق) | تەڵاق |
| Social theory | (النظرية الاجتماعية) | تیۆری كۆمەڵایەتی |
| Typology | (دراسة الانماط او النماذج) | جۆرناسی |
| Interview | (المقابلة) | چاوپێكەوتن |
| Population density | (الكثافة السكانية) | چڕی دانیشتوان |
| Concept | (المفهوم) | چەمك |
| Class | (طبقة) | چین |
| Kinship | (القرابة) | خزمایەتی |
| Social Service | (الخدمة الاجتماعية) | خزمەتگوزاریی كۆمەڵایەتی |
| Ego, Self | (الذات) | خود |
| Subjectivity | (الذاتية) | خودێتی |
| Family | (العائلة) | خێزان |
| Nuclear family | (العائلة النووية) | خێزانی ناوكی |
| Tribe | (القبيلة) | خێڵ |
| Distribution | (التوزيع) | دابەشكردن |
| Division of labour | (تقسيم العمل) | دابەشكردنی كار |
| Institution | (المؤسسة) | دامەزراوە |
| Population | (السكان) | دانیشتوان |
| Matrilineal descent | (النسب الامي) | دایكنەسەبی |
| Data | (البيانات) | داراوەكان/زانیارییەكان |
| Contera culture | (الثقافة المضادة) | دژە كولتوور |
| Culture Lag | (التخلف الثقافي) | دواكەوتنی كولتووری |
| Dualism | (الثنائية) | دوالیزم -دوانە- |
| Psychology | (علم النفس) | دەروونناسی |
| Social psychology | (علم النفس الاجتماعي) | دەروونناسیی كۆمەڵایەتی |

| English | Arabic | Kurdish |
|---|---|---|
| Feudal | (الاقطاع) | دەرەبەگ |
| Feudalism | (الاقطاعية) | دەرەبەگایەتی |
| Out-gruop | (خارجية الجماعة) | دەرەوەی گرووپ |
| Category | (الفئة) | دەستە |
| Social category | (الفئة الاجتماعية) | دەستەی کۆمەڵایەتی |
| Natural phenomena | (الظواهر الطبيعية) | دیاردە سروشتییەکان |
| Social phenomenan | (الظاهرة الاجتماعية) | دیاردەی کۆمەڵایەتی |
| Dimographia | (علم السكان) | دیمۆگرافی |
| Group dynamics | (ديناميكية الجماعة) | دینامیکیەتی گرووپ |
| Behaviour | (السلوك) | رەفتار |
| Race | (العنصر) | رەگەز |
| Role | (الدور) | رۆڵ |
| Reform | (الاصلاح) | ریفۆرم-چاکسازی |
| Social organization | (التنظيم الاجتماعي) | ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی |
| Social order | (النظام الاجتماعي) | ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی |
| Renaissance | (النهضة) | ڕێنسانس |
| Information | (المعلومات) | زانیاری |
| Pathology | زياناسى (الباثولوجيا) | زیانناسی |
| Endogamy | (الزواج الداخلي) | ژنخوازیی خۆبەخۆیی |
| Civilization | (الحضارة) | ژیار/ شارستانییەت |
| Environment | (البيئة) | ژینگە |
| Social environment | (البيئة الاجتماعية) | ژینگەی کۆمەڵایەتی |
| Rituals | (طقوس) | سرووت |
| Sociologist | (عالم الاجتماع) | سۆسیۆلۆژیست/کۆمەڵناس |
| Sociography | (الجغرافيا الاجتماعية) | سۆسیۆگرافی |
| Socialism | (الاشتراكية) | سۆشیالیزم |
| Sociometry | (القياس الاجتماعي) | سۆسیۆمەتری |
| Capitalism | (الرأسمالية) | سەرمایەداری |
| Investment | (الاستثمار) | سەرمایەگوزاری |

